# خوانی ڕووح

## توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ

نووسینی:
مەلا ئەحمەدی شەریعە

چاپی دووەم

٢٠٠٨ زایینی — ١٤٢٩ کۆچی

پرۆژەی تیشك


ناوی کتێب: خوانی رووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ

نووسینی: مەلا ئەحمەدی شەریعە

ژمارەی سپاردن: (٢٤٥٦) ساڵی (٢٠٠٧)

شوێنی چاپ: خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی چوارچرا

نۆرەی چاپ: دووەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

نەخشەسازی بەرگ: فازل قەرەداغی

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٣٩)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

## دەستپێك

گەڵاڵەکردنی نووسینی بابەتێك دەربارەی گەورەیی‌و ڕێزو پلەو پایەی نوێژ لە ئەنجامی بینین‌و بیستن‌و خوێندنەوەی بیروبۆچوون‌و هەڵوێستی جۆراوجۆری خەڵکیی دەربارەی نوێژ بوو، بۆیە هەر لە منداڵییەوە ئێمەیان لەسەر نوێژکردن ڕادەهێناو هانیان ئەداین کە نوێژەکان نەفەوتێنین، ئەوەندەی لەسەر نوێژ لێپرسینەوەو لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکردین باوەڕناکەم لەسەر خواردن‌و خواردنەوەو ژیانی ڕۆژانەو ئیش‌و کارو بژێوی ژیانیشمان ئاوا گەرموگوڕو توندوتیژ لێپرسینەوەمان لەگەڵ کرابێ.

کەسانێکی تریشمان تاك‌و تەرا دەبینی دەیانوت بە نوێژ نییەو بە دڵە. کەسانێکی تر دەیانوت خوا پێویستی بە نوێژو ڕۆژووی ئێمە نییە. لە کەسانێکی تریشمان دەبیست کە دەیانوت نوێژنەکەر کافرەو پیسەو شتی دەستی ناخورێ. هەروەها دەمانبیست کە نوێژ کۆڵەکەی پتەوو پۆڵایینی دینە، نەکردنی نییەو هەر دەبێ ئەنجام بدرێ، بە ئاو، یان بە گڵ، بە پێوە، یان بە دانیشتنەوە، یان بە دڵ.

ئەمانەو چەندەها دیمەن‌و قسەو هەڵوێستی تری جۆراوجۆر بوونە هاندەرم بۆ نووسینی بابەتێك لەسەر نوێژ، بە کۆکردنەوەی ئایەت‌و فەرمودەو ڕای زانایان دەربارەی نوێژ بە مشێوەیە:

بەشی یەکەمی کتێبەکەم بە بابەتی سوژدە دەستپێکرد، کە کۆڵەکەو پایەی سەرەکییە لە نوێژدا، دواتر کڕنووش‌و واتاکانی، بە دوای ئەویشدا نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر پێغەمبەرەکان، ئینجا پلەو پایەی بانگ‌و بانگبێژان‌و پاداشتیان لە ڕوانگەی فەرمودە شیرین‌و زوڵاڵەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، دواتر نوێژکردنی فریشتەکان‌و گرنگیدانیان بە ڕیزەکانی نوێژو دوعاو نزایان بۆ نوێژخوێنان.

هەروەها لە کۆمەڵێ دیمەنی زۆردا باسم لەوە کردووە کە نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە بەشێکی هەرە گەورەو گرنگی هەردوو ڕووی ژیانی بڕواداراندا لایەنی ماددی‌و گیانی‌و دەروونییدا کاریگەریی هەیە، ئینجا چوومە سەر باسی لایەنی پزیشکی‌و شیفاو چارەسەری نوێژ بۆ نەخۆشییە لاشەییەکان‌و نەخۆشییە دەروونییەکان. دواتر

پەیوەندیی نوێژ بە گەشتی ئاسمانیی (ئیسراو میعراج)ی پێغەمبەرەوەو چەند بابەتێك دەربارەی نوێژو تەوبەو پەیوەندیی نوێژ بە تەوبەکارانەوەو نوێژنەکەرو گوناهو تاوانی نوێژنەکردنو پەیوەندیی نوێژ بە مردووەکانەوەو پەیوەست بوونی نوێژخوێنان بە بەهەشتو دۆزەخەوە. لە ناو هەموو بابەتەکاندا دوو بابەتی گرنگ رەنگی داوەتەوە ئەویش نوێژ بۆ هیچ کەسێكو لە هیچ شوێنێك مۆڵەتی نەکردنی نییەو شتی وا لە شەرعی پیرۆزی ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا داوا دەکەم خوا لێمان وەرگرێو لە کەموکورییمان ببورێ. لە ئێوەی خوێنەریش سوپاس دەکەمو چاوەڕێی دیارییە بە نرخەکانتانم لە چاککردنی هەڵەو پینەکردنی شرەو ئامۆژگاری بە نرخو زانستیو پڕ بایەخ. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو برادەرانەش دەکەم کە کارئاسانییان بۆ کردمو یارمەتییان دام لە نووسینەوەو پیاچوونەوەو نەخشەی بەرگو چاپکردنیدا. ئیتر بە خوای میهرەبانتان دەسپێرم.

**مەلا ئەحمەدی شەریعە**

**٢٠٠٧/٩/٢٧**

## پێشەکی

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهد لله فهو المهتد ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لاإله الا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله صلوات الله وسلامه عليه وعلى آله وصحبه أجمعين.**

واتە: هەرچی سوپاسو ستایشو پێزانین هەیە بۆ (أللّه)، هەر سوپاسو ستایشی ئەو دەکەم، هەر پشت بەو دەبەستمو داوای لێخۆشبوونی لێدەکەمو پەنا بەخوا دەگرم لە خراپەی دەروونمو کردارە خراپەکانم، هەرکەس خوا ڕێنمونی بکات ئەوە لەبەرچاو ڕۆشنانە، هەرکەسیش خوا گومڕای بکات بە کەس ڕێنوێنی ناکرێ، (شاهیدی) ئەدەم واتە بڕوای چەسپاوم هەیە. لە ناخی دڵمەوە بڕوام وایە کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق بێجگە لە (اللّه) تاقو تەنهایە. هاوبەشی نییە، بڕوای چەسپاوم هەیەو لێم عەیانە کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە سەڵاتو سەلامو بەزەیی خوا لەگەڵ ڕێزو سڵاوم لەسەر موحەممەدو شوێنکەوتووەکانی و هاوەڵەکانی بەگشتی.

**أما بعد: فإن أصدق الحديث كلام الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار".** واتە: پاشان: بە ڕاستیی ڕاستترین قسە قسەی خوایەو چاکترین ڕێنوێنی ڕینوێنی موحەممەدە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)و خراپترین شتیش داهێنراوەکانە، هەموو شتێکی تازە، داهێنراوە، هەموو داهێنراوێك گومڕاییەو هەموو گومڕاییەك لە ئاگردایە.

## نوێژ لە چەند دیمەنی ئەمرو زوڵاڵی قورئاندا

خوا دەفەرموێت: **"إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَّوْقُوتاً"**. واتە: "بەڕاستیی نوێژ لەسەر بڕواداران فەرز کراوە لە کاتی دیاریکراودا".

**"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ"**. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کڕنوش بەرنو سوژدەبەرنو پەروەردگارتان بپەرستن.

**"حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ * فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَاناً"**. (البقرة: ٢٣٨ ـ ٢٣٩). واتە: پارێزگاریی لە نوێژەکانتان بکەن بە

تایبەتیی نوێژی ناوەڕاست "نوێژی عەسر"، لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردنکەچی ئەگەر ترستان هەبوو بە پیادە یان بە سواریی هەر نوێژەکان بکەن.

"إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَر". واتە: بە ڕاستیی نوێژ قەدەغەو بنبڕی داوێن پیسی و خراپەکاریی دەکات.

"وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ". (النور: ٥٦). واتە: بە چاکیی نوێژ بکەنو زەکاتو بدەنو گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن، بە ئومێد بن خوا بەزەیی پێتاندا بێتەوە. "..وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ". (الروم: ٣١) واتە: بە چاکیی نوێژ بکەنو مەبنە هاوبەش دانەر.

"كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ * إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ".(المدّثر: ٣٨ ـ ٣٩). واتە: هەموو کەس بارمتەی کردەوەکانیەتی بێجگە لە هاوڕێیانی دەستەڕاست، لە بەهەشتدا لەیەك دەپرسن دەربارەی تاوانباران، چی ئێوەی بردۆتە ناخی دۆزەخ؟ دەڵێن ئێمە لە نوێژخوێنان نەبووین.

"فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ". (الجمعة: ١٠). واتە: هەرکات نوێژی هەینی تەواو بوو بە زەویدا پەرشو بڵاوبنەو بە دوای ڕۆزیی خودا بگەڕێنو کاسپیی بکەن و یادی خوا بکەن بە ئومێدی ڕزگاربوون.

## چەپکێك لە گوڵستانی فەرموودە

**عن أبي مالك الأشعري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "الطهور شطر الإيمان".**[1] واتە: لە ئەبی مالیکی ئەشعەرییەوە (ڕەزای خوا لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "پاكو خاوێنیی (دەستنوێژ) نیوەی ئیمانە".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "تبلغ الحلية من المؤمن حيث بلغ الوضوء".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)

---

[1] رواه مسلم، رقم الحديث (٢٢٣). و رياض الصالحين/ ١٠٣١.

[2] رواه مسلم، رقم الحديث (٢٥٠). و رياض الصالحين/ ١٠٢٥.

فەرموویەتی: گوێم لە خۆشەویستم بوو دەیفەرموو: "خشڵی دەستی بڕواداران (لە بەهەشتدا) دەگاتە هەر شوێنێك ئاوی دەستنوێژی پێگەیشتبێ".

**عن معاوية (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "المؤذنون أطول الناس أعناقا يوم القيامة".**[1] واتە: لە موعاویەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: "بانگبێژان لە هەموو کەس گەردنیان بەرزترە لە ڕۆژی دواییدا".

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله ﷺ: "بني الإسلام على خمس شهادة الا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة وحج البيت، وصوم الرمضان".**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ئیسلام لەسەر پێنج پایە دروست کراوە:

١ ـ بڕوابوون بە دڵو بە گیان کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە (ألله) و بڕوابوون بەدڵو بە گیان کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە.

٢ ـ نوێژکردن بە چاکی (نوێژ بەرپاکردن).

٣ ـ زەکات دان.

٤ ـ حەج کردن.

٥ ـ ڕۆژووگرتنی رەمەزان.

**عن بريدة (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "بشر المشائين في الظلم الى المساجد بالنور التام يوم القيامة".**[3] واتە: لە بورەیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: "مژدەی نورێکی

---

[1] رواه مسلم، رقم الحديث (٣٨٧). و رياض الصالحين/ ١٠٣٤.

[2] رواه البخاري، الحديث (٨)، و: ومسلم، الحديث (١٦). صحيح الجامع/ ٢٨٤٠. رياض الصالحين/ ١٠٧٥.

[3] رواه الطبراني في المعجم الكبير، الحديث (١٠٦٨٩) و (١٣٣٤٥)، والأوسط، الحديث (١٢٧٥) و (٤٢٠٧). رياض الصالحين/ ١٠٥٨.

تەواو لە ڕۆژی دواییدا بدەن بە وانەی بە تاریکی دەچنە مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی و خەوتنان".

**عن جابر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "مثل الصلوات الخمس كمثل نهر جار غمر على باب أحدكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات".**[1] واتە: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: نموونەی پێنج نوێژەکە وەکو ڕووبارێکی خوڕو ڕەوان وایە لەبەر دەرگای یەکێکتان هەموو ڕۆژێ پینج جار خۆی لێ بشوات.

**عن أبي موسى (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "من صلى البردين دخل الجنة".**[2] واتە: لە ئەبی موساوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: هەر کەس دوو نوێژە فێنکەکە بەیانیو عەسر بکات دەچێتە بەهەشت.

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) أن رسول الله ﷺ قال: "صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة".**[3]واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوا لەسەربێ) فەرمووی: "نوێژی بە کۆمەڵ خێری زیاترە لە نوێژی تاك بە بیستو حەوت پلە".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ليس صلاة أثقل على المنافقين من صلاة الفجر والعشاء، ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبوا".** [4]
واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "هیچ نوێژێك قورسو گرانتر نییە لەسەر دووڕووەکان لە نوێژی بەیانیو خەوتنان، ئەگەر بیانزانیایە ئەو دوو نوێژە چەندیان خێر تێدایە بە گاگۆڵکەش بوایە بۆی دەچوون".

---

[1] رواه مسلم، الحديث (٦٦٨)، رياض الصالحين/ ١٠٤٣ صحيح الجامع/٥٨٣٠

[2] رواه البخاري، الحديث (٥٤٨) ومسلم (٦٣٥). صحيح الجامع/ ٦٣٣٧. رياض الصالحين.

[3] متفق عليه. رواه البخاري، رقم الحديث (٦١٩)، ومسلم، الحديث (٦٥٠) واللفظ لمسلم. رياض الصالحين/ ١٠٦٤.

[4] متفق عليه. رواه البخاري، الحديث (٦٢٦)، ومسلم (٦٥١). رياض الصالحين/ ١٠٧٣.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: سألت رسول الله ﷺ: أي الأعمال أفضل؟ قال: الصلاة على وقتها. قلت: ثم أي؟ قال: بر الوالدين. قلت: ثم أي؟ قال: الجهاد في سبيل الله".**[1] واته: "عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) کرد کام لە کردەوەکان چاکترە؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، وتم دوای ئەو چیتر؟ فەرمووی چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك، وتم: دوای ئەو چی؟ فەرمووی: جیهاد کردن لە ڕێگای خوادا.

**عن جابر (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ "إن بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة".**[2] واته: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوا لەسەربێ) دەیفەرموو: "بەڕاستیی نێوانی پیاوێکی موسڵمانو کوفرو هاوبەشدانەر نوێژنەکردنە".

**عن أبي قتادة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا دخل أحدكم المسجد فلا يجلس حتى يصلي ركعتين".**[3] واته: لە ئەبی قەتادەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوا لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەگەر یەکێکتان چووە مزگەوت با دانەنیشێ تا دوو ڕکات نوێژ نەکات".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "من قام رمضان إيماناً واحتساباً غفر له ماتقدم من ذنبه".**[4] واته: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "هەرکەس شەونوێژ (تەراویحەکان)ی ڕەمەزان بکات بە بڕواوەو بە ئومێدی پاداشتی خوا، گوناهەکانی پێشووی هەموو وەبەر لێخۆشبوون دەکەون.

---

[1] متفق عليه. رواه البخاري، الحديث (٥٠٤) و (٢٦٣٠) ومسلم، الحديث (٨٥) رياض الصالحين/ ١٠٧٤.

[2] رواه مسلم، الحديث (٨٢)، رياض الصالحين/ ١٠٧٨.

[3] متفق عليه. رواه البخاري، الحديث (١١١٠)، ومسلم، الحديث (٧١٤)، رياض الصالحين/ ١١٤٤.

[4] متفق عليه. رواه البخاري، الحديث (٣٧) و (١٩٠٥)، ومسلم، الحديث (٧٥٩)، رياض الصالحين/ ١١٨٧.

## دیمەنێك لە وتەی زانایان

موحەممەد قوتب خوا تەمەن درێژیی بکات بۆ خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان دەفەرموێت: "**الإنسان عابد بطبعه فلا يستطيع ان تحول الى اللاعبادة إنما يستطيع ان تحول من نوع الى نوع، إنما الخيار فقط في المعبود هل هو الله أو شيء آخر**". واتە: مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا پەرستکارەو ناتوانێ لابدات بۆ نەپەرستن بەڵکو تەنها دەتوانێ لابدات لە جۆریك پەرستنەوە بۆ جۆرێك پەرستنی تر، بێگومان تەنها هەڵبژاردنەکە لە پەرستراوەکەدایە ئاخۆ ئەو پەرستراوە خوا بێت یان شتێکی تر.

سەید قوتبیش (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "**إن الحاجة البشرية اليوم الى هذا المنهج ليست بأقل من حاجتها يومذاك..**". واتە: بە راستیی پێویستیی مرۆڤایەتی لەمرۆدا بۆ بەرنامەی ئیسلام کەمتر نییە لە پێویستیی لەو رۆژگارەدا "سەرەتای ئیسلام".

کریسی میرسیون دەڵێ: "**الإلحاد نوع من الأنانية حيث يجلس الإنسان على كرسي الله**". واتە: بێباوەڕیی جۆرێکە لە خۆپەرستیو خودپەسەندی بە جۆرێك مرۆڤ لەسەر کورسیی خوا دادەنیشیت.

بلوتارخ دەڵێ: **إن مدينة بلا أرض تقوم عليها أسهل من قيام الدولة بلا إله**". واتە: دروستکردنی شارێك لە بۆشاییدا و بەبێ بوونی پارچە زەوییەك کە لەسەری بونیاد نرێ ئاسانترە لە دروستکردنو پیادەکردنی دەوڵەتێك بەبێ خوا.

داود پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "**الهي لو ان لكل شعرة من لسانين يسبحانك الليل وانهار والدهر، ما وفيت حق نعمة واحدة**".[1] واتە: خوایە ئەگەر هەر موێك دوو زمانی هەبوایە و پەسەندی و پاكو پێگەردی تۆیان دەربڕیایە بە شەو و بە رۆژ بە درێژایی رۆژگار هەقی تەنها بەهرەیەکیان نەداوە.

یەکێك لە زانایان فەرموویەتی: "**الناس منذ خلقوا لم يزالوا مسافرين وليس لهم حط عن رحالهم إلا في جنة أو نار**". واتە: خەڵکیی لەوکاتەوە دروستکراون بەردەوام لە سەفەرداو رێبوارن، بارگەو بنەو باریان ناکەنەوە مەگەر لە بەهەشتێکدا یان لە دۆزەخێکدا نەبێت.

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٠٦.

**"من لم تبك الدنيا عليه لم تضحك الآخرة اليه".**[1] واته: هەرکەس دونیا بۆی نەگریی دوارۆژ بۆی پێناکەنێ.

سەیید (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"إنتهيت من فترة الحياة في ظلال القرآن الى يقين جازم حاسم: إنه لاصلاح لهذه الأرض ولا راحة لهذه البشرية ولاطمأنينة لهذا الإنسان ولا رفعة ولابركة ولاطهارة ولا تناسق مع سنن الكون وفطرة الحياة الا بالرجوع الى الله".** واتە: لە ماوەی ژیان بە سەر بردن لە سێبەری قورئاندا گەیشتومە دڵنیایی کە بەڵگەنەویستەو چەسپاوو یەکلاکەرەوەیە، کە ئەم سەرزەوییە چاك نابێتو ئەم مرۆڤایەتیە ئاسوودە نابێتو ئەم ئادەمیزادە ئارامو بەرزیەتیو فەڕو پیرۆزیو پاكو بێگەردیو جۆشدان ئاوێتەی سوننەتو رەوشتی بوونەوەرو سروشتی ژیان نابینێت تەنها بە گەڕانەوە نەبێت بۆ لای خوا.

## ناوەڕۆکی ئەم کتێبە

نوێژ دووهەم پایەی ئیسلامەو رەمزی ئیسلامەتییە، نیشانەی ئیمانو بڕوایەو گەورەترین خواپەرستییە کە گەردنکەچیو ملکەچیو زەلیلی بەندە دەردەخات بەرامبەر بە خوا و دڵی بەندەی خواناس پڕ دەکات لە گەورەییو بڕوابوون بە خوا.

نوێژ گەورەترین خۆراكو شەرابی زوڵاڵو بێگەردی پاراو کردنی درەختی ئیمانە، نوێژ بڕوا دەچەسپێنێو گەشەی پێئەداو وزەو گەشەش ئەدا بە بەروبوومەکانی بڕوا لە کردەوەی چاكو هەڵنان بۆ چاکەکردن.[2]

نوێژ ئاسوودەییو ئارامی ویژدانو دڵو دەروونەو پەیوەندیی پتەوو پۆڵاینی نێوان بەندەو خودایە بە یادی خوا.

نوێژ تەسلیم بوونو یەکلابوونەوەیە بۆ خوا، پەروەردەکردنی رۆحو گیانە، رۆشنکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی دڵە بە چاندنو ریشەداکوتانی گەورەییو شکۆداریی خوا.

---

[1] صفة التفسير ج٤ ص٦١.

[2] الرياض الناضرة، ص٢١، عبدالرحمن السعدي.

نوێژ رازێنەرەوەو ئارایشتکاری مرۆڤە بە رەوشتو ئاکارو گوفتاری شیرینو جوان.

نوێژ کاکڵەو ناوەڕۆكو چەقی راستەقینەی دینو دینداربیەو سونەتی تەواوی پێغەمبەران بووە.

نوێژ هۆکاری پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان بەندەو خوایە بە هۆیەوە بەندەی خواناس رۆحو دڵو گیانی ئاوێتەی وزەو تواناو هێزی پۆلاینی بڕوابوون بە رۆژی دوایی دەبێت، ئەوانە لە سزای پەروەردگاریان دەترسن. کە بە راستیی سزای پەروەردگاریان مایەی ئەمینی و دڵنیایی نییە.

نوێژ گەورەترین پشتیوانە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی دینو دونیا، هەرکەس پارێزگاریی لە نوێژەکانی بکاو بەردەوام بێت لەسەریانو زایەیان نەکات، زیاتر هەستی خێرکردنو بەخشینی تیادا زیادو پتەو دەکات تەواوی ژیانی ئاوێتەی چاکەکردن و خێرکردن دەبێتو خواپەرستیو گوێڕایەڵیی پەروەردگاری لا ئاسان دەبێت.[١]

خوای گەورە دەفەرموێت: **"إِنَّ الإنسان خُلِقَ هَلُوعاً * إذا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً * وَإذا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً * إِلَّا الْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ * وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ * لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ * وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ * وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ * إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ * وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ"**. (المعارج: ١٩ ـ ٢٩). واتە: بەڕاستیی مرۆڤ بە شپرزەو چاوچنۆك دروست کراوە، کە دووچاری شەڕو گرفتاریی بوو ورەی دەڕوخێو هاوار دەکات کە دەکەوێتە خۆشیی، سپڵەو چاوچنۆکە. بێجگە لە نوێژخوێنان ئەوانەی لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامنو نایەڵن نوێژیان بچێ، ئەوانەی لەماڵو سامانیاندا بەشی دیاریکراویان هەیە. بۆ سواڵکەرو بێبەشان ئەوانەی رۆژیی دوایی بە راست دەزانن، ئەوانەی لە سزای پەروەردگاریان دەترسن، بەڕاستیی سزای پەروەندیان مایەی ئەمینیو دڵنیایی نییە، ئەوانەش داوێنیان دەپارێزن.

لە دیدو روانگەی هاوشێوەی ئەم ئایەتە پیرۆزانەوە دەبینی کە هیچ کەسێك نابینی پارێزگاریی لە نوێژەکان بکاتو کاردانەوەی چاکی نەبێت لەسەر هەموو کردارو گوفتارو

[1] الرياض الناضرة، ص٢١، عبدالرحمن السعدي.

جموجولّی تەواوی ژیانی، هەربۆیەش نوێژ کراوە بە ڕەمزی ڕزگاری و خۆشبەختی و لە بانگداو ڕۆژانە چەند جار دووبارە دەکرێتەوەو بە دەنگی بەرزو زوڵاڵی بانگبێژ خەڵکی پێڕادەچڵەکێنن.

لە نوێژدا مرۆڤ لەبەردەم پەروەردگاریدا دەوەستێ بە داماویو گەردنکەچی، بە دڵو بە گیانو جەستە هەست بە گەورەییو دەسەڵاتی خوا دەکات بە جۆرێك ئەو هەستە ناسکە ئاوێتەی خۆشەویستی و ترسو جوانیو شکۆداریی پەروەردگاری دەبێت هەست بە بەرزیی دەکات، چونکە پەیوەستە بە خوای باڵادەست.

نوێژ پلەو پایەو مەقامێکی بەرزو بڵندی هەیە لە ئیسلامدا، کە هیچ پەرستنێکی پێناگات، پلەو پایەی نوێژ ڕاستەوخۆ دوای موسڵمانبوون و وتنی شایەتومانەکانە بۆ ئەوەی بەڵگەو شاهید بێت لەسەر ڕاستیی شایەتوومانو ئەو بڕوایەی لە دڵی نوێژخوێندا جێگیرە.

نوێژ لە دونیاو هەرچی لە دونیادا هەیە چاکترە، ئیسلامەتی پێ تەواو دەبێت، تاوانەکان دەسڕێتەوە پلەکان بەرز دەکاتەوە، بەندە زیاتر لە خوا نزیك دەکاتەوە، نوێژ دەبێتە هۆی زیادبوونی نوری ئیمان لە دڵدا.[1]

نوێژ یەکەم پەرستنە لە مەککەدا پێویست (فەرز) کراو دواتریش لە مەدینە تەواو کرا.

نوێژ کلیلی هەموو چاکەیەکە، هۆگریو ئاسوودەیی و بەختیاری بەدڵ و دەروون دەبەخشێتو وزەو تواناو هەڵمەتو چوستو چالاکیی دەبەخشێتە لاشە.

ڕووحو گیانو کاکڵەو ناوکرۆکی نوێژ ئامادەبوونی دڵە لە بەردەست پەروەردگارا گفتوگۆو قسە لەگەڵ کردنو پیاهەڵوتنو ستایش کردنو پاڕانەوەو لاڵانەوەو دەردە دڵ کردنو داوای نزیکبوونەوەو پاداشت وەرگرتنە لە خوا، ئەم حاڵو مەقامەش بێگومان دل ڕۆشن دەکات لە لای هەموو پزیشکانیش ڕوونو ئاشکرایە کە ئارامی دڵو ئاسوودەیی گیانو دڵخۆشیو دڵشادیی دەبێتە هۆی نەهێشتنو ڕیشەکێش کردنی غەمو خەفەتو پەژارەو دڵەڕاوکێ و گەورەترین هۆی لەشساغی و پتەوی و سەلامەتی لاشەیە.

---

[1] الرياض الناضرة. ص٢٢.

نوێژ جۆرەها وزەی لاشەیی تیایە کە ئەندامی لاشە بەهێز دەکات، دەبێتە هۆی توانەوەی چەوری و ماددە خەستو ناجۆرەکانی ناو لاشە لە هەردوو لایەنی دەروونی و گیانی کە باسمکردو لایەنی لاشەیش، کە بریتییە لە ڕۆیشتنو هاتنو هەستان و دانیشتنو کڕنوش بردنو سوژدە بردن جار لە دوای جار، هەروەها چەندەها جار خۆپاکردنەوە، هەموو ئەم جموجوڵو بزوانە سوودەکانیان بەرچاو و بەرهەستەو کەس لێی بەگومان نییە مەگەر نەفام.(١)

پەروەدگار نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت)ی داناوە لە پێنج فەرزەکاندا و لە نوێژی هەینیو نوێژی جەژنو نوێژەبارانەو نوێژی خۆرگیرانو نوێژی مانگ گیراندا، چونکە کۆبوونەوەو یەکدەستیو کۆدەنگی وزەو توانا بەخشەو خێروبێری تیایە لە فێربوونو فێرکردنو زانست سۆزو خۆشەویستیو پەیوەست بوونو جۆشدانی ڕیزی موسڵمانانو ئاگاداربوون لە حاڵی نوێژخوێنانو پارێزگاریی لە نوێژەکانو وەرگرتنی پاداشتی چەندانەو ئاگاداربوون لەوانەی کەمتەرخەمن دەربارەی نوێژ، هەروەها دوورکەوتنەوەشە لە دابڕانو پچڕپچڕی ڕیزی موسڵمانان.

لە نوێژدا موسڵمانان هەست بە هۆگری و یەکڕیزی و یەك پارچەیی هەموو موسڵمانانی سەرانسەری جیهان دەکەن، بەڵکو پشت ئەستوورن بە یەکڕیزیی نوێژخوێنانو بەیەك پارچەیی نوێژخوێنان بەوەی ڕوویان لەیەك رووگەو لە یەك خوایە، بەیەك شێواز نوێژ دەکەنو دەپاڕێنەوە، جیاوازییان نییە لە شوێنو چۆنیەتی نوێژکردن و ڕەگەزو چینو توێژ، هەژارو دەوڵەمەند، پاشاو گەدا، گەورەو بچووك، نێرو مێ، عەرەبو عەجەم.

نوێژ لە هەموو حاڵەتو قۆناغەکانی ژیانتدا لەگەڵتایە لە ماڵەوە لەسەرفەردا لە کاتی نەخۆشیو ساغیو هەژاریو دەوڵەمەندیو خۆشیو ناخۆشیو ترسو تەنانەت لە کاتی مردنیشدا.

نوێژ پێنج فەرزەو هەینیو نوێژی جەژنەکانو نوێژەبارانەو نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران، شەونوێژ و نوێژی چێشتەنگاو سەلامی مزگەوت، نوێژی بەیانی نیوەی ڕۆژ،

---

[1] الرياض الناضرة. ص٢٣.

بەشی کۆتایی ڕۆژ عەسر، کۆتایی ڕۆژ نوێژی ئێوارە، نوێژی خەوتنان پێش خەوتن، نوێژی پێویستیو دەیان نوێژی تر لە حاڵەتی جیاوازیی تردا.

نوێژ ڕاوەستانەکەی قورئان خوێندنە، کڕنوش بردنەکەی پەسەندی و بێگەردی دەربڕینە "تەسبیحاتە" ڕاستبوونەوەی سوپاسو ستایشە، هەردوو سوژدەکانو دانیشتنی نێوانیان دووبارە تەسبیحاتە، کە دەربڕینی پەسەندیو بێگەردیی خوایە، تەحیات سەلامکردنە لە پێغەمبەرو نوێژخوێن خۆیو پیاوچاکان و تازەکردنەوەی ئیمانە بە وتنی (**لا إله إلا الله**) هەروەها سەڵاوات دانە لەسەر پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)، کۆتاییەکەشی سەلام کردنە لە هەموو نوێژخوێنانی لای ڕاست و چەپی نوێژخوێن لەسەرانسەری جیهان.

نوێژ یەکەم خشتو بەردی پۆڵاینی بناغەی ئیسلامە، یەکەم خشتە خوا کردویەتییە بنچینەو بناغەی ئیسلام و کۆتا خشتە دوژمنانی ئیسلام لە ریشەی دەردێنن کە نوێژ نەما، دینیش نەماوە.[1]

ئیبنولقەییم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی فەوتاندنی نوێژو نوێژنەکەر فەرموویەتی: **"لا يختلف المسلمون أن ترك الصلاة المفروضة عمداً من أعظم الذنوب وأكبر الكبائر، وإن إثمه عند الله أعظم من إثم قتل النفس، وأخذ الأموال، ومن أثم الزنا والسرقة وشرب الخمر، وإنه متعرض لعقوبة الله وسخطه وخزيه في الدنيا والآخرة"**.[2] واتە: موسڵمانان لەوەدا جیاوازییان نییە، کە وازهێنان لە نوێژە فەرزەکان بە ئەنقەستو بەبێ بیانوو یەکێك لە گەورەترینی گوناهە گەورەکانە، بێگومان گوناهی نوێژنەکردن لە لای خوا گەورەترە لە گوناهی خەڵك کوشتنو داگیرکردنو بردنی ماڵی خەڵکی و گەورەترە لە تاوانی زیناو دزییو عارەق خواردنەوە، نوێژنەکەر شایستەی سزاو خەشمو قینو ریسوایی دەبێت لە لایەن خواوە لە دونیاو دوارۆژدا.

---

1 الصلاة ص٢٦. أ ـ د ـ عبدالله الطيار.

2 صحيح وصايا الروسول ج١، ص٤٨٥.

خوشك‌و برای موسڵمانم ئەم نووسراوەی لەبەر دەستدایە مشتێكە لە خەرمانێك بەڵكو قومێكە لە دەریایەك دەربارەی گەورەی و پلەو پایەی نوێژ، دەخوازم مایەی ڕەزامەندیی خواو پاشانیش سوود لێوەرگرتن بێت.

چاككردنەوەی هەڵەو سڕینەوەی پەڵەو پینەكردنی شڕەو ئامۆژگاری‌و زانیاریی زیاتر دڵخۆش‌و شادمانم دەكات بەوپەڕی شانازییەوە لە پێشوازییدا دەبم‌و بەدەست وەری دەگرم و بە چاو دەیبینم‌و بە دڵ پێی رازیی دەبم‌و هەموویان دەخوێنمەوەو لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا دایان دەنێم، ئازیزەكانم لەم نوسراوەدا هەرچی راست‌و دروست و بێ لەكەیە ئەوە گومانت نەبێ لە خواوەیە، ئەوەش هەڵەو كەموكوڕییە لە منی بەندەی بچووك‌و كەم تواناوەیە.

ئیتر سەلامی خوا لە هەموومان.

**ئەحمەد صالح رەشید**
**ناسراو بە مەلا ئەحمەدی شەریعە**
**١١/٤/٢٠٠٧ ـ ٢٣/ ربیع الأول/ ١٤٢٨**

## سۆزێك دەربارەی نوێژ

نوێژ دوعاو نزاو پاڕانەوەو لالأنەوەیە لە لایەن بەندەی بێدەسەلأتو لاواز بەرامبەر بە پەروەردگاری مەزنو شكۆدارو دەسەلأتدارو بێباك.

نوێژ دڵسۆزیو پاكسازی دڵو دەروونە بۆ خواوەندی راستەقینەو كردگار، یەكێ لە زانایان دەفەرموێت: **"إعلموا أن باب الملك لاتقرع بالأظافر إنما تقرع بالقلب السليم"**. واتە: ئەوە بزانن كە دەرگای پادشای گەورە كە خودایە بە نینۆك لێینادرێ، بەڵكو بە دڵی ساغ لێیدەدرێ.

نوێژ هۆكاری بەرزو بڵند كردنەوەی بەندەكانە لە جیهانی نزمو ماددەگەرییەوە بۆ جیهانی بەرزو بڵندی رۆحانی، لەم روانگەشەوە خوا داوا لە بەندەكانی دەكات خۆبەكەمزانین بكەنە كالأی بالأیان لە فەرمودەی پێغەمبەردا (سەلأتو سەلامی خوای لەسەربێت) هاتووە: **"ما تواضع أحد لله الا رفعه الله"**. واتە: كەسێ نەبووە خۆی بە كەم بزانێ و خوا بەرزی نەكردبێتەوە، نوێژیش خۆبەكەم زانینە لە بەرامبەر خوا.

زانایان بە دانەی گەوهەر نیگارو دیمەنی ئەم فەرمودەیان نەخشاندووە كە لە قووڵیی و بنو بێخی دەریاكاندا نەبێت دەست ناكەویت، خۆی بەكەمزانیی رۆچووە بنی دەریاو زەریاكانەوە، بەلأم خۆبەگەورەزان لاكە تۆپیوەو مردارەبووەو بەسەر تۆێژی دەریاوەیە بن ئاو نابێو كەسیش لە دوویان ناگەڕێ.

ژیری بیروهۆش لەسەردایە، سەریش پلاندانەرو بەرنامەرێژی خراپەكارییە لە ئادەمیزاداو لە هەموو ئەندامەكانی لاشەش بەرزترە، بۆیە ئادەمیزاد دەبێ سەری بخاتە سەرزەوی تا بەرزبیتەوە لە لای خواو خۆشەویست بێ لای پەروەردگاریو بیروهۆشو بەرنامەی ژیانی تەسلیمی خوا بكات.

نوێژ ئادەمیزاد فێری خەمخۆریو مشورخواردنی خەڵكیی دەكات بڕوانە ئەم وتە شیرینە: **"أن الذي يعيش لنفسه قد يعيش مستريحا ولكنه يعيش صغيراً ويموت صغيراً، فأما الكبير الذي يحمل هذا العبء الكبير فما له والنوم وما له والراحة وما له والفراش الدافيء والعيش الهاديء والمتاع المريح ان المصلي يحمل عبء الناس قال تعالى "أصلاتك تأمرك أن نترك مايعبد آباءنا"**.[1]

[1] الجامع الصحيح من أحاديث النساء ص٤٤٧.

واتە: بەڕاستیی ئەوەی بۆ خۆی و لە پێناوی خۆیدا دەژی لەوانەیە ژیانی خۆش و ئاسوودە بێت، بەڵام بە بچوکیی دەژیو بە بچوکییش دەمرێ، بەڵام کەسی گەورە ئەو کۆڵو بارە گرانە هەڵدەگرێ، ئەو لە کوێو خەوو پشوو و جێگەی گەرمو نەرمو ژیانی ئاسوودەو هێوەرو کەلو پەلی رازاوە لە کوێ؟ نوێژخوێن کۆڵ بە خەڵکییەوە هەڵدەگرێ، خوا دەربارەی شوعەیب دەفەرموێ گەلەکەی بە شوعەیبیان وت: ئەی شوعەیب ئەوە نوێژەکەت فەرمانت پێدەکات کە واز لەو بتانە بێنین کە بابو باپیرەمان پەرستویانن؟ کافرو هاوبەشدانەرەکانیش دەیانزانی نوێژ ئادەمیزاد لە هەموو خراپەیەك دەگێڕێتەوە. هەموو ئەرکە شەرعییەکان لە زەویدا فەرز کراونو بەڵام نوێژ لە ئاسمان فەرز کراوە.

دکتۆر ئەحمەد مستەفا متەوەلی فەرموویەتی: **"إذن فالصلوات من أفرض الفرائض في دين الإسلام"**.[1] واتە: نوێژەکان فەرزترین فەرزن لە دینی ئیسلامدا.

هەروەها دەربارەی نوێژ دەفەرموێ: **وقد فرضها الله عزوجل، على نبيه محمد ﷺ في أعلى مكان وصل اليه البشر، وفي أشرف ليلة لرسول الله ﷺ وبدون واسطة احد وفرضها الله عزوجل على رسول الله محمد ﷺ خمسين مرة في اليوم والليلة ولكن الله عزوجل خفف على عباده حتى صارت خمسا بالفعل والخمسين في الميزان وهذا يدل على أهميتها ومحبة الله لها..."**[2] واتە: بێگومان خوای گەورەو باڵادەستنوێژی فەرز کردووە لەسەر موحەممەد (سەڵاتو سەلامی خوا لەسەر بێ) لە بەرزترین شوێنێك کە مرۆڤی پێگەیشتبێت، لە پیرۆزترین شەوی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا بەبێ هۆکاری کەسێك خوا نوێژی لەسەر پێغەمبەرەکەی فەرز کردووە سەرەتا لە شەوو رۆژێکدا پەنجا نوێژ، بەڵام خوای میهرەبان کەمی کردەوەو سووکی کرد لەسەر بەندەکانی هەتا بوونە پێنج نوێژ بە کردەوە، بەڵام لە تەرازوودا پەنجا نوێژ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگیو خۆشەویستیی نوێژ بە لای خواوە.

---

[1] موسوعة تربية الأولاد ج١ ص٢٢٩.

[2] موسوعة تربية الأولاد ج١ ص٢٢٨.

نوێژ تەحیەو سڵاوکردنە لە خوای پەوەردگار **"التحیات لله"**. هەموو ڕێزلێنانەکان بۆ خودایە. **"الصلوات الطیبات"** هەموو نوێژو نزاو سکاڵاکان بۆ خودانو هەر دەبێ بۆ ئەو ئەنجام بدرێن.[١]

نوێژ سەلامکردنە لە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ)، **"السلام علیك أیها النبي ورحمة الله وبركاته"**. سەلامو بەزەیی و فەڕو پیرۆزی لەسەر پێغەمبەری خوا، ئەم سەلامەش بڕیاردانە لە لایەن موسڵمانەوەو بەڵێن دانە بە پێغەمبەری خوا کە لە لایەن منەوە سەلامەتیو هیچ بێ فەرمانییەکی تۆ ناکەم و هیچ کارو کردارو گوفتارێك ناکەم کە تۆ پێت ناخۆش بێت، خوا سەلامەتت کاو رزگارت کات لە هەر گرفتێك دێتە ڕێی مرۆڤ لە بەرزەخ و لە قیامەت.

نوێژ سەلامکرنە لە خودی نوێژخوێن خۆی واتە بەڵێن بە خۆی ئەدات کە شتێك ناکات زیانی بۆ دونیاو دوارۆژی خۆی هەبێ.

هەروەها نوێژ سەلامکردنە لە بەندە چاکەکانی خواو بەڵێن دانە پێیان کە لە لایەن منەو سەلامەتن **"السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین"**. واتە: سەلام و سەلامەتی لەسەر خۆمانو بەندە چاکەکانی خوا، خودا ئێمەشو ئەوانیش سەلامەت کات لە گشت ئافاتێ، سەلام لە بەندە چاکەکانو لە فریشتەکانو لە ئادەمیزادەکانی ئێستاو لەمەوپێش کە ڕێگەیان ڕۆشن کردۆتەوە بۆ مەردم.[٢]

نوێژ وەفاداریو پەیوەست بوونو دانەبڕانە لە پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) هەروەها لەسەر شوێنکەوتوانی بە گشتی.

**"اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد"**. واتە: خودایە بەزەییو ڕێزی خۆت داڕێژە بەسەر موحەممەدو شوێنکەوتوانی.

نوێژ تازەکردنەوەی ئیمانو باوەڕی موسڵمانە بە وتنی: **"أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله"**. واتە: بڕیار ئەدەم لە ناخمەوە بەدڵ و بە زمانیش دەری دەبڕمو بە کردەوەش ئەیسەلمێنم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق بێجگە لە (الله)، بە

---

[1] بەندایەتی، مامۆستا ناسری سوبحانی ١٩١.

[2] بەندایەتی لاپەڕە ١٩٣.

هەمان شێوەش بە دڵ بڕیار ئەدەم و بە زمان دەری دەبڕم و بە کردەوەش ئەیسەلمێنم کە موحەممەد پێغەمبەرو رەوانەکراوی "ألله"یە.

زەکات ساڵی جارێك فەرزە، رۆژوو ساڵی مانگێكو حەج لە ژیاندا جارێك فەرزە، بەڵام نوێژ شەوو رۆژی پێنج جار فەرزە.

لە شەوورۆژدا یەك رۆژوو دەگیرێ، بەڵام پێنج جار نوێژی فەرز ئەکرێ، کە ئەرکێکی خواییە و دەبێ ئەنجام بدرێ، بۆ حەج یەکجار، ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) بانگی داوە، بەڵام بۆ نوێژ رۆژی پێنج جار بانگ دەدرێ، حەج تەنها لە یەك شوێن لەسەر گۆی زەوی ئەنجام دەدرێ، بەڵام سەدان هەزار، بەڵکو ملیۆنەها مزگەوت بۆ نوێژ دروست کراون، بەڵکو هەموو گۆی زەوی مزگەوتەو پاكو بێگەردە، دەشێ بکرێتە میحرابی خواپەرستی بۆ هەموو ئەرکە شەرعییەکان لە زەکاتو حەجو رۆژوو مۆڵەتو بیانوو دواخستن و هەندێ جار نەکردنیش هەیە، بەڵام نوێژ مۆڵەتی نەکردنو دواخستنو دەغەڵیو بڕوبیانوی نییە بۆ هیچ کەس لە پاشاو گەداو هەژارو دەوڵەمەند، نێرو مێ، لە شار بێ یان لە لادێ، لە ماڵ یان لە سەفەر، بە ئاو یان بە گڵ، بە زمان یان بە دڵ، بە پێوە یان بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەبوو بە راکشانەوە لەسەر گڵ، بە سواریی، بە پیادە، لە وشکایی، لە ئاودا، لە ئاسمانو هەوادا، نە ساغو نەنەخۆش نەخەفەتبارو نەدڵخۆش.

دەستنوێژ میکرۆبو نەخۆشی و گوناهو تاوان دەفەوتێنێ، بانگو چریکەی (الله أکبر) شەیتان راودەنێ و دەیترسێنێ و دەیڕەتێنێ، فریشتەی خوا لە کاتی هەموو نوێژێکدا هاوار دەکات ئادەمیان ئەو ئاگرەی داتان گیرساندووە بیکوژێننەوە با نەتان سوتێنێ، نوێژ گوناهو تاوان و خراپە هەڵدەوەرێنێ، نوێژ پێش دروست کردنی ئادەمیزاد فەرز بووە لەسەر فریشتەکان، دواتریش فەرز بووە لەسەر هەموو پێغەمبەرەکان هەر لە ئادەم تا خاتەم.

نوێژنەکردن لە ئیسلامدا نییە کام پێغەمبەر نوێژنەکەر بووە، کام پیاوچاك نوێژنەکەر بووە یا نوێژی فەوتاندووە بە عەمدەنو دواتر گێڕابێتیەوە.

کام هاوەڵی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) مۆڵەتی نوێژنەکردنی پێدرا، کام موجاهیدو خەباتگێڕو چاکەکار، کام کاربەدەستو خەلیفەو زانا وتی: بە دڵە نەك بە کار، نوێژ سوپاسگوزارییە، ئیماندارییە، شوکرانە بژێرییە.

خۆشەویستی خوایە، بەڵێنە، پەیمانە، کلیلی دەرگای ئاسمانە.

دەرگای ئاسمان بۆ نوێژ دەکرێتەوە.

دەرگای بەهەشت بۆ نوێژ دەکرێتەوە.

دەرگای دڵەکان بە نوێژ دەکرێنەوە.

کێ دەرگای ئاسمانو بەهەشتو دڵەکان دەکاتەوە، نوێژ بکەن بۆ خواو یادی بکەن تا دەرگای ئاسمانەکان و دەرگای بەهەشتو دەرگای دڵەکانتان بۆ بکاتەوە.[١]

پاداشتی هەر نوێژێکی فەرز یەك بە دەیە، خۆ ئەگەر بە کۆمەڵ (جەماعەت) بکرێت، یەك بە بیستو حەوتە،[٢] (١ × ١٠= ١٠) نوێژ خێری هەر نوێژێکە، کە رۆژانە دەیکەیت، یەك نوێژ دەکەی بە کردار پاداشتی (١٠) نوێژ وەردەگری لە تەرازوودا یەك نوێژی فەرز بە جەماعەت بکرێت خێری (٢٧) نوێژی هەیە، جا ئەگەر خوا پێداوێك هەر پێنج فەرزەی بە جەماعەت کرد "١ × ١٠= ١٠ × ٥ × ٢٧= ١٣٥٠". پێنج نوێژ دەکەیو پاداشتی هەزارو سێ سەدو پەنجا نوێژ وەردەگری.

یەك نوێژی سوننەت لە ماڵەوە بە پەنهانی و دوور لە چاوی خەڵکیی پاداشتو خێری پەنجا نوێژی هەیە. کردنی تەنها یەك نوێژ لە چۆڵەوانیدا خێر و پاداشتی پەنجا نوێژی هەیە[٣] لەوەش زیاتر دەبێتە هۆی لێخۆشبوونی خوا.

نوێژنەکەر هەڕەشەی بێباوەڕی و هاوبەشدانەری و سپڵەییو یاخیبوونو پەیمانشکێنیی خواو پێغەمبەری خوای لێکراوە.

**عائض القرني** لە کتێبی **(مجتمع المثل)**دا دەڵێ: **"تارك الصلاة مغضوب عليه في السماء مغضوب عليه في الأرض، تارك الصلاة تشتكي منه العجماوات والحوت والسمك والطيور والزحالف كلها لأنه سبب لعذاب الله وقطع الرزق".**[٤]

قال ﷺ: **"لولا شيوخ ركع وأطفال رضع وبهائم رتع لصب عليهم العذاب صبا". أخرجه أبو يعلي.** واتە: نوێژنەکەر مایەی تووڕەییو خەشمو قینە لە ئاسمان، مایەی

---

[1] مجتمع المثل عائض القرني ص١٤٣.

[2] یان یەك بە بیستو پێنجە.

[3] فەرموودەکانم لە سەرەتای کتێبەکەداو لە شوێنی خۆیدا باسکردووەو پلەی فەرموودەکەشم باسکردووە.

[4] مجتمع المثل الدكتور عائض القرني ص١٢.

تورەیی‌و خەشم‌و قینە لە زەوی، بێ زمانەکان‌و نەهەنگ "فیلەتەن" و ماسی‌و باڵندەو خشۆکەکان هەموو شەکواو گازندە دەکەن لە نوێژنەکەر، چونکە هۆگریان نابن‌و دەبنە هۆی بڕینی رزق‌و رۆزییان. پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: "ئەگەر پیری خواپەرست‌و منداڵی شیرەخۆرو ئاژەڵی لەوەڕخۆر نەبوایە سزا بەسەرتاندا دادەباری".

پێغەمبەری خوا لە کەعبەی پیرۆز نوێژی دەکرد پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە کە زیاتر لە (٣٦٠) بتی تیا بوو، بە رەوای نەدەزانی نەچێتە مزگەوت هەرچەند پڕکرابوو لە بت، دەبێ چۆن رەوا بێ ئێمە نەچینە مزگەوتی ئیسلام.[١]

هەروەها دەفەرموێت هەرکەس نوێژی عەسر بفەوتێنێ کردەوەکانی پووچەڵ دەبنەوە، ئەگەر فەوتاندنی یەك نوێژ هەموو کردەوەکانی پووچەڵ بکاتەوە، دەبێ فەوتاندن‌و نەکردنی هەموو نوێژەکان چی کاریگەرییەکی هەبێ.

پێغەمبەری خوا لەوانەبوو ماڵەکان بسوتێنێ بەسەر کەسانێکدا کە لە نوێژی جەماعەت خۆیان دوادەخست، ئەی دەبێ هەڵوێستی پێغەمبەر چی بێت، دەربارەی ئەو کەسەی هەر نوێژ ناکات.[٢]

کەسانێك کە تەمەڵی‌و دەغەڵییان کردووە لە ئەنجامدانی نوێژ خوای پەروەردگار بە مونافیق‌و دوڕووی لە قەڵەمداون ئەی کەسانێك کە نە بە چوست‌و چالاکی‌و نە بە تەمەڵی، نە بە ساردو سڕی بە هیچ جۆرێك هەر نوێژ ناکەن.

نوێژ نورو رووناکی‌و دونیاو دوارۆژو ناوگۆڕە، یەکەم فەرزو پایەی دینە کە ئادەمیزاد لێپێچانەوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ. ئەگەر بە چاکی نوێژی کرد بوو لە دەرگای نوێژەوە دەچێتە بەهەشت.

خۆ ئەگەر نوێژنەکەر بوو هەر بەو حاڵەش مردبوو تەوبەی نەکردبوو دەچێتە دۆزەخ‌و کە لێیان پرسی بۆ دۆزەخییت دەڵێ: "لم نك من **المصلين**"، نوێژخوێن نەبووم، بۆیە لە ناخی دۆزەخدام.

---

[1] فتاوى معاصرة ص٢٦٨ يوسف القرضاوي.

[2] فتاوى معاصرة ص٢٠٨ يوسف القرضاوي.

هەموو بونەوەر رووی لە خودایەو رەورەوەی ژیانیان بەرەو خوا دەچێ، بەڵام کەمێکی کەم لە جنۆکەو ئادەمیزاد لە بەرامبەر بوونەوەرێکی گەورەدا پشتاو پشت بەرەو خوا دەچن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە تەفسیری وشەی (تەسبیح) بە هەموو شێوازەکانیەوە دەفەرموێت بە واتای نوێژە.

**"یسبح لله مافي السموات والأرض"** عەبدوڵڵا (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: "واتە: نوێژ بۆ خوا دەکەن هەرچی لە ئاسمانو زەویدان".

**"سبح لله مافي السموات والأرض"**. واتە: نوێژ دەکەن بۆ خوا هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدان.

لەسەر بێژینگو لە کاتی ناوناندا بە منداڵ دەوترێ **"حي على الصلاة"** واتە: رابە بۆ ئەنجامدانی نوێژ.

کاتێکیش مرد حەقێکی مردووەکە بەسەر زیندووەکانەوە کردنی (نوێژە لەسەر تەرمەکەی تا نوێژ ببێتە تکاکار و گوڵاوو میسکی سەرمۆر لە ژیانی دونیای مردووەکاندا). نوێژ لەسەر بێژینگ تا سەردارە مەیت.

# سوژده

## سوژده چییه؟

وشەی **"السجدة"** به هەموو وشەو واتا داتاشراوەکانییەوە نەوەدونۆ جار له قورئاندا هاتووە.

سوژده واته دانانی تەوێڵ لەسەر زەوی، یان هەر نزمییەك که له ئاستی تەوێڵی ئادەمیزاد نزمتر بێت به نیازی بەندایەتی و گەردنکەچی و خۆ بەکەم زانین له بەرامبەر دەسەڵاتێکی گەورەتردا.

سوژدەش دروست نییه و رەوا نییه ببرێت بۆ کەس بۆ خودا نەبێت، چونکه دانانی تەوێڵ لەسەر زەوی به نیازی کڕنوش بردن شایستەی هیچ شتێك و هیچ کەس نییه بێجگه له خودای دروستکەری بوونەوەر.

کڕنوش، نەوی کردن و دانەواندنی بەرزترین و بڵندترین ئەندامی لاشەی ئادەمیزاده بۆ نزمترین شوێنێك له ئاستی لاشەی خۆیدا لەسەر زەوی یان هەر شتێکی تر که مرۆڤی لەسەر راگیربووبیٚ.

## پله و پایەی سوژده

سوژده کاکڵەو ناوەڕۆکی هەموو جۆرەکانی پەرستنه و گرنگترین و بەپێزترین جۆری بەندایەتی فریشتەکان و پێغەمبەرەکان بووە و پەروەردگار دەربارەی خواپەرستیی فریشتەکان دەفەرموێت: **"وإنّا لَنَحْنُ الصّافّون"**[1] واته: ئێمه خۆمان ریز دەکەین بۆ نوێژکردن.

پێغەمبەری خوداش (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بێت) لەوبارەوە فەرموویەتی: عن حكيم بن حزام قال: **(بينما رسول الله ﷺ في أصحابه إذ قال لهم: أتسمعون ما أسمع؟ قالوا ما نسمع من شيء، قال ﷺ: إني لأسمع أطيط السماء وما تلام أن تئط، وما فيها موضع شبر إلاّ وعليها ملك ساجد أو قائم)**[2].

---

[1] سورة الصافات / ١٦٥.

[2] رواه الطبراني في المعجم الكبير، الحديث (٣١٢٢). ئەلبانیش فەرمویەتی: "صحيح على شرط مسلم". سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٨٥٢. وعالم الملائكة الأبرار ل٣١.

واته له حەکیمی کوڕی حیزامەوە (ڕەزای خودای لیّ بیّت) وا ڕەخسابوو پیّغەمبەری خودا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) له ناو هاوڕیّکانیدا بوو پیّی فەرموون ئەریّ ئیّوەش دەیبیستن ئەوەی من دەیبیستم؟ وتیان هیچ نابیستین، فەرمووی دەمن جیڕەجیڕی ئاسمان دەبیستم ناهەقیشی نییە کە قرچەی بیّت، چونکە شویّنی بستیّکی نییە کە فریشتەیەك سەری له سوژدەدا نەبیّت. یان بە پیّوە نەبیّت، یەکیّك له بەلّگەی پلەو پایەی سوژدە ئەوەیە کە خوا فەرمان بە جیّبەجیّکردنی دەکات وەکو دەفەرمویّت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ"** **(الحج: ٧٧)**. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هیّناوە کڕنوشو سوژدەبەرنو پەروەردگارتان بپەرستنو کردەوەی چاك بکەن، بەلّکو رزگارتان بیّتو سەرفراز بن.

لەبەر ریّزو پلەو پایەی سوژدەیە کە گەورەترین کردەوەیە، شویّنەکەشی ناونراوە (مساجد) واتە شویّنی سوژدە بردن.

هەروەها پەروەردگار دەربارەی سوژدەی فریشتەکان دەفەرمویّت: **"إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ"**.(١) واتە: بیّگومان ئەوانەی لای پەروەردگاری تۆن فیز ناکەن و خۆ بەزلزان نین له پەرستنی ئەودا، پەرستنو پاك و بیّگەردیی ئەو دەکەن و هەر بۆ ئەویش کڕنوش دەبەن.

سوژدە نەبردن خۆ بەگەورەزانینەو خۆپەسەندییە، بۆیە خودا بە ئیبلیسی لەعینی فەرموو (بۆ له کڕنوشبەران نەبووی، وتی چۆن کڕنوش دەبەمە بەر مرۆڤیّك له سوالّەت دروست کراوە، چونکە خۆی له کلّپەی ئاگر دروست کرابوو).[٢]

دەربارەی کڕنوشی پیّغەمبەرەکانیش (سەلامی خوایان لیّ بیّت) له چەندەها شویّنی قورئانی پیرۆز و له فەرمودەی پیّغەمبەردا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) باسکراوە، دەربارەی داود (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) دەفەرمویّت: **"... فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعاً وَأَنَابَ"**. (ص: ٢٤).[٣] واتە: داود داوای لیّخۆشبوونی له پەروەردگاری خۆی کرد و بە روودا چووە سوژدە و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری.

---

١ الأعراف / ٢٠٦.

٢ الحجر / ٣١، ٣٢.

٣ ص / ٢٤، لیّرەدا (راكعا) بە واتای (ساجدا) دیّت، واتە: کڕنوشی بردو چووە سوژدە. **زبدة التفسير من فتح القدير ص٦٠٠.**

ئادەمیەکان لە سوژدەدا لە هەموو کات نزیکترن لە خودای خۆیانەوە، پێغەمبەرەکانیش (سەلامی خوایان لێ بێت) لە هەموو کەس نزیکتر بوون لە خوداوە، کەواتە لەم روانگەیەشەوە دەڵێین پەیامبەران لە هەموو کەس زیاتر سوژدەیان بۆ پەروەردگاریان بردووە. لە رۆژی دواییشدا نیشانە و شوێنەواری کڕنوش و سوژدە بە ناوچەوانیانەوە لە هەموو کەس زیاتر دەدرەوشێتەوە.

ئادەمیزاد لە کڕنوشدا سەری نەوازش و سوپاسگوزاریی نەوی دەکات بۆ ئەو خودایەی دروستی کردووە ناوەندی تەوێڵی دەخاتە سەر زەوی و لەو خاك و خۆڵەی هەڵدەسوێ کە لێی دروست بووە لە ناخیشیدا ئەو راستییە چەسپاوە و دەدرەوشێتەوە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێتەوە بە گڵۆ تێکەڵی ئەو خاكو خۆڵە دەبێتەوە کە ئەمڕۆ ناوچەوانی لەسەر دادەنێ و دۆستایەتی لەگەڵ دەکات و بێگومانە لە رۆژانی داهاتوودا ئەو خاك و خۆڵە لە باوەشی دەگرێ.

لە کڕنوشدا ئادەمیزاد خۆی بە تاوانبار دەزانێ وەکو خەتابار پەنا دەباتە بەر خاوەن هەق تا چاوپۆشیی لێ بکات و لێی ببوورێ، هەر بۆیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رەزای خوای لێ بێت) لەسەر گڵ نەبێت سوژدەی نەدەبرد.[1]

خوای گەورە لە وەسفی موسڵمانانی راستەقینە دەفەرموێت: **(وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَقِيَاماً) (الفرقان: ٦٤)**. واتە: ئەوانەی شەو تا بەیانی روو بە پەروەردگاری خۆیان سوژدە دەبەن و وەستاون. بۆیە پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر ئاوو قوڕو گڵ سوژدەی دەبرد.[2]

## سوژدە تاوان دەسڕێتەوە و پلەش بەرز دەکاتەوە

خوای گەورە دەربارەی داود دەفەرموێت: **"... فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعاً وَأَنَابَ * فَغَفَرْنَا لَهُ ذَلِكَ وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ"**.[3] واتە: داود داوای لێخۆشبوونی لە

---

١ إحياء علوم الدين، ج١، ص١٤٩.

٢ البخاري و مسلم.

٣ سورەتی ص / ٢٤، ٢٥.

پەروەردگاری کردو بە روودا چووە سوژدەو گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری. خوا دەفەرمویت ئێمەش خۆش بووین لەوەی کردی بێگومان بۆ ئەو هەیە لە لای ئێمە نزیکایەتی و جوانترین شوێنی حەوانەوە.

کۆمەڵێك لە زانایانی پێشین فەرمویانە داود دوای تەوبەکردنەکەی پلە و پایەی لە جاران زیاتر بەرزتر بوو لای پەروەردگاری.

وتراوە لە هەندێ فەرمودەی پێشینانددا (خودا فەرموویەتی بە داود ئەی داود جاران وەکو پاشا روت تێ دەکردم، بەڵام دوای ئەوەی حوکمەکەی کرد پەشیمان بوویتەوە و بە سوژدەدا چووی بۆم وەك بەندە تێ دەکەی).

زیاتر لە یەکێ لە پێشین فەرمویانە داود دوای تەوبەکردنەکەی پایەدارتر بووە لە لای خودا هەتا پێش هەڵەکەی، فەرمویانە: بۆیە خودا فەرموویەتی: **"فَغَفَرْنَا لَهُ ذَلِكَ وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ"**. (ص: ٢٥). زیاد لە لێخۆشبوون دوو پلەی تریشی پێ بەخشیوە:

١ ـ (**زلفي**): واتە نزیکی لە خوا.

٢ ـ (**حسن مآب**): چاکترین مەنزڵگە لە لای خودا و باشترین گەڕانەوە بۆ لای خودا.[١]

توێژەرەوانی قورئان فەرمویانە: "داود چل شەو لە سوژدەدا ماوەتەوە سەری بەرز نەکردۆتەوە تەنها بۆ نوێژە فەرزەکان، یان بۆ کارێکی ناچاریی نەبێت، تەنانەت ناوچەوانی زەوی گەزتبووی، گژو گیا بە فرمێسکەکانی روابوو.[٢]

لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) هاتووە: (**عن معدان بن أبي طلحة، قال: سألت ثوبان مولى رسول الله ﷺ وقلت حدثني حديثا ينفعني الله به؟ قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: ما من عبد يسجد لله سجدة إلاّ رفعه الله بها درجة وحط عنه بها خطيئة**).[٣] واتە لە مەعدانی کوڕی ئەبی تەلحە

---

[١] طريق الهجرتين، إبن قيم الجوزية، ص٢٧٣.

[٢] زاد المسير، إبن الجوزي، ب٧ / ل٢٠.

[٣] إسناده صحيح، أخرجه مسلم، رقم (٢٢٥)، (٤٨٨) رواه بن حبان في صحيحه، الحديث (١٧٣٥)،، تعظيم قدر الصلاة، رقم ٢٨٩.

فەرموویەتی پرسیارم کرد لە سەوبانی مەولای پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بێت) وتم فەرمودەیەکم بۆ باس بکە کە خودا بەهۆیەوە سوودم پیٚ بگەیەنێت لە لای خودا؟ فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بێت) ئەیفەرموو هیچ بەندەیەك نییە کە تەنها سوژدەیەك بۆ خودا بەرێت حەتمەن خودا بەو سوژدەیە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە و تاوانێکی لیٚ دەسڕێتەوە.

**وعن أبي أمامة قال: أتيت رسول الله ﷺ فقلت: مرني بأمر أنتفع به، قال ﷺ: اعلم انك لاتسجد لله سجدة إلاّ رفعك الله بها درجة، وحط منك بها خطيئة**[1]. واتە: ئەبی ئومامە فەرمووی چومە خزمەتی پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بێت) پێم وت فەرمانی کارێکم پیٚ بکە سوودی لیٚ بکەم، فەرمووی بزانە تۆ هیچ سوژدەیەك بۆ خودا نابەیت کە خودا پلەیەك بەرزت نەکاتەوە و تاوانێکت لیٚ نەسڕێتەوە.

**وعن أبي أمامة: أن النبي ﷺ قال له: "إعلم أنك لا تسجد لله سجدة إلاّ رفعك الله بها درجة وحط عنك بها خطيئة"**.[2]واتە: لە ئەبی ئومامەوە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بێت) پێی فەرموو: بزانە بێگومان تۆ هیچ سوژدەیەك بۆ خودا نابەیت کە پلەیەك بەرزت نەکاتەوەو تاوانێکت لیٚ نەسڕێتەوە.

**وعن مطرف (رضي الله عنه) قال قعدت إلى نفر من قريش، فجاء رجل فجعل يصلي ويرفع ويسجد، ولا يقعد فقلت: والله ما أرى هذا يدري ينصرف على شفع أو على وتر. فقالوا ألا تقوم إليه فتقول له؟ قال: فقمت فقلت له: يا عبد الله ما أراك تدري تنصرف على شفع أو على وتر؟ قال: ولكن الله يدري، وسمعت رسول الله ﷺ يقول: من سجد لله سجدة كتب الله له بها حسنة، وحط عنه بها خطيئة ورفع له بها درجة. فقلت من أنت؟ فقال أبو ذر! ! فرجعت إلى أصحابي فقلت: جزاكم الله من جُلَساءَ شَرَّاً أمرتموني أن أعلم رجلاً من أصحاب النبي ﷺ ! !. وفي رواية:**

---

[1] إسناده صحيح، رواه أحمد في مسنده، الحديث (٢٢١٩٤)و (٢٢٢٧٤)، والطبراني في المعجم الكبير، الحديث (٨١٠)و (٧٤٦٣). تعظيم قدر الصلاة، رقم ٣٠١.

٢ إسناده حسن، تعظيم قدر الصلاة، رقم ٣٠٢.

**فرأيته يطيل القيام، ويكثر الركوع والسجود فذكرت ذلك له فقال: ما آلوْتُ أن أحسن، إني سمعت رسول الله ﷺ يقول: من ركع ركعة أو سجد سجدة رفع الله بها درجة وحط عنه بها خطيئة.**[1]

واته: له موترەفەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: لەگەڵ کۆمەڵێ قورەیشی دانیشتبووم، پیاوێك هات و دەستی کرد بە نوێژکردن، سوژدەی دەبردو بەرز دەبووەوەو دانەدەنیشت لە نێوان سوژدەکاندا، وتم: وەڵڵا ئەمە لەوە ناچێ بزانێ تاك و جوت چییە لە نوێژدا، وتیان ئەی بۆ ناچی پێی بڵێی؟ فەرمووی: چوم بۆ لای و پێم وت: ئەی بەندەی خودا وا نازانم لەسەر جووت یان تاك راوەستی؟ فەرمووی بەڵام خودا دەیزانێ من لە پێغەمبەری خودام بیستووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: "هەرکەس سوژدەیەك بۆ خودا بەرێت خودا چاکەیەکی بۆ دەنوسێ و تاوانێکی لێ دەسڕێتەوەو پلەیەك بەرزی دەکاتەوە بەو سوژدەیە. وتم تۆ کێی؟ فەرمووی: ئەبوزەر!! گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێکانم و وتم خوا پاداشتی خراپتان بداتەوە فەرمانتتان پێ کردم یەکێك لە هاوڕێکانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فێر بکەم".

لە ریوایەتێکی تردا: بینیم زۆر بە پێوە بوو لەسەر ئەژنۆ و لە کڕنوشدا زۆر دەمایەوە، منیش ئەوەم پێ وت فەرمووی: کەمتەرخەمیم نەکردووە لە چاکیدا خۆم گوێم لە پێغەمبەر بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو هەرکەس تەنها جارێك بچەمێتەوە بۆ خودا یان تاکە سوژدەیەکی بۆ بەرێت بەوە خودا پلەیەك بەرزی دەکاتەوە و تاوانێکی لێ دەسڕێتەوە.

## سوژدە بە ئیمان ناوبراوە لە قورئاندا

لە قورئانی پیرۆزدا لە دەقی گێڕانەوەی چیرۆكو داستانی موساو فیرعەونو موسڵمان بوونی جادووگەرەکانی فیرعەون دەفەرموێت: **"وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ * قَالُواْ آمَنَّا بِربِّ الْعَالَمِينَ * رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ * قَالَ فِرْعَوْنُ آمَنتُم بِه قَبْلَ أَن آذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَـذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُواْ مِنْهَا أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ".**

[1] رواه أحمد، الحديث (٢١٣٤٦)، والبزاز بنحوه، وقال المنذري: وهو بمجموع طرقة حسن أو صحيح، الترغيب، ٥٧٣.

**(الأعراف: ١٢٠ ـ ١٢٣)**. [١] واتە: هەرچی جادووگەر هەبوون بە سوژدەدا چوون، وتیان باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری جیهانیان. پەروەردگاری موسا و هارون. فیرعەون وتی چۆن باوەڕتان پێ هێنا بەر لەوەی من ئیزنتان بدەم.

لێرەداو لە دەقی فەرمودەکەی خوادا کە لە زمانی جادووگەرەکان و فیرعەونەوە گێڕاویەتیەوە بەبێ کەم و زیاد هەردوو لایان چ جادووگەرەکان و چ فیرعەون کڕنوش و سوژدەی ئەوانیان بە ئیمان ناو بردووە ئێستا لەگەڵ ئێمە سەرنج بدە: "جادووگەرەکان سوژدەیان برد، بەڵام لە دەربڕینەکەیاندا نەیان وت سوژدەمان برد بۆ پەروەردگاری خۆمان بەڵکو وتیان ئیمانمان هێنا بە پەروەردگار و راهێنەری جیهانیان، چونکە باشترین و چاکترین پەرستن کە رەنگدانەوەی ئیمان بێت و تەعبیر لەو ئیمانە بدات لە ناخی مرۆڤدا هەیە، بێجگە (لە سوژدە) هیچی تر نییە هەروەها کاتێکیش فیرعەون هەڕەشەی لێ کردنو پێیاندا هەڵشاخا نەیوت بۆ سوژدەتان برد؟ بەڵکو خوا دەفەرموێت: فیرعەون وتی: باوەڕتان بە موسا کرد و ئیمانتان پێ هێنا پێش ئەوەی ئیزنتان بدەم.

**"إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّداً وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ". (السجدة: ١٥)**. واتە: بەڕاستیی تەنها ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دەهێنن کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان وەبیردێنییەوە بە سوژدەدا دەچنو پاکو بێگەردیو سوپاسگوزاریی پەروەردگاریان دەکەنو خۆیان بە گەورە نازانن.

لەم روانگەیەوە بۆمان دەردەکەوێت هەزاران ساڵ پێش ئێستا سوژدە پێناسەو دەربڕینی پڕاو پڕی ئیمان بووە. هەروەها لە چیرۆکی ژنە پاشای سەبەئدا باس لەوە دەکات کە خۆریان پەرستووە و باوەڕیان پێی هەبووەو بە خوایان زانیوە، بەڵام بە سوژدە دەری دەبڕێ لە قورئاندا دەفەرموێت "یسجدون للشمس" کڕنوش بۆ خۆر دەبەن نافەرموێت باوەڕیان بە خۆر هەبووە یان خۆریان پەرستووە، یان هەر جۆرە دەربڕینێکی تر، چونکە سوژدە رەنگدانەوەی ئیمانەو کاکڵەو ناوەڕۆکی هەموو پەرستنێکە. هەروەها لە سورەتی "طه"دا هەمان باسی موساو فیرعەونو ئیمان هێنانی جادووگەرەکان باس دەکاتو دەفەرموێت: **"فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّداً قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ**

---

[١] الأعراف / ١٢٠ ـ ١٢٣.

**هَارُونَ وَمُوسَى * قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ"**. واته: جادووگەرەکان هەموویان کڕنوشیان بردو چوونە سوژدەو وتیان باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری هارون و موسا. فیرعەونیش وتی باوەڕتان پێ هێنا پێش ئەوەی ئیزنتان بدەم.

لێرەشدا دەفەرمویێت جادووگەرەکان بە سوژدەدا کەوتنو وتیان ئیمانمان هێنا، نەیان وت سوژدەمان برد بۆ پەروەندی هارون و موسا. هەروەها فیرعەونیش وتی ئیمانتان پێ هێنا پێش ئەوەی ئیزنتان بدەم، نەیوت سوژدەتان برد پێش ئەوەی ئیزنو بدەم.

هەروەها لە سورەتی (**الشعراء**) هەمان باس و چیرۆك دووبارە بۆتەوە وەکو دەفەرمویێت: **"فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ * قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ * رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ * قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ..."** (الشعراء:٤٦ ـ ٤٩).[١] واتە سەرجەم جادووگەرەکان بە سوژدەدا چوون. وتیان باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری جیهانیان. پەروەردگاری موسا و هارون. فیرعەون وتی باوەڕتان هێنا پێش ئەوەی ئیزنو بدەم.

لێرەشدا سوژدەیان بردو وتیان ئیمانمان هێنا نەیان وت سوژدەمان برد. هەروەها فیرعەونیش نەی وت بۆ سوژدەتان برد، بەڵکو وتی بۆ ئیمان و باوەڕتان پێ هێنا.

هەروەها لە سورەتی (**آل عمران**)دا بە هەمان شێوە سوژدەی پەیوەستی ئیمان کردووە وەکو دەفەرمویێت: **"لَيْسُواْ سَوَاء مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ * يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُوْلَـئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ"**. (آل عمران: ١١٣ ـ ١١٤). واتە: گاورو جوەکان هەموو یەکسان و چوونیەك نین، کۆمەڵی وایان تێدایە کە روو بە خوا دەوەستن و بە شەوا ئایەتانی خوا دەخوێننەوە و سەر دەخەنە سەر سوژدە، ئەوانە ئیمان و باوەڕیان بە خوداو رۆژی دوایی هەیە و فەرمان دەدەن بە چاکە و رێگە لە خراپە دەگرن بە پەلە دەست پێشخەریی دەکەن بۆ چاکە کردن، بێگومان ئەوانە لە پیاوچاکانن.

---

[١] الشعراء / ٤٦ ـ ٤٨.

## هەموو دروستکراوەکان سوژدە بۆ خوا دەبەن

سوژدە رەنگدانەوەی گەردنکەچیو ملکەچیو بێ دەسەڵاتییە لە بەرامبەر پەروەردگاردا. هەموو دروستکراوەکان کە سەرتاپێی بوونەوەر دەگرێتەوە لە بەرامبەر دەسەڵات و توانای خوداوەندا ملکەچن، ئەو دەمەش رێز و پیێزی بەندەکان دەردەکەوێت و دەبنە خاوەنی پلە و پایە کە دان بە بێهێزیی خۆیاندا بنێن و تەعبیر و گوزارشت لە ناوەڕۆك و حەقیقەتی خۆیان بدەن و لە بەرامبەریشدا پەسەندیو گەورەیی خودا دەسەلمێنیێ، ئەوانەش لوتبەرزیی دەکەنو لە بەرامبەر پەروەردگاریاندا و راستی و رەسەنیەتی خۆیان دەشارنەوە بە لای خوداوە زۆر بێ رێزو بێ هێزو بێ پێزن وەکو نەمرود مێشولەیەکیان لە قەبەڵ دەکات یان وەکو فیرعەون بە ئاوی خواردنەوە دەیخنکێنیێ یان مێشولەشی ناوێ بەڵکو خۆی خۆی دەکوژێ و کەس تووشی ئەزیەت ناکات، ئەمانە خوێی چێشتن لە چاو ئەو سوکایەتیو بێڕێزکردنەی بەسەر ئیبلیسی مەلعونیدا هێناو دوژمنیش بە دەستەی نەبێت هەموو کاتێکی مردنێکە، دەیان حاجیی خۆیان بە فەتارەت ئەدەنو گیانیان دەخەنە مەترسییەوە بۆ رەجم کردن و نەفرین لێ کردنی.

خودا دەفەرموێت: **"وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأرض طَوْعاً وَكَرْهاً وَظِلالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ"**. (الرعد: ١٥). واتە: سوژدە بۆ خودا دەبات هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بە خۆ بەخش و پێخۆشحاڵی یان بە ناچاری و زۆرەملی، سێبەرەکانیشیان بە ئێواران و بەیانیان سوژدە دەبەن. هەروەها دەفەرموێت: **"وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأرض مِن دَآبَّةٍ وَالْمَلآئِكَةُ وَهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ"**. (النحل: ٤٩) واتە: سوژدە بۆ خوا دەبات هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە و سەنگی هەیە و فریشتەکانیش خۆشیان بە گەورە نازانن، (باغر)یش نین.

هەروەها دەفەرموێت: **"أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الأرض وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ"**. (الحج: ١٨). واتە: ئایا تۆ نابینی ئەوانەی وا لە ناو ئاسمانەکانو ئەوانەی لە زەمیندانو خۆرو مانگو ئەستێرەکانو کۆسارو درەختەکان و جانەوەرو زۆر لە مەردم سوژدە هەر بۆ خوا

دەبەن؟ زۆرێکیش سزایان بۆ بڕیار دراوە، خودا هەر کەسێ دوچاری سوکایەتی بکات تازە کەس ڕێزی لێنانێ بێگومان خودا هەرچی بیەوێ دەیکات.

لێرەدا سەرنجی ئەوە بدەن کە لە هەموو کڕنوشبەرەکاندا ئادەمیزادی جیا کردۆتەوە بەوەی کە فەرموویەتی زۆرێك لە ئادەمیزاد سوژدە دەبات‌و زۆرێکیش لەوان سوژدە نابات، کەواتە یاخی بوون و سەرپێچی لە ناو ئادەمیان سەری هەڵداوەو هەر ئەوانیش پەیڕەوی دەکەن لەگەڵ براو دۆستەکانیان لە جنۆکە.

بەڵێ هەموو دروستکراوەکان ئەستۆگیرو پابەندی بەرنامەیەکن، کە پەروەردگاریان بۆی دارشتون و لێی لا نادەن بێجگە لە ئادەمیزاد کە خودا ژیری‌و بیری داوەتێ بۆ تێڕامان و تێگەیشتن و پیادەکردنی بەرنامەی خودا، نەك بۆ بەرنامەڕێژی‌و خۆکردنە خودا بەسەر ئادەمییەکانەوە وەکو هەندێ لە ئادەمییان پێی هەڵدەستن.

هەروەها خودا دەفەرموێت: **"أَوَ لَمْ يَرَوْاْ إِلَى مَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلاَلُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالْشَّمَآئِلِ سُجَّداً لِلّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ"**. (النحل: ٤٨).[١] واتە: داخۆ بە چاو نەیاندیوە و نەیانڕوانیوەتە هەرچی خودا بەدیی هێناوە، سێبەریان بە لای راست و چەپدا دەسوورێتەوە بە ملکەچی سوژدەبەرەو خوا دەبەن. خوایە سوژدە بۆ تۆ دەبات لە تاریکی شەو و رووناکی رۆژو کەشتی‌و پاپۆڕو خانوبەرەو دەریای بێ پەی‌و مانگی پرشندار.[٢]

خودایە بۆ تۆیە سەر لە سوژدەدا بوون سەدو بیست‌و چوار هەزار پێغەمبەرو تەواوی فریشتەکان‌و پیاوچاکان‌و خواپەرستان‌و شاخ‌و داخ‌و دێم‌و جاف، کەشکەشانی فەلەك‌و ئادەمیانی بەنمەك، مانگ‌و خۆر، باڵندەو درندەو هەزاران جۆر لە هەوادا لە بۆشایی، لە دەریادا لە وشکایی.

## سوژدە مەشخەڵی خوا پەرستییە لای فریشتەکان

سوژدەبردن و زاراوەی سوژدە رەمزی هەموو ئەو نزیکی‌و خواپەرستی‌و گوێڕایەڵی‌و ملکەچی و فەرمانبەرداریی‌ەی فریشتەکانە بۆ خودا، هەر بۆیەش خودا لە باسی

---

[١] سورة النحل / ٤٨.

[2] رهبان الليل، ج٢، ص٩٦.

پەرستن‌و گوێ لەمستی فریشتەکان بۆ پەروەردگاریان دەفەرموێت: خۆیان بەگەورە نازانن لە ئاستی پەرستن و ملکەچیی بۆ پەروەندی خۆیان‌و سوژدەی بۆ دەبەن. وەکو دەفەرموێت: "إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ) (الأعراف: ٢٠٦). واتە: ئەوانەی لای پەروەندت پەسەندن. بێ فیزن لە پەرستنی‌و پەسنی پاکی‌و بێگەردی ئەو دەدەن هەر بۆ ئەویش سوژدە دەبەن.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "أطّت السماء وحق لها أن تئط، والذي نفس محمد بيده ما فيها موضع شبر إلاّ وفيه جبهة ملكٍ ساجدٍ يسبح الله بحمده".**[1] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئاسمان جیڕە جیڕی دێت، ناهەقیشی نییە کە جیڕە جیڕی بێت، سوێند بەوە گیانی منی بە دەستە شوێنی بستێك نییە کە ناوچەوانی فریشتەیەکی لەسەر نەبێت و تەسبیحات و ستایشی خودا نەکات.

**روى النواس بن سمعان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: إذا أراد الله أن يوحي بالأمر تكلم بالوحي أخذت السماوات منه رجفة، أو قال رعدة شديدة خوفاً من الله عزّ وجلّ فإذا سمع ذلك أهل السماوات صعقوا وخروا لله سجداً، فيكون أول من يرفع رأسه جبريل فيكلمه الله تعالى من وحيه بما أراد.**[2] واتە: نواسی کوڕی سەمعان (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتەوە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی هەرکات خودا بیەوێت فەرمانێك بفەرموێت بە نیگا ئاسمانەکان ڕائەچڵەکێن و لەرزە دایان دەگرێت یان فەرمووی گرمەیەکی بەهێزی لە ترسی خودا لێ دەرئەچێت ئەگەر خەڵکی ئاسمان گوێیان لێبوو لە هۆش خۆ دەچن بەسوژدەدا دەکەون یەکەمیان کە سەر بەرز دەکاتەوە جبریلە (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) خودا چی بووێت نیگای پێ دەفەرموێت.

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: إن من السماوات سماء ما فيها موضع شبر إلاّ وعليه جبهة ملك. أو قدماه قائماً، ثم قرأ: (وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ * وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ) (الصافات: ١٦٥ ـ ١٦٦).** واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی

---

[1] صحيح، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ١٠٢٠.

[2] عالم الملائكة الأبرار، ص٣٣. رواه إبن جرير وإبن خزيمة والطبراني وإبن أبي حاتم واللفظ له.

مەسعودەوە (رەزای خوای لیٚ بێت) فەرمووی لە ئاسمانەکان ئاسمانێکیان تیایە شوێنی بستێك نییە کە فریشتەیەك ناوچەوانی تێدا دانەنابی یان لەسەر قاچ تێیدا نەوەستا بیٚ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە، واتە: بێگومان ئێمە خۆمان ریزبەند دەکەین (بۆ نوێژ)، ئێمە خۆمان لە پەسەندی ئەوداینو پاكو بێگەردی ئەو دەردەبڕین.

**وعن جابر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "مررت ليلة أسري بي بالملأ الأعلى، وجبريل كالحلس البالي من خشية الله تعالى".**[1] واتە: لە جابرەوە (رەزای خوای لیٚ بێت) فەرمووی پێغەمبەر (سەلاٌتو سەلامی خوای لیٚ بێت) فەرموویەتی ئەو شەوەی شەوڕەویم پێکرا بە لای دەستەی بالاٌدا تێپەڕیم، جوبرەئیل وەکو ژێرڕاخەر وابوو لە ترسی خودا.

**عن حكيم بن حزام (رضي الله عنه) قال: "بينما رسول الله ﷺ في أصحابه إذ قال لهم: أتسمعون ما أسمع؟ قالوا: ما نسمع من شيء، قال إني لأسمع أطيط السماء، وما تلام أن تئطّ وما فيها موضع شبر إلاّ وعليه ملك ساجد أو قائم".**[2] واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە فەرموویەتی وابوو پێغەمبەر (سەلاٌتو سەلامی خوای لیٚ بێت) لە ناو هاوەڵەکانیدا بوو و لەوێدا پێی فەرمون: ئەریٚ دەبیستن ئەوەی من دەیبیستم وتیان: هیچ نابیستین فەرمووی دە من قرچە قرچی ئاسمان دەبیستم، خۆ لۆمەش ناکرێت ئەگەر قرچەی بێت، چونکە شوێن بستێکی تیا نییە کە فریشتە لە سوژدەدا یان بە پێوە نەبێت.

هەروەها لە سورەی (**الطور**) باسی (بيت المعمور) دەکات کە شوێنی حەج و خواپەرستیی فریشتەکانە، هەروەکو لە ئاسمانی یەکەم (**بيت العزة**)[3] هەیە.

---

[1] إسناده حسن موقوف، رواه الطبراني في المعجم الأوسط، الحديث (٤٦٧٩). رقم ٢٥٤ تعظيم قدر الصلاة.

[2] رواه الطبراني في المعجم الكبير، الحديث (٣١٢٢). والطحاوي في مشكل الآثار، قال فيه الألباني: صحيح على شرط مسلم، سلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم ٩٥ و رقم ٧٢٧ عن أبي هريرة.

[3] عالم الملائكة الأبرار، ص ٣٢، عمر الأشقر.

## سوژدەبردنی بەردو دار ودرەخت و رووەکە خشۆکەکان

پێشتر وتمان سەرتاپای بوونەوەر لە پەسەندی و سوپاسگوزاریی پەروەندی خۆیان بێئاگانینو سوژدەی بۆ دەبەنو بێدەسەلاتیی خۆیانو دەسەلاتداریی پەروەردگاریان بە سوژدە دەردەبڕن، هەندێکیش لە دروستکراوانی خودا بە تایبەت باسکراون، لەم بارەوە لە قورئاندا دەفەرموێت: **"وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ"** (الرحمن: ٦). واتە: درەخت و رووەکە خشوکەکانیش سوژدە دەبەن.. بەڵێ مادە بێ گیانو بێهەستەکانیش پاپەندی بەرنامەیەکن کە پەروەردگاریان لەو رۆژەوە رەخساندونی و بۆی دارشتون ئەوانیش لێ ی لانادەن.

ئەگەر ورد بینەوە لە هەموو دنیادا هەنار هەر هەنار دەگرێ، گوێز هەر گوێز دەگرێ و هەنجیر ترێ ناگرێ و مێویش خورما ناگرێ با چەندەها جار پایزو بەهاری تەمەنیشیان بەرێ بکەن، ژیانەوەی بەهارو مردنی پایز بەرنامەی خودایان پێ ناگۆڕێ. هەروەها چیرۆکی کڕنوش بردنی بەردو درەختەکان بۆ پێغەمبەری خودا (سەلات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) پێش بوونی بە پێغەمبەر بەڵگەی روون و ئاشکرایە **(أبوطالب)** لەگەڵ کۆمەڵێ پیاوماقوڵ و بازرگانی قورەیش رویان کردە وڵاتی شام، پێغەمبەریش کە جەوانێکی دوانزە ساڵ بوو لەگەڵ خۆیان برد، خواپەرستی گۆشەگیری گاور میوانداریی کردن کە هەرگیز میوانداریی نەکردبوون پێیان سەیر بوو کاتێك سەرقاڵی بار خستن بوون خواپەرست بەناویاندا دەسووڕایەوە هەتا دەستی پێغەمبەری (سەلات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) گرت‌و وتی ئەمە گەورەی هەموو جیهانەکانە خودا رەوانەی دەکات بە بەزەیی (رحمة) بۆ هەموو جیهانەکان، پیاوە گەورەکانی قورەیش وتیان چۆن دەزانی؟ وتی: کاتێك ئێوە لەو دورەوە سەرتان هەڵداو دەرکەوتن یەك درەخت‌و یەك بەرد نەما سوژدە نەبات، دارو بەردیش بە دیداری پێغەمبەران نەبێ سوژدە نابەن.[1]

[1] باسەکە بەدرێژی لەو سەرچاوەدا هاتووە لەوانەش **(السيرة النبوية للصلابي ج١ / ل٧٨)**. بەسەرهاتەکەش پێشەوایان **(الترمذي ٣٦٢٠، والحاكم ٢ / ٦١٥، وأبو نعيم في ١٠٩)**. گێڕاویانەتەوە.

## سوژدەبردنی خۆر

خۆریش یەکێکە لەو دروستکراوانەی خوداوەند خۆی نەخشی کێشاوە، ئەویش لەگەڵ سەرجەم بوونەوەردا سوژدە دەبات، بەڵام بە تایبەتی و بە جیاش باسی کڕنوش بردنی خۆر کراوەتەوە:

**عن أبي ذرّ (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ قال: (أتدري أين تذهب هذه الشمس؟ فقالوا الله ورسوله أعلم، قال: فإنها تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش فتخر ساجدة، فلا تزال كذلك حتى يقال لها: إرتفعي ارجعي من حيث جئت طالعة، فترجع فتطلع من مطلعها، ثم تجري لايستنكر الناس منها شيئاً حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش فيقال لها ارتفعي فاطلعي من مغربك فتطلع أنت مغربها، قال رسول الله ﷺ: أتدري متى ذاكم؟ ذلك حين (لاينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيراً) الأنعام ١٥٨)**[١].

واتە: لە ئەبی زەڕڕەوە لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: ئایا دەزانی ئەم خۆرە بۆ کوێ دەچێت؟ وتیان خوداو پێغەمبەرەکەی باشی لێ دەزانن، فەرمووی: دەڕوات تا دەگاتە شوێنی سەقامگیربوونی لە ژێر عەرشدا ئەوجا سوژدە دەباتو هەروا دەمێنێتەوە تا پێی دەوترێ بەرز بەوەو بگەڕێوە بۆ شوێنی هەڵهاتنت، دەگەڕێتەوەو لە شوێنی هەڵهاتنییەوە هەڵدێتەوە، بەو شێوەیە دێو دەچێ کەس پێی قەڵس نییەو نامەنجوی لێ ناکات تا دەچێتەوە شوێنی سەقامگیر بوونی لە ژێر عەرشدا پێی دەوترێ بەرز بەوەو لە خۆرئاواوە هەڵبێ، ئەویش لە خۆرئاواوە هەڵدێ، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی دەزانن ئەوە چ کاتێکە، ئەو دەمەیە خودا دەفەرموێ (هیچ کەس بڕواکەی سوودی پێناگەیەنێت، چونکە لەوەوپێش ئیمانی هێنابێو بە ئیمانەکەشی چاکەی کردبێ.

هەروەها یوسفی پێغەمبەری پێغەمبەرزادە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە خەویدا بینی کە مانگو خۆرو ئەستێرە سوژدەی بۆ دەبەن، خەوی پێغەمبەرەکانیش ڕاست و دروستە و بەشێکە لە وەحیو نیگای خودا، بەشی غەیری خودای تێدا نییەو

[١] رواه مسلم، الحديث (١٥٩) تعظيم قدر الصلاة، ل٢١٠، رقم ٣٢٠.

سروشی پەروەردگارە، بۆ پشتگیریی راستییەتی خەوەکەی یوسفی پێغەمبەر، کە پێغەمبەرنەژادە، خودا لە قورئاندا دەفەرموێت: **"إِذْ قَالَ يُوسُفُ لابيهِ يَا أبتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ"**. (یوسف: ٤). واتە: وەختێ یوسف بە باوکی فەرموو: بابە گیان! من یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگم بە خەو دیتن، کە کڕنوشم بۆ دەبەن.

## لە سوژدەدا ئادەمیزاد لە هەموو کات نزیکترە لە پەروەردگارەوە

خوداوەند ئادەمیزادی دروست کردووەو وای رەخساندووە سەری لە هەموو لاشەی بڵندترە هەتا دانەواندنی ئاسان نەبێتو بۆ هیچێکی نەوی نەکات بێجگە لە پەروەردگاری راستەقینەو خولقێنەری خۆی، بەڕاستیی زەلیلی و بێشەهامەتییە ئەو گەردنە بڵندو سەرەبەرزە بۆ گەلە بتێك، یان ستەمکار و ناکەس بەچەپەك شۆڕ بکرێت. لە خودا دەخوازم یارمەتیو کۆمەکیمان بکات ئەوەندی کورتە ژیانێکمان هەیە سەری بەرزمان نەخەوێنین بۆ بتێکی چەپەڵ یان بەرنامەو فیکرەیەکی پوچەڵ یان چەند دروشمێکی رزیو و گەندەڵ، بۆ!! لە پێناوی چەڵپەیەك یان بەرماوەی حەرامخۆرێك، بە هەزار فێڵ و پاڕانەوەو تکاو رجاو سکاڵاو لالانەوە, دەردەدڵیی و درۆو پەنا بردن بە ناکەس و ماچکردنی دەست و قاچی نامەردو پیاهەڵوتنی راستو درۆ. مەبەرە مێشو لە دەوری سەری دەوڵەمەندو کاربەدەستان مەسوورێرەوەو نەبیتە قەستە سەری خۆت:

ڕابوێرە بە سەربەرزی بە نان و ئاوێك

سەر دامەنەوێنە بۆ هیچ ناپیاوێك

بەرزترین و بەڕێزترین بوونەوەر ئادەمیزادە لە ئادەمیزادیشدا سەر لە هەموو ئەندامەکان بەرز و بەڕێزترو بڵندترە لە غەیری پەروەردگاری خۆی بۆ هەرچی نەوی بکەی لە نرخ و رێزیت دابەزاندووەو سوکایەتیت بە خۆتو ئەویش کردووە، چاکترین پەرستن دانەواندنی بەرزترین ئەندامە بۆ خودا، بۆیە ئادەمیزاد لە هەموو کات زیاتر لە پەروەردگار نزیکترە لە کڕنوشدا.

له فەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت: **(أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء)**[1]. واتە: نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاریەوە لە کاتی سوژدەدایە، کەواتە دوعاو پاڕانەوەی زۆری تێدا بکەن.

**(كان بعض السلف الصالح يسأل ربه في صلاته كل حوائجه حتى ملح عجينه وعلف شاته)!!**. واتە: هەندێ لە پێشینە چاکەکان لە نوێژدا داوای هەموو شتێکیان لە خوا دەکرد تەنانەت خوێی هەویرەکەی و ئالیکی مەڕەکەیشی.

غەزوەی کوڕی زوبەیر (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە سوژدەی نوێژەکانیدا دەیفەرموو (خودایە لە زوبەیری کوڕی عەوام خۆشبە، لە ئەسمائی کچی ئەبی بەکر خۆش بە (واتە باوكو دایکی خۆی).[2]

## سوژدە قەڵغانە لە کاتی دابارینی بەڵادا

لە کاتی رزگار بوون یان لادانی موسیبەت و بەڵایەك ئادەمیزاد سوژدەی سوپاسگوزاری بۆ خودا دەبات کە ئەو بەڵایەی لێ لادا، دەتوانێ لە سوژدەکەشدا بڵێ **(سبحان ربي الأعلى)** سێ جار **(سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اللهم اغفر لي، اللهم إني أشكرك على أن نجيتني من هذه المصيبة ويذكرها)** ناوی بەڵاکە دەبات. ئەمەش پێی دەوترێ **(سجود الشكر)** سوژدەی سوپاسگوزاری. واتە پاك و بێگەردیی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم.

واتە: پاك و بێگەردیی ئەی خودایە، پەروەردگاری ئێمە کە بە سوپاسگوزاریت پەسەندیت ئەدەم خودایە لێم خۆش بە، خودایە بەڕاستیی من سوپاست دەکەم لەسەر رزگار کردنم لەم بەڵایە (ناوی بەڵاکە دەڵێ).

---

[1] رواه مسلم الحديث (٤٨٢)، صحيح وصايا الرسول ج١ / ص٦٢٥. سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١١٧٤.

[2] صلاح الأمة، ج٥ / ص٦٥٦.

## سوژده باشترین سوپاسگوزارییه له كاتی دابارینی بەهرەی خوادا

باشترین سوپاسو جوانترین ستایش بۆ خودا له كاتی بەخشینی بەهرەیەكی گەورەدا سوژده بردنه بۆی، پەروەردگاریش كڕنوشی له هەموو سوپاسو ستایشێك پێ خۆشتره و زیاتر جێگەی رەزامەندییەتی.

**عن سعد بن أبي وقاص (رضي الله عنه) قال: "خرجنا مع رسول الله ﷺ من مكة نريد المدينة، فلما كنا قريباً من غَزْوَراء نزل ثم رفع يديه فدعا الله ساعة ثم خر ساجداً، فمكث طويلاً، ثم قام فرفع يديه ساعة، ثم خر ساجداً، فعله ثلاثاً، وقال: إني سألت ربي، وشفعت لأمتي فأعطاني ثلث أمتي فخررت ساجداً لربي شكراً، ثم رفعت رأسي فسألت ربي لأمتي، فأعطاني ثلث أمتي، فخررت ساجداً لربي شكراً، ثم رفعت رأسي فسألت ربي لأمتي، فأعطاني الثلث الآخر، فخررت ساجداً لربي).**[1]

واته: له سەعدی كوڕی ئەبی وقاصەوه (رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: (لەگەڵ پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) له مەككەوه چوین به نیازی مەدینه، كاتێ نزیك بووینەوه له (عەزوراء) دابەزی هەردوو دەستی بەرز كردەوه و سەعاتێك پاڕایەوەو پاشان چووه سوژدەوەو زۆر مایەوه، ئینجا هەردوو دەستی بەرز كردەوه سەعاتێكی تر، پاشان چووه سوژده، سێ جار ئاوای كردو فەرمووی: داوام له پەروەردگارم كردو تكام بۆ ئوممەتم كرد سێیەكی ئوممەتی پێ بەخشیم، یەكسەر چومه سوژده بۆ سوپاسگوزاریی پەروەردگارم، ئینجا سەرم بەرز كردەوه داوای ئوممەتەكەم له پەروەردگارم كرد، سێ یەكی تری ئوممەتەكەمی پێ بەخشیم، یەكسەر چومەوه سوژده كڕنوشی سوپاسگوزاریم برد بۆ پەروەردگارم، پاشان سەرم بەرز كردەوه، داوام له پەروەردگارم كرد بۆ ئوممەتەكەم، سێ یەكەكەی تریشی پێ بەخشیم، یەكسەر كڕنوشم بۆ پەروەردگارم برد).

لەم كڕنوشەدا دەتوانی بڵێی (**سبحان ربي الأعلى**) سێ جار[2]. (**سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اللهم اغفرلي اللهم إني أشكرك على هذه النعمة**) ناوی شتەكەیش دەبەیت.

---

[1] رواه أبو داود الحيث (٢٧٧٥)، ورياض الصالحين، رقم ١١٥٩.

[2] شرح رياض الصالحين، العثيمين، ص٢٨٢، رياض الصالحين رقم ١١٥٩.

به کوردییش دەتوانی هەمان دوعا یان هەر نزایەکی تر بکات ئەم سوژدەیەش پێی دەوترێ (**سجدة الشكر**) سوجدەی سوپاسگوزاریی[1].

**عن أبي بكرة نعيم بن الحارث (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ كان إذا جاءه أمر يَسُرُّ به خرّ ساجداً شاكراً لله تعالى)**[2] وفي روايه (**شاكراً لربه**). واتە: لە ئەبی بەکرەوە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) عادەتی وابوو هەر شتێك دڵی خۆش بکردایە بە سوژدەدا دەچو بۆ سوپاسگوزاریی خودا.

هەروەها کڕنوش بردنی کەعبی کوڕی مالیك لەسەردەمی پێغەمبەردا کاتێك مژدەی گێرابوونی تەوبەکەی لە لایەن خوداوە پێ درا وەکو لە فەرمودەی ژمارە (٢١) لە (**رياض الصالحين**) فەرمودەکە بە درێژیی هاتووە و باسکراوە، سوژدەی سوپاسگوزاریی بۆ خوای گەورە برد.

پێغەمبەری گەورەو مەزنی ئیسلام رەمز و پێشەوای سوپاسگوزارانە، **عن المغيرة بن شعبة (رضي الله عنه) قال: إن كان النبي ﷺ ليقوم أو ليصلي حتى ترم قدماه أو ساقاه، فيقال له، فيقول: أفلا أكون عبداً شكوراً)**. لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەگەر پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) هەڵدەستا بۆ نوێژکردن (بە شەو) ئەوەندەی نوێژ دەکرد تا بەرە پێکانی دەئاوسان یان بەر ئەژنۆکانی دەماسین پێی دەوترا، دەیفەرمو: ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزاربم".

**قال هشام بن سعد: سمعت محمد بن كعب قال: "كان نوح ﴿عليه السلام﴾ إذا أكل قال الحمد لله، وإذا ركب قال الحمد لله فسماه الله عبداً شكوراً"**. واتە: لە هشامی کوڕی سەعیدەوە فەرمووی گوێم لە موحەممەدی کوڕی کەعب بوو فەرمووی (نوح) (سەلامی خودای لێ بێت) کە شتێکی دەخوارد دەیفەرمو (الحمدلله) ئەگەر سوار دەبوو دەیفەرمو (**الحمدلله**) خوداش ناوی نا (بەندەی سوپاسگوزار).[3]

---

[1] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[2] رواه أبو داود رقم ٢٧٧٤، ورياض الصالحين ص٣٦٢، وقال الألباني صحيح.

[3] إسناده حسن، أخرجه أحمد ج٢ / ص٤٦١، موسوعة الأخلاق الإسلامية.

**قال إبن أبي الدنيا: حدثنا على بن جعد أخبرني مزاحم بن زفر، عن مسعر قال: "لما قيل لهم (اعملوا آل داود شكراً) سبأ ١٣، قال لم تأت على القوم ساعة إلاّ ومنهم مصلٍّ".**[١] واته: كاتێ وترا خانەوادەی داود بە کردەوە سوپاسی خوا بکەن. فەرمووی هیچ کاتێك نەبووە ئەو خانەوادەیە لە نوێژدا نەبن.

خودای پەروەردگار دەربارەی سلێمان (سەلامی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: کاتێك بە دۆڵی شارە مێرولەکاندا ڕۆیشت فەرمووی: **"رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ".**[٢]واتە پەروەردگارا رام بێنە و حەزی ئەوەم تێدا دروست بکە، کە سوپاسی بەهرەکانی تۆ بکەم بەسەر خۆم و باوانمەوە.

کاتێك موسڵمانان لە (عەین جالوت) تەتەرەکانیان تێك شکاند کوڕی (کتیفا)یان بەدیل گرت وتیان باوکت رای کردووە وتی راناکات گەڕان لە ناو کوژراوەکاندا دۆزیانەوە یەکسەر مەلیك **(مظفر)** سوژدەی سوپاسگوزاریی برد.[٣]

## بە سوژدە نەبێت کەم و کوڕی نوێژ پڕنابێتەوە

هەر کەموکوڕییەك لە نوێژدا بە کردنی زیادەیەك یان نەکردنی فەرمان پێکراوێك جێگەی خۆی ناگرێتەوە و ئەو کەم و کوڕییە پڕنابێتەوەو شکستە بەند نابی بە سوژدە نەبێت، ئەویش بردنی دوو سوژدەیە پێش سەلام دانەوە، ئەو دوو سوژدە کەم و کوڕی نوێژەکە پڕ دەکاتەوە و هەڵەو پەڵەی نوێژەکە پینە دەکات.

**عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا شك أحدكم في صلاته فلم يَدْرِي كم صلى! ثلاثاً أم أربعاً، فليطرح الشك وليبن على ماإستيقن، ثم يسجد سجدتين قبل أن يسلم فان كان صلى خمساً شفعن له صلاته وإن كان صلى إتماماً لأربع كانتا ترغيماً للشيطان".**[٤] واتە: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خودا (سەلامی خودای لێ

[1] إسناده صحيح، أخرجه البيهقي في الشعب رقم ٤٢٠٦.

[2] النمل / ١٩.

[3] صلاح الأمة، ج٦ / ص٢٤٣.

[4] رواه مسلم ٥٧١، الأدلة الرضية، ص٧٨، الفقه المنهجي، ص١٧٣.

بێت) فەرمووی: (ئەگەر یەکێکتان کەوتە گومانەوە لە ناو نوێژەکەیدا نەیدەزانی چەندی کردووە! سێ یان چوار، با گومانەکە بڕەوێنێتەوە بە دڵنیاییەوە تەواوی بکات ئینجا دوو سوژدەبەرێت پێش سەلام دانەوەی جا ئەگەر پێنج رکاتی کردبوو بۆی دەکەنە چوار رکات (سوژدەکان) خۆ ئەگەر چوار رکاتی تەواویشی کردبوو ئەوە قەپۆزی شەیتانیان پێ دەشکێنێ.

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ صلى الظهر خمساً فقيل له أزيد في الصلاة؟ فقال وما ذاك؟ قال صليت خمساً، فسجد سجدتين بعدما سلم.**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێ بێت)، پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) نوێژێ پێنج رکاتی کرد پێی وترا نوێژ لێی زیاد کراوە؟ فەرمووی بۆ چیبووە؟ وتی پێنج رکاتت کرد، یەکسەر دوو سوژدەی برد دوای سەلام دانەوە.

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: وإذا شك أحدكم في صلاته فليتحرً الصواب, فليتم عليه ثم ليسلم, ثم يسجد سجدتين).**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی ئەگەر یەکێکتان کەوتە گومانەوە لە ناو نوێژەکەیدا (نەیدەزانی چەند رکاتی کردووە) با بە دوای ڕاستییەکەدا بگەڕێ و تەواوی بکاتو پاشان سەلام بداتەوە، ئینجا دوو سوژدەبەرێت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: النبي ﷺ الظهر أو العصر فسلم, فقال له ذو اليدين: الصلاة يارسول الله أنقصتْ؟ فقال النبي ﷺ (أحقُ ما يقول؟ قالوا: نعم فصلىَ ركعتين أُخريتين, ثم سجد سجدتين.**[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەر نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری پێ کردین، سەلامی دایەوە، (ذوالیدین) پێی فەرموو ئەی پێغەمبەری خوداﷺ نوێژەکە!! کورت بۆتەوە ؟ پێغەمبەر فەرمووی: ڕاستە ئەوەی دەیڵێت؟ وتیان: بەڵێ, دوو رکاتی تری پێ کردین

---

[1] أخرجه البخاري، ١١٦٨. ومسلم ٥٧٢، الأدلة الرضية، ص٧٨.

[2] أخرجه البخاري ٣٩٢ ومسلم ٥٧٢. والادلة الرضية ص٧٩.

[3] البخاري رقم ١١٦٩.

ئینجا دوو سوژدەی برد. هەروەها چەند فەرمودەیەکی تریش لەم بارەوە هەیە وەکو ژمارە (١١٦٦ بوخاری)و ژمارە (٥٧٠ مسلم). و ژمارە (١٢٠٨ إبن ماجە)و ژمارە (ابو داود ١٠٣٦).

**عن عبدالله قال: صلى النبي ﷺ الظهر خمسا, فقالوا أزيد في الصلاة؟ قال (وما ذاك)؟ قالوا: صليت خمسا, فثنى رجليه وسجد سجدتين"**[1] (عبدالله، أي عبدالله بن مسعود). واتە: لە عەبدوڵڵاوە فەرمووی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بێت) نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین پێنج رکات، وتیان ئایا نوێژ لێی زیاد کراوە؟ فەرمووی: بۆ؟ وتیان پێنج رکاتت کرد قاچەکانی جووت کردەوەو دوو سوژدەی برد.

## شەیتان هەرگیز لە رێگەی سوژدەوە ناتوانێت دەست لە ئادەمیزاد بوەشێنێ

توندوتۆڵترین پەیوەندیی نێوان بەندەو پەروەردگار دوای ناسین و بڕوابوون بە خودا سوژدەبردنە، بۆیە شەیتانیش لە رێگەی سوژدەوە ناتوانێ دەست لە ئادەمیزاد بووەشێنێ، چونکە قایمترین و پۆڵاترین سەنگەری خواپەرستییە. شەیتانیش خۆی لەسەر سوژدە بە لەعنەت کراوە.

هەر لەو دەمەیدا کەوتەبەر نەفرین و نەفرەتی خودا رووبەڕووی خودا هەڕەشەی لە ئادەمیزاد کردو ئەوی لە دڵێدا بوو هەڵی رشت و رق و قینی و شەڕەنگیزی و جامی غەزەب و توڕەیی خۆی بە چەند رستەیەك دەربڕی و باسی هەموو ئەو رێگەو شوێن و دەرفەتانەی کرد کە لەوێوە ئادەمیزاد دەکاتە ئامانجی پیلانە گڵاوەکانی، بەڵام رێگەی سوژدەو نزاو پاڕانەوەی باس نەکرد، چونکە دەیزانی ئەو دوو شوێنە مەیدانی ئەو نییەو لەو دوو شوێنەوە دەسەوسانە وەکو خودا لە چیرۆکی سوژدە نەبردنی ئیبلیس بۆ ئادەم دەفەرموێت: **"قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ * ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ" (الأعراف: ١٦ ـ ١٧)**. واتە: چونکە گومڕات کردم و لە رێگەت لادام، دەبێ بۆیان

---

[1] رواه البخاري، رقم ٣٦٩، وفتح الباري رقم ٤٠٤ ج٢ ص٦٧.

ڕۆنیشم و ڕاستەڕێی تۆیان لێ بگرم، ئەوسا لە پێش و پاشەوە بۆیان دەچم و ڕاست و چەپیشیان لێ دەگرم، ئەوەدەمی زۆرینەیان سوپاسگوزاریو شوکرانەبژێریی ناکەن، واتە: دونیاو دوارۆژو چاکەو خراپەیان لێ بشێوێنم.[1]

لێرەشدا مەبەستی سەرباسەکەی ئێمە بە ڕۆشنی دیارە، چونکە ئادەمیزاد بە شەش لادا جموجوڵ دەکاتو دەبزوێتو دەتوانێ بە شەش لادا فەرمانی خودا جێ بەجێ بکات، لای ڕاست، لای چەپ، سەرەوە، خوارەوە، پێشەوە و دواوە، بەڵام لێرەدا شەیتان تەنها چوار لای باسکردووەو خۆی لەو دوانەی تر کەڕو لاڵ کردووە کە لای سەرەوە واتە ڕێگەی دوعاو نزاو پاڕانەوە, لای خوارەوە کە ڕێگەی سوژدەو خۆ بەکەمزانین و خوا بەگەورەزانین, سوژدەبردنە. شەیتان بە گوێرەی ڕابووردوی کە نزیك بووە لە پەروەردگاریەوە دەیزانی هەرکەس بە دڵ و گیان بپاڕێتەوەو بلاڵێتەوە لە پەروەردگاری و سوژدەی بەجۆش و خرۆشی بۆ بەرێ، کەس ناتوانێ خۆی لە قەرە بدات و لە خشتەی بەرێ، هەر بۆیە لە پیلانە گلاوەکانیدا نەخشەی ڕاستەوخۆی بۆ سوژدەبەر و کڕنوشبەرو نزاخوازان نەکێشاوە هەرچەندە لێشیان غافڵ و بێ ئاگا نابێت و زۆریشیان لێ بەداخە.

ڕێگەی سوژدە ڕێگەیەکی سادەو ئاسان نییە شەیتان بە ئاسانی دەستی تێکێشێ و کەری خۆی تێدا تاودا, بەڵکو سەخترین و سامناکترین و پۆلاییترین دەروازەیە کە شەیتان لێیەوە زێفەر بە ئادەمیان بەرێ. هەر بۆیەش هەر ئادەمییەك سوژدەی بۆ پەروەردگاری بەرێ شەیتان قەڵس و دڵتەنگ دەبێت و دەگری و دەناڵێ وەکو لە پاش ئەم باسە دەیخوێنیتەوە، هەر کەسیش شەیتان توانی ڕێگەی سوژدەو دوعای لێ بگرێ ئەو کەسە دەبێتە بەند و یەخسیری شەیتان، وەکو باڵندەی نێو قەفەزی لێ دەکات و زەلیلو داماو و بێ دەسەڵاتی دەکات، تەنانەت توانای بە سەر خۆشیدا نامێنێت و شەیتان دەیخەڵەتێنێ و دونیاو دوارۆژی لە دەست دەردێنێ و لە چاکەخوازیی دادەڕنێ و لە زەلکاوی خراپەی هەڵدەکێشێ.

[1] بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە سەیری (زاد المسیر إبن الجوزي) بکە ب٣ / ل١٣٥ ـ ١٣٦.

## سوژده داخ و ناسۆره بۆ شەیتان

شەیتان لە هەموو پەرستنەکان زیاتر بە سوژدە قەڵس دەبێت و غەم و پەژارە دایدەگرێتو تەنانەت دەستیش دەکاتە گریان کە بینی ئادەمییەك سوژدە بۆ پەروەردگاری دەبات، مرۆڤ لە کاتی سوژدەدا لە هەموو کات زیاتر لە خوا نزیکەو لە هەموو کاتیش زیاتر شەیتانی لێدووره، بۆیە دڵی ئارام و هۆگری پەروەندی خۆیەتی و ترسی شەیتانی نییە.

کڕنوشی قورئان خوێندن لە قورئاندا چواردەن لەم سورەتانەدا: **"الأعراف, الرعد, النحل, الإسراء, مريم", دووجار لە: "الحج, الفرقان, النمل, السجدة, الم تنزيل، النجم، الإنشقاق، العلق"**.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) إذا قرأ إبن آدم السجدة فسجد, اعتزل الشيطان يبكي ويقول: ويل له, أمر بن آدم بالسجود فسجد, فله الجنة, وأمرت بالسجود فعصيت، فلي النار**[1]. واتە: لە ئەبی هورەیرەوە فەرمووی پێغەمبەری خودا (سەلامی خودای لیّ بێت) فەرموویەتی: هەر کات ئادەمیزاد ئایەتی سوژدەی خوێندو سوژدەی برد شەیتان کەنارگیر دەبیّ و دەگری و دەڵیّ سزاو وەیل بۆی, ئادەمیزاد فەرمانی پیّ کرا سوژدەبەرێت. ئەوا سوژدەی برد دەچێتە بەهەشتەوە, منیش فەرمانم پێکرا سوژدەبەرم نەمبردو سەرپێچیم کرد دەچمە ئاگرەوە.

## بەڵگە لەسەر سوژدەی قورئانخوێندن زۆرە لەوانەش:

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) قال: كان النبي ﷺ يقرأ علينا السورة فيها السجدة, فيسجد ونسجد, حتى ما يجد أحدنا موضع جبهته.**[2] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لیّ بێت) فەرمووی وا ئەبوو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لیّ بێت) سورەتێکی بەسەردا دەخوێندینەوە ئایەتی سوژدەی تیابوو، سوژدەی دەبردو ئێمەش سوژدەمان دەبرد, تەنانەت هەبوو لەناو ئێمەدا شوێنی ناوچەوانی بە تەواوی نەئەبوویەوە.

---

[1] إسناده صحيح، رواه مسلم رقم ٨١، وإبن ماجه ١٠٥٢، وأحمد ٩٧١١، وفي رواية يقول: (وَيْلَهْ).

[2] رواه البخاري رقم ١٠٢٥.

**(كان النبي يقرأ علينا القرآن فإذا مر بالسجدة كبر وسجد وسجدنا معه)**[1]. واته: پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) قورئانی بۆ دەخوێندین کە بە سەر ئایەتی سوژدەدا تێ دەپەری (الله أكبر)ی دەکردو سوژدەی دەبرد، ئێمەش سوژدەمان دەبرد لەگەڵیدا.

**وعن عمر (رضي الله عنه) قال: "ياأيها الناس إنا نمر بالسجود، فمن سجد فقد أصاب، ومن لم يسجد فلا إثم عليه"**.[2] واته: لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێمە بە ئایەتی سوژدەدا تێدەپەڕین هەرکەس سوژدەی ببردایە پێکابووی, هەرکەسیش سوژدەی نەبردایە گوناهی لەسەر نەبوو.

**وفي رواية عن إبن عمر (رضي الله عنهما): ان الله لم يفرض علينا السجود الا أن شاء.** واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بیت) "بێگومان سوژدەی قورئان خوێندن لەسەرمان فەرز نەکرابوو، ئەگەر خۆمان بمان ویستایە سوژدەمان دەبرد".

## لەسەر سوژدە نەفرەت لە ئیبلیس کراوە

لە قورئانی پیرۆزدا باس لەوە دەکات کە ئیبلیس (شەیتان) یەکێك بووە لە نزیکانی خوداو دۆستو هاودەمی فریشتەکان، بەڵام هەر کە خودا فەرمانی پێ کرد سوژدەی ڕێز بۆ ئادەم بەرێت لەگەڵ سەرجەم فریشتەکان هەموو سوژدەیان برد، بەڵام ئەم لاساریی کردو ملی نەداو فەرمانی خودای ئەنجام نەدا و فەرامۆشی کرد، لەسەر ئەنجامنەدانی ئەو تاقە سوژدەیە خودا بەر نەفرەت و لەعنەتی خۆی داو لە ئاسمانێ را فڕێی دایە خوارو لە چاکترین کەسەوە بوو بە خراپترین و شەڕەنگێزترین کەس, تەنانەت بووە ڕەمزی هەموو خراپەو شەڕو ئاژاوەو فیتنەو بەدکرداری و بەدڕەفتارییەك.

لێرەوە بە ڕۆشنی دەردەکەوێت کە سوژدەبەران کاتێك ڕاست دەکەن لەگەڵ پەروەردگاریان کە دووربن لە هەموو خراپەکارییەك, بە کڕنوشو سوژدە ئادەمیزاد دوورەپەرێز دەبێت لە هەموو نامرۆییەك, هەروەها بە کڕنوش نەبردنیش مرۆڤ هێدی هێدی بەرەو خراپە مل دەنێ و ڕوو لە خراپە دەکاتو هەستیشی پێ ناکات و بە

---

[1] رواه أبو داود رقم ١٤١٣.

[2] رواه البخاري، رقم ١٠٢٧.

کارێکی چاکیشی دەزانێ, هەتا وای لێ دێت چاکە بە خراپە و خراپە بە چاکە دەزانێ و دەبێتە میکرۆبو بەڵاو نەگبەتی بۆ خۆی و دەوروبەرو گەل و نیشتمانی.

خودا لە باسی سەرگوزشتەی شەیتاندا واباس دەکات کە پێش یاخی بوونی لە سوژدە نەبردن چ خراپەی نەبوونو کەسی وەڕز نەکردووەو کەسی بەشەڕ نەداوەو لە کەس بەداخ نەبووە, بەڵام سەرەتای شەڕەنگێزیی و شوڵ لێ هەڵکێشان خراپەی لەو کاتەوە بوو کە سوژدەی نەبرد بە ئەنجام نەدانی سوژدە دەستی دایە بێعاری و بەدڕەفتاری و بەدکرداری و بووە دێوەزمەی نەگبەتی و ماری حەوت سەر و لە قاچی ئادەمیان ئاڵا، لە چەند شوێنێ لە قورئاندا ئەم داستان و بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە، هەرجارەی لە دیمەنێکی قیزەونی لاساری شەیتان باس دەکات. وەکو دەفەرموێت: **"وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبي وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ"** (البقرة: ٣٤). واتە: کاتێ بە فریشتەکانمان وت کڕنوش لە بۆ ئادەم بەرن, غەیری ئیبلیس هەموویان سوژدەیان بۆ برد، ئەو خۆی بە زلتر زانی و چووە ریزی کافران.

هەروەها دەفەرموێت: **"وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ"**. (الكهف: ٥٠). واتە: ئەوسا بە فریشتەکانمان وت: سوژدە وەبەر ئادەم بەرن سوژدەیان برد ئیبلیس نەبێ, ئەو (بنە جن)[1] بوو لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو.

هەمان باس لە سوڕەتی **"الحجر ٣٠ ـ الزمر ٧٣ ـ الأعراف ١١ ـ الإسراء ٦١ ـ طه ١١٦"**دا بە شێوازی جۆراو جۆر باسکراوە. بەڵێ ئیبلیسی شەیتان و دوور لە هەق لەسەریەك کڕنوشبەر نەفرەتی هەتا هەتایی کەوت کە سوژدەی ڕێزو شکۆداریی بوو, بەڵام کەسێك یەك شەو و رۆژ نوێژ بفەوتێنێ واتە (٣٢) سیو دوو سوژدە تەنها لە شەووڕۆژێکدا دەفەوتێنێ دەبێ لە لای خودا حوکمی چی بێت کە سوژدەی پەرستنیشەو بۆ خوداشە نەك بۆ ئادەم, یەك جاریش نییە لە تەمەندا، بەڵکو رۆژی (٣٢) سی و دوو جارە. جیاوازییش زۆرە لەم بوارەدا سوژدەی شەیتان:

١ ـ بۆ ئادەم بوو.

٢ ـ سوژدەی ڕێز بوو.

---

[1] بنە جن: واتە: لە بناغەدا جنۆکە بوو.

٣ ـ لە ژیان و ماوەی تەمەنیدا یەك جار بوو و دەبێ ئەوەی سوژدەی نوێژە فەرزەکان بفەوتێنێ حاڵی چۆن بێت کە: بۆ خودایە. سوژدەی پەرستنە و لە شەو و ڕۆژێکدا (٣٢) سوژدەیە.

## ئیسماعیل پێغەمبەر داوای لە باوکی کرد لە کاتی سوژدەدا بیکاتە قوربانیی

بەڵێ کاتێك خودای گەورە بە نیگاو لە ڕێگەی خەوبینینەوە ئیبراهیمی ئاگادار کرد (سەلامی خوای لێ بێت) کە کوڕە تاقانەو جگەرگۆشەکەی بکاتە قۆچی قوربانیی، ئیبراهیم کوڕە نازدارەکەی ئاگادار کرد لە فەرمانی خودا، ئەویش بەوپەڕی دڵقایمی و خۆنەویستییەوە ئامادەیی دەربڕی، بەڵام تەنها داوای ئەوە بوو بەڕودا بیخات و لە کاتی سوژدەدا سەری ببڕێ نەکا سۆزی باوکایەتی و ئاگری جگەر کاری تێبکات و زۆر دەستی لێ دانەگرێ یان هەر نەبێ لە کاتی سەربڕینەکەدا دڵەڕاوکەو خوت خوتەی شەیتان بە دڵیدا گوزەر بکات. کوڕێك خواپەرست و دەست بە دەستنوێژو سەر لە سوژدە بێت ئاوا نەخشەی مەرگی خۆی بۆ خۆی دادەڕێژێ هەتا باوکی سەربەرز بێت و تووشی نسکۆ و خەجاڵەتی نەبێت. سوژدە کە کاکڵە و ناوکرۆکی خواپەرستییە هەموو جۆرەکانی تری پەرستنیش کە لە دوای سوژدە دێن مرۆڤی دڵسۆزو لێبڕاو و فیداکار دروست دەکەن بۆ بەرژەوەندیی کەسوکارو دۆستو خزم و هاووڵاتی و تەنانەت هەموو مروڤایەتیش, بە جۆرێك بابای سوژدەخواز و کڕنوشبەری راستەقینە خۆی کردۆتە قۆچی قوربانیی لە پێناوی خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی خەڵکیی لە دونیاو دواڕۆژدا هەر وەکو لە داستانی بەقوربانی کردنی ئیسماعیل پێغەمبەرو لاوی خواپەرست و فیداکاری هاوڕێیانی چاڵە ئاگرینەکان (**أصحاب الأخدود**) کە لە قورئاندا باسی لێ کراوە.

هەروەها سوژدەبردنی بێگەرد، بڕواداری دڵسۆزو راستەقینەی واپەروەردە دەکاتو پێ دەگەیەنێت کە گیانی خۆی دەکاتە قوربانی فەرمودەی خوداو ئامادەیە بکوژرێ، بەڵام دەست بۆ خوێن و رۆحی کەس درێژ نەکات هەروەکو لە داستانی دوو کوڕەکەی ئادەم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) "هابیل و قابیل" لە قورئاندا باس کراوە کە قابیل ویستی هابیلی برای بکوژێ و هەڕەشەی لێ کردو خۆیدا هەنگاوت، بەڵام

هابیلی خواناس‌و بڕواداری ڕاستەقینە وتی من دەستی خۆم بە خوێنی تۆ سوور ناکەم و بشمکوژی ئاوڕت لیَ نادەمەوە، چونکە کوشتن کارێکی ناشرینەو خوا پێی ناخۆشە, دەنا دەتوانم دەستت لیَ بوەشێنم.

خودا دەربارەی سەرمەشقی خەباتکاران‌و قوربانیدەران و فیداکاران (ئیبراهیم) لە قورئاندا باس دەکات، کە ئیبراهیم لە پێشدا خۆی خرایە ناو ئاگرو پاشان هەڕەشەی کوشتنی لیَ کراوە، دواتر لە وڵات و نیشتمان و زێدی باو و باپیری وەدەرنرا، لە پاش هەموو ئەم دەردی سەریانە لە ئاسمانەوە داوای لیَ کرا دەبیَ ئیسماعیل تاقە گوڵی پایزی ژینت بکەیتە قوربانیی، وەکو دەفەرموێت: **"فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ * فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ"**. (الصافات: ١٠٢ ـ ١٠٣). واتە: کاتێك ئیسماعیل لەگەڵ باوکی دەچووە کاریَ، باوکی پێی فەرموو کوڕی خۆم من لە خەومدا ڕاسپێراوم تۆ سەربڕم, وردبەوە بزانە چۆنی لێك دەدەیتەوە, گوتی باوە چیت پیَ سپێراوە ئەنجامی بدە بە ویستی خودا لێرە بە دواوە خۆراگریی من دەبینی.

کاتێك هەردووکیان تەسلیمی خودا بوون لەسەر ڕوو تخێلی کرد[1] توێژەرەوانی قورئانی پیرۆز دەفەرمون لەو کاتەدا ئیسماعیل داوای لە باوکی کرد لە دەمی کڕنوش بردندا سەری بڕیَ[2] وتی حەز دەکەم کە چەقۆکەت خستە سەرگەردنم سەرم لە سوژدەدا بێت[3], هەر بۆیە خودا دەفەرموێت (**وتله للجبين**). واتە: بە ڕوودا پاڵی خست.

## جادووگەرەکانی فیرعەون بۆ سوژدەیان هەڵبژارد و کردیانە ڕەمزی تەوبەکەیان

هەرکە خودا فەرمانی کرد بە موسا بچێتەوە بۆ میسرو پێغەمبەرایەتی خۆی بۆ فیرعەون و دارودەستەکەی ئاشکرا بکات, موسا (سەلامی خودای لیَ بێت) گەڕایەوە میسرو چووە کۆشکی فیرعەون‌و ڕووبەڕووی وەستا و پیَ ڕاگەیاند کە بۆتە پێغەمبەر و

---

[1] واتە : پاڵی خست ـ ڕای کێشا ـ درێژی کرد.

[2] زاد المسير، ج٦ / ص٣١٦. وصفوة التفاسير، ج١٤ / ١٨.

[3] تعظيم قدر الصلاة، ل٤٠.

شتی زۆری بۆ روون کردەوەو وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە، فیرعەون فیشاڵی کردو بە فیزەوە وتی برۆ لەگەڵ جادووگەرەکانم پێشبڕکێ بکە بزانم چیت پێ دەکەن, وادەیان دیاریی کردو جاڕیان داو خەڵکیان بانگێشت کرد, فیرعەون جادووگەرەکانی بانگ کرد بەرچاوڕوونیی تەواوی کردن و پێ وتن خۆتان ئامادە بکەن و بە ریزو یەکدەست بۆی بچنە مەیدان و بیبەزێنن, وتیان فەرمانت بەجێیە، بەڵام کە بەزاندمان بەخششمان ئەدەیتێ، وتی ئێوە لە نزیکانی خۆم دەبن‌و هەموو شتێك دەخەمە بەردەستان. کاتێ وادەی دیاریکراو هات ئاپۆڕای خەڵکیی رووی کردە (مەدیەن)، جادووگەرەکان هاتن و کڕنوشیان بۆ فیرعەون برد، پاشان موسا (سەلامی خوای لێ بێت) هات و ملی بۆ کەس کەچ نەکردو سەری بەرزی لە بەرامبەر فیرعەوندا نەوی نەکرد، پێشبڕکێ‌و کێبەرکێ دەستی پێ کرد، پەتە گوریس و حەبلیان هەڵداو جادووی گەورەیان کرد، چاوبەستی خەڵکی و پەردەپۆشی راستیان کرد لەبەرچاوی خەڵکیی، پاشان موسا عەساکەی هەڵداو هەموو پەتو گوریسەکانی ئەوانی هەڵلوشی جادووگەرەکان تەوبەیان کردو یەکسەر سوژدەیان برد، چونکە زانییان سوژدە باشترین و نزیکترین رێگەیە بۆ رەزامەندیی خودا. ئەو دەنگ و باسەش لە چەندەها شوێنی قورئاندا باس کراوە لەوانەش: **"قَالَ لَهُم مُّوسَى أَلْقُوا مَا أَنتُم مُّلْقُونَ * فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ * فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ * فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ * قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ * رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ"**. **(الشعراء: ٤٣ ـ ٤٨)**.[١] واتە: موسا بەوانی راگەیاند چیتان ئامادە کردووە بۆ هاویشتن بیهاوێژن. ئەوانیش پەت و گاڵوکەکانیان فڕێداو گوتیان بە گەورەیی فیرعەون هەر خۆمان دەیبەینەوە. ئەوسا موساش داردەستەکەی فڕێدا گۆزوگومەت هەموو جادووەکانی ئەوانی چنییەوەو هەڵی لوشین. جادووگەرەکان یەکسەر بە سوژدەدا چوون. وتیان باوەڕمان کرد بە پەروەردگاری جیهانیان. پەروەندی (موسا) و (هارون).

هەروەها لە سوڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێت: **"وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ * قَالُواْ آمَنَّا بِرِبِّ الْعَالَمِينَ * رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ"**. (الأعراف: ١٢٠ ـ ١٢٢). هەروەها لە سوڕەتی (طه)دا دەفەرموێت: **"فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّداً قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى"**

---

[١] الشعراء ٤٣ ـ ٤٧.

**(طه: ٧٠)**. واتە: جادووگەرەکان دەستبەجێ سوژدەیان بردو گوتیان باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری موسا و هارون.

جادووگەرەکان نزیکترین رێگەیان لە رێگەکانی ئیمانهێنان و پەشیمان بوونەوەو تەوبە کردن هەڵبژارد، بەڵکو کاکڵەو ناوەڕۆکی خواپەرستییان کردە دەستەگوڵی تەوبەکەیان کە کڕنوشبردن بوو، زانییان سوژدە لە هەموو پەرستنەکان کاریگەرترە لەسەر دڵ و دەروونیان و زیاتریش جێگەی رەزامەندییە لای پەروەردگاریان.

## سوژدە تکای پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) مسۆگەر دەکات لە رۆژی دواییدا

هەرکەس تامەزرۆو ئومێدخوازی تکای پێغەمبەرە بۆ رۆژی دوایی بابزانێ کڕنوشبردن نزیکترین و ئاسانترین رێگەیە بۆ بە دەست هێنانی تکای پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە مەحکەمەی خوای گەورە. لەم بارەوە ئەم فەرمودەیە دەکەینە بەڵگە: (**عن فاطمة بنت الحسين أن رجلاً قال: يارسول الله ادع الله ان يجعلني من أهل شفاعتك قال: أعني بكثرة السجود**)[١]. واتە: لە فاتیمە کچی حسێنەوە: پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خودا لەخوا بپاڕێرەوە بۆم کە وەبەر تکای تۆ کەوم فەرمووی: دەکۆمەکیم بکە بە سوژدە بردنی زۆر.

شێخ الإسلام پێشەوا (**حافظ أبي عبدالله محمد** کوڕی نصر **المروزي**) (رەحمەتی خودای لێ بێت) لەسەر ئەو فەرمودەیە ئەبوهرەیرەو ئەبوسەعید دەیگێڕنەوە (رەزای خوایان لێ بێت) کە دەربارەی شەفاعەت دەفەرموێت تکای پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ ئیمانداری دۆزەخییە، کاتێ لە دۆزەخ دەردەچێت بە شوێنەواری کڕنوش لە ناوچاوانیاندا دەناسرێنەوە، مەروزیش دەفەرموێت بە روون و ئاشکرا دەردەکەوێت لەم فەرمودەیەدا ئەوانەی وەبەر شەفاعەت و تکای پێغەمبەر دەکەون نوێژخوێنان و سوژدەبەرانن و غەیری ئەوان وەبەر ناکەون.[٢]

---

[١] إسناده مرسل وهو حسن لغيره، والحديث رواه بمعناه مسلم من حديث ربيعة بن كعب الأسلمي رقم (٤٨٩)، تعظيم قدر الصلاة، رقم ٣١٩.

[٢] تعظيم قدر الصلاة، ل٦٦٤.

## یەك سوژدە خێری زیاترە لە دونیا و هەرچی لە دونیادایە

تاقە کڕنوشێك لە رۆژی دواییدا فریای ئادەمیزاد دەکەوێت لە تەنگەژەو کوێرەوەریی رزگاری دەکات. بەڵام کەسی بێباوەڕ ئەگەر هەموو دونیاو هەرچی لە دونیادایە بیکاتە قوربانی و بەلاگێڕی خۆی تۆزقاڵێ سوودی پێناگەیەنێت و لێی وەرناگیرێ. لەم روانگەوە دەردەکەوێ یەك سوژدە خێری پترەو زیاتر سوود دەگەیەنێت لە هەموو دونیا و هەرچی تێیدایە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: والذي نفسي بيده ليوشكن أن ينزل فيكم إبن مريم حكما مقسطا فيكسر الصليب و يقتل الخنزير ويضع الجزية وتفيض المال حتى لا يقبله أحد, حتى تكون السجدة الواحدة خيراً من الدنيا وما فيها ثم قال أبو هريرة (رضي الله عنه), إقراوا إن شئتم (وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيداً) (النساء: ١٥٩)**[١].

واتە: لە ئەبی هوریرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە نزیکە کوڕەکەی مەریەم بێتە خوارەوە بۆ ناوتان بە دادگەری و عەدالەت, خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەرانە هەڵدەگرێ و ماڵ و سامان هەڵدەڕژێ هەتا کەس نابی وەری گرێ تەنانەت تاقە سوژدەیەك لەو رۆژەدا خێری زیاترە لە دونیاو هەرچی لە دونیا دایە، پاشان ئەبوهورەیرە فەرمووی ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە.

(لە خاوەن کتێبەکان تاقە کەسێك نییە باوەڕ بە عیسا نەهێنی پێش مردنی، لە رۆژی دواییشدا دەبێتە شاهید بەسەریانەوە).

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "والذي نفسي بيده، ليوشكن، أن ينزل فيكم إبن مريم حكما عدلا فيكسر الصليب ويقتل الخنزير ويضع الحرب ويفيض المال, حتى لايقبله أحد, حتى تكون السجدة الواحدة خيراً من الدنيا وما فيها)**[٢]. واتە: لە ئەبی هوریرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا

---

[١] رواه البخاري رقم (٢١٠٩)، ومسلم رقم (١٥٥)، لە کتێبی (العقائد الإسلامية السيد سابق، ص٢٥٥، وأشراط الساعة ٣٤٧، و سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٧٠٧٧.

[٢] رواه البخاري في كتاب أحاديث الأنبياء، وكتاب المظالم، وكتاب البيوع باب قتل الخنزير، ومسلم في كتاب الإيمان رقم ١٥٥، والقيامة الصغرى، عمر الأشقر / ص٢٦٥.

(سەلاَتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی سویّند بەو خودایە گیانی منی بە دەست، نزیکە کوڕی مەریەم بە دادپەروەریو دادگەری, سەلّیب دەشکیّنیّ, جەنگ هەلّدەگریّ و مالّ و سامان هەلّدەڕیّژیّت تەنانەت کەس وەری ناگریّ، دونیا بە شیّوەیەکی لیّدا یەك سوژدە خیّری زیاتر دەبیّت لە دونیا و هەرچی لە دونیادایە.

## پیّغەمبەر شانازیی دەکات کە یەکەم کەسە سوژدە دەبات لە مەیدانی مەحشەردا

سوژدە بردن مایەی شانازیی پیّغەمبەران و پیاوانی خودا بووە، هەر یەکیّ لە پەیامبەران و پیاوچاکان بە کڕنوش بەندایەتی راستەقینەی خۆیان سەلماندوەو ئەو ئەوینو خۆشەویستییەی لە دەروونیاندا ئاوری عەشقی خودایی بووە بە سوژدە دەریان بڕیوەو لە کڕنوشی پەرستنیاندا رەنگی داوەتەوە, کلّپ و کۆی دلّیان بە خەواندن و نەوی کردنی سەری بەرزیان بۆ پەروەندی مەعشوقی خۆیان دامرکاندووە, ئەو سەرە بەرز و بلّندانەی کە لە غەیری خودا کەس بە نزمی و لە شۆڕبوونەوەدا نەیبینیون بەلّکو هەر بە کوفرو بیّدینیان زانیون سەرشۆڕکردن بۆ غەیری خودا. لە بەشیّکی فەرمودەی شەفاعەتدا هاتووە (.. **فيأتون عيسى فيقول لست هناكم, ولكن ائتوا محمدا, عبدا قد غفر الله ما تقدم من ذنبه و ما تأخر قال رسول ﷺ: فيأتونني, فاستأذن على ربي فيأذن لي, فإذا أنا رأيتهم وقعت له ساجدا, فيدعني ماشاء بم قال: يامحمد ارفع رأسك, قل يسمع, وسل تعطه, واشفع تشفع.."**.[1] واتە: لە فەرموودەی شەفاعەتدا هاتووە، خەلّکەکە یەك یەك هاوارو سکالاّ دەبەنە خزمەت پیّغەمبەرەکان لە ئادەمەوە تا عیسا هەموویان بەڕیّیان دەکەن و دەفەرموون کاری ئیّمە نییە، تا عیسا دەفەرمویّت من پیاوی ئەو کارە نیم، بەلاّم بچنە خزمەتی موحەممەد ئەو بەندەی خودایە رابووردو و داهاتووی چاوپۆشیی لیّکراوەو خۆش بووە، فەرمووی کە هاتنە تکام, داوا لە پەروەردگارم دەکەم مۆلّەتم بدات کە ریّگەی پیّدام کاتیّ من بینیم سوژدەم بۆ برد ئەوەندەی ویستی لەسەر بوو لیّمگەڕا، پاشان فەرمووی ئەی موحەممەد سەرت بەرزکەرەوە: بلّیّ داوات بەجیّیەو وەرگیراوە داوا بکە پیّت بەخشراوە، تکا بکە تکات بەجیّیە.

---

[1] إسناده صحيح والحديث متواتر / البخاري رقم ٤٢٠٦ ومسلم رقم ١٩٣ / تعظيم قدر الصلاة رقم ٢٦٢

لەم روانگەیەشەوە خواپەرستان زۆر عەشقی سوژدە بوون، پێشەوا غەزالی دەگێڕێتەوە، کە عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس هەموو رۆژێ هەزار جار سوژدەی دەبرد، بۆیە ناویان نابوو **(السجاد)**.[1]

هەروەها سەعیدی کوڕی جوبەیر فەرموویەتی: خەفەت بۆ هیچ شتێکی دونیا ناخۆم بۆ سوژدە نەبێت.

## بە سوژدە بڕوادار و دووڕوو لێك جودا دەکرێنەوە

لە ژیانی دونیادا کە جیهانی یەکەمە, ئارامگای دڵی بڕوادار سوژدەگاکەیەتی کە ناوچاوانی لە بەرامبەر پەروەردگاریدا دەنێتە سەر زەوی‌و هەستی کامڵ دەبی ـ ت بەرامبەری‌و دەزانێت سازگارترین چاوگەی خواپەرستیی ئەنجام داوەو کاکڵەو ناوکرۆکی پەرستنی بۆ خودای خۆی کردووە, هەست دەکات کافر ئەوەی بۆ ناکرێت‌و دووڕووش بەڕاستیی بۆی ئەنجام نادرێت، خۆ ئەگەر جار جارێکیش لە روو دامێنێ‌و سوژدەیەك بەرێ هێندە بە تەمەڵی‌و نارێکی‌و بێگارەوە دەیبات هەستی پێ دەکرێت کە بۆ خودا نییە لە جیاتی ئارامی دڵ و گیان دڵی تەنگ‌و دەروونی پڕئازار دەبێت، خوا دەفەرموێت: **"وَإِذا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقرآن لَا يَسْجُدُونَ"** (الانشقاق: ٢١). واتە: (کافرو دووڕووەکان هەردەمێکیش قورئانیان لە لا بخوێنرێت سوژدە نابەن).

زانایان دوو رایان هەیە:

١ ـ (لا يسجدون) نوێژ ناکەن.

٢ ـ (لا يسجدون) واتە: ملکەچ و گەردنکەچ نابن.

هەروەها دەفەرموێت: (**وَإِذا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ**). واتە: ئەگەر پێیان بوترێ (بەبێبڕواوەڕان) بۆ خودا سوژدەبەرن سوژدە نابەن[2].

دەربارەی ئابڕوچونی دووڕووەکان لە دوارۆژدا، خوا دەفەرموێت: **"يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ"**. (القلم: ٤٢). واتە: ئەوێ رۆژێ کە لە حەیبەتا چاکی لێ دەکێ بەلادا و بانگێشتی کڕنوش بردن دەکرێن، بەڵام ناتوانن.

---

[1] احياء علوم الدين ج١ ص ١٤٩

[2] لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دوو بۆچوون هەیە: ١ ـ ئەگەر یان بوترێ سوژدە بەرن لە قیامتدا سوژدە نابەن. ٢ ـ ئەگەر لە دونیادا پێیان بوترێ نوێژ بکەن نوێژ ناکەن. **زاد المسير إبن الجوزي** ب٨/ ل١٨١

هەركەس لە دونیادا سوژدەی راستەقینەی بۆ خودا نەبردبێ یان هەر سوژدەی نەبردبێ لەوێندەرێش خاكەسارو دەسەوسان رەق دەبێت و خۆی بۆ ناچەمێتەوە هەروەكو دیرەگی ژێر نیرگە. ئەوانەش بە دەغەڵیو دووڕوویی سوژدەیان بردبێت لە دونیادا بە مەرەدی كافران دەچن و ناچەمنەوە و سوژدەیان بۆ نابرێت.

**جاء حديث عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) (.. إذا كان يوم القيامة نادى مناد ألا لتلحق ـ لعله ـ قال كل أمة بما كانت تعبد, فلا يبقى احد كان يعبد صنما ولا وثنا و لا صورة إلا ذهبوا حتى يتساقطوا في النار, ويبقى من كان يعبد الله وحده من بر وفاجر, ثم يبتدئ الله لنا فيقول: هل بينكم وبين الله من آية فتعرفونها, فيقولون نعم: فيكشف عن ساق, فيخر سجدا أجمعون, فلا يبقى أحد كان يسجد في الدنيا سمعة ولا رياء ولا نفاقا إلا على ظهره طبق واحد, كلما أراد أن يسجد خر على قفاه...)**[1]. واتە: لە فەرمودەكەی ئەبی سەعیدی خودریدا هاتووە (... كاتێ رۆژی زیندوبوونەوە دێت، جاڕدەرێك بانگ دەكات: ئاگادارین با پەیوەندیی بكەن (پێدەچێ بڵێ) هەموو ئوممەتێك بەوەی لەوەپێش بت و پەیكەر و وێنەیەكی پەرستبێ و نەچێتەوە بەدەمیەوە هەتا دەچنە ئاگرەوە، ئەوانە دەمێننەوە كە تەنها و تەنها هەر خودایان پەرستووە لە چاكەخوازانو خراپكاران ئینجا خودا دەست پێ دەكات بۆمان و دەفەرموێت: ئایا لە نێوان ئێوەو خودادا نیشانەیەك هەیە پێی بناسنەوە؟ دەڵێن: بەڵێ خودا ساقیان بۆ دەردەخات, هەموو بە سوژدەدا دەچن, یەك كەس نامێنێتەوە لەوەپێش لە دونیادا سوژدەی بردێ بۆ رووپاماییو دووڕوویی كە لەسەر پشت نەبێتە یەك تەبەق, هەر كە بیەوێت سوژدەبەرێت لەسەر پشت وەعەردی دەكەوێت.

پیاوێكی دیندارو خواناس گێڕایەوە بۆم كە خزمێكی نزیكی خۆی هەرگیز نوێژی نەكردبوو نەشی دەكرد، هەتا لەسەرەمەرگدا چەند كەس تەكلیف و تكاو لالآنەوەیان لێ كرد شایەتمان بێنێت، كۆتا قسەی ئەوە بوو وتی هەتا ساخ بووم سەرم بۆ دانەخستووە، بە خوا ئێستاش سەری بۆ داناخەم، ئیتر یەكسەر گیانی سپاردو سەلبی سەرەمەرگ بوو (پەنا بە خوای گەورە).

---

[1] رواه البخاري رقم (٤٣٠٥) ومسلم رقم (١٨٣)/ والجامع الصحيح من أحاديث النساء، ص٣٣.

## سوژده نیشانەو رمزی ناسینەوەی بڕوادارانە لە ڕۆژی دواییدا

سوژدەبەر شوێنی سوژدەکە لە ناوچەوانیدا دەدرەوشێتەوە دەبێتە پێناسەی بڕوادارو پێی شکۆمەندو سەربەرز دەبێت لە ڕۆژی دواییدا. هەموو کەسێك لەو ڕۆژەدا بە دیاردەو نیشانەی کارەکەی دەناسرێتەوە ئەو کەسەی ڕۆژانەو بەردەوام دەستنوێژی گرتووە شوێنەواری دەستنوێژەکەی دەدرەوشێتەوە لە دەست و دەم و چاو و رویدا و لە قاچەکانیدا. دزو دەستپیس نیشانەی هەیە داوێنپیس و زیناباز بۆگەنی ناخۆشی لێ دێت وەکو لە فەرمودەدا هاتووە بابای کڕنوشبەریش ئەگەر خەڵکیی دەستو قاچی بدرەوشێتەوە ئەم ناوچاوانی بەسەری بەرزو بڵندیەوە شەوق دەداتو هەموو ئاپۆرەی خەڵکیی لە مەیدانی مەحشەردا دەیبینن و ئاواتی پێ دەخوازن. خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: (**سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ**). واتە: دروشم و شوێنەواری کڕنوشبردن بە روخسار و ناوچەوانیانەوە دیارە.

**عن عبدالرحمن بن نفير إنه سمع أبا ذر وأبا الدرداء قالا قال رسول الله ﷺ: "أنا أول من يؤذن له في السجود يوم القيامة، وأول من يؤذن له برفع رأسه، فأنظر بين يدي فأعرف أمتي من بين الأمم فأنظر عن يميني فأعرف أمتي من بين الأمم، فأنظر عن شمالي، فأعرف أمتي من بين الأمم، فقال رجل: يا رسول الله ﷺ! كيف تعرف أمتك من بين الأمم؟ قال: غرّ محجلون من آثار الطهور، ولا يكون أحد من الأمم كذلك غيرهم فأعرفهم أنهم يؤتون كتبهم بأيمانهم، وأعرفهم بسيماهم في وجوههم من أثر السجود، وأعرفهم بنورهم يسعى بين أيديهم"**.[١]

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی جوبەیری کوڕی نەفیرەوە گوێی لە ئەبازەڕو ئەبادەردا بوو فەرمویان پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی من یەکەم کەسم لە ڕۆژی دواییدا مۆڵەتی سوژدەم پێ دەدرێت، یەکەم کەسم ڕێم پێ دەدرێت سەر بڵند بکەمەوە، سەیری بەردەمم دەکەم ئوممەتی خۆم دەناسمەوە لە ناو ئوممەتەکاندا بە لای ڕاستدا دەڕوانم ئوممەتەکەم دەناسمەوە لە ناو ئوممەتەکاندا، بە لای چەپدا دەڕوانم ئوممەتەکەم دەناسمەوە لەناو ئوممەتەکاندا، پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خودا چۆن ئوممەتەکەت دەناسیەوە لە ناو ئوممەتەکاندا؟ فەرمووی: روخسار و دەستو قاچیان

[١] إسناده حسن وله شواهد، رواه أحمد رقم (٢١٧٨٨) / تعظيم قدر الصلاة، ص١٦٨ ـ ١٦٩.

دەدرەوشێتەوە، شوێنەواری دەستنوێژیان، هیچ ئوممەتێکی تر وا نییە، دەیانناسمەوە نامەی کردارەکانیان دەدرێتە دەستی راست، بە سەرو سیمای درەوشاوەو نورانییان دەیانناسمەوە لە شوێنەواری سوژدە هەروەها بەو نورو رووناکییەی بەردەمیان رووناك دەکاتەوە.

## بە شوێنەواری سوژدە وەسفی هاوڕێیانی پێغەمبەر کراوە

هاوڕێیانی دڵسۆزو ئەمەکداری پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) نموونەی خواپەرستیو رەوشتبەرزیو دڵسۆزی و دینداری و خەباتو تێکۆشانو ئازایەتی گوێڕایەڵیو فیداکاریو خۆنەویستیو دڵنەرمیو خۆڕاگریو پشوودرێژیو راستبێژیو دڵپاکیو دەمپاکیو دەست و داوێنپاکیو حەقبێژی بوون، هەربۆیە لە چەندەها دیمەنی قەشەنگی قورئاندا وەسف کراونو خودا رەزامەندیی خۆی نیشانداونو سەلامی ئاراستە کردوونو بە پاڵەوانو پشتو پەنای پێغەمبەرەکەیو دینەکەی لە قەڵەمی داون، فریشتەی ناردووە بۆ کۆمەکیان لە تەنگانەدا، ئایەتی پیرۆزی قورئانی دابەزاندوەتە سەریان، فریشتەی ئاسمانی ناردووە بۆ شوردنیان لە کاتی شەهیدیدا، وشکانی و دەریای بۆ رام هێناون، زۆرێك لەوان هەر لە دونیای رووندا مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، بوونە سەرقافڵەی زانایان و شەهیدان و گەنج و لاوەکان و ئافرەتانی بەهەشت.

لە یەکێ لە دیمەنەکانی قورئاندا خودای گەورە بەم شێوەیە وەسفیان دەکات: (**مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّه وَالَّذينَ مَعَهُ أشدَّاء عَلَى الْكُفَّار رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّه وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُود ذَلكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ..**).[1] واتە: موحەممەد پێغەمبەری خودایە، ئەوانەش لەگەڵ ئەون لە بەرامبەر بێباوەڕان توندوتیژو لەناو خۆیاندا دلۆڤان و بەسۆزن، لە کڕنوش و سوژدەدا دەیانبینی، داخوازی چاکەو رەزامەندی خودان، دروشمی ئەوان لە روخساریاندا شوێنەواری سوژدەیە، وێنەی ئەوان لە تەوراتدایەو وێنەیشیان لە ئینجیلدا هەیە...

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودا دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر دەفەرموێت (لە شەڕدا پاڵەوانو فیداکارو خۆنەویست و شێری مەیدان و شمشێری خودان، لە ئاشتیشدا دلۆڤان

[1] سورة الفتح / ٢٩.

و دڵنەرم و بە بەزەیی و بەسۆز و هێمن و ئارامن، ئەم هەموو سیفەتە بەرز و ئاكارە جوانانەش ئەنجامی ئەوەیە هەردەم لە كڕنووش و سوژدەدا دەیانبینی، چۆن لە قورئاندا باسیان كراوە هەرواش لە تەورات و ئینجیلدا باس كراون و گەل و هۆزەكانی رابردووش پێناسیان دەزانن.

## سوژدەی ناتەواو خێر و فەڕی نوێژ بە با ئەدات

سوژدە كە پایەیەكی سەرەكییە لە نوێژداو نوێژ بەبێ سوژدە نەكردنی باشترەو بە نوێژ تۆمار ناكرێ بۆ خاوەنەكەیو ئەركی لەسەر سووك ناكاتو سزای نوێژنەكەری لێ لا ناداتو بە نوێژخوێنیش نایەتە ژمار.

**عن أبي عبدالله الأشعري (رضي الله عنه) قال: قال النبي ﷺ (مثل الذي لايتم ركوعه، وينقر في سجوده، مثل الجائع يأكل التمرة والتمرتين، لا يغنيان عنه شيئاً)**[1]. واتە: لە ئەبی عەبدوڵڵای ئەشعەریەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: (نموونەی ئەو كەسەی كڕنووش (چەمینەوەی نوێژی) بە تەواوی ئەنجام نادات و لە سوژدەدا دەنووك دەوەشێنێ، وەكو نموونەی برسییەك وایە خورمایەك یان دوو خورما بخوات، هیچ بەری دڵی ناگرێ).

**وعن بلال (رضي الله عنه) أنه أبصر رجلاً لا يتم الركوع ولا السجود فقال: لو مات هذا لمات على غير ملة محمد ﷺ**.[2] واتە: لە بیلالەوە گێڕدراوەتەوە كە پیاوێكی بینیوە چەمینەوەو كڕنووشو سوژدەی نوێژی بە تەواوی نەدەكرد فەرمووی: ئەگەر ئەوە ئاوا بمرێ لەسەر غەیری دینی موحەممەد (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) مردووە.

---

[1] أخرجه الطبراني في المعجم الكبير رقم (٣٨٤٠)، وصحيح الجامع ٩٩٧، وصحيح وصايا الرسول، ج١ / ص٦٢١.

[2] رجاله ثقات : رواه الطبراني في الأوسط رقم ٢٦٩١ والكبير رقم ١٠٨٥ غير أنه قال في الكبير: (لمات على غير ملة عيسى عليه السلام)، ورواته ثقات، الترغيب ٧٦٢، وصحيح وصايا الرسول ج١ / ص٦٢١.

## به سوژده ئادەمیزاد لە خودا نزیك دەبێتەوە

لە بابەتی ژمارە (٩) نۆدا باسی ئەوەمان کرد کە ئادەمیزاد لە کڕنوشدا لە هەموو کات لە خودا نزیکترە. لێرەشدا بەڵگە دێنین لەسەر نزیکبوونەوەی ئادەمیزاد لە خودا بە هۆی کڕنوشەوە وەکو دەفەرموێت: (**كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ**) (**العلق: ١٩**) واتە: (هەرگیز گوێڕایەڵی ئەو مەکەو سوژدەبەرەو نزیك بەوە).

کەواتە ئەگەر دەتەوێت نزیك بیتەوە لە پەروەردگاری خۆت سوژدەی بۆ بەرە، جادووگەرەکانی فیرعەونیش لە بێ باوەڕی و کوفرو بێ دینییەوە بە سوژدە بازیان داو نزیکی خودا بوونەوە لە چەند چرکەیەکدا وازیان لە فیرعەون خودای درۆینەو کۆلکەخودای بێ فەڕ هێنا و بەیەك سوژدە دۆستایەتی هەتا هەتاییان لەگەڵ خودا بەست و بۆ هەمیشە هاوەڵدانانو بێ دینیو خراپەکاریو چڵکاوخۆریو داردەستی ملهوڕانیان لە چاڵ ناو بەیەك سوژدە هەموو زەلیلیو کاسەلێسیو مرۆڤپەرستیو نەفامیو چاوبەست و جادووگەرییان زیندەگۆڕ کردو بەگژ فیرعەوندا چوون و شەهید بوون، بەرەو خودا فڕین، هەروەها لە بەشێکی فەرمودەی سەحیحی قودسیدا هاتووە (... **لايزال العبد يتقرب إلى بالنوافل**..). واتە: بەردەوام بەندەکەم بە ئەنجامدانی سوننەتەکان لە من نزیك دەبێتەوە (نوێژ بەبێ سوژدە نابێتو بەتاڵە)، کەواتە بەشێکی نزیکبوونەوەکە بە سوژدەبردنە. ئەو دەمەی خودا زۆری پێ خۆشە بەندەی تیادا ببینێ کاتێکە لە سوژدەدا بێت. قال تعالی: **"الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ * وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ"**. (**الشعراء: ٢١٨ ـ ٢١٩**). واتە: ئەو خودایەی کە تۆ دەبینی بەوەستاوی. هاتوچۆشت لەگەڵ سوژدەبەراندا. خودا هەموو کات بەندەکانی دەبینێ، بەڵام بۆ بینینی کاتی نوێژو سوژدەی بە تایبەتی باس کرد, دیارە لە مەقام و پلە و پایەی گەورەیە تێیدا باسی کردووە بە سەر هەموو مەقام و پلە و قۆناغەکانی تردا.

## سوژدە کاکڵەی خوا پەرستیەو بۆ غەیری خوا دروست نییە

هیچ خواپەرستییەك بۆ جگە لە خودا دروست نییە، هەر پەرستنێك بۆ جگە لە خودا هاوەڵدانان و هاوبەشدانانە، ئەگەر بێ بیانوی شەرعیی بێت. سوژدەش کە ناوەڕۆك و بناغەی پەرستنەکانە بێجگە لە خودا کەس شایستەی نییە و رایەی ناکەوێ.

خودا دەفەرموێت: (**لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ**).١ واتە: سوژدە بۆ خۆرو مانگ مەبەن، سوژدە بۆ خودایەك بەرن كە ئەوانی بەدی هێناون، ئەگەر هەر ئەو دەپەرستن.

لەم روانگەیەوە پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (**اللهم كما صنت وجهي عن السجود لغيرك فصنه عن المسألة لغيرك..**)[2].واتە: ئەی خودایە هەر چۆن رووی منت پاراستووە لە سوژدەبردن بۆ غەیری خۆت, ئاوهاش بیپارێزە لە دەست پان كردنەوە و لە غەیری خۆت..).

پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خودای لەسەر بێت) لەو فەرموودەدا كە باسی نوێژ نەكردن لە كاتە قەدەغەكراوەكاندا دەكات، دەفەرموێت كاتێك خۆر لە ئاوابووندایە كافرەكان سوژدەی بۆ دەبەن[3]. بەڵگەیە كە سوژدەبردن بۆ غەیری خودا كوفرو بێباوەڕییە.

## سوژدە رەمزی بەندایەتی هەموو گەلان بووە

خودا ئادەمیزادو جنۆكەی تەنها بۆ بەندایەتیو پەرستنو ملكەچیی خۆی دروست كردووە, هەر بۆیەش یەكەم قۆناغی ئاوێتە بوونی گیان و جەستەی باوەگەورەی ئادەمیزاد بە سوژدە دەستی پیٚ كرد ئەوی رازییە سوژدەبەرێت خودای لە خۆی رازیی كردو پەیمانی بەندایەتی نویٚ كردەوە, ئەویش سوژدەی نەبردو رەمزی شەڕەنگێزی و نەگبەتیو خراپەكاریو نازناوی شەیتانی كرایە مەدالیاو تەوقی ئاگرین لە گەردنی كرا.
هەر لەو روانگەیەشەوە یەكەم ئادەمیزاد كرایە پەیامبەر هەتا ئادەمیزادەكان چاو لە بابیان بكەن, چۆن پێغەمبەرەكان شاگوڵی باخی بوونەوەر بوون لە خواپەرستیدا, نەك هەر لەخوایاخییەك بڵیٚ بیٚ دینیم بە میرات بۆ بەجێماوە.

ڕشتەی بابو باپیری هەموو گەلو نەتەوەكان دەچێتەوە سەر ئادەمو باوەگەورەی هەموویان لە سوژدەبەرانو رەوانەكراوانی خودا بووە, دەبیٚ هەموو گەلەكانیش رێبازی

---

[1] سورة فصلت ٣٧.

[2] ج٢ ص١٨٦ صحيح وصايا الرسول.

[3] صحيح أخرجه مسلم ٨٣٢ , صحيح فقه السنة ج١ ص٢٦٥.

چاکی باوەگەورەیان زایە نەکەن و پەیڕەوی لێ بکەن. خودا دەفەرموێت: **"لَيْسُواْ سَوَاء مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ"**. (آل عمران: ١١٣). واتە: گشت وەکو یەك نین لە ئەهلی کتێب کۆمەڵی وا هەیە کە روو بە خودا دەوێستن و بە شەوا ئایەتانی خودا دەخوێننەوە سەر دەخەنە سەر سوژدە.

هەروەها خودا دەربارەی جیاوازیی خەڵکی و دووبەشبوونی گەلان بۆ خواپەرست و خۆپەرست یان سوژدەبەر و لووتبەرز و نمەك کوێر دەفەرموێت: **(أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ)** (الزمر: ٩). واتە: ئایا خراپەکاران پاکترن یان ئەوە لە دووتوێی شەوگاردا گەردنکەچ و بەرفەرمانەو لە سوژدەدایەو روو بەخوا بەپێوە وەستاوە و لە رۆژی پەسڵان دەترسێ و ئومێدی بە بەرزەیی پەروەردگار هەیە..).

لە فەرمودەی شیرینی پێغەمبەردا هاتووە کە چەند کەسێکی بەنی ئیسرائیلی چوونە سەر گۆرستان و داوایان لە خودا کرد مردووی فلان گۆڕیان بۆ زیندوو بکاتەوە، کاتێ نزایان گیرابوو گۆڕ شەقی بردو قلێشایەوە پیاوێکی لێ هاتەدەر شوێنەوارو نەقشی سوژدە لە ناوچەوانیدا دیار بوو.

## سوژدە تاکە پەرستنە لە رۆژی دواییدا ئەنجام بدرێت

دونیا خانەی هەوڵو تێکۆشانو کۆشش کردنو خەبات کردنو زەحمتکێشانە، هەموو ئەمانەش بۆ بڕوادار خواپەرستی و بەندایەتییە و پاداشتیان لەسەر وەردەگرێ، بەڵام بە دەرچوونی گیان لە جەستە هەموو ئەو ماندویەتییە کۆتایی دێتو مرۆڤ مەیدانی کردەوان بەجێ دێڵێو دەچێتە مەیدانی پاداشتو لێپێچینەوە، ئیتر هەموو دونیاو هەرچی لەسەر دووتوێی زەویدایە یەك سوژدە ناهێنێ ئەستەمە لەوێ ناوچەوانی بۆ لە زەوی بدرێتو تاقە کڕنوشێکیشی بۆ ئەنجام بدرێت، بە سوژدە هەموو کافرو بێ دینو دەغەڵ و دووڕوو جودا دەبنەوە لە بڕواداران‌و لە بێژنگ دەدرێن. ئەو کەسەی سەری بەرزی خۆیو ناوچەوانی بڵندی خۆی بۆ خودا نەبێت بۆ کەس لە زەوی نەدابیت ئەوێ رۆژیش بە ئاسانی لەگەڵ دەرچوونی فەرمانی خودا سەر دەباتە سوژدە، بەڵام بێبڕوا، هاوبەشدانەر، دووڕوو، ئەگەر دونیاو هەرچی لە نێوایدایە بیدات سوژدەیەکی بۆ نابرێتو خۆماندووکردنیشی لێ وەرناگرێ.

خودا دەفەرمویت: "يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ * خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ" (القلم: ٤٣). واتە: ئەوێ رۆژێ کە بەرئەژنۆ دەردەکەوێو نهێنی ئاشکرا دەبێت، بانگ دەکرێن بۆ سوژدەبردن ناتوانن. چاویان شۆڕە و زەبوونی و خەجالەتی دایاندەگرێ، بێگومان ئەمانە بانگێشتی سوژدە بردن دەکران ساغ و سەلامەتیش بوون، بەلام سوژدەیان نەدەبرد لە دونیادا.

لە فەرمودەی زولاڵ و شیرینی پێغەمبەریشدا (سەلاتو سەلامی خودای لێ بێت) بەم شێوەیە دەفەرمویت (عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ[1]...إذا كان يوم القيامة نادى مناد: ... فيخر سجداً أجمعون فلا يبقى أحد كان يسجد في الدنيا سمعة ولا رياءً ولا نفاقاً إلاّ على ظهره طبق واحد، كلما أراد أن يسجد خرّ على قفاه ....).[2] واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە (رەزای خودای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەلاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: کاتێك رۆژی دواییە جاڕدەرێك بانگ دەکات[3] تا دەفەرمویت هەموو بڕواداره راستەکان بە سوجدەدا دەچن، کەس نامێنێ کە لە دونیادا بە شان و باڵی خۆی یان بۆ رووپامایی یان بە دووڕوویی سوجدەی بردبێت بێگومان لەسەر پشت دەبێتە یەك پارچە، هەر کە بیەوێت سوژدەبەرێت بە پشتدا دەکەوێت.

## شوێنی سوژدە ئاگری دۆزەخیش نایسوتێنێ

ئادەمیزاد بە هەر ئەندامێکی لاشەی فەرمانی خودا ئەنجام بدات پێی دەوترێت پەرستن و بەندایەتی، ئەگەر ئەو باوەڕداره گوناهو تاوان و هەقی خەڵکی لەسەر بێت و بچێتە دۆزەخ هەموو لاشەی تەنانەت دڵیشی دەسووتێ وەکو خودا دەفەرمویت: "الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ". (الهُمَزَة: ٧) واتە: ئەو ئاگرە پڕتاو ئەداتە دڵ و دەروون. بەلام

---

[1] الجامع الصحيح من أحاديث النساء، ص٣٣.

[2] رواه البخاري ومسلم رقم ١٨٣، بڕوانە فەرمودەکە بە تەواوی لەم کتێبەدا لە باسی (بە سوژدە بڕوادار و دووڕوو لێك جودا دەبێتەوە).

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شوێنی کڕنوش لە ناوچەواندا ناسووتێ، چونکە بەرزیی خۆی کردۆتە قوربانی فەرمانی خودا لە دونیادا، خوداش لەوێ بەرزی و شکۆداری دەپارێزێ لە تین و تەوژمی ئاگر دەیپارێزێ.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال النبي ﷺ: "إذا فرغ الله من القضاء بين العباد وأراد أن يخرج من النار من أراد أن يرحم ممن كان شهد أن لاإله إلاّ الله، أمر الله أن يخرجوهم فيعرفوهم بعلامة آثار السجود، وحرم الله على النار أن تأكل من بني آدم أثر السجود فيخرجونهم قد امتحشوا، فيصب عليه من ماء بقال له ماء الحياة، فينبتون نبات الحبة في حميل السيل".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی (کاتێ خودا لە دادگایی و حوکمی نێوان بەندەکان دەبێتەوە و دەیەوێت لە دۆزەخ دەریبێنێ کەسانێك و بەزەیی پیایاندا بێتەوە لەوانەی شایەتی و پەسەندییان داوە کە هیچ پەرستراوێك بەهەق نییە بێجگە لە الله، خودا فەرمان ئەدات دەریان بێنن دەناسرێنەوە بە نیشانە و نەخشی شوێنەواری سوژدە، خودا حەرام و قەدەغە دەکات لەسەر ئاگر کە شوێنی سوژدە لە روخساری بەندەکانیدا بسووتێنێ، دەریان دێنن وەکو بزوت، ئاویان بەسەردا دەکەن لە ئاوی حەیات، دەبووژێنەوە وەکو ژیانەوە و چەکەرەکردنی تۆوی پاش لافاو).

سەفوانی کوڕی سولەیم لە زستاندا لەسەربانو لە هاویندا لە کوونی ژوورەوەدا بوو، کاتێ مرد (رەحمەتی خودای لێ بێت) نیشانەی لێ دەرکەوت: سوفیان دەفەرموێت: گۆڕهەڵکەنی مەدینە بۆی گێرامەوە وتی: گۆڕم بۆ پیاوێك هەڵدەکەن بەسەر گۆڕێکی تردا کەوتم جومجومەی کەللەی سەریم دەرهێنا شوێنەواری سوژدە نەخشی لە ئێسقانی کەللەی سەری کردبوو وتم ئەم ئینسانە! دەبێ کێ بێت؟ وتیان نازانی؟ ئەوە گۆڕی صەفوانی کوڕی سولەیمە.

هەروەها لە موحەممەدی کوڕی مەنسورەوە فەرموویەتی خەڵکی مەدینە دەڵێن: شوێنەواری سوژدە ناوچەوانی نیشانەدار کردبوو، ئاوسابوو.

حارسی غەنوی فەرموویەتی **"مرة"** (رەحمەتی خودای لێ بێت) ئەوەندەی سوژدە بردبوو ـ گڵ و خۆڵ و خاك ناوچەوانی خواردبوو, کاتێ مورڕە پیاوێکی خزمی خۆی لە

---

[1] رواه البخاري رقم (٧٠٠٠)، ومسلم رقم (١٨٢)، وجامع الصحيح من أحاديث النساء رقم ٨ / ص٣٢.

خەودا بینیبووی شوێنی سوژدەکەی وەکو ئەستێرەی پرشنگدار دەدرەوشایەوە, وتم ئەوە چییە بە روخسارتەوە؟ فەرمووی: ئەوە شوێنی سوژدەیە بە نور رازاوەتەوە.[1]

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "تأكل النار إبن آدم, إلا أثر السجود, حرم الله عز وجل على النار أن تأكل أثر السجود". صحيح**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیٚ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەلاٚتو سەلامی خوای لیٚ بێت) فەرموویەتی: (ئاگر هەموو لاشەی ئادەمیزاد دەخوات بێجگە لە شوێنەواری سوژدە, خوا حەرام و قەدەغەی کردووە کە ئاگر شوێنەواری سوژدە بخوات).

## خودا مژدە ئەدات بە سوژدەبەران

ئەوانەی سەری بەرزو ناوچەوانی بڵندی خۆیان بۆ کەس دانانەوێنن تەنها بۆ پەروەردگارو دروستکەری خۆیان نەبێت, تەوێڵی خۆیان لە خاكو خۆڵ هەڵدەسوون لە پێناوی رەزامەندیی خودای خۆیان، بێگومان باشترینو چاکترین کاریان ئەنجامداوە، حەقی خۆیانە خودا مژدەی رەزامەندیو لێبوردنو ژیانی خۆشیان پێببەخشێ لەگەڵ سەرجەم تەوبەکاران و خواپەرستانو سوپاسگوزارانو رۆژوەوانانو کڕنوشبەرانو هەموو ئەوانەی فەرمان بە چاکە دەکەنو ریٚ لە خراپە دەگرن و سنوورەکانی دینی خودا دەپارێزن.

سوژدەبەرانیش یەکێکن لەوانەی مژدەی خوداییان پیٚ دراوە, مافی رەوای خۆیانە شایستەن پیرۆزیان بێت، لە سورەتی (التوبة)دا خودا دەفەرموێت: (**التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدونَ الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ**) (التوبة: ١١٢). واتە: ئەوانەی ئەو سەوداو مامەڵەیان لەگەڵ خوادا کردووە ئەمە سیفەتیانە: تەوبەکارن, خواپەرستن, سوپاسگوزارن, گەشتیارو گەڕۆکن یان (رۆژوەوانن) کڕنوشبەرو سوژدەبەرن واتە (نوێژ دەکەن) فەرمان بە چاکە دەکەنو رێگە لە خراپە دەگرنو مزگێنی بدە بە باوەڕداران (ئەوانەی خاوەنی ئەو سیفەتانەن).

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٤٣٣

[2] رواه البخاري رقم (٧٠٠٠)، ومسلم رقم (١٨٢)، سلسلة الأحاديث الصحيحة ٢٩٠٥

**ئەو مژدە خودابیە لە سێ لەو سیفەتانەدا نوێژخوێنان دەگرێتەوە:**

ـ العابدون: خواپەرستان کە سەری هەموو خواپەرستیەکان نوێژکردنە.

ـ الراکعون: کڕنوشبەران, ئەوانەی لەبەر فەرمانبەری خودا بە چۆکدا دەچن و دەچۆمێنەوە.

ـ الساجدون: سوژدەبەران، ئەوانەی ناوچەوانی بەرزو بڵندی خۆیان دەنێنە سەر زەوی بۆ پەروەردگاری خۆیان.

## سوژدە هۆکاری لێخۆشبوونی خودایە

خودای گەورە سوژدەبەرانی خۆش دەوێت و بەخشش و دیاریی رەمزی خۆشەویستییە لە نێوان دوو کەس یان دوو لایەن، هەر بۆیەش خودای پەروەردگار چەندەها بەخششو دیاریی ناوازەو سەنگینی بۆ دۆستو خۆشەویستانی خۆی بڕیار داوە، دیارترینو گەورەترینی ئەو بەخششو دیارییانە لێخۆشبوون و چاوپۆشیی خودایە لە کەموکوڕیو تاوانو ناتەواوی ئەو مرۆڤە بڕوادارو سەربەرزانەی ناوچەوانی بڵندو تەوێڵی بەرزو باڵای خۆیان لە بەرامبەر خوداوەندی خۆیان لەسەر زەوی داناوە بە ئازادی و ویستی خۆیان.

**(وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُواْ حِطَّةٌ وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيئَاتِكُمْ سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ) (الأعراف: ١٦١)**. واتە (لەبیرت بێ) ئەو کاتەی کە پێیان وترا: لەو شارە کە **(قدس)**ە نیشتەجێ بن لە هەر لایەك هەر چیتان دەوێت بیخۆن داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن و بڵێن پەروەردگارا لێمان خۆش بەو گوناهمان لێ هەڵوەرێنە و لە دەروازەی شار سەر بە سوژدە بچنە ژوورەوە، ئیتر هەر هەڵەیەکتان هەیە دەتان بەخشین و پاداشتی زیاترو زیاترتان ئەدەینەوە.

هەروەها لە سوڕەتی **(البقرة)**دا لە ئایەتی (٥٨)دا خودای گەورە هەمان بابەت دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێت: **(وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُواْ هَـذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ**

**الْمُحْسِنِينَ)**. واتە: کاتێك وتمان بڕۆنە ئەو شارە کە (قودسە) بە کەیفی خۆتان ئەوەی حەزتان لێیە بیخۆن, لە دەروازەی شار سەر بە سوژدە بچنە ژوورەوەو داوای لێخۆشبوون بکەن لە خودا، ئەویش لێتان خۆش دەبێت و پاداشتی زیادەش دەداتە چاکەکاران.

هەروەها لە سورەتی (النساء)دا دەفەرموێت: **(وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ الطُّورَ بِمِيثَاقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُلْنَا لَهُمْ لاَ تَعْدُواْ فِي السَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقاً غَلِيظاً)** (النساء: ١٥٤). واتە: بۆ چەسپاندن و جێگیربوونی پەیمانەکە کێوی تووڕمان بەرز کردەوە بە سەریانداو پێمان وتن لە دەروازەی شاری قودسەوە سەر بە سوژدە بچنە ژوورێ و پێمان وتن نابێ لە ڕۆژی شەممەدا دەستدرێژیت لێ رووبدا و سنوور مەبەزێنن پەیمانێکی پتەومان لێ وەرگرتن.

داودی (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس خوا یەك چاکەی لێوەرگرێ ئیتر سزای نادات، بۆیە شێخ حەسەنی بەسری (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: خۆزگە دەمزانی بە مەعلومی کە خوا یەك سەجدەی لێ گیرا کردبم.[١]

## سوژدە هەر بۆ خودایە

هیچ جۆرە پەرستنێك بۆ غەیری خودا دروست نییە بە تایبەت سوژدە کە کاکڵەو ناوکرۆك و چەقی هەموو پەرستنەکانە.

خودا لەم بارەیەوە دەفەرموێت: **"فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا"**. (النجم: ٦٢). واتە: دەسا هەر بۆ خودا سوژدەبەرن و بیپەرستن.

**روى إبن حبان عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: (ما ينبغى لأحد أن يسجد لأحد, ولو كان أحد ينبغى له أن يسجد لأحد لامرت المرأة أن تسجد لزوجها لما عظم الله من حقه)**.[٢] واتە: ئیبن حەببان لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویەتییەوە (ڕەزای خودای لێ بێت: کە پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای

---

[1] رهبان الليل ج١، ص١٦٧.

[٢] رواه البيهقي في السنن الكبرى رقم (١٤٤٨١)، حسنه الألباني في ارواء الغليل برقم ١٩٩٨. والجامع الصحيح من أحاديث النساء ص١١٨. رواه أحمد باسناد جيد ارواء الغليل ٧/ ٥٥. (ونيل الاوطار ٦/ ٢٢٣).

لیٚ بیٚت) فەرمووویەتی: دروست نییە بۆ هیچ کەس سوژدەبەریٚت بۆ کەسیٚکی تر, خۆ ئەگەر بۆ تەنها کەسیٚك دروست بوایە سوژدەبەریٚت بۆ کەسیٚکی تر فەرمانم دەکرد بە ئافرەت سوژدەبەریٚت بۆ هاوسەرەکەی لەبەر گەورەیی مافی پیاو بەسەر هاوسەرەکەیەوە.

لە ئیسلامدا هەموو کەس دەبیٚت ملکەچ و گویٚڕایەڵ و گویٚ لە مشتی فەرماندەو کاربەدەستی خۆی بیٚت لە خیٚزانیشداو لە نیٚوان ژن و میٚردیشدا پیاو فەرماندەو گەورەو میری خیٚزان و ماڵی خۆیەتی، بۆیە دەبیٚت فەرمان بەجیٚ بیٚت تا شیرازەی خیٚزان تیٚك نەچیٚت و نەژاکیٚت و داستانی خۆشەویستیی نیٚوان ژن و میٚردو منداڵ و دایك و باوك لە بەین نەچیٚت و لە جیٚگەی خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی چەند ساڵە رق و خەشم و قین ریشە دانەکوتیٚ لە ناو تاکەکانی کۆمەڵگەدا.

**وروى الإمام أحمد أيضا عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: (لايصلح أن يسجد لبشر, ولو صلح لبشر أن يسجد لبشر لأمرتُ المرأة أن تسجد لزوجها من عظم حقه عليها".** [1] واتە: پیٚشەوا ئەحمەد (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚت) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خودای لیٚ بیٚت) کە پیٚغەمبەری خودا (سەلاٰتو سەلامی خوای لەسەر بیٚت) فەرموویەتی: ناگونجیٚ بۆ هیچ مرۆڤیٚك سوژدەبەریٚت بۆ مرۆڤیٚکی تر خۆ ئەگەر بگونجایەو دروست بووایە مرۆڤیٚك سوژدە بۆ مرۆڤیٚکی تر بەریٚت فەرمانم بە ئافرەت دەکرد کڕنوش بۆ هاوسەرەکەی بەریٚت لەبەر ئەو مافە گەورەی پیاو بەسەر هاوسەرەکەیەوە هەیەتی.

**"إبن الجوزي"** (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) لە تەفسیرەکەیدا (زاد المسیر)دا دەفەرمویٚت **(وأن المساجد لله)** بە چوار شیٚوە تەفسیر کراوە یەکیٚکیان **(وأخلصوا له ولا تسجدوا لغيره).** [2] واتە: تەنها دڵسۆزی خوا بن‌و سوژدە بۆ جگە لە ئەو ئەو مەبەن.

---

[1] رواه أحمد رقم (١٢٦٣٥)، والنسائي في سننه الكبرى رقم (٩١٤٧)، الجامع الصحيح من أحاديث النساء، ص١١٨.

[2] زاد المسير، ج٨ / ص١٣٤.

## پابەند بوون بە سوژدەگاوە نیشانەی ئیمانە

سوژدەگا و بەردەنوێژ و بەرماڵ و کاتی نوێژو مزگەوت کە هەریەکەیان لە شێواز و قاڵبێکدا سوژدەگای بڕواداران زۆر پیرۆزن لە لای خوداو لە لای بەندەکانی خودا. دانیشتن و چاوەڕوانی نوێژ و پەرستن لە هەر کامیاندا وەکو نوێژکردن وایەو هەمان خێرو پاداشتی هەیە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: (لايزال أحدكم في الصلاة مادامت الصلاة تحبسه لايمنه ان ينقلب الى اهله إلا الصلاة) متفق عليه.**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: بەردەوام هەریەکێ لە ئێوە لە نوێژدایە کە سوژدەگاکەی بەجێ نەهێڵێ و چاوەڕوانی نوێژ بکات، هیچ شتێك ڕێی گەڕانەوە ماڵەوەی لێ نەگرێت نوێژ نەبێت.

**وعن أنس (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ أخر ليلة صلاة العشاء الى شطر الليل ثم أقبل علينا بوجهه بعد ما صلى فقال: (صلى الناس ورقدوا ولم تزالوا في الصلاة منذ انتظرتموها).**[2] واتە: لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) شەوێکیان نوێژی خەوتنانی دواخست بۆ نیوەی شەو، پاشان رووی تێ کردین دوای نوێژەکەی و فەرمووی خەڵکیی نوێژیان کردو خەوتن بەردەوام ئێوە لە نوێژدا بوون ئەوەتی چاوەڕێ دەکەن.

## سوژدە دروشم و مەشخەڵی زانایانە

خوا لە هەموو جۆرەکانی بەندایەتی زیاتر خۆشیی لە کڕنوش دێت، چونکە ئادەمیی ئەوپەڕی بەندایەتی و دڵسۆزی خۆی لە کڕنوشدا دەنوێنێ، کاتێك سەری بەرزو بڵندی نەوی دەکات و لەسەر زەوی ناوچەوانی لەو خۆڵە وەرئەدات کە ڕۆژانە بە سەریدا دەڕوات و بە کردەوە دەیسەلمێنێ کە چۆن ئەو زەوی و خاك و خۆڵە ڕاخراوەو تەخت کراوە من بە سەریدا بڕۆم و منیش زەوی ئاسا خۆم ڕاخست و ملکەچ و گەردنکەچی فەرمانی خودای خۆمم، لێی دروست بووم دەچمەوە نێوی و جارێکی تریش لە ناویدا

---

[1] متفق عليه، البخاري رقم (٦٢٨)، ومسلم رقم (٦٤٩)، ورياض الصالحين، رقم ١٠٦١.

[2] رواه البخاري رقم (٦٣٠)، ورياض الصالحين، رقم ١٠٦٣.

دەبووژێمەوەو چەکەرە دەکەم و سەر هەڵدەدەمەوە. لەناو ئادەمیزادەکاندا زانایان میراتگری رەسەن و راستەقینەی پێغەمبەرەکانن، بۆیە چاکترین بەندایەتی و پەرستنیان کردۆتە دروشم و مەشخەڵی رێگای سەختی بەرەوخوا چونیان و رێگەی سەخت و سامناکی نێوان دونیاو دوارۆژیان پێ نزیك و ئاسان کردووە و رێگەی هەزار بە هەزاری دوارۆژیان پێ تەی کردووە. خوا دەفەرموێت: "**(إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرّاً وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ)** (فاطر: ٢٩). واتە: بێگومان ئەوانەی قورئان دەخوێننەوەو نوێژەکانیان بە چاکیی دەکەنو لەو رۆزییەی خوا پێی بەخشیون دەبەخشن بە ئاشکراو نهێنی بە ئومێدی بازرگانییەکن کە هەرگیز نائومێدو دەستخەڕۆ نابن.

خودا دەربارەی سوژدەی زانایان دەفەرموێت: **(أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ)**. **(الزمر: ٩)**. زانایانی راستەقینەو خواپەرست, خودا سەری بەرز کردنەوەو بونە ئەستێرەو ئاسمانی خەڵکیان رازاندۆتەوە، جێگەو شوێنی حەوانەی خۆیان لە ئاسمانی خەڵکیدا بینیوە، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە وەسفی زانایانی ئومەتەکەی دەفەرموێت: **(علماء أمتي كالنجوم)** واتە (زانایانی ئوممەتم وەکو ئەستێرەن). ئەستێرەش، قەتادە (رەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: بۆ سێ شت رەخساون و **(زينة السماء, رجم الشياطين, هداية الضالين)** واتە: رازاندنەوەی ئاسمان, بەردبارانکردنی شەیتانەکان, چاوساغی رێ لێونبووان).

هەر بۆیە خودا دەربارەی زانایانی پێش ئیسلام دەفەرموێت: **(قُلْ آمِنُواْ بِهِ أَوْ لاَ تُؤْمِنُواْ إِنَّ الَّذِينَ أُوتُواْ الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّداً)**. **(الإسراء: ١٠٧)**. واتە: بڵێ ئێوە بڕواتان پێی بێ یان نەبێ ئەو کەسانەی زانیارییان هەبوو ئاگاداربوون لە پێش قورئان و یان لە پێش (پێغەمبەر)دا هەرکات بۆیان بخوێنرێتەوە بە رووردا گەردنکەچ دەکەنو سەری نەوازش دەخەنە سەر زەوی و سوژدە دەبەن.

ئەبویەکر کوڕی عەییاش (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی (حەبیبی کوڕی ئەبی **ثابت**)م بینی لە سوژدەدا, ئەگەر تۆ بتبینیایە ئەتوت مردووە, واتە لە درێژیی ماوەی سوژدەکەی.

هەروەها **عەبدولجەبار** کوڕی **نضری** سوللەمی فەرموویەتی: پیاوێك لە خانەوادەی موحەممەدی کوڕی سیرین قسەی بۆ کردم وتی: (مسلم)ی کوڕی بەشارم بینی سەری لە سوژدەبەرز کردەوە لە مزگەوتی (جامع) لە شوێنی سوژدەکەی ورد بوومەوە هەروەکو ئاویان بەسەر سەریا قلّپ کردبێتەوە ئەوەندەی فرمێسك داباراندبوو، سوفیانی سەوریی (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) فەرموویەتی: گۆڕهەلّکەنێك بۆی باسکردم لە گۆڕهەلّکەنەکانی مەدینە، وتی: گۆڕم بۆ پیاوێك هەلّکەند کەللەسەری مردوویەك دەرکەوت سوژدە کاری لە ئێسکی سەری کردبوو لە کەسێکم پرسی ئەمە گۆری کیّ یە؟ وتی: بۆ نازانی ئەوە گۆڕی (سەفوانی کوڕی سەلیم)ە.[١]

**قال الأعمش: (كان إبراهيم التيمي إذا سجد, كأنه جزم الحائط ينزل على ظهره العصافير)**[٢]. واتە: ئەعمەش فەرموویەتی: کە ئیبراهیمی تەمیمی سوژدەی دەبرد دەتوت پادیوارە چۆلەکە لەسەر پشتی دەنیشتەوە.

**قال علي بن بكار فيقول: "منذ أربعين سنة ما أحزنني الا طلوع الفجر"**.[٣] واتە: عەلی کوڕی بەکار (ڕەحمەتی خوا لیّ بیّ) دەیفەرموو: "**ماوەی چل سالّە هیچ شتێك** خەفەتباری نەکردووم تەنها هەلّهاتنی سپێدەی بەیانی نەبیّ".

یەکیّ لە زانایان دەربارەی خواپەرستیی زاناکان دەفەرموێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا **(وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَقِيَاماً). (الفرقان: ٦٤). "كان ليلهم خير ليل يفترشون وجوههم.."**.[٤] واتە: (ئەوانەی شەو بۆ خوا لە سوژدەدانو بە پێوەن). شەوی ئەوان باشترین شەوە روخساریان رادەخەن.

**وكان الحسن (رحمه الله): "يصلى قائما فإذا عي صلى قاعدا فإذا فتر صلى مضطجعا"**.[٥] واتە: شێخ (حەسەنی بەسری) (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) بەپێوە نوێژی دەکرد کە ماندوو دەبوو بە دانیشتنەوە کە پەکی دەکەوت بە راکشانەوە نوێژی دەکرد.

---

[١] صلاح الأمة ج٢ ص٣٩٨.

[٢] صلاح الأمة ج٢ ص٣٩٣.

[3] رهبان الليل خ٢، ص٥١.

[4] رهبان الليل ج٢، ص٤٣٨.

[5] رهبان الليل ج٢، ص٤٣٩.

**أن سفيان بن عيينة أبي محمد رحمه الله)) كان يقول: "إذا كان نهاري نهار سفيه وليلى ليل جاهل فما أصنع بالعلم الذي كتبت".**[1] واته: سوفیانی كوڕی عوییینه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: "ئەگەر ڕۆژەكەم وەك ڕۆژی بێعەقڵو شەوەكەم وەك شەوی نەفام بێت ئەی چیم بەو زانستە كردووە كە نوسیومەتەوە".

**"شتان بين مدمن الخمر ومدمن القيام الليل".** واته: سەرمەستی شەونوێژو سەرمەستی عارەق زۆر جیاوازن.

**عبدالعزيز بن أبي داود (رحمه الله)) "كان يفرش له الفراش فيضع يده عليه ويقول ما الينك ولكن فراش الجنة الين منك، ثم يقوم الى صلاته".**[2] واته: عەبدولعەزیزی كوڕی ئەبی داود (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) جێگای بۆ ڕادەخراو ئەویش دەستی لەسەر جێگاكەی دادەناو دەیفەرموو چەند نەرمونۆڵی، بەڵام بەڕاستیی پێخەفی بەهەشت لە تۆ نەرمونۆڵترە، ئینجا هەڵدەستاو دەستی دەكرد بە نوێژكردن.

## سوژدەبردنی پێغەمبەرەكان

پێغەمبەرەكان (سەلامی خوایان لێ بێت) هەموو ڕێ و شوێنێكی گونجاویان گرتۆتە بەر بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خودا. ئەگەر ڕەزامەندیی خوایان لە چوونە نێو ئاگردا بینیبێت زۆر بە خۆشحاڵییەوە باوەشیان بۆ ئاگركردۆتەوە و وەك پەروانە خۆیان تێ فڕێداوە, یان ئەگەر لە غەریبنشینی و دوورەوڵات و بەجێهێشتنی نیشتمان و وڵات و خێزان و ماڵ و منداڵ و تەنانەت سەربڕینی جگەرگۆشەی خۆشیاندا ڕەزامەندیی خودایان بەدی كردبێت خۆیان لێ نەبواردووە و پڕ بەدڵ و بە سنگی فراوان و زەردەخەنەی شادییەوە پێشوازییان لێ كردووە. سوژدەش لە پێشەنگی پەرستشەكانەوەیە، بۆیە پێغەمبەرەكان كردویانەتە ویردی سەر زمان و كاڵای باڵای خۆیان و بە جوانترین شێوە و بە باشترین جۆری خواپەرستییان ئەنجام داوە.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) لە سوژدەدا دەیفەرموو: **"سجد لك سوادي وخيالي وآمن بك فؤادي وابوء بنعمتك علي، هذا يدي وما جنيت على**

---

[1] رهبان الليل ج١، ص٥١٢.

[2] رهبان الليل ج١، ص٥٢٣.

**نفسي"**.[1] واته: خوایه سوژده بۆ تۆ دەبا لەشو خەیاڵمو بڕوای بە تۆیە دڵو دەروونم، دان بە بەهرەکانتان دەنێم بە سەرمەوە، ئەوە دەستمو هەموو ئەو تاوانانەش کە هێناویێتی بەسەرمدا.

خودا دەربارەی کڕنوشی پێغەمبەرەکان دەفەرموێت: **(أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ من ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسرائيل وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا إذا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَن خَرُّوا سُجَّداً وَبُكِيّاً) (مريم: ٥٨)**. واتە: ئەوانەی خودا بەهرەگەلی خۆی بە سەردا رشتن لە تەواوی پێغەمبەران لە نەوەی ئادەم و لەوانەش لەگەڵ نوح هەڵمان گرتن و نەوەو وەچەکانی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەش شارەزاو ڕێنوێنیمان کردن هەڵمانبژاردن, هەرکات نیشانەی خوایان بەسەردا خوێنرایەوە بە ڕوودا بە کڕنوشدا دەهاتن و بە کوڵ دەگریان.

## سوژدە بردن سیفەتی بڕوادارانی ڕاستەقینەیە

بڕواداری ڕاستەقینە لە هەرکات و شوێنێك ڕەزامەندیی خودا بەدیی بکات و هەستی پێ بکات هەوڵی بەدەست هێنانی ئەدات و گوێ بە ماندوبوونی لاشەو گلەیی و تانەو تەشەری نەیارانی نادات و لەو ڕێگەیەدا هەست بە ماندویەتی شەکەتی ناکات و دەروون و گیانی ئاسوودە دەکات بە ئەنجامدانی هەر کارو کردارو گوفتارێك کە ڕەزامەندیی پەروەردگاری لێ بەدەست بێنێت, ئەگەر سەری بەرز و تەوێڵی بڵندیشی پێ بخاتە سەر زەوی کە بێجگە لە خودا بە لای بڕواداری ڕاستەقینەوە کەس شایستەی سەر بۆ خەواندن نییە.

بڕواداری ڕاستەقینە ئەو گەردنە شکۆدارەی سەری بەرزو بڵندی ئەوی هەڵگرتووە ئامادە نییە لە بەرامبەر هەموو دونیاو هەرچی لە نێوی دایە و لە بەرامبەر هەڕەشەو شیرو تیری هیچ ستەمکارێك و هیچ فیرعەون و نەمرودێکدا بینێتە سەر زەوی, نە ماڵ و سامان، نە پڕی گیرفان، نە پەیمان و بەڵێنی دەستبڕان، نە چاوبەست و جادووی جادووگەران, ئافرەتی جوان, هاوڕێی سەر سفرەو خوان, بتی بەستەزمان زەرق و بریقی

---

[1] رواه إبن نصرت والبزار رقم (٢٠٣٤) ـ والحاكم ـ وصححه الألباني في صفة الصلاة، رهبان الليل ج١، ص٣١٨ـ ٣١٩).

ژیان, بەسەنگی ئەرزو ئاسمان, گرتن و لێدان، پەت لە گەردن ئالآن، سەری پێناخەنە سەر زەوی بۆ غەیری پەروەردگاری ئەرزو ئاسمان. لەسەر داری سێدارەو دوای مردنیش دەبێت سەرو ناوچەوانی ئەو لە هەمووان بەرز و باڵاتر بێ، وەکو شاعیر دەڵێ:

**علوا في الحياة وفي الممات        والله انك لأحدى المعجزات**

واتە: بە زیندووی و لە ژیاندا سەرت بەرز بوو، بە داری سێدارەشەوە هەر سەرت بەرزە.

سوێند بە (الله) تۆ یەکێکی لە شتە سەرسامکەرەکان و شتە ناوازەکان.

خودا دەفەرموێت: **"التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدونَ الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ" (التوبة: ١١٢)**. واتە: (تەوبەکاران و خواپەرستان و سوپاسگوزارن و رێبوارە دونیاگەڕەکان و کڕنوشبەرو سوژدەبەران و ئەوانەی فەرمان بە چاکە دەکەن و رێگە لە خراپە دەگرن, پارێزگاریی لە سنووری خودا دەکەن و سنووری نابەزێنن، مژدە بدەرە بڕواداران).

## بە سوژدەبردن خوا وەسفی گەلانی خاوەن کتێبی ئاسمانی کردووە

ئەو گەلانەی بەرنامەی خودایان بۆ هاتووەو پێغەمبەریان بۆ رەوانە کراوەو پەیڕەویان لە دینی خوا کردووەو هەزاران فەرمانی خودایان جێبەجێ کردووە و خۆیان پاراستوەو خەبات و جیهادیان کردووەو خوێنیان رشتوە ماڵو سامانیان بەخشیوەو هەزاران ساردی و گەرمی و شەونخونی و تاڵی و سوێریی ژیانیان چەشتووە بۆ چەسپاندنی دینی خودا, بزانە خودا بە کڕنوش بردن بە سوژدەبردن وەسفیان دەکات و دەیکاتە هەوێنی کارەکانیان و رەمزی خەبات و پابەند بوونیان بە دینی خوداوە، خودای گەورە دەفەرموێت: **"لَيْسُواْ سَوَاء مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ"**. (آل عمران: ١١٣) واتە: یەکسان و چوونیەك نین ئەوانەی کتێبیان پێدراوە کەسانی وایان تێدایە لە بەرامبەر خودای خۆیاندا دەوەستن بە پێوەو ئایەتەکانی خودایان دەخوێننەوەو جێبەجێیان دەکەن و سوژدە دەبەن.

## سوژده نەبردن یاخی بوونە لە خوا

سوژدە کە بەرزترین و پیرۆزترین و کاکڵەو ناوەڕۆکی پەرستنەکانەو پڕ واتاترین کۆڵەکەی نوێژە و بەبێ سوژدە هیچ خواپەرستییەك، لە پێشەنگی هەمووشیاندا نوێژ هیچ سەنگ و مانایەکی نییەو وەرناگیرێ و لە جێی پاداشت سزا بە خاوەنەکەی دەدرێ و پەرستنەکان بێ بایەخ و پوچەڵ دەبن و بڕشتیان نابێ و سوود بە دونیاو دوارۆژی خاوەنیان ناگەیەنن و بەڵکو دەبنە رەنجەڕۆ و مایەپوت.

دەبێ کەسێك ئەو پەرستنە گەورەیە پشتگوێ بخات و بەبێ هودە سەیری بکات و فەرمانی خوداو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرامۆش بکات و خۆی لە تەواوی بوونەوەرو دروستکراوەکان هەڵاوێرێ لە خودا یاخی نەبوبێت، شەیتان تەنها یەك جار لە درێژایی ژیانیدا فەرمانی خودای شکاند لە ئەنجامدانی یەك سوژدەدا بە گوێی نەکرد، خوای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم پێغەمبەردا دەربارەی دەفەرموێت: **"يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيّاً"**. (مريم: ٤٤). واتە: بابە! شەیتانێ مەپەرستە، بەڕاستیی شەیتان لە خوای یاخی بووە. بۆ لە سوژدەبردنێکدا بە گوێی خوای نەکرد.

ئەدی ئادەمیزادێك لە شەوو رۆژێکدا (٣٤) سی و چوار جار خودا داوای سوژدە بردنی لێ دەکات ئەگەر بێ گوێی بکات یاخی نەبووە؟ ئیدی یاخی بوون چییە؟

لەم روانگەیەوە خەلیفە عومەری فاروق دەڕوانێتە بکوژەکەی و دەفەرموێت: **(الحمد لله الذي لم يجعل قاتلي يحاجني عندالله بسجدة سجدها له قط..)**.[١] واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی وای کردووە بکوژی من لە لای خودا نەتوانێ بەڵگەم لەسەر بێنێتەوە کە هەرگیز سوژدەیەکی بۆ خوا بردبێت.

## سوژدە لە کاتی تەنگانە و تەنگ پێ هەڵچنینی دوژمناندا

ئادەمیزادی ژیرو خاوەن عەقڵ و کەماڵ لە تەنگانەدا هاناو پەنا بۆ دۆست و خۆشەویستانی دەبات و سەر بە کۆشی خزم و خۆشەویستانیدا دەکات. بڕواداریش لە

[١] صلاح الأمة، ج٦/ ص٥٩.

هەموو خزم و دۆستان نزیكترو خۆشەویستتر بەلایەوە خودای گەورەیە، لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەكدا پەنای بۆ دەبات و رووی تێ دەكات, هەر كەسیش لە خۆشییدا و لە حاڵەتی ئاسایدا خودای لە بیر بێت، خوداش لە كاتی تەنگانەو بێ دەرەتانیدا بە هانایەوە دەچێت و دەرووی خێری لێ دەكاتەوە.

باشترین جۆری پەنابردنیش بۆ خودا سوژدەبردنە، لە كاتی تەنگانەدا، شالاّوی دوژمن، دڵتەنگی، خەمۆكی، دڵەڕاوكێ، خەم و پەژارە، خەفەتباری، كۆست كەوتن، كرداری نابەجێ و گوفتاری ناشایستەی نەیاران، وتەی ناشرین و ناپەسەندی هەرزەو هەست مردوو و ویژدان نەخۆش و دڵ بەزیوان.

لە كاتی دەستوەشاندنی دۆستانی شەیتان لە مرۆڤ و جنۆكەكان، پەنا بۆ خودا بەرەو ئەو هاناو پەنابردنەش لە دیمەنی سوژدەدا دەربڕە بۆ پەروەردگارت، بزانە ئەو سوژدەبردنە سوننەتی پێغەمبەرەكەتە (سەلامی خوای لێ بێت).

خواش فەرمانی بە پێغەمبەرمان كردووە لە كاتی تەنگانەو دڵتەنگیدا پەنا بۆ پەروەردگاری بەرێو سوژدە بۆ خودا بەرێت وەكو فەرموویەتی: **"وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ * فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ". (الحجر: ٩٧ ـ ٩٨).** واتە: بێگومان ئێمە دەزانین و ئاگادارین كە تۆ دڵتەنگ دەبێت بە وتەو گوفتاری گاڵتەجاڕی ئەوان (كافران) پەسەندی و بێگەردی پەروەردگارت دەربڕە بە سوپاسگوزاری و لەسوژدەبەران بە.

هەروەها تەنگەشەو تەنگ پێ هەڵچنینی كافران و نەیاران لە كاتی لێشاو و لافاوی خەم و پەژارە و دڵتەنگیدا پەنا وەبەر نوێژێ بەرە، سوژدەش پایەی سەرەكی نوێژە، چونكە پێغەمبەر لە حاڵەتی نائاسایی و تەنگانەو ناڕەحەتییدا پەنای بردۆتە بەر نوێژكردن.[1]

**عن عبدالله بن سلام ﵁ قال: كان النبي ﷺ: إذا نزل بأهله الضيق أمرهم بالصلاة ثم تلا (وأمر أهلك بالصلاة وآصطبر عليها).**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی

---

[1] أيسر التفاسير ج٣ / ص٩٦.

[2] أخرجه الطبراني في الأوسط رقم ٨٨٦, وقال الهيثمي في المجتمع ١١١٧٣ رجاله الثقات، والصبر في القرآن والسنة الصحيحة ص١٨.

سەلامەوە (ڕەزای خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: پیّغەمبەر (سەڵاّتو سەلامی خودای لیّ بیّت) هەر کات تەنگەژەیەك رووی لە خیّزانی بکردایە فەرمانی پیّدەکردن نویّژ بکەن، پاشان ئەم ئایەتەی خویّندەوە (فەرمان بە خانەوادەت بکە نویّژ بکەن و خۆڕاگرین لەسەر نویّژکردن).

عومەری کوڕی خەتتابیش (ڕەزای خودای لیّ بیّت) دەفەرمویّت: (**إذا صلى من الليل ثم فرغ قرأ هذه الآية) وأمر أهلك بالصلاة وآصطبر عليها**). واتە: کە شەونویّژی دەکردو لیّ دەبووەوە ئەگەر ترس و بیم دایگرتایە ئەم ئایەتەی دەخویّندەوە (فەرمان بە خانەوادەت بکە نویّژ بکات و لەسەری خۆڕاگر بیّت).

**وکان عروة (رضي الله عنه) إذا رأى شيئا من الدنيا جاء الى أهله فقال الصلاة, الصلاة ثم قرأ (وأمر أهلك بالصلاة واصطبر عليها)**.[1] واتە: لە عوروەوە (ڕەزای خودای لەسەر بیّت) ئەگەر بیزانیایە لەلایەکەوە دونیا رووی لە خانەوادەی کردووە دەیفەرموو: نویّژ، نویّژ، پاشان ئەو ئایەتەی دەخویّنەوە: (فەرمان بە خانەوادەت بکە بە نویّژ و خۆڕاگری لەسەری).

**إبن كثير** (ڕەحمەتی خودای لیّ بیّت) دەفەرمویّت لەسەر راڤەی ئایەتی (٩٧ ـ ٩٨) سوڕەتی الحجر: یادی خودای بکە پەسەندیو پاك و بیّگەردی خودا دەربڕە و بیپەرستەو سوپاسگوزاری بکە بە نویّژکردن.[2]

**وقال: كان رسول الله ﷺ (إذا حزبه أمر صلى)** واتە: **إبن كثير** (ڕەحمەتی خودای لیّ بیّت) فەرموویەتی: پیّغەمبەری خودا هەر کات شتیّك تەنگی پیّ هەڵچنییایە نویّژی دەکرد.

## فریشتەکان داوای لیّخۆشبوون و بەزەیی خودا دەکەن بۆ ئەو کەسەی پابەندی سوژدەگایە

خودا خۆشی دیّ لەو بڕوادارەی لەسەر بەرماڵ و سوژدەگاکەی خۆی دەمیّنیّتەوە لە دوای نویّژو بەجیّ ناهیّڵیّ، بەڵکو هەر لەو شویّنە پیرۆزەو خۆی سەرقاڵی نزاو پاڕانەوەو یادی خودا دەکات:

[1] أخرجه الطبري في جامع البيان رقم ١٨٤٥٧ / ١٨٤٥٨

[2] تفسير القرآن العظيم ج٣ / ص٥١٣

یان هەر لە سوژدەگاکەی روو بە قیبلە دادەنیشێ و بە دانیشتنەکەش پاداشتی بۆ دەنووسرێ و فریشتەکان داوای لێخۆشبوون و بەزەیی خودای بۆ دەکەن.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال (الملائكة تصلي على أحدكم مادام في مصلاه الذي صلى فيه مالم يحدث تقول: (اللهم اغفر له, اللهم ارحمه).**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ بێت) پێغەمبەری خودا (سەلامی خوا لێ بێت) فەرمووی (فریشتە داوای لێخۆش بوون و بەزەیی خودا دەکەن بۆ هەر یەکێ لە ئێوە کە بە دەستنوێژەوە لە سوژدەگاکەیدا بمێنێتەوە تا دەستنوێژی هەبێت: دەڵێن خودایە لێی خۆشبە، خودایە بەزەییت پێیدا بێتەوە.

[1] رواه البخاري رقم (٤٣٤)و(٦٢٨)، ومسلم (٦٤٩)، ورياض الصالحين رقم ١٠٦٢.

# كڕنوش "چەمینەوە"

## ( كڕنوش ) چەمینەوە پایەی سەرەكیی نوێژە

چەمینەوە لە نوێژدا پایەو كۆڵەكەی سەرەكی و بنەڕەتی نوێژەو نوێژ بەبێ چەمینەوە سەر ئەژنۆ هیچ مانایەكی نییە و پاداشتیشی لەسەر وەرناگیرێ بەڵكو بە پێچەوانەوە سزاو ئازار چاوەڕێی ئەو كەسە دەكات كە پایەی نوێژ كە كڕنوشە لە نوێژەكەیدا وازی لێ دێنێ و ئەنجامی نادات، تەنانەت دەچێتە ریزی نوێژنەكەران و حیسابی ئەوانی بۆ دەكرێت لە دونیاو دواڕۆژدا ـ بەڵكو دەبێتە ماندوی رەنج بە خەسار و مایەپوچی دونیاو دواڕۆژ.

## كڕنوش لە نوێژدا رەمزی گوێڕایەڵییە بۆ خوا

ئادەمیزاد كاتێك جاڕ ئەدات كە بە دڵ و گیان و زووبان بە كردەوەی ئەندامەكان باوەڕی هێناوە بەخودا و تەسلیمی ئەو بووە و بەڵێنی پێداوە خۆشی و ناخۆشی و تاڵی و شیرینی ژیان و شایی و شین و مامەڵەو كڕین و فرۆشتن تەواوی قۆناغەكانی ژیانی دونیای بە وردو درشتەوە لە چوارچێوەی بازنەی دینی خودا دەرنەچێت, ئینجا ئەو گوێڕایەڵی و پابەندبوون و گوێ لە مشتیەی خۆی بە چەمینەوە دەردەبڕێت, بۆیە تەنها بە ئاستەم خۆ خوار كردنەوە رەمزی گوێڕایەڵی بووە لە لای هەموو میللەت و گەل و هۆزو تیرەكان. خوداش چەمینەوەی تەواوی كردۆتە پابەندی نوێژ و رەمزی و دروشمی گوێڕایەڵی و گوێڕایەڵان.

لێرەوە سەرنجتان رادەكێشم بۆ ئەو وشە سەنگین و پڕ واتایانەی پێغەمبەری خودا لە چەمینەوەی سەرئەژنۆ لە (كڕنوش)دا فەرموویەتی: **(اللهم لك ركعت وبك آمنت ولك أسلمت خشع لله سمعي وبصري ومخي وعظمي وعصبي وما إستقلت به قدمي)**. واتە: ئەی خوداوەند بۆ تۆ چەمیومەوە، كڕنوشم بردووە و باوەڕم هێناوە و تەسلیمی تۆ بووم، ملكەچی خودایە بیستن و بینین و مۆخ و ئێسقان و مێشك و دەماغم و هەرچی قاچەكانم هەڵیان گرتووە ملكەچیی دەردەبڕن بۆ تۆ.

ئەم فەرمان بەرداریەو ئەم تەسلیم بوونە، ئەم وادەو پەیمانە لە کام پەرستندا و لە کام پایەی دین و پەرستنەکاندا ئاوا بە ئاشکرا و بێ پەردە دەربڕاوە و دانی پیادا نراوە کە تەنانەت ئێسقان و مۆخ و چەوریی ناو بۆشایی ئێسکەکانیش بگرێتەوە, مێشك و دەماغ و بیرو هۆش و ئەندێشەوە خەیاڵیش فەرامۆش نەکات تەنها بەیەك چەمینەوە بە زمانی حاڵ نوێژخوێن رایبگەیەنێت کە هەرچی ئەندامی لەش و رەگ و پۆو ئێسك و موو و پێستی لاشەیەتی ملکەچ و یەخسیری فەرمانی خودای دەکات وەکو مردووی بەردەست مردووشۆر. بیستن و بینین و قسەکردن و بۆنکردن و خەیاڵ و خەتەرەی نێو دڵ و دەروونیشی بە پێی بەرنامەی ئەو دەگوزەرینێ و ئەندازەی گەردیلەیەك ئامادە نییە لێی لا بدات، چونکە هەر جۆرە لادانێکی گەورە و بچوك لادانە لە ڕێڕەو و سکەی تایبەتی ژیانی و بەرەو هەڵدێرو تیاچوونی دەبات. لەم روانگەشەوە گوێ گرتن و پاشانیش گوێڕایەڵی لە پێش فەرمان کردن بە جیهاد و نوێژ و رۆژ و حەج و چاکە کردن لە پەیماننامەکان و بەیعەتەکانی پێغەمبەردا هاتووە، کاتێك پەیمانی لەهەر هاوەڵێکی وەرگرتبێت و پەیماننامەی بەهەرکەس و هۆزو تیرەیەك مۆر کردبێت. لەم روانگەشەوە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) هەستانی فارسەکانی لەبەر پاشاکانیان پێناخۆش بووە، چونکە لەگەڵ هەستانەکەیاندا جۆرێك چەمینەوەیان کردووە، کە رەمزی گوێڕایەڵییەو فەرموویەتی **"لاتقوم لي كما يقوم الأعاجم لملوكهم"**. واتە: لەبەرمدا هەڵمەستن وەکو عەجەمەکان لەبەر پاشاکانیان هەڵدەستن.

## خودا فەرمان دەکات بە کڕنوش ( ركوع ) لە نوێژدا

پەروەردگاری بوونەوەر پێی خۆشە هەموو دروستکراوەکان لە فەرمانی دەرنەچن و گوێڕایەڵی بکەن بەوپەڕی فەرمانبەرداری و گوێ لە مستی و خۆشی نایە لە تاکڕەوی و گوێڕایەڵی یەك لایەنە، یان تاکەکەسیی بۆیە لە قورئاندا دەفەرموێت (**وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ**). واتە (نوێژ بکەن لەگەڵ نوێژخوێنان) ئیبن عەباس وای تەفسیر کردووە.

وتراویشە: گفتوگۆیە لەگەڵ جولەکەو خودا بۆ ئەوان دەدوێ، چونکە لە نوێژی ئەواندا (ركوع)ی تیا نەبووە، بە هەر حاڵ چەمینەوە (ركوع) ئەوەندە پایەو جەمسەرێکی سەرەکییە لە نوێژدا هەموو نوێژی بەناوەوە کراوە، یان لە جیاتی هەمووشی ناوی ئەو براوە، چونکە نوێژ هەر خۆی گوێڕایەڵی خودایە.

لەبەر گەورەیی و پلەو پایەی گوێڕایەڵییە خودا (ركوع)ی لە نوێژدا وەپێش سوژدە خستووە هەتا هەمووان بزانن کەسێ زۆر گوێڕایەڵ نەبێت و سەری لە ڕێدا نەبێت سوژدەی لێ چاوەڕێ ناگیرێت.

## ئەوانەی کڕنوش (ركوع) نابەن خودا بە تاوانبار ناویان دەبات

کڕنوش کە ڕەمزی گوێڕایەڵییە, پێغەمبەران و خواپەرستان هەستی گوێڕایەڵی خۆیان بە کڕنوش دەربڕیوە، هەر لەم دیدەوە دەڕوانینە ئەو وتە شیرینانەی پێغەمبەری خودا لە کڕنوشدا وەکو دانەی گەوهەر ریزی کردوون، بەم شێوەیە (خودایە هەر بۆ تۆ کڕنوش دەبەم هەر بە تۆ بڕوام هەیە و هێناوە, هەر تەسلیمی تۆ بووم ملکەچیم بۆ خودا کردووە، بیستنم, بینینم, مۆخم، ئێسکم, و بیرو هۆشم, ئەوەی لاقەکانم هەڵیانگرتووە. بە پێچەوانەشەوە هەر کەس کڕنوشی نەبرد دەشێ بڵێین نە بیستن و نە بینین و نە مۆخ و نە ئێسك و نە بیرو هۆشی و نە ئەوەش لەسەر لاقەکانی ڕاگیراوە، هیچ کامیان ملکەچ و فەرمانبەری خودا نین. زۆرێك لە عەرەبەکان و خەڵکی سەردەمی نەفامی ئامادە بوون نوێژ بکەن، بەڵام بەبێ ركوع واتە: دەیانویست نوێژ بکەن، بەڵام ئامادە نەبوون لە هەموو گەورە بۆ بچوکێکدا لە فەرمانی خودا دەرنەچن, وەك بە زمانی حاڵ خۆیان وتبێتیان خودا دەفەرموێ نوێژ بکەن بەبان چاوان غەیری نوێژیش دانێ بۆ خۆمان. هەتا خواش پێیان بفەرموێت (**واركعوا مع الراكعين**).[1] واتە: لەگەڵ کڕنووشبەران کڕنووش بەرن.

هەروەها دەفەرموێت: **"كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلاً إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ * وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ * وَإِذا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ"**.[2] واتە: بخۆن و بای باڵ بدەن کەمێك بەڕاستیی ئێوە تاوانکارن, واوەیلا بۆ درۆزنان لەو ڕۆژەدا، ئەگەر پێیان بوترێ کڕنووش بەرن کڕنووش نابەن.

---

[1] البقرة ٤٣.

[2] المرسلات ٤٦ ـ٤٧ ـ ٤٨.

# بانگ و بانگبێژان

## بانگ و بانگبێژان

واتاکانی بانگ: بانگدان ئەرکێکی خوداییە لەسەر ئوممەتی ئیسلام بانگدان خواپەرستییەو دەبێت کاربەدەستی موسڵمانان کەسی تایبەتی بۆ دیاریی بکات و موچەی بژێویی بە زیادەوە بۆ مسۆگەر بکات تا بە دەنگی زولاڵی رۆژی پێنج جار بانگ بفەرموێت و لە گەردنی بەرزی منارەکانەوە خولقی میوانەکان بکات و فەرمووبیان لێ بکات بۆ ماڵی خوداو رایانچڵەکێنێ بە نەڕەو چریکەی (الله أکبر).

بۆیەش بانگی موحەممەد واتە بانگی ئیسلام بە ئاشکرایە هەتا هەموو لایەك بگرێتەوە بێ جیاوازیی و کەس نەڵێ لەگەڵ من یان ئێمەیەتی یان بانگی فلان تیرە و فیسار بەرەباب دەکات.

تەنانەت باسی ئیماندارا‌ن و موسڵمانانی تیا نییە بەڵکو روو بە هەمووان دەفەرموێت (**حي علی الصلاة**) رابن بەرەو نوێژ, (**حي علی الفلاح**) رابن بەرەو رزگار بوون, لەگەڵ کەسێکی دیاریکراوی نییە، باس لە رشتەو رەگەزی کەس ناکات, نافەرموێت عەرەب یان هۆزی قورەیش وەرنە ماڵی خودا. بانگێشتی دەوڵەمەندان یان هەژاران ناکات، بانگی چین و توێژێکی تایبەتی ناکات، هەتا لە چین تاقمێکی تریان هان دات و شەڕی چینایەتی و رەگەزایەتی گەرای زۆرانبازی و مرۆڤخۆری و خوێنڕێژی بچێنێت وەرنە ماڵی خودا, خودای هەمووتانە ماڵەکەی بۆ هەمووتانە ئەوی سەد ساڵە نوێژ دەکات و پێی لە مزگەوت نەبڕاوە, ئەوەش سەد ساڵە بێ فەرمانیی خودا دەکات تەنها جارێك رووی لە ماڵی خودا نەکردووە ئێستا هاوشانی یەکن، شانبەشانی یەك لە ریزی نوێژدا بەرەو روگە و روو لە خوا ملکەچ بە پێوە وەستاون پاشاو گەدا هەمووتان وەرن بۆ ماڵی خودای خۆتان، فەرماندار و فەرمانبەر, دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات، نێرو مێ، گەورەو بچوك (**حي علی الصلاة**) رابن، خۆ کەون بۆ ئەنجامدانی نوێژ. لە مزگەوت، لە ماڵ لە بازاڕ، لەسەر ئیش و کارو باخچەو بێستان، لە ناو کێڵگە و شوێنی پشوودان، لەسەر لوتکەی چیاکان، لە تاریکایی شیو و دۆڵەکان، لە بنی دەریا،

له بۆشایی ئاسمان، به پیاده، به سواریی، له هەر کونجێکی جیهان هەی راپەڕە نوێژەکەت بکە.

بانگبێژ به زمانی حاڵی دەڵێ ئەی ئادەمی و پەرییەکان ئەوا من پێم راگەیاندن بانگم کردن له کاتی دیاریکراودا، خودا تۆ به شاهید به، جا خەڵکینه گوناهی خۆتان له ملی خۆتان.

وشەو رستەکانی بانگ تایبەتی نین بۆ هۆزو تیرەو گەلێکی تایبەتی یان چین و توێژ و نەوەیەکی دیاریکراو یان بۆ شارو وڵاتێکی دیاریکراو و یان سەدە و سەردەمێکی مێژوو، نا، سوێند به خوای بوونەوەر چەند وشەیەکی سادە و زوڵاڵ و پڕ مانان، هەموو گوێیەك دەتوانێت بیانبیستێ، هەموو دڵ و مێشکێك به ئاسانی وەریان دەگرێت. وشەو پیتەکانی بانگ به لێو و پوك دەرنابڕێن، بەڵکو هەر هەموویان پیت و وشەی مەعنەویی دەروونینو له دڵ و دەروونەوە دەردەچن و بەڵگەن لەسەر بڕواهێنان و بڕوا پێبوون، کردەوەو کرداری دڵ و دەروون و ئەندامەکانی لاشە.

وتراوە بانگدان جاڕدانە بۆ نوێژ کە چاکترین و باشترین کردارە بە چەند وشەیەك کە چاکترینو باشترینو بەرزترین یادی خودان و لێیان زیاد ناکرێن و لێیان کەم ناکرێتەوەو بێ کەم و کوڕین.[1]

وشەکانی بانگ هەموویان گەورەییو تاکو تەنهای خودایان تیادا دەدرەوشێتەوە، بۆیەش بیلال کرایە بانگبێژ، چونکە کاتێك له لایەن هاوبەشدانەرەکانەوە سزا دەدراو داوای پاشگەزبوونەوەیان لێ دەکرد پڕ بەدەم هاواری دەکرد: (أحد أحد) پاداشتی درایەوە به بانگبێژیی کە وشەکانی بانگ هەمووی یەکتاپەرستی و یەکخواناسی و گەورەیی خودایە.[2]

یەکەم بانگبێژ جبریل بوو (سەلامی خودای لێ بێت) کە لە ئاسمانی دونیا بانگی فەرموو، عومەری کوڕی خەتتاب و بیلال گوێیان لێ بوو، عومەر (رەزای خودای لێ بێت) خێرا هەواڵەکەی هێنا بۆ پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت)، ئەوجاکە بیلال هات، پێغەمبەریش پێی فەرموو: عومەر پێشتکەوت ئەی بیلال.[3]

---

[1] فتح الباري، ج٢ /ص٢٩٠، دار الفكر.

[2] فتح الباري، ج٢ /ص٢٨٣، دار الفكر.

[3] فتح الباري ج٢ /ص٢٧٩، دار الفكر.

## چۆن بانگدان بڕیار دراوە[1]

نوێژ لە پێش کۆچ کردن لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە فەرز بوو لەسەر گرۆی ئادەمیزادو پەریی لە گەشتی پیرۆز و پڕ نهێنیی پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) لە شەوڕەوی و بەرزبوونەوە لە کەنارەکانی ئاسمانەوە بەرەو بۆشایی ئاسمان سەرکەوتنو گەڕان بەیەك بەیەکی ئاسمانەکانداو وەرگرتنی گەورەترین پایەو ئەرکی دینەکەی بۆ سەرتاپای ئوممەتی خۆی لە هەر دوو رەگەزی مرۆڤ و پەری.

ماوەیەکی زۆر نوێژ بە نهێنی دەکرا لە کونجی ماڵەکان و شیو و دۆڵەکاندا، پاشان هێدی هێدی ئاشکرا بوو، دەبوو نوێژ بە کۆمەڵ بکەن، بەڵام چۆن خەڵکیی ئاگادار بکرێنەوە و بانگێشتی مزگەوت بکرێن، کاتی نوێژەکانیان پێ رابگەیەنرێت، زۆر شتیان بیر لێ کردەوە، بەڵام لەسەر هیچ کامیان پێك نەهات.

ئەبوداود بە سەنەد (رشتەیەکی) راست گێڕاویەتییەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبدورەبی ئەنساری گێڕاویەتییەوە کە فەرموویەتی کاتێك پێغەمبەری خودا (سەلامی خودای لەسەر بێت) فەرمانی کرد کەڕەنا لێ بدرێت بۆ کۆکردنەوەی خەڵکیی بۆ نوێژەکان لە خەومدا پیاوێك لە دەورم دەخولایەوە و کەڕەنایەکی بەدەستەوە بوو، وتم ئەرێ پیاوی خودای ئەو کەڕەنایە نافرۆشیت؟ وتی چی پێ دەکەیت؟ وتم خەڵکی پێ بانگ دەکەمە نوێژ، وتی ئەی بۆ شتێکی لەمە باشترت پێ نەڵێم؟ وتم بەڵێ، وتی بڵێ (الله أكبر، الله أكبر) هەتا کۆتایی بانگ، پاشان هەندێك لێم دوورکەوتەوە ئینجا وتی: کاتێکیش هەستای بۆ نوێژ بڵێ (الله أكبر، الله أكبر) هەتا کۆتایی قامەت، جا کاتێك رۆژم لێ بۆوە چوومە خزمەت پێغەمبەر و هەواڵم پێدا بەوەی بینیم، ئەویش فەرمووی **(إنها رؤيا حق، إن شاء الله تعالى، قم إلى بلال فألق عليه ما رأيت فليؤذن به فإنه أندى صوتاً منك)**. واتە: بێگومان خەونێکی راستە بە ویستی خودا، هەستە بچۆرە لای بیلال ئەوەی بینیوتە پێی بڵێ، چونکە ئەو دەنگی زوڵاڵترە لە تۆ، منیش[2] لەگەڵ

---

[1] زانایان رایان جیاوازە بانگدان سوننەتە یان فەرزە، یان فەرزی کفایەیە، ج۱، ص۱۸٦، **مغني المحتاج**.

[2] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید: ئەو پیاوە بوو کاتێك هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەری بیست پاڕایەوە و فەرمووی خودایە چاوەکانم کوێر بکەی با لە دوای پێغەمبەر هیچ شتێك نەبینم، دەستبەجێ هەردوو چاوی کوێر بوو، ج۱/ص۱۸٦، **مغني المحتاج**.

بیلال وەستام، بانگەکەم پێ دەوت و ئەویش دەیفەرموو، عومەری کوڕی خەتاب لە ماڵی خۆیەوە گوێی لێبوو بە هەڵەداوان هاتەدەر کراسەکەی لە دووی دەخشاو دەیفەرموو سوێند بەو خودایەی تۆی بەهەق رەوانە کردووە ئەی پێغەمبەری خودا بێگومان ئەو چی بینیوە منیش هەمان شتم بینیوە، پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی (**فلله الحمد**) ئەمەش خەونێکی رووت نەبووە، بەڵکو نیگای ئاسمانیش پشتگیری بوو.

(بەززار) گێڕاویەتیەوە (رەحمەتی خودای لێ بێت) کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) لە شەوڕەوی و بەرزبوونەوەیدا بانگی بە گوێیا دراوە لەسەروی حەوت ئاسمانەکانەوە، پاشان جبریل پێشی خست و ئەویش پێشنوێژیی کرد بۆ خەڵکی ئاسمان کە (ئادەم و نوح)یان تێدا بوو (سەلامی خودایان لێ بێت)، خودا پلە و پایەی ئەرز و ئاسمانی بۆ تەواو کرد.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) بە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی فەرموو کاتێك خەوەکەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە: (**سبقك بذلك الوحي**). واتە: سروش (نیگا) پێش تۆ کەوت بە هێنانی بانگ و وشەکانی بانگ. ئەمەش راسترین قسەیە کە داود لە ئیبن ئیسحاقەوە گێڕاویەتیەوە کە جبریل بانگی هێنا بۆ پێغەمبەر پێش ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی زەید خەوەکەی ببینێ بە هەشت رۆژ.

پێش فەرزبوونی ئەم بانگە پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) زۆر دڵگران ئەبوو کە هەموو موسڵمانان بەیەکەوە نوێژ نەکەن، هەر لەو روانگەوە فەرموویەتی: (**لقد أعجبني أن تكون صلاة المسلمين واحدة، حتى لقد هممت أن أبثّ رجالاً في الدوور ينادون في الناس لحين الصلاة، وحتى هممت أن آمر رجالاً يقومون على الاطام ينادون المسلمين بحين الصلاة**)[١].(صحيح) واتە: وام حەز دەکرد کە نوێژکردنی موسڵمانان یەك بوایە، هەتا ویستم کە پیاوانێك بڵاو بکەمەوە بە ناو ماڵاندا بانگی خەڵکیی بکەن بۆ کاتی نوێژەکان، هەتا وای بۆ چووم و ویستم فەرمان بکەم بە پیاوانێك لەسەر شوێنی بەرز راوەستن و بانگی موسڵمانان بکەن لە کاتی نوێژەکاندا.

---

[1] رواه أبوداود رقم (٥٠٦)، صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٥١١٧.

## بانگبێژ گەردنی لە هەمووان بڵندترە لە ڕۆژی دواییدا

بە فەرمودەی ڕاست و دروست و پیرۆزی پێغەمبەری ئیسلام (سەڵات‌و سەلامی خودای لێ بێت) بانگبێژ لە ڕۆژی دواییدا لە هەموو کەس گەردنیان بەرزترە و سەرێکیش ئەو گەردنە هەڵی گرتبێت لەسەری هەمووان بەرزترە، خاوەنی ئەو گەردنە بڵندو سەربەرزەش لە هەمووان کامەران و بەختەوەرترە بە هۆی ئەو کارە پیرۆزەی لە دونیادا ئەنجامی داوە کە بانگێشت کردنی مەردومە بۆ کار و پەرستنێك کە مایەی ڕزگار بوونە و چاکترین کار و کردەوەیە ریشەکێشکەری هەموو خراپە و تاوانێکە. بە دەنگی زوڵاڵی لە گەردنی بەرزی منارەکانەوە خەڵکیی بانگ دەکات بۆ کارێك کە کاری فریشتەکان و پێغەمبەرەکان و پیاوچاکانە.

بۆ کارێك کە خۆشەویستترین کار بووە بە لای پێغەمبەرەوە و بە گلێنە و بیلبیلەی چاوی خۆی داناوە و بە ئیمان و دڵسۆزیی ناو بردوەو لە ماڵەوەو لە سەفەر و بە ساغی‌و نەخۆشی و تەنانەت لەسەرەمەرگیشدا دەستبەرداری نەبووەو بەڵکو کۆتا وشەی لە دونیا دەرچوونی بووە.

بانگبێژ خەڵکیی بانگ دەکات بۆ گرنگترین وەسیەتی پێغەمبەرەکان تکاو تکاکاری مردووەکان کە نوێژە، بانگبێژ خولقی میوانەکانی دەکات بۆ ماڵی خودا، پێنج فەرزە پێشوازییان لێ دەکات بە بڵندگۆ جاڕیان بۆ ئەدات، بۆیە دەڵێن مافی خۆیەتی پیرۆزی بێت لە ڕۆژێکدا هەموو هۆزو تیرەو گەل و میللەتەکان بە چۆکا کەوتونەتە سەر ئەژنۆ ئەو قنج و قیتە و سەری لە هەمووان بەرزترە.

**عن معاوية (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "المؤذنون أطول الناس أعناقاً يوم القيامة".**[1] واتە: لە موعاویەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (سەڵات‌و سەلامی خودای لێ بێت) دەیفەرموو (بانگبێژان لە هەموو کەس گەردنیان بەرزترە لە ڕۆژی دواییدا).

دەنگ و سەدایەك کە بەهرەی خودایە و پێیان بەخشراوە لە شتی بێ هودەدا بەکاریان نەهێناوە و نەیانکردۆتە کەناڵێك بۆ پیاهەڵوتنی ڕاست و درۆ لە پێناو

---

[1] رواه مسلم رقم (٣٨٧)، رياض الصالحين ص٣٣٦، رقم ١٠٣٤.

چلپەیەکی دونیادا یان بۆ ئەوەی دوو دیناری لە مستی نێن و هەتا دەمرێ چاوی لە دەستی خەڵکی بێت.

## گوێ نەدان بە بانگ و گاڵتە پێکردنی سیفەتی کافرانە

بانگ، خودا بۆ بەندە خواپەرستەکانی داناوە بۆ کۆکردنەوەیان لە کاتی جەنگ و خەباتدا، لە کاتی وەرزی حەج کردندا، لە کاتی هاتنی نوێژەکاندا, بۆیە دەبێبڕواداران بە دەنگیەوە بچن و چییان پێ سپێراوە ئەنجامی بدەن.

بانگی جیهادو خەبات بۆ ئامادەباشی و خۆسازدانە بۆ بەخشینی خوێن و گیان و سەرو ماڵ لە پێناو بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلام و رزگار کردنی چەوساوە و بێدەرەتانەکان.

بانگی حەج جاڕدانێکی خوداییە بۆ کۆکردنەوەی گەشتیارانی ماڵی خودا لە هەر چواردەوری دونیاوە بە نوێنەری هەموو گەل و نەتەوە و رەگەزو زمان و رەنگە جیاوازەکانەوە, بە خەرجکردنی ماڵێکی زۆر کە بە رەنجی شان و عارەقی ناوچەوان پەیدایان کردووەو ماڵی حەلاڵ و زولاڵی خۆیانە, بەجێهێشتنی ماڵ و منداڵ و نیشتمان و خزم خۆیشان, گرتنەبەری رێگەی هات و نەهات لە پێناو رەزامەندیی خودا.

بانگی نوێژ فەرمووکردنی نوێژخوێنانی ئوممەتی موحەممەدە (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) بۆ ماڵی خودا، بۆ سفرەی خوداناسی، بۆ یەکرێزی و یەکسانی و گوێڕایەڵی و تازەکردنەوەی بەڵێننامە لەگەڵ خودا.

بۆ وەڵامدانەوەی بانگی خودا، بۆ شوێنی هەڵوەرینی گوناهەکان, بەدەنگەوەچوونی هەموو ئەو بانگ و جاڕدانانە لەگەڵ توانادا و نەبوونی رێگردا ئەرکێکی شەرعیو خواییەو دەبێبڕوادار بە پەلە و هەڵەداوان بچێ بە پیریەوە **(فاسعوا الى ذكر الله)** بە پەلەو بە پەرۆشەوە بچن بە دەمیەوە.

کەواتە هەر کەس گوێی پێ نەدات و لە بەرامبەریشدا گاڵتەو لاقرتێ بە بانگ بکات لە دین دەردەچێت و سیفەتی کافرو بێبڕواکانە وەکو خودا دەفەرموێت: **(وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ اتَّخَذُوهَا هُزُواً وَلَعِباً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَعْقِلُونَ)** (المائدة: ٥٨).

واتە: (ئەگەر بانگیان کەیتە نوێژ گاڵتەو گەمە بە بانگ دەکەن)، ئەم ئایەتەش لە باسی کافرەکاندایە, ئەوەش بە هۆی ئەوەیە کە قەومگەلێکی بێ عەقڵن.

بانگ لە لایەن خوداو پێغەمبەرەوەیە (**وآذان من الله ورسوله**) هەرکەس بەبێ هودە و کەمنرخ سەیری بکات لە دینی ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە.

## هەموو شتێك شاهیدی ئیمان بۆ بانگبێژ ئەدات

ئەم بوونەوەرە بە وردو درشتیەوە شاهیدی بۆ بانگبێژ ئەدەن لە ڕۆژی دواییداو شاهیدی ناهەقیش نادەن. ئێمەی ئادەمیش تەواوی بوونەوەر لێمان دەبنە شاهیدو گەواهی کردەوەکانمان ئەدەن. ئەوەی چاکە بە چاك, ئەوەش خراپە بە خراپ. پێغەمبەری خودا لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا "**يومئذ تحدث أخبارها**" فەرموویەتی: واتە: لەو ڕۆژەدا دەنگ و باسەکانی دەخوێنێتەوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن رسول ﷺ إنه قال: أتدرون ما أخبارها؟ قالوا: الله ورسوله أعلم: قال: (أخبارها أن تشهد على كل عبد وأمة بما عمل على ظهرها تقول: عمل كذا وكذا يوم كذا كذا).**[1] واتە: لە ئەبی هوڕیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە فەرموویەتی: ئەزانن کامەیە هەواڵەکانی زەوی؟ وتیان خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی هەواڵەکانی شاهیدیدانە لەسەر هەموو کەسێك نێر یان مێ بەوەی لەسەر پشتی زەوی کردویانە دەڵێ ئەوەو ئەوەو ئەوەیان کردووە.

**وعن عبدالله بن عبدالرحمن بن أبي صعصعة ان أبا سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال له: (إني أراك تحب الغنم والبادية, فإذا كنت في غنمك أو باديتك ـ فاذنت للصلاة، فارفع صوتك بالنداء فإنه لايسمع مدى صوت المؤذن جن ولا انس، ولا شيء إلا شهد له يوم القيامة. قال أبوسعيد سمعته من رسول الله ﷺ.**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عبدورەحمانی کوڕی ئەبی صەعصەعەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێت) پێی فەرموە دەتبینم مەڕو ماڵات و دەشت و دەرت

---

[1] رواه الترمذي في القيامة رقم (٢٤٧٩)، وقال هذا حديث حسن صحيح غريب ـ ورواه الحاكم في المستدرك رقم (٣٠١٢)، وقال صحيح الأسناد. ٥٣٣/٢ وزاد المسير ج٨ ص٣٠٥ إبن الجوزي.

[2] رواه البخاري (٥٨٤)، ورياض الصالحين، ص٣٣٦، رقم ١٠٣٥. وسلسلة الأحاديث الصحيحة، ٢٤٥٠.

پێخۆشە، جا هەرکات لە ناو ئاژەڵەکانتدا بوویت یان لە دەشت و دەر بوویت و بانگت فەرموو دەنگت بەرز کەرەوە لە کاتی بانگداندا، چونکە هەرچی پەری و مرۆڤ و هەر شتێکی تریش هەیە و گوێی لێیە شاهیدی بۆ بانگبێژ ئەدات لە رۆژی دواییدا، بەڵێ شاهیدی بۆ ئەدەن کە نەك هەر خۆی کردەوەی چاکی کردووە، بەڵکو بانگەوازیشی کردووە و جاڕی داوە بۆ چێن و توێژەکانی مەردم.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "المؤذن يغفر له مدى صوته، ويشهد له كل رطب ويابس، وشاهدُ الصلاة يكتب له خمس وعشرون صلاة، ويكفر عنه ما بينهما".**[1]

واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەری خودا (سەڵات و سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: بانگبێژ تا دەنگی بڕوات لێخۆش بوونی گوناهەکانییەتی، هەموو تەڕو وشکێك شاهیدی بۆ ئەدات، ئەگەر بانگبێژ ئامادەی نوێژیش بوو خێری بیست و پێنج نوێژی بۆ هەیە و گوناهی نێوانیشیان دەسڕێتەوە.

## لەگەڵ دەنگی (الله أكبر)ی بانگ شەیتان رادەکات

نرکەی (الله أكبر) جێ بە شەیتان لێژ دەکات و لە حەیبەتا تەنها فریای راکردن دەکەوێت، ئەو شوێنە بەجێ دێڵێت کە لێیەوە بانگی خەڵکیی دەکرێت بۆ نوێژکردن و رووکردنە خوداو تازەکردنەوەی پەیمان لەگەڵیدا، بانگبێژ خەڵك بانگ دەکات بۆ لەعنەتبارانکردنی شەیتان و فەرامۆش کردنی خۆی و حیزبەکەی و بەرنامە تێکدەرەکەی.

شەیتان لەگەڵ بیستنی سەدای (الله أكبر)ی بانگبێژ ئەو جێگەیە بەجێ دەهێڵێت و نائومێد دەبێت لە کەسانێك بە دەنگ ئەو بانگە زوڵاڵو وشە سازگارو جاڕە خوداییەوە دێن و زرینگ و چوست و چالاك وەڵامی ئەدەنەوە، چۆن پێغەمبەری خودا لە ئیش و کارو ماڵ و خێزانیدا سەرقاڵ دەبوو، بەڵام کە گوێبیستی بانگ دەبوو، هەروەکو کەسیان نەناسێ بە جێی دەهێشتن بە هەڵەداوان بەرەو شوێنی بانگەکە بەڕێ دەکەوت.

---

[1] رواه أبوداود (٥١٥)، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٦٦٤٤.

لەگەڵ بیستنی بانگی پیرۆزی ئیسلام خەڵکیی لە هەموو تەمەنێکداو لە هەموو چین و توێژێکەوە گەورە و بچوك، نێرو مێ، هەژارو دەوڵەمەند، پاشاو گەدا بە دەستی بە دەستنوێژ و زمانی پاراویان بە یادی خودا روو لە مزگەوتەکان دەکەن، بۆیە شەیتان لەگەڵ بیستنی یەکەم وشەی بانگ بە هەڵەداوان و چنگ لەسەرشان رادەکات ئەو شوێنە بەجێ دێڵێت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا نودي بالصلاة ادبر الشيطان، له ضراط حتى لايسمع التاذين، فإذا قضي النداء اقبل حتى إذا ثوب للصلاة ادبر حتى إذا قضي التثويب أقبل, حتى يخطر بين المرء ونفسه يقول: أذكر كذا وأذكر كذا ـ لما لم يذكر من قبل ـ حتى يظن الرجل ما يدري كم صلى".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژ شەیتان پشت هەڵ دەکات, تڕ بەرئەداتەوە هەتا گوێی لە بانگەکە نەبێت، کاتێك بانگ تەواو بوو دێتەوە پێش و هەتا بانگبێژ دەڵێت (**الصلاة** خير من النوم) نوێژ لە خەو خێرترە، دووبارە هەڵدا و هەتا لەوەش تەواو دەبێت، ئینجا دێتەوە هەتا گەرای خەیاڵ و خەتەرە لە نێوان هەرکەسێك و دڵ و دەروونیدا دەچێنێ و دەڵێ: فلان شت وەبیر خۆت بێنەوە، بیر لە فلان شت بکەوە ئەوەی لەوەوپێش لەبیریشی نەبووە، تا وای لێدێ کابرا نازانێت چەند رکات نوێژی کردووە.

دەبێ لەگەڵ کەڵەشێر بە ئەدەب بین، کەڵەشێر لە دەمەو بەیانیاندا بە دەنگی زوڵاڵی خۆی خەڵکیی بەخەبەر دێنێ بۆ رووکردنە خواو نوێژکردن بیستنی دەنگی کەڵەباب نیشانەی ئاوەدانییەو کەسانی ئاوارەو سەرگەردان بە بیستنی دەنگی زوڵاڵی کەڵەشێر دڵخۆش و کەیفساز دەبن. ئەوانەش دەردەدار و گرفتارن و شەوێکیان لێ دەبێتە ساڵێکی یەڵدا و دەبجورستان لە تاو ئازار و ئەشکەنجەی دەروونی خۆیان، کەڵەشێر لەگەڵ شەبەقی بەرەبەیاندا بە دەنگی زوڵاڵ و ئاوازی مژدەبەخشی خۆی دڵخۆشیان دەکات و مزگێنی نزیکبوونەوەی خۆرهەڵهاتنی رۆژێکی نوێیان پێ ئەدات.

---

[1] متفق عليه / رواه البخاري رقم (٥٨٣) ومسلم رقم (٣٨٩)، رياض الصالحين ص٣٣٧ / رقم ١٠٣٦ ومع شرح العثيمين ص٢٢٧ ج٣/ رقم ١٠٣٦

پێغەمبەری خواش (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) داوامان لێ دەکات رێز لەو بانگبێژە گەردن بڵندە بگرین و چاکەی چاکەکارانمان لەبەر چاو بێت، وەکو دەفەرموێت: (**لا تسبوا الديك فإنه يوقظ للصلاة**).[1] صحيح. واتە: جوێن بە کەڵەشێر مەدەن، بێگومان ئەو بە خەبەرتان دێنێ بۆ نوێژ.

## لە شەو و رۆژێکدا پێنج جار بانگ دەدرێت

لە شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژی فەرز هەیە، دەبێ بۆ هەر نوێژێکی فەرزیش بانگ بدرێت، کەواتە رۆژانە لەسەرانسەری جیهاندا پێنج جار بانگ دەدرێت لە سەدان هەزار مزگەوتەوە و لە گەردنی منارەکانەوە بە بڵندگۆو ئامێری سەردەم بانگی پیرۆزی ئیسلام بە ئاشکراو بە دەنگی بەرزی زوڵاڵ دەدرێت بە گوێی خەڵکیداو بە گوێی جیهاندا، بە گوێی ئادەمی و پەری و فریشتەکاندا بە شاهیدیی هەموو بوونەوەر، وەکو لە فەرمودەی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) بە راست و دروستی باسی لێکراوە کە هەرچی گوێی لە بانگ بێت شاهیدیی بۆ بانگبێژ ئەدات لە رۆژی دواییدا.

لەسەردەمی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) لە شەو و رۆژدا شەش جار بانگ دراوە، چونکە بۆ نوێژی بەیانی دوو بانگیان داوە، لە لایەن دوو هاوڕێیی بانگبێژی پێغەمبەرەوە کە بیلال و عەبدوڵڵای ئیبن ئوم مەکتوم بوون (رەزای خودایان لێ بێت). بانگی یەکەمی بەیانی لە شەودا بووە بۆ لە خەو هەستان و ئامادەباشی و شەونوێژ، بۆیەش لە بانگی یەکەمدا فەرموویەتی (**الصلاة خير من النوم**) واتە: نوێژ لە خەو باشترە.

## پلە و پایەی بانگبێژان

بانگبێژان ئەمینداری موسڵمانان و جێگەی متمانەن و باوەڕپێکراون، لە کاتی دیاریکراودا بانگ دەفەرمونو پاش و پێشو کەم و زیادی پێناکەن، چاوبەست لە

---

[1] رواه أبوداود رقم (٥١٠١)، والطبراني في المعجم الكبير رقم (٥٢١٠)، صحيح الجامع الصغير ٧٣١٤.

خەڵكیی و بە تایبەتی موسڵمانان ناكەن، كەسی نائەمین و بێ متمانە و بێ هۆش ناكرێتە بانگبێژ.

بانگبێژ گەردنی لە هەمووان بەرز و بڵندترە لە ڕۆژی دواییدا[١]، هەموو شتێك شاهیدی ئیمان و هەستان بەو ئەركە شەرعییەی بۆ ئەدەن.[٢] تەنانەت پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) قەدەغەی كردووە كە جوێن بە كەڵەشێر بدرێت، چونكە خەڵكیی وەخەبەر دێنێت بۆ نوێژ، بە تایبەتی بۆ نوێژی بەیانی.

**عن زید بن خالد قال: قال رسول الله ﷺ: "لا تسبوا الدیك فإنه یوقظ للصلاة".**[٣] واتە: لە زەیدی كوڕی خالیدەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "جنێو (جوێن) بە كەڵەشێر مەدەن كە ئەو خەڵكیی بە خەبەر دێنێت بۆ نوێژ".

بانگبێژ خاوەنی كۆمەڵێ سیفەت و پێناسەی جوان و بەرزە، بانگبێژ دەبێ مەبەستی تەنها ڕەزامەندیی خودا بێت و بە كرێ و نرخێكی دونیایی وشە پیرۆز و بەرزەكانی بانگی خودا هەرزانفرۆش نەكات.

**قال رسول الله ﷺ لعثمان بن أبي العاص (... واتخذ مؤذناً لا یأخذ علی أذانه أجراً).**[٤] واتە: پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خودای لەسەربێت) فەرمووی بە عوسمانی كوڕی ئەبی عاص (بانگبێژێك دابنێ كە لە بەرامبەر بانگ وتنەكەیدا كرێ وەرنەگرێت).

بانگبێژ خاوەنی سیفەتی دادو دادگەری و ئەمینی و ئەمیندارییە، بۆیە بە هیچ جۆرێك دروست نییە كەسانی نائەمین و چەواشەكار و بێ متمانە بكرێنە بانگبێژ، هەتا

---

[1] فەرمودەكە پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

[2] صحیح البخاري كتاب التوحید، فتح الباري، ١٣ / ٥١٨. والقیامة الكبری، الأشقر، ج٥ / ص١٦٩.

[3] رواه أبوداود رقم (٥١٠١)، والطبراني في المعجم الكبیر رقم (٥٢١٠)، صحیح الجامع الصغیر وزیادة، ج٢ / ص١٢٢٢، رقم ٧٣١٤، ومختصر مسلم ١٨١٤.

[4] صحیح أخرجه أبو داود، رقم ٥٣١، والترمذي ٢٠٩، وإبن ماجه ٧١٤، والنسائي ١٦٣٦. صحیح فقه السنة، ج١/ ص٢٧٣ و ٢٨٠.

کەس نەتوانێت کاتی پێنج فەرزەی نوێژ کە خودا دایناوە بگۆڕێتو سوکایەتی بە دینی خواو پەرستشی موسڵمانان بکرێت.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لیّ بێت) فەرموویەتی: **(الإمام ضامن والمؤذن مؤتمن فأرشد الله الأئمة، وغفر للمؤذنين)**.[1] واتە: پێشەوا ئەستۆگیری موسڵمانانەو بانگبێژ ئەمیندارە، خودا ڕێنیشاندەرو بەرچاو ڕۆشنکەری پێشەوایان بێت و لە بانگبێژانیش خۆش بێت.

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "دخلت الجنة ليلة أسري بي، فسمعت في جانبها وجساً، فقلت: يا جبريل ما هذا؟ قال: بلال المؤذن"**.[2] صحيح. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لیّ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەلامی خودای لیّ بێت) فەرمووی: لە گەشتی شەوڕەویمدا چوومە بەهەشت لە لایەکیەوە گوێم لە دەنگێك بوو، وتم ئەی جبریل ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەوە بیلالی بانگبێژە.

هەر دەربارەی پلە و پایەی بانگبێژان پێغەمبەر (سەلامی خودای لیّ بێت) دەفەرموێت: **(المؤذن يغفر له مدى صوته، ويشهد له كل رطب ويابس، وشاهد الصلاة له خمس وعشرون صلاة، ويكفر عنه ما بينهما)**.[3] واتە: بانگبێژان لێبووردنی گوناهەکانی بە ئەندازەی ڕۆیشتنی دەنگیەتی و هەموو تەڕو وشکێك شاهیدیی بۆ ئەدات و ئەگەر ئامادەی نوێژیش بێت خێری بیستو پێنج نوێژی بۆ هەیە، گوناهی نێوان هەردووکیانیشی لیّ دەسڕێتەوە.

سوننەتە بانگبێژ سەری پەنجەی بخاتە گوێیەوەو لە وتنی (**حي علي الصلاة**)و (**حي علي** الفلاح) ڕوو بە لای ڕاست و چەپدا وەردەگێڕێ.

---

[1] صحيح أخرجه أبو داود ٥١٧، والترمذي ٢٠٧، وأحمد ٧١٦٩، صحيح فقه السنة، ج١ / ص٢٧١.

[2] رواه أحمد رقم ٢٣٢٤، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٣٣٧٢.

[3] رواه إبن حبان رقم (١٦٦٦)، وأبوداود (٥١٥)، وأحمد (٩٣١٧)، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٦٦٤٤.

**عن عون بن أبي جحيفة، عن ابيه، قال: (رأيت بلالاً يؤذن ويدوور ويتبع فاه ههنا وههنا).**[1] واته: لە عەونی کوڕی جحیفه لە باوکییەوە فەرموویەتی: بیلالم بینی بانگی دەفەرموو لە "**حي على الصلاة**"و "**حى على الفلاح**"دا بەم لاو لادا رووی دەگێڕا.

## لە نێوان بانگ و هەستان بۆ نوێژ نزا و پاڕانەوە ڕەد ناکرێتەوە

ئەو کاتەی بانگبێژ بانگی فەرمووەو لە بانگ بۆتەوە ئەوەی خۆی بە موسڵمان بزانێت و دەرفەتی هەبێت روو لە مزگەوت دەکات و بە دەنگ بانگەوازی ئیسلام و جاڕی خوداییەوە دێن، ئەو کاتە زۆر پیرۆزە، چونکە کاتی گوێڕایەڵیو کاتی بەدەمەوەچوونی فەرمانی خودایە، بۆیە پێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی (**عن أنس، أن النبي ﷺ قال الدعاء لا يرد بين الأذان والإقامة فادعوا**).[2] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی (نزاو پاڕانەوە ڕەد ناکرێتەوە لە نێوان بانگو (قامەت) (واتە: هەستان بۆ نوێژدا) بپاڕێنەوە).

هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە (**عن النبي عن عبدالله بن عمرو أن رجلاً قال: يا رسول الله ﷺ، إن المؤذنين يفضلوننا، فقال رسول الله ﷺ (قل كما يقولون، فإذا انتهيت، فَسَلْ تُعْطَه)**.[3] واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا بانگبێژەکان لە ئێمە چاکترن، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی ئەوان چی دەڵێن تۆش وا بڵێ کە لێش بوویتەوە، بپاڕێرەوە و داوا بکە پێت دەبەخشرێت).

---

[1] رواه الحاكم رقم (٧٢٥)، والترمذي (١٩٧). و تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي، ج١ / ص٦١٤، رقم ١٩٧.

[2] صحيح أخرجه أبو داود ٥٢١، والترمذي ٢١٢، وإبن خزيمة ٤٢٥، وأحمد ١٢٦٠٦. صحيح فقه السنة، ج١ / ص٢٨٧، وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٣٤٠٥.

[3] الحديث لابأس به أخرجه أبو داود ٥٢٤، وإبن حبان ١٦٩٥، وصحيح فقه السنة، ج١ / ص٢٨٧.

تەنانەت چوونە دەرەوە لە مزگەوت لەو کاتەدا دروست نییە مەگەر کەسێك بیانوویەکی شەرعیی هەبێت، بۆ نمونە سەفەری بێت یان زۆر نەخۆش بێت... هتد.

**فعن أبي الشعثاء قال: كنا قعوداً في المسجد مع أبي هريرة فأذن مؤذن فقام رجل من المسجد يمشي فأتبعه أبوهريرة بصره حتى خرج من المسجد، فقال أبو هريرة: أما هذا فقد عصى أبا القاسم ﷺ.**[1] واتە: لە ئەبی شەعسائەوە فەرموویەتی ئێمە لە مزگەوت دانیشتبووین لەگەڵ ئەبی هورەیرە، بانگبێژ بانگی فەرموو پیاوێك هەستاو رۆیشت، ئەبوهورەیرە چاوی دایە تا لە مزگەوت چووە دەر، ئەبوهورەیرە فەرمووی: بەڕاستیی ئا ئەوە لە أبا القاسم یاخی بووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) (واتە: لە پێغەمبەر).

هەروەها پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی (**الدعاء مستجاب بين النداء والإقامة**).[2] واتە: نزاو پاڕانەوە لە نێوان بانگو هەستان (**الإقامة**) بۆ نوێژ گیرایە.

هەروەها فەرموویەتی: (**الدعاء لا يرد بين الآذان والإقامة**).[3]واتە (پاڕانەوە رەد ناکرێتەوە لە نێوان بانگ و قامەتدا).

## هەر ئاوەدانییەك بانگی تیادا نەدرا ، شەیتان زاڵ دەبێت بە سەریاندا

بانگ دەنگێکی زوڵاڵە، بانگ حەققی خودایە و لە هەر شوێن و کون و قوژبنێکی دونیادا دەنگ و ئاوازی ئەو وشە سازگارانە بەرز بێتەوە و ببیسترێت شەیتان رادەکات و ئەو شوێنە بەجێ دێڵێت وەکو لە لاپەڕە ١٦٥ بۆ ١٦٦دا ئەو فەرمودەیەم باس کردووە.

---

[1] صحيح أخرجه مسلم ٦٥٥، وأبوداود ٥٣٦، والنسائي ١٦٤٨، والترمذي ٢٠٤، صحيح فقه السنة وأدلته، ج١/ ص٢٨٧ –٢٨٨، .

[2] حسن، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٣٤٠٦.

[3] صحيح، رواه أحمد رقم (٢١٧٥٨)، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٣٤٠٨.

هەروەها ئەگەر کەسانێك لە شارو شارۆچکەو گوند، تەنانەت دەشت و دەریشدا بن و بانگ نەفەرموون و دەنگی بانگیان لێ نەبیسترێت گومانی تیا نییە کە شەیتان سواری سەریان بووەو چۆکی پێ داداون.

**عن أبي الدرداء، قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (ما من ثلاثة (لايؤذّن) ولا تقام فيهم الصلاة إلاّ استحوذ عليهم الشيطان).** واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: هیچ سێ کەسێك نییە کە بانگ نەدەن و نوێژ نەکەن حەتمەن شەیتان سواری سەریان دەبێت و بە سەریاندا زاڵ دەبێت، بۆیە کۆمەڵێك لە زانایان رایان وایە کە بانگدان فەرزە، چونکە واز لێ هێنانی دەبێتە هۆی زاڵ بوونی شەیتان[1]، کۆمەڵێکیش لە زانایان بە سوننەتیان زانیوە.

تەنانەت بانگدان لەسەر قەبرو گەشتو گەڕانو کاروانو جەنگو نیشتەجێدا ئەرکێکی شەرعییەو پێغەمبەری خودا لێی بێ دەنگ نەبووەو وازی لێ نەهێناوە، تەنانەت نوێژی فەوتاویشیان بەبێ بانگدان نەکردۆتەوە.[2] کاتێك پێغەمبەری خوداو هاوەڵەکانی لە سەفەردا خەبەریان نەبووەوە بۆ نوێژی بەیانی کاتێك خۆرهەڵاتو بەخەبەر هاتن پێغەمبەر فەرمانی کرد بە بیلال کە بانگ بفەرموێت و قامەتیش بکات، خەڵکیی راست کاتەوە بۆ نوێژ ـ لەگەڵ دەنگی (الله أکبر)ی بانگدا دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە.

دەنگی بانگبێژ دەچێتە ئاسمان و دەرگای ئاسمانەکانی بۆ واڵا دەکرێت و دەخرێتە سەر پشت و نزا و پاڕانەوە لەو کاتە گیرا دەبێت بە جێبەجێکردنی داواکەیان و وەرگرتنی پاداشتەکەی لە دواڕۆژدا. خەڵکی ئاسمانیش بە بانگی مزگەوتەکان رادەچڵەکن و نوێژ دادەبەستن و دوعای خێر بۆ بانگبێژان دەکەن.

---

[1] صحیح فقه السنة، ج١ /ص٢٧٣.

[2] صحیح فقه السنة، ج١ / ص٢٧٤، و ج١ / ص٢٦٤.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ (إذا نودي للصلاة فتحت أبواب السماء واستجيب الدعاء). صحيح**[1] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: هەر کە بانگدرا بۆ نوێژ دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوەو نزاو پاڕانەوەش گیرا دەبێت.

[1] رواه أبو يعلي رقم (٤٠٧٢)، والطيالسي رقم (٢١٠٦)، سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٨١٨.

## چیرۆکی بانگبێژێك

هەرکەس خودا کارەکەی پێ خۆش بێت لێشی خۆش دەبێت و چاوپۆشیشی لێ دەکات، کارێکی زۆر گرنگ و سەرسوورهێنەر دەکات و دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەموو تاوانەکانی، دەبێ ئەو کارە گرنگە چی بێت و چەندی ئەزیەت و کوێرەوەری بووێت.

**عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: (يعجب ربكم من راعي غنم في رأس شظية بجبل يؤذِّن بالصلاة ويصلي فيقول الله عزّ وجلّ: أنظروا إلى عبدي هذا يؤذن ويقيم الصلاة يخاف مني، قد غفرت لعبدي وأدخلته الجنة).**[1] واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (سەلامی خودای لێ بێت) دەیفەرموو: (پەروەردگارتان خۆشی دێت لە شوانی مێگەلێك لەسەر لوتکەی چیایەك بانگ دەدات و نوێژەکەی دەکات و خودا دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەی من بکەن بانگ دەفەرموێتو بە چاکیو رێکوپێکی نوێژەکەی دەکات، لە من دەترسێت، بەڕاستیی لەو بەندەیەم خۆش بووم و دەیخەمە بەهەشتەوە.

## پێشبڕکێ و تیروپشك بۆ بانگدان

پێشینی ئەم ئومەتی ئیسلامە بە تایبەتیش هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) زۆر داکۆکییان کردووە و هەوڵیان داوە بۆ بانگ وتن، تەنانەت جاری وا هەبوو کار گەیشتۆتە پێشبڕکێو کێبەرکێ و تیروپشك، کۆمەڵێ خەڵك مشتومڕیان بوو لەسەر بانگ وتن و نەدەگەیشتنە ئەنجام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس تیروپشکی کرد لە نێوانیاندا.[2]

بۆ کاری خێر، بۆ ئیشی چاك هاوەڵانی پێغەمبەر (سەڵامی خودای لێ بێت) لە پێش هەموو کەسەوە گەردنیان بەرز و سەریان بڵند بووەو خۆیان نەشاردۆتەوەو خۆیان نەدزیوەتەوە، چونکە پێغەمبەری خودا (سەڵامی خودای لێ بێت) وای راهێنابوون و پەروەردەی کردبوون.

---

[1] صحيح أخرجه أبو داود ١٢٠٣، والنسائي (المجتبى) رقم (٦٦٦) ٢ /٢٠، وأحمد ٤ / ١٥٨، وصحيح فقه السنة، ج١ / ص٢٧١.

[2] فتح الباري، ج٢ / ص٣٠١، ٣٠٢.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال (لو يعلم الناس ما في النداء والصف الأول ثم لم يجدوا إلاّ أن يستهموا عليه لاستهموا، ولو يعلمون ما في التهجير لاستبقوا اليه، ولو يعلمون ما في العتمة والصبح لأتوهما ولو حبواً).**[1] واته: له ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەری خودا (سەلاّتو سەلاّمی خودای لێ بێت) فەرمووی (ئەگەر خەڵکیی بیانزانیایە چەند خێر لە بانگدانو ڕیزی یەکەمی نوێژدایە ئینجا هیچ ڕێگەیەك نەبوایە لە تیروپشك زیاتر، بێگومان تیروپشکیان بۆ دەکرد، ئەگەر بیشیان زانیایە دواخستنی نوێژی نیوەڕۆ بۆ کاتی فێنك چەند خێرە پێشبڕکێیان بۆ دەکرد، ئەگەر بیانزانیایە نوێژی خەوتنان و بەیانی چەند خێرە بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاڵۆڵکەش[2] بێت).

بڕوانە ورەبەرزیی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خودای لێ بێت) بە ڕێگەدا دەڕۆیشت بانگی دەکرد نوێژ، نوێژ خەڵکی خەبەر دەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی، هەموو ڕۆژێکیش ئەم کارەی دەکرد.[3]

## بانگبێژان ئەمینداری ئوممەتن

بانگبێژ دەبێت کەسێکی بڕواداری ڕاستەقینەو ڕاستگۆو لەخواترس و ئەمین بێت و جێگەی متمانەی خەڵکیی بێت و زۆر ئاگاداری کاتەکانی نوێژ بێت، نابێ سەرقاڵیی کاتەکانی نوێژی لە بیر بباتەوە نابێ کەسێکی شپرزە و لەرزۆك و ورە ڕوخاوو بێ هیممەت بێت، هەر خەم و پەژارەیەك ڕووی تێکرد ئەرکەکەی خۆی لە یاد بکات، تەنانەت دەستنوێژیشی هەبێت چاکترە.

لەم بارەوە پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: **"أمناءُ المسلمين على صلاتهم وسحورهم المؤذنون".**[4] فەرمودەکە لە عەبدوڵلای کوڕی

---

[1] البخاري، رقم ٥٩٠و٦٢٤. ومسلم رقم ٤٣٧، وفتح الباري، باب الإستهام في الآذان ج٢ / ص٣٠١، وصحيح الجامع الصغير وزيادة رقم ٥٣٣٩، ورياض الصالحين رقم ١٠٣٣.

[2] گاڵۆڵكە: لەسەر ئەژنۆ ـ چنگەكرە.

[3] صلاح الأمة، ج٢ / ص٣٦٧.

[4] حسن، سنن البيهقي الكبرى رقم (١٨٤٩) / وسلسلة الأحاديث الصحيحة ١٤٠٣

عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) واتە: ئەمیندارو متمانەبەخشی موسڵمانان بۆ نوێژ و پارشێویان بانگبێژانن.

بە مەرج گیراوە بانگبێژ دەبێ نێرینە بێت و ژیرو پێگەیشتوو (بالغ) بێت, بە هیچ جۆرێ دروست نییە بانگبێژ بێبڕوا، یان شێت بێت. بەڵام بۆ منداڵی ژیرو زرنگ دروستە.

هەروەها دەبێ شارەزای سوننەتو کاتەکانی بانگ بێتو دەنگی بەرزو خۆش بێت و بە پێوە بانگ بفەرموێت, بەڵام لە سەفەردا بە سواریی دروستە بانگ بفەرموێت, هەروەها لە شوێنێکی بەرز راوەستێ و رووی لە قیبلە بێت و رووی بە لای راستا وەرگێڕێ لە (**حي علي الصلاة**) وە بە لای چەپدا لەگەڵ (**حي علي الفلاح**)و دەبێ دادپەروەر بێت پێغەمبەر فەرموویەتی (**الإمام ضامن والمؤذن مؤتمن**) پێشەوا کاری موسڵمانانی لە ئەستۆدایە، بانگبێژیش ئەمیندارە.[١]

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال قال رسول الله ﷺ الإمام ضامن والمؤذن مؤتمن، اللهم أرشد الأئمة واغفر للمؤذنين)**.[٢]واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی پێشەوا کاری موسڵمانانی لە ئەستۆدایە، بانگبێژیش ئەمیندارە، دەسا خودایە رێنیشاندەری پێشەوایان بکە و لە بانگبێژان خۆش بە.

هەروەها پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: (**المؤذن أُمناء المسلمين على صلاتهم وحاجتهم**).[٣]**حديث** حسن واتە: بانگبێژان ئەمینداری موسڵمانانن بۆ نوێژەکانیانو پێوستیەکانیان.

**وقد روى عن غير واحد من أصحاب النبي ﷺ إنهم قالوا: من سمع النداء فلم يجب فلا صلاة له)**.[٤]واتە زیاتر لە هاوڕێیەکی پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە (سەڵاتو

---

[1] المفصل ج١ ص٢٠٦

[2] رواه أبو داود ٥١٧، وتحفة الأحوذي ج١ ص٦٣٩ رقم ٢٠٧

[3] سنن البيهقي الكبرى رقم (١٨٧٥)، سلسلة الأحاديث الصحيحة ٦٦٤٦

[4] رواه الحاكم رقم (٨٩٣)، والبيهقي في السنن الكبرى رقم (٥٣٧٤)، والترمذي رقم (٢١٧)، تحفة الأحوذي ج١ ص٦٥٩

سەلامی خوای لیّ بیّت) کە فەرمویانە: هەرکەس گویّی لە بانگ بوو وەڵامی نەدایەوەو بە دەنگیەوە نەچوو نویّژەکەشی نەکردووە، یان ئەرکیّکی شەرعیی واز لیّهیّناوە.

**وعن إبن عباس عن النبي ﷺ: (من سمع النداء فلم يجب فلا صلاة له إلا من عذر).** [1] **اسناده صحيح** واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لیّ بیّ) لە پیّغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بیّت): (هەرکەس گویّی لە بانگ بوو بە دەنگیەوە نەچوو، وەڵامی نەدایەوە خیّری نویّژی نییە مەگەر بیانووی هەبیّت).

---

[1] رواه إبن حبان رقم (٢٠٦٤)، والبيهقي (٥٣٧٥)، تحفة الأحوذي ج١ ص٦٥٩.

# دەستنوێژ

## دەستنوێژ

وشەی (**الوضوء**) لە (**الوضاءة**)ەوە هاتووە، کە بە واتای (**النظافة والنضارة**) واتە: پاکوخاوێنی و گەشاوەیی یان درەوشاوەیی دێت.

(**والوُضوء بالضم**)، واتە: دەستنوێژ. (**والوَضوء بالفتح**)، واتە: ئاوی دەستنوێژ.

لە شەرعیشدا: واتە شۆردنی دەم و چاوو روخسارو هەردوو دەستەکان لەگەڵ ئانیشکەکانداو دەستی تەڕ هێنان بە سەرداو شۆردنی هەردوو قاچەکان لەگەڵ قولەپێکان.

خوا لە قورئاندا دە فەرموێت: "**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ**". (**المائدة: ٦**). واتە: (هۆ گەلی بڕواداران) ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر هەستان بۆ نوێژکردن، روخسار و دەستەکانتان لەگەڵ ئانیشکەکان بشۆرن، دەستی تەڕ بە سەرتاندا بێنن و قاچەکانتان بشۆرن لەگەڵ گۆزینکەکان. لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا (سەلامی خودای لێ بێت) هاتووە:

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: (لا تقبل صلاة أحدكم إذا أحدث حتى يتوضأ)**.[1] واتە لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: هیچ یەکێ لە ئێوە نوێژی لێ وەرناگیرێ کە بێ دەستنوێژ بوو هەتا دەستنوێژ نەگرێت.

**وعن إبن عمر (رضي الله عنه) قال: إني سمعت رسول الله ﷺ يقول (لا يقبل صلاة بغير طهور، ولا صدقة من غلول)**.[2] واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (رەزای خودایان لێ بێت) فەرمووی خۆم گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) دەیفەرموو (خودا نوێژ وەرناگرێ بە بێ دەستنوێژ (پاك و خاوێنی) وە خێریش وەرناگرێ لە دزی دەستکەوتی جەنگ).

---

[1] صحيح أخرجه البخاري، ٦٥٥٤، ومسلم ٢٢٥، وغيرهما، صحيح فقه السنة، ج١ / ص١٠٨.

[2] صحيح أخرجه مسلم، ٢٢٤.

**وعن إبن عباس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: (إني أمرت بالوضوء إذا قمت إلى الصلاة).**[1] واته له عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خودایان لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: (بەڕاستیی فەرمانم پێ کراوە بە دەستنوێژ هەر کات هەستام بۆ نوێژ). فەرمودەی تر زۆرە لەسەر دروستی و گەورەیی چۆنیەتی دەستنوێژ و فەرز و سوننەتەکانی.

## گەورەیی و پلە و پایەی دەستنوێژ

دەستنوێژ نیوەی ئیمانە و تاوان و گوناه و خراپە دەسڕێتەوەو پلەو پایەی بەندە بەرز دەکاتەوە، دەستنوێژ ڕێگەی بەهەشتەو بە هۆیەوە پێغەمبەری خودا (سەلامی خودای لێ بێت) ئوممەتەکەی دەناسێتەوە، لاشەی بڕوادار ئەوەندەی بە ئاوی دەستنوێژ تەڕ بووبێت و ئاوی دەستنوێژی بەرکەوتبێت بە خشڵ و زێڕ و زیو و گەوهەر دەڕازێتەوە.

نوێژ کە گەورەترین خوداپەرستیەو لە دوای شایەتمان لە هەموو پایەو فەرزو ئەرکە شەرعییەکان گەورەترە، بەبێ دەستنوێژ دروست نییەو وەرناگیرێ.

دەستنوێژ پاك و خاوێنییە, خۆپاراستنە لە پیسی و چەپەڵی، حەج بەبێ (تەواف) هەڵسووران بە دەوری رووگەی بڕواداراندا دروست نییە، چونکە پایەی حەجە، (تەوافیش) بەبێ دەستنوێژ دروست نییە. دەستنوێژ، پەرستنە پەرستنیش بۆ جگە لە خودا دروست نییە.

ئەو تاوانانەی بە دەست و زمان و چاوەکان و گوێچکەو قاچ و لوت و سەرتاپای ئەندامەکانی لەش دەکرێن، دەستنوێژ رایان دەماڵێت و لە بن و بێخیان دێنێت. ئەوەندەی گرنگی بە شۆردنی ئەندامەکان ئەدەی کە جێگەی روانینی خەڵکییە، دەبێ زۆر زیاتر لەوە گرنگیی بدەی بە دڵو دەروون، کە جێگەی تێڕوانینی خودایە.

دەستنوێژ سوننەتە بۆ کاتی خەوتن و فەرزو ئەرکی شەرعیە لەسەرمان بۆ مردووەکان و کاتێك کەسێکمان دەمرێت و توانای دەستنوێژی نامێنێ ئەرکی شەرعییەو پێویستە لەسەر زیندوەکان و هەقی مردووەکانە دەستنوێژی بۆ بگرن و بە

---

[1] صحيح أخرجه الترمذي ١٨٤٧، وأبو داود ٣٧٦٠، والنسائي (المجتبى) رقم (١٣٢) ١ / ٨٥، صحيح الجامع ٢٣٣٣، صحيح فقه السنة، ج١ / ١٠٨.

پاکی ئەسپەردەی خاکی بکەن. دەستنوێژ کە شۆردن و پاککردنەوەی هەندێك لە ئەندامەکانی لاشەیە لە جێی هەموو ئەندامەکانی تر.

شۆردنی ئەو ئەندامانە رەمزە بۆ واتایەکی پەنهانی کە پاکردنەوەی ئەو ئەندامانەیە لە هەموو خراپەو دزی و گزییەك کە دەتوانێت پێیان بکرێت هەر وەکو روکەشی و پێستی ئەو ئەندامانە لە چڵك و پیسی و عارەق و بۆنی ناخۆش و تەپوتۆز پاککراوەتەوە.

ئەگەر دەستنوێژ واتایەکی شاراوە و پەنهانی گەورەتری نەبێت جیاوازیی چی دەبێت لە نێوان دەستنوێژی هاوەڵانی پێغەمبەر کە چاوو قاچیان شتوە لەگەڵ دەموچاو و قاچو دەستی دووڕووەکان کە تەنها چڵك و پڵکی روکەشی لێکراوەتەوە لە بەرامبەردا ئەو ئەندامە شۆراوانە لە هیچ خراپەیەك نەپارێزراون. بەڵام دەستنوێژی هاوەڵانی پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) رەمزی پاك و بێگەردی ئاشکراو پەنهانی بوون و ناوو ناوەڕۆکی دەستنوێژیان یەك بووە کە رووی دەرەوەی ئەندامەکانیان شۆردوە رووی ناوەوەشیان پاراستوە لە هەموو بێ فەرمانییەکی خودا, لە هەر ناشەرعییەك، لە هەموو کارو کردارو گوفتارو خەیاڵ و خەتەر و بیرکردنەوەیەك کە فەرمانی خودا و پێغەمبەری لەسەر نەبێت.

بابای دەستنوێژگر بە شۆردنی روخسارو دەموچاوی گوناهو تاوانەکانی پێشووی لێ دەسڕێتەوە و پەیمان و بەڵێنێکیشە کە لە داهاتوودا ئەوەی بە سەرمەوەیە دەیپارێزم لە خراپە و بێ فەرمانی خودا و پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت).

شۆردنی دەستەکانیش بە هەمان شێوە داماڵین و شۆردنی پێستی تاوانبارییەو وادەو بەڵێنی پاك راگرتنە لە داهاتوودا.

دەستی تەڕ هێنان بەسەردا یان بەشێك لەسەردا ئەگەر سێ مووش بێت، هەمان پاکسازی و بەڵێن و پەیمانە، کە بڕواداری راستەقینە باش لێی حاڵییە کە دەبێ میشك و مۆخ و ئێسقان و بیرو ئەندێشەی بپارێزێ لە هەموو بەتاڵ و خەون و خەیاڵێك، لە هەموو چەواشەکاری و خەیاڵی ئەفسوناوی و بیری پڕوپوچ و بێ ناوەڕۆك، ئەگەرنا دەستی تەڕ هێنان بەسەر سێ موودا یان بەشێك لەسەردا چی واتایەك دەگەیەنێت. ئایا کەسێکی دەست بە دەستنوێژ لێی قبووڵ دەکرێت مێشك و مۆخی بکاتە گەراخانەی فیکرو بیری نەزۆك و نەکڵۆك لە جیاتی هەقو راستی، درۆو دەلەسەو پەستی تێئاخنێ

و بیکاتە شەیتان بازاڕ. شۆردنی قاچەکانیش لابردنی هەموو چڵك و پڵك و عارەق و بۆنی ناخۆشە، رۆژی بە لایەنی کەمەوە پێنج جار، تا تاوانەکانی رەگ دانەکوتن و گەرا دانەنێن، لە بەرامبەریشدا رۆژی هەر نەبێ پێنج جار پەیمان و بەڵێن تازە دەکاتەوە لەگەڵ خودای خۆیداو بە زمانی حاڵ دەڵێ خودایە ئەم قاچانەم ئاوا پاك و بێگەرد را دەگرم لە ژەنگ و ژاری چڵك و چەپەڵ و گوناهو بێفەرمانیی خودا لە روکەش و پەنهاندا.

## دەستنوێژ نیوەی ئیمانە

دەستنوێژ راستەوخۆ پەیوەندیی بە ئیمانەوەیە، چونکە دەستنوێژ رەمزی پاك و خاوێنییە لە ئاشکرا و پەنهانی بڕواداردا، بڕواش رەمزی پاك و بێگەردی دڵ و دەروونە لە فەرمودەشدا هاتووە بەم شێوەیە: **عن أبي مالك الأشعري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ (الطهور شطر الإيمان)**[1]. واتە: لە ئەبی مالیکی ئەشعەرییەوە (رەزای خودای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "پاکوخاوێنی (دەستنوێژ) نیوەی ئیمانە".

دەستنوێژ و خۆشتن کە پێویستن موسڵمان ئەنجامیان بدات و بەبێ ئەو دوانە نوێژ دروست نییە، هەردوکیان پەیوەستن بە ئیمانەوە و لەگەڵیدا جۆش دراون، ئەمانەتێکی نهێنییە تەنها خودا لێی ئاگادارە، ئەگەر کەسێك بەبێ دەستنوێژ و تەنانەت بە لەشی گرانیشەوە نوێژ بکات، کێ پێی دەزانێت؟ کێ دەتوانێت بڵێ نوێژەکەی دروست نییە.

## دەستنوێژ رێگەی بەهەشتە

کەسانی پاکو بێگەرد نەبێ ناچنە بەهەشتەوە مەگەر خودا بە بەخشندەییو چاکەی خۆی کەسانێك ببەخشێت کە گوناهبار بن، دەستنوێژیش رەمزو کانگای پاکیەتییە کە بە لایەنی کەمەوە پێنج جار دووبارە دەبێتەوە کەسانی باوەڕداری راستەقینە بە دەستنوێژەکەیان بەهەشتیان دەستگیر بووە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال لبلال: (يا بلال حدثني بأرجى عمل عملته في الإسلام، إني سمعت دفّ نعليك بين يديّ في الجنة قال: ما**

[1] صحيح أخرجه مسلم ٢٢٣ وغيره، صحيح فقه السنة، ج١ / ص١٠٨، رياض الصالحين رقم ١٠٣١.

**عملت عملاً أرجى عندي من أني لم أتطهر طهوراً في ساعة من ليل أو نهار إلاّ صليت بذلك الطهور ما كتب لي أن أصلي)**[1]. واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: ئەی بیلال پێم بڵێ ئومێدت بە کام کردەوەت زۆرە لە ئیسلامدا، بەڕاستیی گوێم لە خشەی نەعلەکەت بوو لە پێشمەوە لە بەهەشتا، فەرمووی: هیچ کردەوەیەکی وام نەکردووە زۆر جێگەی ئومێد بێت لام، ئەوە نەبێت هەر کات دەستنوێژم گرتبێت بە شەو یان بە ڕۆژ بەو دەستنوێژە ئەوەندەی خودا بە نسیبی کردبێت نوێژم پێ کردووە.

## دەستنوێژ گوناهو تاوان دەسڕێتەوە

دەستنوێژ ژەنگ و ژار و تۆز و خۆڵی تاوانەکان دەشواتەوە. **عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: (إذا توضأ العبد المسلم، أو المؤمن، فغسل وجهه خرج من وجهه كل خطيئة نظر إليها مع قطر الماء، أو مع آخر قطر الماء، فإذا غسل يديه خرجت من يديه كل خطيئة كان بطشتها يداه مع الماء، أو مع آخر قطر الماء، فإذا غسل رجليه خرجت كل خطيئة مشتها رجلاه مع الماء، أو مع آخر قطر الماء، حتى يخرج نقياً من الذنوب)**[2]. واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەری خودا (سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی (هەر کات بەندەیەکی موسڵمان یان (بڕوادار) دەستنوێژی گرت و روخساری شۆرد هەرچی تاوانێك بە سەیر کردن کردویەتی لە دەم و چاوی هەڵدەوەرێت لەگەڵ دڵۆپی ئاوەکەدا یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپی ئاوەکەدا. هەر کە دەستەکانی شۆرد هەر تاوانێك بە دەستەکانی کردبێتی لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵدەوەرێت. یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپی ئاوەکەدا. هەرکات قاچەکانی شۆرد هەموو تاوانێك بە لاقەکانی کردبێتی و بۆی ڕۆیشتبێت لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵدەوەرێت ـ یان لەگەڵ کۆتا دڵۆپی ئاوەکەدا ـ تا بە پاك و بێگەردی و بێ تاوان دەرباز دەبێت).

---

[1] صحيح أخرجه البخاري ١٠٩٨، ومسلم ٢٤٥٨، صحيح فقه السنة، ج١ / ص١٠٩.

[2] صحيح أخرجه مسلم ٢٤٤ وغيره، صحيح فقه السنة، ج١/ص١٠٩، .

**وعن عثمان (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: (من توضأ هكذا غفر له ما تقدم من ذنبه، وكانت صلاته ومشيه إلى المسجد نافلة)**[1]. واته له عوسمانەوه (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: هەرکەس ئاوا[2]دەستنوێژ بگرێت چاوپۆشی له هەموو پێشووی دەکرێت، خێری نوێژەکەی و ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت بە خێر بۆی دەنووسرێ.

**ففي حديث عثمان في صفة وضوء النبي ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ (من توضأ مثل وضوئي هذا ثم قام فصلى ركعتين لا يحدث فيهما نفسه غفر له ما تقدم من ذنبه)**[3]. واته: له فەرموودەی **عوسماندا** (ڕەزای خودای لێ بێت) له وەسفی دەستنوێژی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس دەستنوێژ بگرێت وەکو ئەم دەستنوێژەی من، ئینجا هەستێ دوو ركات نوێژ بكات بەبێ داڵغەو غایله، چاوپۆشی دەكرێت له هەموو گوناهەكانی ڕابردووی.

**وعن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ (من توضأ فأحسن الوضوء خرجت خطاياه من جسده حتى تخرج من تحت أظفاره)**[4]. واته: له **عوسمانی** کوڕی عەففانەوه (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: (هەرکەس دەستنوێژ بگرێت بە چاکترین دەستنوێژ تاوانەکانی له لاشەی دەردەچن تا له ژێر نینۆکەکانییەوه هەڵدەوەرن).

## بەدەستنوێژ گرێکوێرەی شەیتان دەکرێتەوە

شەیتان حەز دەکات موسڵمان زۆر بخەوێتو خەوخۆش بێت, خەو قورس بێت, زوو بخەوێت و درەنگ بەخەبەر بێت، تەنانەت دوعای شەوی درێژو خەوی قووڵ و گرانی بۆ دەکات. شەیتان پێی خۆشە خواپەرستان زۆربەی ژیانیان بە خەو بەسەر بەرن تا زیاتر له دونیاو خەڵکی دونیا بێ خەبەر بن.

---

[1] صحيح أخرجه مسلم ٢٢٩، وغيره.

[2] واته: وەکو ئەم دەستنوێژەی من هەموو فەرز و سوننەتەكانی دەستنوێژ جێبەجێ بكات.

[3] صحيح أخرجه البخاري رقم (١٥٨)و (١٦٢)، ومسلم ٢٢٦، وغيرهما.

[4] رواه مسلم رقم (٢٤٥)، رياض الصالحين رقم ١٠٢٦، ص٢١٧.

پێغەمبەری گەورەمان (سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەرەکان بەچاو دەخەوتن و دڵیان بەردەوام هۆشیار و بەخەبەر بووە.

شەیتان نەفرەتی لێ بێت بۆ گەیشتنی بە ئاوات خۆی زۆر رێگەی گرتۆتەبەر لەوانەش:

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "يعقد الشيطان على قافية رأس أحدكم إذا هو نام ثلاث عقد يضرب على مكان كل عقدة عليك ليل طويل فارقد, فإن أستيقظ فذكر الله انحلت عقدة، فإن توضأ انحلت عقدة، فأن صلى انحلت عقدة، فأصبح نشيطا طيب النفس, وإلا أصبح خبيث النفس كسلان".** [1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: شەیتان لەسەر پشتە سەری هەر یەکێکتان سێ گرێ دەبەستێ و لە هەموو گرێیەکیشدا دەڵێ: (شەوێکی درێژ! دەبخەوە! جا ئەگەر بەخەبەر هات و یادی خوای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە, ئەگەر دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژیشی کرد گرێکەی تر دەکرێتەوە, ئەوسا رۆژ بە دەروونێکی ئاسوودەو چوستو چالاکەوە دەکاتەوە، ئەگەرنا دەروون پیس و تەمەڵ و تەوەزەل دەبێ.

**قال البيضاوي (رحمه الله): "يحل عقد الشيطان بثلاثة: الذكر، الوضوء، الصلاة".** واتە: بەیزاوی (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: گرێ کوێرەی شەیتان بە سێ شت دەکرێتەوە: یادی خوا، دەستنوێژ، نوێژکردن.

## بە دەستنوێژ پلەو پایەی بڕوادار بەرز دەبێتەوە

بە هەموو خواپەرستییەك بەندە ئەندازەیەك لە خوا نزیك دەبێتەوەو پلەی بەرز دەبێتەوە, بەڵام تا پەرستشەکە گەورەتر بێت زیاتر پلەو پایەی خواپەرستەکەی پێ بەرز دەبێتەوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "ألا أدلكم على ما يمحو الله به الخطايا ويرفع به الدرجات؟ قالوا: بلى يارسول الله! قال: اسباغ الوضوء على**

---

[1] صحيح أخرجه البخاري ١٠٩١ و مسلم ٧٧٦ واللفظ للبخاري. وصحيح فقه السنة ج١ ص١١٠.

**المكاره ...".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لەسەر بێت) فەرمووی ئەرێ چاوساغیتان بکەم بۆ سەر ئەو شتەی خودا تاوانەکانتانی پێدەسرێتەوە و پلەکانتانی پێ بەرز دەکاتە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی دەستنوێژگرتن بە چاکی لە کاتی ناڕەحەتیدا.

## ئوممەتی ئیسلام بە شوێنەواری دەستنوێژ دەناسرێتەوە لە دوارۆژدا

شوێنی دەستنوێژ لە ئەندامەکانی لەشدا لە ڕۆژی دواییدا دەدرەوشێتەوە، بە هۆیەوە هەموو بڕواداران و نوێژخوێنانی ئوممەتی موحەممەد (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) دەناسرێتەوە، هەرکەسیش ئەو ڕەمزو مەشخەڵەی پێوە نەبێت لە ئوممەتی موحەممەد نایەتە ژمار وەکو لە فەرمودەکاندا دەردەکەوێت. بڕوادارانی ئوممەتی ئیسلام هەر بەو سیفەت و ناونیشانە بانگ دەکرێن و جیا دەکرێنەوە لە تەواوی ئوممەت و گەلانی تر.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعت النبي ﷺ يقول: "إن أمتي يدعون يوم القيامة غرا محجلين من آثار الوضوء فمن إستطاع منكم أن يطيل غُرته فليفعل". متفق عليه.**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەر بوو (سەلامی خودای لێ بێت) دەیفەرموو: "بێگومان ئوممەتی من لە ڕۆژی دواییدا بە وەسفی دەست و دەم و چاو و قاچی جوانی و پرشنگدارەوە بانگ دەکرێت کە شوێنەواری دەستنوێژە، جا هەرکەس دەستوانی نوری دەست و روخساری درێژ بکاتەوە با هەوڵی بۆ بدات".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ أتى المقبرة فقال: "السلام عليكم دار قوم مؤمنين, وإنا إن شاء الله بكم لاحقون وددت أنا قد رأينا إخواننا: قالوا: أو لسنا إخوانك يارسول الله؟ قال: أنتم أصحابي، وإخواننا الذين لم يأتوا**

---

[1] صحيح أخرجه مسلم باب فضل اسباغ الوضوء على المكاره ٢٥١ واللفظ له, والترمذي ٥١ وغيرها- صحيح فقه السنة ج١ ص١٠٩. رياض الصالحين ١٠٣٠. وتحفة الأحوذي، ج١ ص ١٧٧ الطبعة الأولى.

[2] متفق عليه، البخاري ١٣٦ باب فضل الوضوء الغر المحجلون، واللفظ له ومسلم ٢٤٦، ورياض الصالحين رقم ١٠٢٤.

**بعد، قالوا: كيف تعرف من لم يأتوا بعد من أمتك يارسول الله ؟ فقال: أرأيت لو أن رجلاً له خيل غير محجلة بين ظهري خيل دهم بهم, ألا يعرف خيله؟ قالوا: بلى يارسول الله, قال: فإنهم يأتون غرا محجلين من الوضوء وأنا فرطهم على الحوض ..."**[1] غر: **بياض في** رأسها، دهم: أسود.[2]واته: له ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚت) پیٚغەمبەری خوا (سەلاٌتو سەلامی خوا لیٚ بیٚ) چووە گۆڕستان و فەرمووی: (سەلامی خواتان لیٚ بیٚ)، خانەی بڕواداران بە ویستی خوا ئیٚمەش بە ئیٚوە دەگەین، بەڕاستیی پیٚم خۆش بوو ئیٚمەش براکانمان ببینیایە، فەرموویان: ئەی ئیٚمە برای تۆ نین ئەی پیٚغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئیٚوە هاوڕیٚی منن، براکانمان جاریٚ نەهاتون, وتیان: چۆن یەکیٚك دەناسی کە تا ئیٚستا نەهاتبیٚ لە ئوممەتەکەت ئەی پیٚغەمبەری خوا؟ فەرمووی دەبینن ئەگەر پیاویٚك رەوە ئەسپیٚکی هەبیٚ قەشان و مەچەك سپی لەناو کۆمەلیٚ ئەسپی رەش و بۆزدا و یەك رەنگدا, ئایا ئەسپەکانی خۆی ناناسیٚتەوە؟ وتیان بەلیٚ ئەی پیٚغەمبەری خوا، فەرمووی: دە ئەوانیش دیٚن بە روخسارو دەست و قاچی درەوشاوە و نورانییانەوە لە شویٚنەواری دەستنویٚژ من چاوەڕیٚیان دەکەم لەسەر حەوزەکەم. دهم: واتە: رەش، غر: واتە: قەشان، ناوچەوان سپی.

## دەستنویٚژ نورە لە رۆژی دواییدا بۆ بڕوادار

شویٚنەواری دەستنویٚژ لە روخسارو دەست و دەم و چاو و قاچەکاندا نورانی و پرشنگدار دەبیٚت، هەروەکو بە خشلٌ و ئالٌتون و زیٚڕ و زیو و گەوهەر رازابیتەوە، چونکە خودا ئەوەندە دەستنویٚژ و پاکو خاویٚنی بەندەکانی پیٚ خۆشە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعت خليلي ﷺ يقول: "تبلغ الحلية من المؤمنين حيث يبلغ الوضوء". والحلية هي: النور يوم القيامة.**[3]واتە: لە ئەبی

---

[1] رواه مسلم ٢٤٩ واللفظ له وأخرجه النسائي وإبن ماجه.

[2] شرح رياض الصالحين لعثيمين ج٣ ص٢٢١.

[3] والحديث الصحيح أخرجه مسلم رقم ٢٥ واللفظ له، مختصر النسائي ١٤٩، مختصر صحيح مسلم ١٣٤، وصحيح فقه السنة ج١ ص١١.

هورەیرەوە (رەزای خودای لیّ بیّت) فەرمووی گویّم لە خۆشەویستم بوو (سەلاّت و سەلامی خودای لیّ بیّت) دەیفەرموو نورو درەوشانەوە لە بڕوادارا دەکاتە ئەو شویّنەی ئاوی دەستنویّژی گەیشتۆتیّ. **الحلية:** واتە نوریّکی تایبەتییە لە رۆژی دواییدا.

## دەستنویّژ کلیلی هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتە

دەستی بە دەستنویّژ کە پاك و بیّگەرد بیّت لە چلّك و چەپەلّ لە هەمان کاتدا لە گوناهوتاوان شایستەیە دەرگای بەهەشتی بۆ بخریّتە سەر پشت، دەستیّك رۆژیی بە لایەنی کەمەوە پیّنج جار بشۆریّت و رۆژی پیّنج جار بەلیّن و پەیمان لەگەلّ خودای خۆیدا تازە بکاتەوە کە هیچ جۆرە خراپەیەك بەو لاشەیە ناکات کە دەستنویّژی پیّ گیراوە.

گیّڕدراوەتەوە کە قازیی ئەبو تەییب سواری پاپۆڕیّکی بارکیّشی دەریایی دەبیّت لە کاتیّکدا تەمەنی لە نزیکی سەد سالّیدا دەبیّت, دەیەویّت لەناو پاپۆڕەکەوە خۆی هەلّداتە ناو دەریاکە، هاوڕیّکانی پیّیان وت: ئەی شیّخ! کاری وا نەکەیت رزگارت نابیّت، یان توشی ئازار دەبیت، ئەویش فەرمووی ئەم ئەندامانەم لە هەموو تاوان و بیّ فەرمانییەکی خودای خۆم پاراستوە خوداش ئەو لاشەیە دەپاریّزیّت **"احفظ الله يحفظك"**. واتە: خۆت بپاریّزە لە بیّ فەرمانی خودا، خوداش دەتپاریّزیّت.[1]

پاك و خاویّنە ئەگەر دەروونی و دەرەکی بیّ ئەگەر چاکو خاویّنی پۆشاك و لاشەو دلّ و دەروون بیّت لە چلّك و چەپەلّی لاشەو پۆشاك و گوناهو تاوان و تاوانە دەروونییەکان شایستەی بەهەشت و خۆشەویستی خوایە **"ويحب المتطهرين"**. واتە: خوا پاك و بیّگەردانی خۆش دەویّ.

**عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) ـ عن النبي ﷺ قال: "مامنكم من أحد يتوضا فيبلغ أو فيسبغ الوضوء ـ ـ ثم قال أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له, وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، إلا فتحت له ابواب الجنة الثمانية يدخل من أيها شاء".**[2] واتە: لە عومەری کوڕی خەتتابەوە (رەزای خودای لیّ بیّت) گیّڕدراوەتەوە،

---

[1] باخچەی شکۆداران.

[2] رواه مسلم ٢٣٤ عن عقبة بن عامر واللفظ له, ورياض الصالحين رقم ١٠٣٢ وشرح العثيمين ج٣ ص٢٢١ وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٨٠٣ بلفظ آخر.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ئێوە دەستنوێژێکی تەواو و باش بگرێت پاشان بڵێ (شاهێدیی ئەدەم واتە بە دڵ بڕوام هەیە کە هیچ خودایەك نییە بەحەق بێجگە لە الله و هاوبەشی نییە وەبە دڵ بڕوادەکەم کە موحەممەد بەندەو رەوانەکراوی خودایە) حەتمەن هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی لێ دەکرێتەوە لە کامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە.

## خودا خۆشی دێت لە دەستنوێژ

دەستنوێژ خواپەرستیە, پەرستنێك کە هەمووی پاکو خاوێنی و پاکو بێگەردییە لە رواڵەت و ئاشکراو پەنهانی بڕواداردا، بۆیەش خودا خۆشی لێ دێت، چونکە خودا جوان و پاك و بێگەردە، شتی جوان و چاك و بێگەردیش نەبێت وەرناگرێت.

پیاوێکی یاریدەر (أنصار) بە لای کۆڕێکدا تێدەپەڕیو پێیان دەفەرموێت: **"توضؤوا فإن بعض ماتقولون شرّ من الحدث!"**. واتە: "دەستنوێژ بگرن، چونکە بێگومان هەندێك لەو قسانەی ئێوە لە بێ دەستنوێژی خراپترن". بۆیە پێشینی ئەم ئوممەتە زۆر گرنگییان بە دەستنوێژگرتن داوەو هەوڵیان داوە لە زۆربەی کاتەکانی ژیانیاندا دەست بەدەستنوێژ بن.

جەعفەری کوڕی نوسەیری دینەوەری پرسیاری کرد لە بەردەستەکەی، چیت لێ بینیوە: وتی لە کاتی مردنیدا فەرمووی یەك (درهەم)ی داگیر کراوم لابوو هەزاران درهەمم زیاتر بۆ کردووە بەخێر، بەڵام هیچ شتێك لەوە زیاتر سەرقاڵی نەکردوم، ئینجا فەرمووی: دەست بخەمە ناو ریشی, زمانیشی بەسترابوو، دەستی گرتم ریشی خۆی پێ هەڵگلۆفی ئینجا مرد. بۆیە جەعفەر گریاو فەرمووی چی دەڵێن دەربارەی پیاوێك لە دواهەناسەیدا نەیهێشتوە ئادابیکی شەرعی لە دەست دەرچێ.[1]

**قال رسول الله ﷺ: "إن الله طيب يحب الطيب، نظيف يحب النظافة، كريم يحب الكرم، جواد يحب الجود، فنظفوا أفنيتكم ولا تشبهوا باليهود".**[2] واتە:

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج٢ ص٢٣٢ ـ ٢٣٣.

[2] صحيح وصايا الرسول ج٢ ص٣٩٧ / أخرجه الترمذي وقال غريب. وقال الشيخ الألباني: حديث حسن. المشكاة (٤٤٨٧).

پێغەمبەری خودا (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "خودا چاکە و چاکەی پێخۆشە, پاکەو پاکژی پێخۆشە، بەڕێزەو بەڕێزیی پێخۆشە, بەخشندەیەو بەخشندەیی پێخۆشە، دەوروبەرتان "ماڵ و مەنزڵتان" پاك بکەنەوەو چاو لە جولەکە مەکەن.

هەروەها خودا لە قورئاندا دەفەرموێت: "**إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ**". واتە: خودا بێگومان تەوبەکارانی خۆش دەوێت و پاکژەکان و پوختەکانی خۆش گەرەکە.

خودا ئاوی پاکی داباراندوە بۆ بەندەکانی لە ئاسمانەوە "**وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً**". واتە: لە ئاسمانەوە ئاوی پاك و خاوێنکەرەوەمان بۆ باراندون.

پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: "**ان الماء طهور لا ينجسه شيء**". واتە: بێگومان ئاو پاك و خاوێنکەرەوەیە، هیچ شتێك پیسی ناکات.[1]

هەروەها خودا دەفەرموێت: "**فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ**". (**التوبة**: ١٠٨). واتە: پیاوانێك لەو مزگەوتەدان حەز دەکەن پاك بن، خواش پاکانی خۆش دەوێت.

## پاکی ئاشکرا و پەنهان

خوا فەرمانی بە ئیبراهیم و ئیسماعیلی خۆشەویست و پێغەمبەری خۆی کرد، بەم شێوەیە: "**وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ**". (**البقرة**: ١٢٥). واتە: "ئیبراهیم و ئیسماعیلم راسپارد کە ماڵی من پاك بکەنەوە بۆ حاجییانو خەڵوەتکێشانو سوژدەبەران".

هەمان راسپاردە بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) لە سوڕەتی حەجدا دووبارە بۆتەوە لە (ئایەتی ٢٦).

وشەی (**طهر**) بە هەموو شێوازە دارژاوەکانیەوە نزیکەی (٣١) سی و یەك جار لە قورئاندا هاتووە. کە هەمووی بەڵگەیە لەسەر گرنگی پاك و خاوێنی, ئاشکرا و پەنهانی.

---

[1] واتە: هەر ئاو شت پاك دەکاتە نەك شت ئاو پیس بکات بەشێوەیەکی گشتی.

خودا واجبی کردووەو کردویەتییە ئەرکێکی شەرعیی، رۆژی پێنج نوێژ بە دەستنوێژەوە بکرێت.

خودا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات و دەفەرموێت: **"وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ"**. واتە: پۆشاکت خاوێن رابگرە. کاتێکیش کابرای عەرەبی دەشتەکی لە مزگەوتی پێغەمبەردا میزی کرد، پێغەمبەر فەرمانی کرد بە هاوەڵە بەرێزەکانی بەئاو پاکی بکەنەوە و بیشۆرنەوە[1].

کاتێکیش لەشگران بوون خودا دەفەرموێت: **"وَإِن كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُواْ"**. واتە: ئەگەر لەشگران بوون خۆتان بشۆن و خۆتان پاك بکەنەوە.

تەنانەت خودا هەموو سەرزەوی پاکژ راگرتووەو کردویەتیە مزگەوت و شوێنی نوێژ، دەربارەی ئەم باسەش پێغەمبەر دەفەرموێت: **"جعلت الأرض كلها لي ولأمتي مسجدا، فأينما أدركت رجلاً من أمتي الصلاة فعنده مسجده وعنده طهوره"**.[2] واتە: زەوی هەمووی بۆ خۆم و ئوممەتەکەم کراوەتە مزگەوتو پاك و خاوێن کراوە، لەهەر کات و شوێنێکدا کەسێکی ئوممەتم کاتی نوێژی هات مزگەوتەکەی و پاکی و پاکەرەوەکەی لەوێیە.

هەروەها خودا دەربارەی پاکی زەوی دەفەرموێت لە ئایەتێکدا: **".. فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً"**. **(المائدة ٦)**. واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت لەو حاڵەتانەدا نیازی بەکارهێنانی تۆزی پاکی زەوی بکەن بۆ روخسارو دەستەکانتان.

## دەستنوێژ، دەرکردنی شەیتان و لابردنی تورەییە

لە ئامۆژگاریو وەسیەتەکانی پێغەمبەری پێشەوامانداا باسی چارەسەری یەکێك لە دەردە کوشندە دەروونییەکان هاتووە کە تورەییە و چارەسەرەکەشی دەستنوێژگرتنە، ئادەمیی ئەگەر تورە دەبێت عەقڵی وەکو خۆی نامێنی حاڵەتی ئاسایی نییە، زۆر جاریش هەڵەو شەرو ئاژاوە و زەرەرو زیان گەیاندن بە خۆیو خەڵکی، بە ژنو منداڵ، بە خزمو دراوسێو هاورێو دایكو باوکی دەگەیەنێت و سەرئەنجامەکەشی پەشیمانییە.

---

[1] متفق عليه، البخاري ٦٠٢٥ ومسلم رقم ٢٨٤.

[2] حسن أخرجه احمد رقم (٢٢١٩٠)، ٥/ ٢٤٨. صحيح فقه السنة ج١ ص١٨٨.

توڕەبوون بۆ کەسێك نەخۆشیی دڵی هەبێت زیانی زۆرە لە بەرزبوونەوەی فشاری خوێنو خێرابوونو پەلەکردنی لێدانی دڵ و هەڵچون و جەڵتەی دڵ.

پێغەمبەری سەردار و سەرمەشقی بەرەی ئادەمی و پەریی چارەسەری بۆ ئەم حاڵەتە نائاساییە و بۆ ئەم دیاردە دزێوە و سیفەتە خراپە چەند شتێکە، یەکێك لەوانە دەستنوێژگرتنە.

**عن عطية السعدي (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إن الغضب من الشيطان وإن الشيطان خلق من النار وإنما تطفأ النار بالماء فإذا غضب أحدكم فليتوضأ".**[1] واتە: لە عەتییەی ئەلسەعدییەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەری خودا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: بێگومان توڕەیی لە شەیتانەوەیە و شەیتانیش لە ئاگر دروست کراوە، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، کەواتە ئەگەر کەسێك لە ئێوە توڕە بوو با دەستنوێژ بگرێت.

## دەستنوێژ سوننەتی پێغەمبەرانە

هەموو پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لێ بێت) نوێژیان کردووە بە جۆرێك لە جۆرەکان کە خودای گەورە بەرنامەڕێژیی بۆ کردون و سوننەت و ڕێ و شوێنی بۆ داناون، نوێژیش بە بێدەستنوێژ دروست نییە، لەم ڕوانگەیەوە دەردەکەوێت دەستنوێژگرتن و پاکوخاوێنی و پاکژی سوننەتی هەموو پێغەمبەران بووە.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "من توضأ واحدة، فتلك وظيفة الوضوء التي لابد منها ومن توضأ اثنتين فله كفلان ومن توضأ ثلاثا، فذلك وضوئي ووضوء الأنبياء قبلي".**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خودایان لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەرکەس دەستنوێژ بەیەکجار شۆردن بگرێت ئەوە کاری پێویستی دەستنوێژەو بەبێ

[1] رواه أبو داود رقم ٤٧٨٤، ضعيف/ الحكمة النبوية ص١٠١ ـــ ١٠٢ و ج٣ ص٣٠٨ صحيح وصايا الرسول.

[2] رواه احمد رقم ٥٧٣٥، ضعيف ٢/ ٩٨، الأحاديث المنتخبة ص١٦٥. الترغيب والترهيب.

ئەوجارە نابێت، هەرکەسیش دەستنوێژ بگرێت بە دووجار ئەوا دوو پاداشتی هەیە، هەر کەسیش دەستنوێژ بگرێت (سێ جار سێ جار) ئەوە دەستنوێژی من و پێغەمبەرەکانی پێش منە.

## بابای دەست بە دەستنوێژ ناوی لە لا پەڕەیەکی گرنگدا تۆمار دەکرێت

کردەوەکان بە چاك و خراپەوە لە لاپەڕەیەکدا دەنووسرێت کە هیچ کەس دەستی لێی گیر نابێت پێی دەوترێت "كِتَابٌ مَّرْقُومٌ"[1] واتە: پەراوێکی نیشانەدارە.

کەس ناتوانێ دەستکاریی بکات لە ئادەمیزاد و پەری و پێغەمبەران و تەنانەت فریشتەکان و نزیکانی بارەگای خوداش.

**عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ومن توضا، ثم قال: أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لاإله الاانت استغفرك واتوب اليك". "كتب في رق ثم طبع بطابع فلم يُكتسر الى يوم القيامة". (رواه الحاكم، صحيح على شرط مسلم).**[2] واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: "هەرکەس دەستنوێژ بگرێت ئینجا بڵێ: (شەهادەت ئەدەم "بەدڵ بڕوادەکەم" کە هیچ خودایەکی بەحەق نییە بێجگە لە الله تەنهایەو هاوەڵی نییە وەشەهادەت ئەدەم کە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی خودایە, خودایە بمگێڕی لە تەوبەکاران وەبمگێڕی لە پاکژەکان، خودایە بە سوپاسگوزاری پەسەندی و بێگەردی تۆ ئەدەم وەشەهادەت ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە بێجگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و تەوبە وەلای تۆ دەکەم) بۆی دەنوسرێت لە لاپەرەیەکدا ئینجا مۆر دەکرێت ناشکێت هەتا ڕۆژی دوایی.

---

[1] نامەی خراپەکان پێی دەوترێت "سیجین" کە پەراوی رەش و نیشانەدارە. نامەی ئاکارە چاکەکانیش پێی دەوترێت "علیین" کە ئەویش پەڕاوی بەرز و نیشانەدارە / **المطففين** ئایەتی ٧ـ٩ و ئایەتی ١٨ ـ ٢٠.

[2] **المستدرك رقم (٢٠٧٢)، والأحاديث المنتخبة ص ١٦٥.**

**قال رسول الله ﷺ: "من توضأ ثم قال سبحانك اللهم وبحمدك، لا اله الا انت، أستغفرك وأتوب اليك، كُتب في رقّ، ثم طبع بطابع، فلم يكسر إلى يوم القيامة".** [1]

واته: پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: هەرکەس دەستنوێژ بگریّ و پاشان بلّیّ خوایە پاکو بیّگەردی تۆ بە سوپاسگوزاری ستایشکردن دەردەبڕم، هیچ پەرستراوێك نییە بیّجگە لە تۆ، داوای لیّخۆشبوونت لیّدەکەم، ئەم شایەتیدانەی دەنووسریّ لە پارچەیەکدا، ئینجا مۆر دەکریّ بە مۆرێك هەتا رۆژی دوایی ناشکیّ.

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة ٢٣٣٣ والحديث صحيح بمجموع طرقه المرفوعة.

# نوێژ

نوێژ گەورەترین خواپەرستیە کە لە زمانی عەرەبیدا بناغەکەی "صَلَّیَ"یان لە (صَلَّوٰ)ی وەرگیراوە، کە چەند واتایەکی هەیە بە گوێرەی ئەو واتایانە "صلاة" هەموو کەسو هەموو شتێكو هەموو دروستکراوەکان و تەنانەت دروستکەرو بەدیهێنەری دروستکراوەکانیش دەگرێتەوە وەکو لەم بابەتەی داهاتوودا دەیبینیت نوێژ بەگەورەدانانە، بەزەیی و سۆزە، نزاو پاڕانەوەیە، داوای لێخۆشبوونە، پلەو پایەیە، شەرەف و رێزە، پەسەندی و شاهیدی واتە لەسەر بێگەردی خودا، بڕوایە، زیندووکردنەوەی گیانە، فریادڕەسی تەنگانەیە، نزیکبونەوەیە لە خوا و جۆشدانی دڵەکانە بە خۆشەویستی خودا.

نوێژ قەڵغانە، پاکوخاوێنیە لە پیسی و چەپەڵیە دەرەکیەکانو پاکو بێگەردییە لە ژەنگ و ژاری تاوان و پیسیە پەنهانیەکان و دەروونیەکان.

نوێژ رەمزو دروشمی پەرستنی پێغەمبەرەکان و فریشتەکانو دۆستەکانی خودایە. تەنانەت بتپەرست و هاوبەشدانەرەکانیش بۆ نزیکبوونەوەیان لە خوا درۆینەکانیان یان دەستخستنی مەرامەکانیان نوێژیان کردۆتە پێشەنگی پەرستنو چەپکە گوڵی دەستیان.

نوێژ هەر بۆ خودایە، یەکخواپەرستی و یەکتاپەرستی لە نوێژدا بە چاکترین شێوە رەنگ دەداتەوە.

نوێژ سەلام و ئاشتیخوازییە و بەیعەتە لەگەڵ خودا.

نوێژ بەگەورە دانانی خودایە ـ نزاو پاڕانەوەیە ـ داوای لێخۆشبوونە لە خودا، سۆز و بەزەییە ـ سووتانو جۆشدانی دڵ و دەروونە بە راز و نیاز لەگەڵ خودا.

نوێژ ئەدەب و رێزە.

نوێژ پەروەردەیە لەسەر گوێڕایەڵی کردنی بۆ پێشنوێژو پابەندبوون بە کاتی دیاریکراوەوە.

نوێژ یەکلاکردنەوەی بەندەیە بۆ خوداو بۆ چەند ساتێکیش بێت رووکردنە خواو پشت کردنە دونیایە.

## وشەی نوێژ "الصلاة" لە زمانی عەرەبییدا

ڕەگەزو بناغەی وشەی "**الصلاة**" لە زمانی عەرەبیدا چەند واتایەکی هەیە، بە گوێرەی پێکهاتەی ئەو پیتانەی وشەی نوێژ "**الصلاة**"ی لیَ پێکهاتووە:

"**الصلاة**" کرداره رابردووەکەی یەکەمجار سێ پیت بووە "**صَلَی**"، کە ئەمیش لە بنەڕەتا لەم دوو حاڵەتە بەدەر نییە یان:

١ ـ **صَلَی ـ "صَلَو"** بووە.

٢ ـ **صَلَی ـ "صَلَي"** بووە.

بەو شێوەیە دوو واتا دەگەیەنێت:

**١ ـ النار وما أشبهها من الحميّ كما تقول: "صَلَيتُ العصا بالنار إذا لينتها وقومتها الناس".**

واتە: ئاگر و ئەوەی لەو بچێت لە گەرم کردن و سوورکردنەوە وەکو دەڵێی "گۆچانەکەم بە ئاگر گەرم کرد هەرکات خەڵك نەرمی بکات و راستی بکەنەوە, یان "**صَلَيت اللحم: أي شويتهُ**: برژاندم".

٢ ـ "**جنس من العبادة**" بنەماو رەگەزێکە لە پەرستن. "صليتُ" نوێژم کرد , پاڕامەوە بە شکۆداری رامگرت، پیرۆزم راگرت.

وشەی "**الصلاة**" لە زاراوەی زمانی عەرەبیدا ئەم واتایە دەگەیەنێت.

**الصلاة لغة: الدعاء ـ والتبريك ـ والتمجيد**

وشەی "**الصلاة**" ئەم واتایانە دەگەیەنێت:

١ ـ ـ **الدعاء** ـ واتە نزاو پاڕانەوە یان "التبريك" واتە: فەڕو پیرۆزیی یان "التمجيد" واتە: شکۆدار راگرتن و بەگەورە دانان.

**قال السُهيلي (رحمه الله): أصل الصلاة: "انحناء" ثم سمو الرحمة حُنُواً.**

واتە : بنەڕەتی وشەی (**الصلاة**) "**انحناء**" سۆز و دلۆڤانی پاشان بە وشەی "**الرحمة**"یان وتوە "**حُنُو**" هەرکات مەبەست بە نوێژ بۆ زێدە مەعنا بوو "**مبالغة**" ئەو کات وشەی "**الصلاة**" لە جێی وشەی "**انحناء**" بەکاردێت وەکو نوێژی مردوو کە سۆزە بەرامبەر مردووەکە، بۆیە پێی دەوترێت "**صلاة الميت**" نوێژی مردوو، کە تکاو پاڕانەوەیە بۆ ئەو کەسەی مردووەو دەستی لە دونیا بەر بووە، تۆش بەزەییت پێیدا

دێتەوە. بۆیە بۆ نوێژی مردوو دەوترێت **"صليت عليه"** نوێژم لەسەر کرد, نالێیت **"دعوت عليه"**. دوعام لێ کرد، بەڵام بۆ دوژمن دەڵێی **"دعوت عليه"** دوعام لێ کرد، نالێیت **"صليت على العدو"**، چونکە لێرەدا بە واتای سۆزو بەزەیی دێت **"انحناء"** بۆیە بۆ دوژمن بەکار نایەت.[١]

بەکورتی وشەی **"الصلاة"** بەم واتایانە هاتووە لە هەر دیمەنێکدا واتای تایبەتی و شایستەو گونجاوی هەیە بۆ نموونە:

**١ ـ الصلاة من العبد: الدعاء**

واتە: وشەی **"الصلاة"** لە بەندەوەو خواپەرستەوە بە واتای نزاو پاڕانەوەیە وەکو بڕوادار دەڵێت: **"اللهم صلِّ على محمد"** دەپاڕێتەوە لە خودا کە پلەو پایەی پێغەمبەر لە دونیاو دوارۆژدا بەرز کاتەوە ـ یان بەزەیی و ڕێزی خۆی داباڕێنێ بۆ سەر پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) **(إبن الأعرابي)** دەفەرموێت وشەی **"الصلاة"** بۆ فریشتەکان و ئادەمیەکان و پەریەکان وەستان و کڕنوش و سوژدەیە.[٢]

**٢ ـ الصلاة من الملائكة دعاء واستغفار.** واتە: وشەی **(الصلاة)** لە فریشتەکانەوە بە واتای نزاو پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونە. هەروەها **(إبن الأعرابي)** دەفەرموێت: واتە وەستان لە نوێژدا کڕنوشو سوژدەیە.

**٣ ـ الصلاة من الله الرحمة.** واتە: وشەی **(الصلاة)** لە لایەن خواوە بە واتای بەزەییە **"إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ..)**. واتە: خودا بەزەیی خۆی و فریشتەکان دوعاو پارانەویان بۆ موحەممەد دەنێرن.

**٤ ـ الصلاة من الهوام والطير التسبيح:** واتە: وشەی **(الصلاة)** لە زیندەوەر و مار و مێروو و باڵندە و وێنەی ئەوانەوە تەسبیحاتی خودایە، دەربڕینی پەرستنی و پاك و بێگەردی خودایە.[٣]

**٥ ـ الصلاة التعظيم لما فيها من تعظيم الرب. "قاله إبن الأثير"**. واتە: وشەی **"الصلاة"** بە واتای بەگەورەدانانە، چونکە نوێژ بەگەورە دانانی پەروەردگارە.[١]

---

[1] نضرة النعيم، ج٦، ص٢٥٣٧.

[٢] نضرة النعيم، ج٦، ص٢٥٣٨.

[٣] نضرة النعيم ج٦، ص ٢٥٣٨.

وەبەکارهێنانی وشەی "**الصلوات لله**" لە تەحیاتدا بۆ گەورە و شکۆدار راگرتنی خودایە.

قال أبوبکر: الترحم. واتە: ئەبوبەکر فەرموویەتی بۆ دان پیانانی "هەموو بەزەیی و سۆزێکە بۆ خودا".[٢]

نوێژ "**الصلاة**" لە پێناسەی زانایاندا: بریتییە لە چەند گوفتار و کردارێك کە بە (الله أکبر) دەست پێ دەکات و بە سەلام دانەوە کۆتایی دێت، بە پێی چەند مەرجێکی تایبەتی.

"خەتتابی" (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: وشەی "**الصلاة**" ئەگەر بە مەعنای بەگەورە دانانو رێزو بەخشندەیی هات هەر بۆ خودا بەکاردێت و بێجگە لەو بۆ کەسی تر بەکار نایەت[٣].

## حاڵی نوێژخوێنان لە کاتی نوێژکردندا

لە کاتی نوێژکردندا خەڵکیی هەموو چوونیەك نین و هەریەکە بە شێوازێك لەگەڵ واتاو ناوەڕۆکی نوێژەکەیدایە "إبن القیم" (رەحمەتی خودای لێ بێت) لەوبارەوە فەرموویەتی: خەڵکیی لەناو نوێژکردنداو لەناو نوێژەکانیاندا پێنج پلەیان هەیە:

١ ـ پلەی ستەم لە خۆکردنو کەمتەرخەمی، ئەویش ئەو کەسەیە کەمتەرخەمی لە دەستنوێژو کاتی نوێژەکان و سنوورە شەرعیەکانی نوێژو پایەکانیدا دەکات.

٢ ـ پارێزگاریی دەکات لە کاتەکانو سنوورەکانو پایە ئاشکراکانو دەستنوێژ، بەڵام کەمتەرخەمە لە دوورخستنەوەی داڵغە لێدان و خەیاڵ و خەتەرەی شەیتان.

٣ ـ ئەوکەسەیە سنوورەکانو پایەکانی نوێژ دەپارێزێتو هەوڵی زۆریش ئەدات لە دوورخستنەوەی خەیاڵ و خەتەرەی و داڵغە لێدان و سەرگەرم و سەرقاڵی دوورخستنەوەی دوژمنەکەیەتی بۆ ئەوەی نوێژەکەی لێ تێك نەدات، ئەو کەسە لە نوێژو جیهادایە.

---

[١] نضرة النعیم، ج٦، ص ٢٥٣٧.

[٢] نضرة النعیم، ج٦، ص ٢٥٣٨.

[٣] نضرة النعیم، ج٦، ص ٢٥٣٩.

٤ ـ ئەو کەسەیە کە هەڵدەستێت بۆ نوێژکردن هەموو ماف و پایەو سنوورەکانی تەواو دەکات و دڵی هەر سەرقاڵی ئەو لایەنەیە تا لە دەستی نەچێت سەرتاپای دڵ و دەروون و بیر و ئەندێشەی تیادا قاڵ بووە.

٥ ـ ئەو کەسەیە هەر کات هەستا بۆ نوێژ وەکو ئەوەی پێشوو بەرەوپیری دەچێت، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی خۆی دەخاتە بەردەستی خوداو بە دڵ سەیری دەکات و چاودێریی خۆشەویستی و گەورەی خوا دەکات هەروەکو ببینێت و سەیری بکات، ئەو کات بە هیچ جۆرێك خەیاڵ و خەتەرەو داڵغە رێگەی نییە و لە نێوان ئەو نوێژخوێنەو پەروەردگاریدا پەردە هەڵدەگیرێ و تەنها سەرگەرمی گفتوگۆ کردنە لەگەڵ پەروەردگاری و زۆر لێی نزیکە.[1]

## واتاکانی وشەی "الصلاة" لە قورئاندا

لە قورئانی پیرۆزدا وشەی **"الصلاة"** بە چەند مانایەك هاتووە، لەوانەش:

١ ـ بە مانای نزاو پاڕانەوە، قال تعالی: **"إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ"**. (التوبة: ١٠٣). واتە: نزای تۆ ئۆقرەو ئارامیە بۆ ئەوان.

٢ ـ بە مانای لێخۆشبوون، خودا دەفەرموێت: **"إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً"**. (الأحزاب: ٥٦). واتە: خوا سەڵاوات ئەدات لەسەر پێغەمبەر، فریشتەکانیش نزاو داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن، ئەی گرۆی بڕواداران سەڵاواتی لەسەر بدەن.

٣ ـ بە مانای بەزەیی, خودا دەفەرموێت: **"هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ.."**. (الاحزاب: ٤٣). واتە: ئەو ئەو خودایەیە کە بەزەییو سەلامی خۆی دەرێژێ بەسەرتاندا، هەروەها نزاو سەلامی فریشتەکانیش.

٤ ـ بە مانای نوێژی ترس، خودا دەفەرموێت: **"وَإِذا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ.. "**. (النساء: ١٠٢). واتە: ئەگەر خۆت لەناویاندا بووی "ئەی موحەممەد" لە سەفەرداو نوێژت بۆ دابەستن.

---

[1] نضرة النعيم ج٦ ص ٢٥٣٨، والوابل الصيب ص ٣٨ـ ٣٩

٥ ـ به ماناى نوێژى مردوو، خودا دەفەرمووێت: **"وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَداً.."**. (التوبة: ٨٤). واته: هەر کەسێکیشیان لێ مرد هەرگیز نوێژ لەسەر تەرمەکەی مەکە.

٦ ـ به ماناى نوێژى سەفەر, خودا دەفەرمووێت: **".. فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ.."**. (النساء:١٠١). واته هیچ گوناهێکو ناگاتێ کە نوێژەکان و کورت بکەنەوە.

٧ ـ به ماناى نوێژى ئوممەتەکانى رابردوو، خودا دەفەرمووێت: **"وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيّاً"** (مريم: ٣١). واته: راى سپاردوم نوێژ بکەم و زەکات بدەم تا لە ژیاندا بم".

٨ ـ به ماناى کڵێسەی جولەکەکان، خودا دەفەرمووێت: **"وبيعٌ والصلَواتٌ"**. واتە: سوژدەگاو کۆخ و کڵێسەکان.

٩ ـ به ماناى پێنج فەرزەی نوێژ، خودا دەفەرمووێت: **"وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ.."**. (البقرة: ٤٣). واته: نوێژەکان بە چاکی بکەن و زەکات بدەن.

١٠ ـ به ماناى ئیسلام، خودا دەفەرمووێت: **"فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّى"**. (القيامة: ٣١). واته: هەرگیز نە بڕوای هێناوە و نە نوێژی کردووە.[١]

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە بە ئیمان ناو برابێت

خودا لە قورئانی پیرۆزدا نوێژی بە ئیمان ناو بردووە، چونکە نوێژ تەنها بۆ خودایە و لە نوێژدا هەردوو شایەتمانەکەی تێدایە، بە وتنیان ئیمان تازە دەبێتەوە.

خودا دەربارەی ئەوانەی نوێژیان روو بە رووگەی قودس کردبوو، پاشان روگە گۆڕا بەرەو مەککە و وایان گومان برد نوێژەکانی روو بە قودس کردویانە بە فیڕۆ چوون دەفەرمووێت: **".. وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ.. "**. **البقرة ١٤٣**.[٢] واته: هەرگیز خودا نوێژی ئێوە زایە ناکات.

---

[1] نضرة النعيم، ج٦، ص٢٥٣٩ـ ٢٥٤٠.

[٢] نضرة النعيم، ج٣، ص٦٤٦.

وعن البراء قال: **"كنا لا ندري ما نقول للذين ماتوا وهم يصلون الى بيت المقدس"**. واتە: لە بەڕائەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئێمە نەماندەزانی چی بڵێین دەربارەی ئەوانەی مردبوونو نوێژیان روو بە قودس کردبوو پێش ئەوەش رووگە بگوڕێت. ئەم ئایەتە پیرۆزە روونی کردەوە کە ئیمانی ئەوانە واتە: "نوێژەکانیانم" بە زایە نەداوە.

**عن إبن عباس (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله ﷺ لوفد عبد القيس: "آمركم بأربع وانهاكم عن أربع: آمركم بالإيمان بالله، هل تدرون ما الإيمان بالله؟ شهادةُ أن لا إله إلا الله، وإقامُ الصلاة، وايتاء الزكاة وتعطوا من المغنم الخمس"**.[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بە وەفدی کوڕی عەبدولقەیسی فەرموو: فەرمانتان پێ ئەکەم بە چوار شتو ڕێشتان لێ دەگرم لە چوار شت: فەرمانتان پێ دەکەم بە بڕوابوون "إیمان" ئەزانن بڕوابوون بەخوا چییە؟ شایەتی دانە کە هیچ پەرستراوێك بە هەق نییە بێجگە لە (الله)، نوێژکردن و زەکاتدان و لە ماڵ و سامانی دەستکەوتیش پێنج یەك بدەن".

**قال إبن مسعود (رضي الله عنه: "من لم يصل فلا دين له"**.[2] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەرکەس نوێژ نەکات دینی نییە.

**وقال أبو درداء: "لا إيمان لمن لا صلاة له..."**.[3] واتە: "ئیمان" بڕوای نییە هەرکەس نوێژی نەبێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر "ڕەزای خوایان لێ بێت" دەفەرموێت لە وتەیەکی درێژدا ئەمە بەشێکیەتی دەفەرموێت: **"والصلوات الخمس عمود الدين لا يقبل الله الإيمان إلا بالصلاة"**.[4] واتە: "پێنج فەرزەی نوێژ کۆڵەکەو بڕبڕەی پشتی دینی خوایەو بڕوا لە کەس وەرناگرێ بەبێ نوێژ".

---

[1] البخاري ٧١١٧ ومسلم ١٧ واللفظ للبخاري. ونضرة النعيم ج٦ ص٢٥٥٢ رقم ٣.

[2] رواه البيهقي رقم (٦٢٩١)، والطبراني في المعجم الكبير (٨٩٤٢)، صحيح فقه السنة ج١ ص٢٣١.

[3] الترغيب والترهيب ٨١٨، صحيح موقوف.

[4] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٢٤.

**وقال عمر: "لا حظّ في الإسلام لمن ترك الصلاة".**[1] واتە: عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بەش و پشکی لە ئیسلامدا نییە ئەوەی واز لە نوێژ بێنێ".

**وقال رسول الله ﷺ: "بين الكفر والإيمان الصلاة".**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "نێوانی کوفرو بێباوەری و ئیمان نوێژە". واتە: ئەگەر نوێژی کرد ئیماندارە، ئەگەر نوێژی نەکرد بێبڕوایە.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: "من ترك الصلاة فلا دين له".**[3]واتە: لە عەبدوڵڵا کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەر کەس واز لە نوێژ بێنێ دینی نییە". نوێژ بە ئیمان ناوبراوە، چونکە نوێژ وتەو نیازی دڵ و کردارە.

## نوێژ وەڵامدانەوە و بەدەمەوەچوونی فەرمانی خوایە

خوا لە قورئاندا فەرمان بە نوێژ دەکاتو پێغەمبەریشی ڕاسپاردوە کە فەرمان بە نوێژ بکات، لێرەوە دەردەکەوێ کە نوێژکردن جێبەجێکردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێ). خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: **"وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ"**. (الشورى: ٣٨). واتە: ئەوانەی وەڵامگۆی پەروەردگاریان بوون و بە دەم فەرمانیەوە چوون و نوێژەکانیان بە چاکی کردووە، ئیش و کاریان بە پرس و ڕایە لە ناو خۆیاندا لەوەش پێمان داون دەبەخشن و خەرج دەکەن.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە درابیتە پاڵ بەڕاست دانانی ئیسلام

بەڕاست دانانی دین "تصديق" بە دڵ و بە زوبان بە کردەوە دێتەجێ, کەوابوو بڕوابوون بە خودا بەبێ کردەوە، بە بێ ڕەنگ دانەوەی ئەو باوەڕە لە ڕواڵەتو ئەندامەکانی لاشەدا بەبێ کاریگەریی لەسەر گوفتار و کردار و هەڵسوکەوت بەبێ ڕاستکردنەوەی ڕەفتار و ئاکار، هیچ واتایەکی نییەو دەبێتە شەیتان باوەڕ، چونکە

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١ ص.٢٣

[2] رواه، صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٨٤٩. حديث صحيح.

[3] الترغيب والترهيب ٨١٦ حسن موقوف.

شەیتان دەزانێ کە خودا هەیە و تاق و تەنهایە و دەسەڵاتدارە، مردن و ژیانی بە دەستە، بەڵام هەمووی بە زانینێکی نەزۆك و بێبەر و بێسوود، شەیتان لەگەڵ خودا قسەو گفتوگۆی کردووە، بەڵام بەبێ گوێڕایەڵی و بە بێ کردارپێکردن سوودی پێ ناگەیەنێت.

لەم روانگەیەوە دەڕوانینە ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: **"فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّى"**. **(القيامة: ٣١)**. واتە: هەرگیز بڕوای نەهێناوە و نوێژیشی نەکردووە.

هەروەها لە سوڕەتی "المعارج"دا خودای گەورە باسی لە ئادەمیەکان بەگشتی کردووە کە شپرزەو دانەمەزراون، بێجگە لەو کەسانەی خاوەنی چەند سیفەت و ئاکار و رەفتارێکن لەوانەش: **"إِلَّا الْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ"**. **(المعارج: ٢٣)**. واتە: جگە لە نوێژخوێنان ئەوانەی بەردەوامن لەسەر نوێژکردن. دواتر دەفەرموێت: **"وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ" (المعارج: ٢٦)**.[١] واتە: ئەوانەش رۆژی پاداشت و سزا بەڕاست دەزانن.

## نوێژ دوای باوەڕبوون بە نادیار، داوای جێبەجێ کردنی کراوە

دوای باوەڕبوون بە نادیار "غەیب"، یەکەم پایەی ئیسلام و یەکەم ئەرکی شەرعیی کە داوای ئەنجامدانی کرابێت، خودا فەرمانی بە جێبەجێکردنی کردبێت نوێژە.

خودا دەفەرموێت: **(الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ) (البقرة: ٣)**. واتە: ئەوانەی بڕوایان بەنادیار هەیە و نوێژ بە چاکیی دەکەن و لەو شتانەش پێمان داون ئەبەخشن.

**(أبوعبدالله المروزي)** "ڕەحمەتی خودای لێ بێت" دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: **"فلم يبدأ بعد الإيمان بالغيب بفريضة قبل الصلاة"** واتە: خودا "دوای باوەڕبوون بەنادیار باسی هیچی نەکردووە بێجگە لە نوێژ".

هەروەها دەفەرموێت: **".. وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالآخرةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَهُمْ عَلَى صَلاَتِهِمْ يُحَافِظُونَ"**. **(الأنعام: ٩٢)**. واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە کۆتا "دوارۆژ" هەیە باوەڕیان پێیەتی، ئەوانەی پارێزگاریی لە نوێژەکانیان دەکەن.

---

[١] المعارج ٢٦ زبدة التفسير ص٧٨ تفسير سورة القيامة.

له سوڕەتی(**فاطر**)یشدا دەفەرموێت: "**.. إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ..**". (**فاطر ١٨**). واتە: تەنها ئەوانە ئاگادار کەرەوە کە لە نادیاردا لە پەروەندی خۆیان دەترسن بە چاکی نوێژەکانیان دەکەن. هەروەها خوا دەفەرموێت لە ئایەتی (١٨)ی سوڕەتی (فاطر: "**..إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ...**" واتە: "تەنها ئەوانە بێدار بکەرەوە کە بە پەنهانی لە پەروەردگاریان دەترسنو بە چاکی نوێژەکانیان دەکەن..".

## نوێژ لەگەڵ دڵسۆزی "إخلاص" بە یەکەوە جۆش دراون

هەموو کردەوەیەکی چاك دەبێ دوو مەرجی بنەڕەتی و سەرەکیی تیابیت، بەبێ ئەو دوو مەرجە هیچ کارو کردارێك گیرابوونی نییە "الإخلاص، الصواب".[1] واتە: بە گوێرەی شەرع بێتو لێی دەرنەچێ.

کردنی هەموو کردارێك لەبەر خوا بە گوێرەی شەرعی خوا، هەوێنی هەموو کردار و گوفتارو خواپەرستیەکن.

لێرەدا باسی ئەوە دەکەین کە نوێژ جۆش دراوە بە دڵسۆزیی "إخلاص"، خوا دەفەرموێت: "**وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ**". (البينة: ٥). واتە: فەرمانیان پێنەدرابوو تەنها بە پەرستنی خوداو بە دڵسۆزی لە دینی ئەوداو بە تەنها روو لە خوا کردن و نوێژکردن بەچاکیی نەبێت.

هاوسەری "حسانی کوڕی سینان" وتی: حەسان عادەتی وابوو لەگەڵما دەهاتە ناو جێگەوە ئینجا دەیخەڵەتاندم چۆن ژن منداڵەکەی دەخەڵەتێنێت، جا کە دەیزانی من خەوم لێکەوتەوە خۆی ئەدزیەوەو ئەچووە دەرەوە، ئینجا هەڵدەستا نوێژی دەکرد: پێموت ئەی باوکی عەبدوڵڵا چەند خۆت سزا ئەدەیت بەزەییت بەخۆتا بێتەوە، فەرمووی: بێدەنگ بە خاك بەسەر، لەوانەیە بخەوم جارێکی تر لێی هەڵنەستمەوە.[2]

---

[1] شروط قبول العمل: ١ـ الاخلاص ٢ـ الصواب ٣ـ العزم. واتە : مەرجەکانی گیرابوونی کردەوە سیانە: ١ـ دڵسۆزی ٢ـ پێکان شەرع ٣ـ نیازمەندی.

[2] موسوعة الأخلاق الإسلامية، ج١، ص٣٣.

**عن أبي سعيد (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ألا أخبركم بما هو اخوفُ عليكم عندي من المسيح الدجال؟ الشرك الخفي: ان يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر رجل".**[١] واته: له ئه‌بی سه‌عیده‌وه (ره‌زای خوای لیّ بیّت) پیّغه‌مبه‌ری خوا (سه‌لاّت‌و سه‌لامی خوای لیّ بیّت) فه‌رمووی: ئه‌ریّ هه‌والّتان بده‌میّ به‌وه‌ی له مه‌سیحی ده‌جال زیاتر لیّی ده‌ترسم بۆ ئیّوه؟ هاوبه‌ش دانانی بچوك: كه پیاویّك هه‌ستیّت نویّژ بكات‌و نویّژه‌كه‌شی برِازیّنیّته‌وه كه زانی كه‌سیّك لیّی ورد ده‌بیّته‌وه.

پیّغه‌مبه‌ر (سه‌لاّت‌و سه‌لامی خوای لیّ بیّت) ئه‌وه‌نده له ریابازی‌و رووپامایی ترساوه، ئه‌وه‌نده له ده‌جال نه‌ترساوه. مزگه‌وت كه پیرۆزترین شویّنه له‌سه‌ر زه‌وی به لای خواوه نه‌بوونی دلّسۆزی‌و بوونی دووڕوویی‌و ده‌غه‌لّی دووڕووه‌كان كردییه زبلّدان‌و خواش فه‌رمووی: "**لاَ تَقُمْ فِيهِ أَبَداً**.." واته: هه‌رگیز له مزگه‌وتی (ضرار) كه مزگه‌وتی دووڕووه‌كانه نه‌وه‌ستی‌و خواپه‌رستیی نه‌كه‌یت.[٢]

ـ بزانه دلّی ئه‌و كه‌سه‌ی تۆ ریاو رووپامایی بۆ ده‌كه‌ی به‌ده‌ستی ئه‌و خوایه‌یه تۆ لیّی یاخی بووی. **مطرف** كوڕی عه‌بدوللاّ (ره‌حمه‌تی خوای لیّ بیّ) فه‌رموویه‌تی: "ئه‌گه‌ر هه‌موو شه‌و بخه‌وم‌و به خه‌و شه‌وگارم به‌سه‌ر به‌رم به‌یانی بۆی په‌شیمان ببمه‌وه پیّم خۆشتره له‌وه‌ی هه‌موو شه‌و شه‌ونویّژ بكه‌م به‌یانی له خۆم رازی بم‌و خۆم پیّ چاكتر بیّ له خه‌وتووه‌كان.

ـ (موحه‌ممه‌دی كوڕی واسیع) ئه‌لّیّ: ئاخ بۆ هاوریّكانم، هاوریّكانم له ده‌ستچوو، پیّیان وت: ئه‌بوعه‌بدوللاّ! ئه‌وه نییه گه‌نج‌و لاوه‌كان به‌ڕۆژوون‌و شه‌ونویّژ ده‌كه‌ن‌و جیهاد ده‌كه‌ن له پیّناوی خوادا؟ فه‌رمووی: به‌لاّم له‌خۆڕازی بوون ره‌نجه‌ڕۆی كردوون‌و تیّكی داون.

---

[١] حسن، رواه إبن ماجة (٤٢٠٤) / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٦٠٧.

[2] رهبان الليل ج٢، ص٣٥٤.

## نوێژ یەكەم پایەی ئیسلامە دوای شایە تمان

ئەو پایانەی ئیسلامی لەسەر دروست كراوەو كۆشكی شكۆداری ئیسلام هەموو قورساییو سەنگی لەسەریانە پێنج پایەن، دوهەم پایەی پۆلاینی ئیسلام نوێژكردنە.

ئەو پێنج پایانەش هەتا یەكەمیان جێگیر نەبووبێت و نەچەسپا بێت و سەقامگیر نەبووبێت، باس لە دووهەمیان نەكراوە، بە هەمان شێوەش پایەی سێهەم و چوارەم و پێنجەم.

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله ﷺ: "بني الإسلام على خمس: شهادة ان لا إله إلا الله، وأن محمداَ رسول الله وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، وحج البيت وصوم رمضان".** [1] واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دروست كراوە، بڕوابوون كە هیچ خودایەك نییە بە هەق بێجگە لە الله و بڕوابوون كە موحەممەد پێغەمبەری خودایە، نوێژكردن بە چاكی و زەكات دان و حەج كردنی ماڵی خودا و ڕۆژووی رەمەزان. كەواتە وتنی شەهادەت بەبێ نوێژكردن سوود ناگەیەنێت.

**وعن إبن عمر (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله ﷺ: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لاإله إلاالله محمد رسول الله ويقيموا الصلاة، ويؤتوا الزكاة، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم الابحق الإسلام وحيسابهم على الله".** [2]

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە (رەزای خودایان لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خودای لێ بێت) فەرمووی: "فەرمانم پێكراوە كە بجەنگم لەگەڵ خەڵكی بێ دیندا تا شاهێدی ئەدەن "واتە بڕوا دەهێنن" كە هیچ پەرستراوێك بە هەق نییە بێجگە لە (الله)و بڕوابهێنن كە موحەممەد پێغەمبەری خودایەو نوێژەكانیان بە چاكی دەكەن و زەكات ئەدەن، جا ئەگەر ئەوەیان كرد لە من قەدەغەیە خوێن و ماڵیان مەگەر بە حەقی ئیسلام حیساب و كیتابیشیان لەسەر خودایە.

---

[1] متفق عليه البخاري رقم (٨) ومسلم رقم (١٦) ورياض الصالحين رقم ١٠٧٥ وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٨٤٠.

[2] متفق عليه البخاري رقم (٢٥) ومسلم رقم (٢٢). رقم ورياض الصالحين رقم ١٠٧٦.

نوێژ یەکەم ئەرکی شەرعی و فەرمانی خودایە دوای شایەتمان وەکۆتا ئەرکیشە لەسەر مرۆڤ دوای شایەتمان. هاوەڵانی پێغەمبەریش (رەزای خوایان لێ بێ) یەکەم کارێك دوای شایەتمان کردبێتیان نوێژ بووە، بۆ نموونە:

**"أول ما تعلم وفعل أبوذر بعد الشهادتين الصلاة".**[١] واتە: یەکەم شت ئەبو زەڕ فێری بوو و ئەنجامیدا دوای هەردوو شایەتمانەکە نوێژ بووە.

لەسەرەتای موسڵمان بوون و دەست کردن بە خواپەرستی دوای بڕوابوون بە خودا و شایەتمان داوای نوێژکردن کراوە، لەسەرەمەرگ و گیانەڵاشدا داوای نوێژکردن دەکرێت بەپێوە ئەگەرنا بە دانیشتنەوە، بە راکشانەوە، بە دەم، بە دڵ، بە ئاو، بە گڵ، ئەگەرنا وتنی شایەتمان کۆتا خواحافیزی لە دونیا دەرچوون و فڕینە بەرەو دونیای بەرزەخ و دوارۆژ.

**عن حذيفة بن اليمان (رضي الله عنه)، قال : قال رسول الله ﷺ: "يدرسُ الإسلام كما يدرس وشى الثوب، حتى لايُدري ما صيام ولاصلاة، ولانسك, ولاصدقة و لَيُسَّرَى على كتاب الله عز وجلَّ في ليلة فلا يبقى في الأرض منه آية وتبقى طوائف من الناس، الشيخ الكبيرُ العجوز يقولون: أدركنا آباءنا على هذه الكلمة: "لا إله إلا الله" فنحن نقولها" فقال له صلة: ماتغني عنهم: "لا إله إلا الله" وهم لا يدرون ما صلاة ولا صيام ولا نسك ولا صدقة.."**.[٢]واتە: لە حوزەیفەی کوڕی یەمانیەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئیسلام دەشۆڕێتەوەو کاڵ دەبێتەوە وەکو چۆن رەنگ و نەقشی پۆشاك و جل و بەرگ کاڵ دەبێتەوە، تا وای لێ دێت نازانرێ نوێژ چۆنەو رۆژوو چۆنەو قوربانیی چۆنەو خێرکردن چۆنە، بە شەوێك قورئانی پیرۆز لەناو خەڵکیدا هەڵدەگیرێ و تاقە ئایەتێك لەسەر زەوی نامێنێ، کۆمەڵێ لە خەڵکی دەمێننەوە کە پیاوی پیرو پەککەوتەن، دەڵێن: ئێمە لە باب‌و باپیرەمانەوە ئەم رستەیەمان بۆ ماوەتەوە "لا إله

---

[1] دکتور عائض القرني لە کتێبی (مجتمع المثل)، ص١٦٠، ئەم دەقەی باس کردووە.

[٢] صحيح. صحيح قصص الرسول ج٢ ص٤١٦ , رواه إبن ماجه ٤٠٤٩ , و قال في الزوائد: إسناده صحيح رجاله ثقات ورواه الحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٨٧.

إلا الله"، ئێمەش دەیڵێینەوە (صلةُ) پیاوێك بووە لەوانەی فەرمودەکەیان گێڕاوەتەوە، فەرمووی: جا خۆ "لا إلە إلا الله" سوودیان پێ ناگەیەنێ کە ئەوان نازانن. نوێژ چییە و ڕۆژوو و قوربانی و خێر چییە ؟

سەعید نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەبەردەم مەجلیسی نوواب گفتوگۆی لەگەڵ کەمال ئەتاتورك کرد، کەمال بە تووڕەییەوە بە نورسی وت: "بێگومان من تۆم بانگ کرد بۆ ئێرە بۆ ئەوەی سوود لە بۆچونەکانت وەرگرم، تۆش لە جیاتی ئەوە هیچ نەماوە باسی بکەی نوێژ نەبێت". شێخ نورسی وەڵامێکی جەرگبڕی دایەوە پێی وت: "ئەوە بزانە ئەی پاشا! گەورەترین ڕاستیی دوای ئیسلام نوێژە، ئەوەی نوێژ ناکات خائین و ناپاکەو حوکمی خائینیش وەرناگیرێ".[1]

## نوێژکردن ڕەمزی پابەندبوونە بە قورئانەوە

کۆڵەکەو ستونی بنەڕەتی بڕوابوون بە قورئان بریتییە لە بە ڕاستدانانو خوێندن و شارەزابوون و جێبەجێکردنی ئایەتە پیرۆزەکان.

**قال تعالى: "وَالَّذِينَ يُمَسَّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ إِنَّا لاَ نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ".** (الأعراف/ ١٧٠). واتە: ئەوانەی پابەندی قورئانن و بە چاکیی نوێژەکانیان دەکەن ئێمە پاداشتی چاکەکاران زایە ناکەین و بەفیڕۆی نادەین.

ئەگەر بڕواو ئیمان هەر جاڕو بانگەوازێکی بۆش و بێ ناوەڕۆك بێت جیاوازیی چییە لەگەڵ جاڕی شەیتان کە دەزانێ خودا هەیە و بەدەسەڵاتەو مردن و ژیانی بەدەستەو سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەری ڕەوانە کردووە و شەیتان هەمووشیانی یەك یەك بینیوەو دژایەتی هەر هەموویانیشی کردووەو بەهەشت و دۆزەخی دیوەو قسەی لەگەڵ خوداو فریشتەکان کردووە، بەڵام دینی بێ کردار داری بێبەرەو شەیتانیش لەگەڵ ئەو هەموو شتەدا هەر شەیتانە.

---

[1] صلاح الأمة ج٣ ص٤٩٦.

## نوێژ میراتی[1] پێغەمبەرە بۆ ئوممەتەکەی

پێغەمبەری ئیسلام (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە دوای خۆی دینار و درهەم و پارەو پولی بە میرات جێ نەهێشتووە، کۆشك و تەلارو باخ و بێستان و دوکان و بازاڕو سەروەت و سامانی لە دوا بەجێ نەماوە، بەڵکو دینی ئیسلامو فەرموودەی خوداو سوننەتە پیرۆزەکانی خۆی بۆ ئوممەتەکەی جێهێشتووە، قورئانی گەورەو سوننەتی بێگەردو پەروەردەی خوایی بەرنامەیەك سەرچاوەی لە ئاسمانەوە تێکەڵ بە گڵ نابێت و کۆن نابێت و لە بەین ناچێت، بەڵکو هەمیشە زیندوو و تازەو پڕ بە بەرەکەتە.

میراتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) قورئانەو سوننەت و رەوشت و ئاکارو بازنەی زانست و پێنج فەرزەی نوێژە و وتاری هەینییەو دەرس و وانەو کۆڕی زانستە.

**روى الطبراني بإسناد حسن عن أبي هريرة (رضي الله عنه) "أنه مر بسوق في المدينة، فوقف عليها وقال: يا أهل السوق ما أعجزكم!! قالوا وما ذاك يا أباهريرة؟ قال: ذاك ميراث النبي ﷺ يقسم وأنتم ههنا، ألا تذهبون فتأخذوا نصيبكم منه قالوا: وأين هو؟! قال: في المسجد، فخرجوا سراعاً، ووقف أبو هريرة (رضي الله عنه) لم يبرح مكانه حتى رجعوا فقال لهم: ما لكم؟ فقالوا يا أباهريرة قد أتينا المسجد فدخلنا فيه فلم نر شيئاً يقسم، قال: وما رأيتم؟ قالوا رأينا قوماً يصلون وقوماً يقرءون القرآن وقوماً يتذاكرون الحلال والحرام، فقال أبو هريرة: ويحكم فذاك ميراث محمد ﷺ إنه لم يورث درهماً ولا ديناراً وإنما ورّث العلم فمن أخذه أخذ بحظ وافر".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە "بە بازاڕدا تێپەڕی و هەڵوێستەیەکی کردو فەرمووی: ئەی خەڵکی بازاڕ چەند بێدەسەڵاتن!! وتیان چی بووە ئەباهوریرە؟ فەرمووی: ئەوە میراتی پێغەمبەرە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دابەش دەکرێت و ئێوەش لێرەن، ئەرێ بۆ ناچن بەشی خۆتان وەرگرن وتیان: ئەوە لە کوێیە؟! فەرمووی: لە مزگەوتە، بە هەڵەداوان

---

[1] المسجد مهد الإنطلاقة الكبرى، ص٢٩، عائض بن عبدالله القرني.

[2] رواه الطبراني في المعجم الأوسط (١٤٢٩)، له (رسالة (المسجد مهد الإنطلاقة الكبرى)، ص٢٩ـ٣٠ وەرگیراوە.

ڕۆیشتن، ئەبوهورەیرەش وەستاو لە شوێنی خۆی نەجولاَ تا هاتنەوە، پێی فەرموون، چیتان کرد؟ وتیان: ئەی ئەبا هورەیرە چوینە مزگەوت نەمانبینی هیچ دابەش بکرێت، فەرمووی ئەی چیتان بینی؟ وتیان: کۆمەڵێك نوێژیان دەکرد، کۆمەڵێك قورئانیان دەخوێند، کۆمەڵێك باسی حەڵاڵ و حەرامیان دەکرد، ئەبو هورەیرە فەرمووی: ماڵوێرانینە! دەی ئەوە میراتی پێغەمبەرە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت)، بێگومان ئەو ئاڵتون و زیوی بە میرات بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو زانیاریی بەجێ هێشتووە، هەر کەس دەستی خات بەشێکی چاکی پێ بڕاوە".

## ڕۆیشتن بۆ نوێژ ڕووناکی تەواوە لە ڕۆژی دواییدا

ڕۆیشتن بۆ ماڵی خودا و ڕووکردنە مزگەوت کە ماڵی ڕاستەقینەی خودان لەسەر زەوی و لە ئاسمان پاداشتێکی گەورەی هەیە، خودا خۆشی دێت لە میوان و میوانداریی هەر بۆیە زۆر فەرمانی پێ کردووە و پێغەمبەرەکانی لەسەر میوانپەرێزیی و میوانداریی گۆش کردووە بەڵکو ڕێزگرتن لە میوان پەیوەستە بە ئیمانەوە **"من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فليكرم ضيفه"**. واتە: هەر کەس بڕوای بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت.

خودای گەورە بۆ میوانەکانی خۆی کۆمەڵێك پاداشتو ڕێزی دیاریی کردووە کە هیچ خانەخوێیەك پاداشتی وای نییە بۆ میوانەکانی، یەکێك لەوانە لەم فەرمودەیەدا باسکراوە:

**عن بُرَيْدَة (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "بَشّرِ المشائين في الظُلَم الى المساجد بالنور التام يوم القيامة"**.[1] واتە: لە بورەیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "مژدەی ڕووناکیەکی تەواو لە ڕۆژی دواییدا بدەن بەوانەی بە تاریکی هاتوچۆی مزگەوت دەکەن.

**عن أبي مالك الأشعري قال رسول الله ﷺ: "الطهور شطر الإيمان, والحمد لله تملأ الميزان وسبحان الله والحمد لله تملآن مابين السماء والأرض والصلاةُ نور,**

---

[1] رواه أبو داود رقم (٥٦١)، والترمذي رقم (٢٢٣)، رياض الصالحين رقم ١٠٥٨.

**والصدقة برهان، والصبر ضياء والقرآن حجة لك أو عليك، كل الناس يغدو فبائع نفسهُ، فمعتقهُا أو موبقها".**[1] واتە: لە ئەبی مالیکی ئەشعەریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "پاكژی نیوەی ئیمانە، **الحمدلله** پڕی تەرازوەكەیە **"سبحان الله والحمدلله"** پڕی ئاسمان و زەوییە، نوێژ ڕوناكییەو خێر بەڵگەیەو خۆڕاگریی ڕۆشناییەو قورئان بەڵگەیە بۆت یان لەسەرت هەموو كەس كە بەیانی دەكاتەوە خۆیان فرۆشتوە، جا یان خۆی ڕزگار كردووە یان خۆی تووشی تیاچوون كردووە.

## نوێژخوێن لە ماڵ دەرچێ بۆ نوێژ سپاردەی خودایە

نوێژخوێن كە لە ماڵ دەردەچێت و بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خودا دەچێت و بە گوێرەی شەرعی خودا نوێژەكەی ئەنجام ئەدات، بۆیە پارێزگاریی ئەو بەندەیە خودا دەیگرێتە دەست خۆی.

**عن أبي أمامة (رضي الله عنه) أن رسول ﷺ قال: ثلاثة كلهم ضامن على الله، إن عاش رُزق وكُفي، وان مات ادخله الله الجنة: من دخل بيته فسلم فهو ضامن على الله. ومن خرج الى المسجد فهو ضامن على الله ومن خرج في سبيل الله فهو ضامن على الله.**[2] واتە: لە ئەبی ئومامەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: سێ كەس هەر یەكەیان مسۆگەرن لە لایەن خوداوە، ئەگەر ژییان ڕزقیان ئەدات، ئەگەر مردن دەیانخاتە بەهەشتەوە: هەركەس بچێتەوە ماڵی خۆی و سەلام بكات ئەوە مسۆگەرە لە لایەن خواوە، هەركەس بڕوات بۆ مزگەوت ئەوە مسۆگەرە لە لایەن خواوە، هەر كەس بڕوات لە ڕێی خودا ئەوە مسۆگەرە لە لایەن خواوە.

**قال أبو درداء لإبنه: يا بني، ليكن المسجد بيتك، فاني سمعت رسول الله ﷺ يقول: "ان المساجد بيوت المتقين، فمن كانت المساجد بيوته، ضمن الله له**

---

[1] رواه الترمذي رقم (٣٥١٧)، صحيح الجامع الصغير وزيادته ٣٩٥٧ ومختصر مسلم ١٢٠.

[2] صحيح ـ سنن أبي داود ٢٤٩٤.

**بالروح والرحمة والجواز على الصراط الى الجنة"**[1]. واتە: ئەبو دەرداء بە کوڕەکەی فەرمووو: کوڕم با مزگەوت ماڵت بێ، بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: "بەڕاستیی مزگەوتەکان ماڵی لەخواترسانن، هەرکەس مزگەوتەکان بکاتە ماڵی خۆی، خوای گەورە وادەی ئەوەی ئەداتێ کە بیخاتە خۆشیو خۆشگوزەرانی بیخاتە ناو سۆزی خۆیەوەو ئاسانیش لە (**صراط**)ەوە بپەڕێنەوە بۆ بەهەشت.

## لەسەر ئەژنۆش بێت دەبێ بچینە نوێژ

نوێژ لە گەورەترینی پایەکانی ئیسلامە و وازلێهێنان و کەمتەرخەمی لە کەس قبوڵ ناکرێت لە ئاستی نوێژدا، هەر کەسیش بەرژەوەندیی دونیاو دوارۆژی خۆی بزانێت ئەگەر بەڕۆیشتنیش نەتوانێ بۆی بڕوات بە گاگۆڵکەو سکەخشەو لەسەر ئەژنۆ خۆی بۆ دەکێشێ و خۆی دەگەیەنێتێ و لە دەست خۆی نادات، بە پیادە، بە سواریی، تەنانەت بە خۆخشاندن و خۆخلیسکاندن بێت بەسەر بەفریشدا ئامادەی ئەنجامدانی دەبێت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) ان رسول الله ﷺ قال: "ولو يعلمون ما في العتمة والصبح لأتوهما ولو حبواً"**[2]. لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە بێگومان پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەگەر بیانزانیایە چی (خێرێك) هەیە لە نوێژی خەوتنان و بەیانیدا بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکەش بوایە".[3]

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ليس صلاة اثقل على المنافقين من صلاة الفجر والعشاء ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبواً".**[4]

---

[1] صلاح الأمة في الهمة ج٢ ص٣٦٤ الطبعة الثانية قال الشيخ محمد أبو الليث الخير آبادى إسناده صحيح.

[2] متفق عليه البخاري رقم ٥٩٠ ومسلم رقم ٤٣٧ ورياض الصالحين رقم ١٠٧٢.

[3] گاگۆڵکە: لەسەر چنگ، یان لەسەر ئەژنۆ.

[4] متفق عليه البخاري رقم ٦٢٦ ومسلم ٦٥١ ورياض الصالحين ١٠٧٣.

واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لیّ بیّت) فەرمووی پیّغەمبەری خوا (سەڵات و سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: هیچ نویّژیّك لە نویّژی بەیانیو خەوتنان گرانتر نییە لەسەر دووڕووەکان، ئەگەر بیانزانیایە چەندیان خیّر تیّدایە لەسەر ئەژنۆ و بە گاگۆڵکەش بوایە بۆی دەهاتن.

**قال إبن مسعود (رضي الله عنه): "...ولقد كان الرجلُ يُؤتى به يهادى بين الرجلين حتى يقام في الصف".**[1] واتە: عبداللە کوڕی مسعود (ڕەزای خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: ".. بەڕاستیی پیاوی وادەبوو دەچوونە بن باڵی تا لە ریزی نویّژدا رادەوەستیّنرا".

**وعن إبن عمر (رضي الله عنه) قال: "كنا إنا فقدنا الرجل في الفجر والعشاء أسأنا به الظن".**[2] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: ئیّمە ئەگەر کەسیّکمان بەرچاو نەکەوتایە لە نویّژی بەیانی و خەوتنان گومانی خراپمان پیّدەبرد.

تەنانەت پیاوچاکانی پیّشینی موسڵمان لەسەرەمەرگیشدا خۆیان کوتاوە بەرەو مزگەوت، چونکە بە سوننەتی پیّغەمبەریان زانیوە کە لەسەرەمەرگدا تەشریفی پیرۆزی هیّنایە مزگەوت بۆ نویّژ کاتیّك ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لیّ بیّت) پیّشنویّژیی بۆ موسڵمانان دەکرد لەسەر فەرمانی پیّغەمبەر (سەلامی خوای لیّ بیّت). لە موسعەبی کوڕی زوبەیر گیّڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: گویّم لە عامری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری بانگبیّژ بوو، تینی ئەدا بەخۆی و دەیفەرمو دەستم بگرن!! وتیان تۆ زۆر هیلاکی. فەرمووی گویّم لە بانگەوازی خودا بیّت و نەچم بە دەنگیەوە!!، ناچار دەستیان گرت لەگەڵ پیّشنویّژدا نویّژی دابەست یەك رکاتی کردو لە ناو نویّژەکەدا گیانی سپارد.[3]

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٤٠٥.

[2] رواه الطبراني في المعجم الكبير رقم (١٣٠٨٥)، صحيح وصايا الرسول ج١ ص ٤٠٥.

[3] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٣٩٢.

**كان الربيع بنُ خثيم: "يُحمل الى الصلاة وهو مشلول! !"**. واتە: ڕەبیعی کوڕی خەسیم: "هەڵدەگیرا بۆ نوێژ کە شەلەلی هەبوو". **عن أبي حيان التميمي عن ابيه، قال: "أصاب الربيع الفالجُ فكان يُحمل الى الصلاة، فقيل له؟ انه رُخص لك قال: قد علمتُ، ولكن أسمع النداء بالفلاح!"**. هەروەها ئەبی حەییان تەمیمی لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی ڕەبیع تووشی ئیفلیجیی بوو، هەڵیان دەگرت بۆ نوێژ، پێی وترا تۆ مۆڵەتت هەیە نەچیت، دەیفەرموو دەزانم، بەڵام گوێم لە بانگ بێت بڵێ **"حي على الفلاح"** ڕابن بۆ ڕزگاریتان بچن.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەو شەوەی تیایدا مرد بە پێوە نوێژی دەکرد[١]

## فریشتە سەڵاوات ئەدەن لەو کەسەی دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژ

فریشتە سەڵاوات ئەدەن لە نوێژخوێن واتە داوای لێخۆشبوون و بەزەیی خودا دەکەن بۆ ئەو موسڵمانەی بۆ نوێژ دەچێتە مزگەوت، فریشتەکانیش بەبێ فەرمانی خودا هیچ کارێك ناکەن و بێ فەرمانی خوداش ناکەن **"لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ"**. واتە: لە هیچ فەرمانێکی خوا یاخی نابن. لێرەوە دەردەکەوێت کە فریشتەکان بە فەرمانی خودا سەڵاوەت ئەدەن لە نوێژخوێنان.

**قال رسول الله ﷺ: ان الملائكة تصلى على الذي يأتى المسجد للصلاة فتقول (اللهم صلَ عليه، اللهم ارحمه مالم يؤذ فيه مالم يحدث فيه".**[٢] واتە: پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی فریشتەکان سەڵاوات ئەدەن لەو کەسەی دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژو دەڵێن ئەی خودایە لێی خۆش بەو بەزەییت پێیدا بێتەوە, تا ئازاری بۆ کەس نەبێت و داڵغەو خەتەرەی تێدا لێنەدات هەر سڵاواتی لەسەر ئەدەن.

---

[١] موسوعة الأخلاق الإسلاميه، ج١ ص٢٣٢.

[٢] رواه مسلم رقم ٦٤٩.

## تا لە دورتر بێتە مزگەوت خێری زیاترە

هەر کارێکی خێر تا زیاتر خۆی بۆ ماندوو بکرێت و زیاتر ئەرکی بۆ بکێشرێ پاداشتی زیاترە، ئەو کەسەی بچێتە نوێژ بەهەر هەنگاوێك چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت، یان هەر بە یەك هەنگاو خێرێکی بۆ دەنووسرێ و گوناهێکی بۆ دەسڕێتەوە، بێگومان تا دوورتر بێت هەنگاوی زیاتر دەبێت و خێرو پاداشتی زۆرترە.

**عن أبي موسى (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: إن أعظم الناس أجرا في الصلاة أبعدهم اليها ممشى فابعدهم والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الامام اعظم أجراً من الذي يَصلي ثم ينام".**[1] واتە: لە ئەبی موسا (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (سەلاٌتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "بەڕاستیی گەورەترین پاداشتی نوێژخوێنان بۆ ئەوەیانە کە لە دوورترەوە دێتە نوێژ دەبا لە دوورەوە بێن، ئەو کەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا نوێژەکەی دەکات لەگەڵ پێشنوێژ پاداشتی زۆرترە لەو کەسەی کە نوێژەکەی دەکات و دەخەوێت.

**عن أبي بن كعب (رضي الله عنه) قال: كان رجلٌ من الأنصار لا أعلم احداً أبعد من المسجد منه, وكانت لا تخطئُهُ صلاة فقيل له: لو اشتريت حماراً تركبُهُ في الظلماء وفي الرّمضاء قال: ما يسرُّني أن منزلي إلى جنب المسجد، إنى أُريدُ ان يكتبَ لي ممشاي الى المسجد, ورجوعي إذا رجعتُ الى أهلي، فقال رسول الله ﷺ: "وقد جمع الله لك ذلك كلهُ".**[2] واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: پیاوێك لە یاریدەدەرەکان بڕواناکەم کەس ماڵی لەو دوورتر بێت لە مزگەوتەوە لە هیچ نوێژێکیش دوانەدەکەوت پێیان وت: ئەگەر گوێدرێژێکت بکڕیایە و بەسواری هاتوچۆت بکردایە لە تاریکەشەوو شەوەزەنگو قرچەی گەرمادا، ئەویش فەرمووی بەخوا پێمخۆش نییە ماڵم لە تەنیشت مزگەوتێ بێت "مزگەوتی پێغەمبەر" بەڕاستیی من دەمەوێت بە هاتنە مزگەوت و گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە خێرم بۆ بنوسرێت پێغەمبەر (سەلاٌتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "خوا هەموو ئەو خێرەی بۆ کۆکردویتەوە".

---

[1] متفق عليه، رواه البخاري رقم ٦٢٣ ومسلم رقم ٦٦٢، ورياض الصالحين رقم ١٠٥٧.

[2] رواه مسلم رقم (٦٦٣)، رياض الصالحين رقم ١٠٥٥.

عن جابر (رضي الله عنه) قال: "خلت البقاع حول المسجد فأراد بنو سلمة ان ينتقلوا قرب المسجد فبلغ ذلك النبي ﷺ فقال لهم: "بلغني أنكم تريدون أن تنقلبوا قرب المسجد؟". قالوا: نعم يارسول الله، قد أردنا ذلك، فقال: "يا بني سلم ديارَكم تكتبُ آثاركم، ديارَكم تكتبُ آثاركم". فقالوا: مايسرنا إنا كنا تحولنا". رواه مسلم[1] وفي رواية (إن لكم بكل خطوة درجة). واته: له جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: "پارچە زەوی خاڵیی لە دەوری مزگەوتی پێغەمبەر هەبوون (بەنوسەلەمە) ویستیان بگوێزنەوە نزیکی مزگەوت "لەوێ خانوو بکەن"، ئەم باسە بە پێغەمبەر گەیشتەوە (سەلاٌتو سەلامی خوای لێ بێت) پێی فەرموون: بیستومە دەتانەوێت بگوێزنەوە نزیکی مزگەوت؟". وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا وامان نیازبوو. فەرمووی: "ئەی (بەنی سەلەم) دەستبەرداری خانووبەرەتان مەبن شوێنەوارتان دەنوسرێ دووجار دووبارەی کردەوە". وتیان: ئیتر حەز ناکەین ماڵەکانمان بگوێزینەوە. لە ڕوایەتێکی تردا پێی فەرموون "بێگومان" بە هەموو هەنگاوێکتان پلەیەکتان دەست دەکەوێت.

وعن إبن عباس قال: كانت الأنصار بعيدة منازِلُهم من المسجد فارادوا أن يقتربوا فنزلت: "وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ" فثبتوا".[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی یاریدەدەرەکان ماڵیان لە مزگەوتەوە دوور بوو ویستیان نزیك بنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت: "هەرکارێك پێشدەستیان لێ کردووەو بەزیندوی کردویانە شوێنەواریشیان گشت دەنووسین"، ئیتر دەستبەرداری شوێنی خۆیان نەبوون.

## ڕۆیشتن بۆ نوێژ پلە بەرز دەکاتەوە

هەرکەس ڕوو لە خوا بکات خواش ڕووی تێدەکات، هەرکەس بەرەو خوا بچێت خواش بەرەو پیری دێت بە چاکتر و باشتر، ئەگەر کەسێك بستێك لە خوا نزیك بێتەوە خوا گەزێك خۆی لێ نزیك دەکاتەوە. ئەگەر گەزێك لە خوا نزیك بێتەوە، خوا باڵێك

---

[1] البخاري رقم ١٧٨٨ ومسلم رقم ٦٦٥، رياض الصالحين ١٠٥٦.

[2] صحيح، سنن إبن ماجة، ٦٣٧، وصحيح وصايا الرسول ج١ ص٣٧٠.

لێی نزیك دەبێتەوە، خۆ ئەگەر بە ڕۆیشتنی ئاسایی بەرەو خوا بکەوێتەڕێ، خوا بە ڕاکردن بە خێرایی دێت بەرەو پیری، هەرکەسیش ڕوو لە مزگەوت و ماڵی خوا بکات ئەوە پاداشتی میوانی بەڕێزو خۆشەویستی پێ دەدرێت لە لایەن خواوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "ألا أدلكم على ما يمحو الله به الخطايا، ويرفع به الدرجات؟ قالوا: بلى يارسول الله. قال: "إسباغ الوضوء على المكاره وكثرة الخطا الى المساجد، وإنتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط فذلكم الرباط".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەرێ ئاگادارتان بکەم لەوەی گوناهی پێ دەسڕێتەوە و پلەکانی پێ بەرز دەبێتەوە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: "دەستنوێژگرتن بە چاکی و زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت و چاوەڕوانی کردن لەم نوێژەوە بۆ ئەو نوێژ، ئەوە جیهادە، ئەوە جیهادە".

## ڕۆیشتن بۆ نوێژ گوناهو تاوان دەسڕێتەوە

ڕۆیشتن بۆ نوێژو بەرەوپیرچوونی نوێژ، یەکێکە لە کردەوە چاکەکانو خوای گەورەش کۆمەڵێ پاداشتی داناوە بۆ هەرکەسێك هەستێت بە نیازی نوێژکردن، هەتا ڕێگەش دوورتر بێت خێری زیاترەو زیاتر گوناهو تاوانی لێدەسڕێتەوەو بە کەمبوونەوەو مەفحبوونەوەی تاوانەکانیشی، هێواش هێواش لە خوا نزیك دەبێتەوە تا دەبێتە دۆستو خۆشەویستی خواو لە لای ئەویش پلەی بەرز دەبێتەوە.

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال أن النبي ﷺ قال: "من تطهر في بيته ثم مضى الى بيت من بيوت الله، لِيَقضِيَ فريضة من فرائض الله، كانت خُطواته، إحداها تَحُطُ خطيئة، والأخرى ترفع درجة".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: هەر کەس لە ماڵەوە دەستنوێژ بگرێ و بڕوات بەرەو ماڵێك لە ماڵەکانی خوا بۆ ئەنجامدانی نوێژێك کە خوا

---

[1] رواه مسلم ٢٥١، رياض الصالحين ١٠٥٩.

[2] رواه مسلم ٦٦٦، رياض الصالحين ١٠٥٤.

فەرزی کردووە، هەنگاوەکانی، یەکێکیان گوناهێك دەسڕێتەوەو ئەوی تریان پلەیەك بەرزی دەکاتەوە.

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "صلاة الرجل في جماعة تُضعّفُ على صلاتِهِ في بيته وفي سوقهِ خمساً وعشرين ضعفاً وذلك أنه إذا توضأ فأحسن الوضوء, ثم خرج الى المسجد، لا يخرجُهُ الا الصلاة، لم يخطُ خطوة إلا رُفعت له بها درجة، وحطت عنه بها خطيئة، فإذا صلى لم تزل الملائكة تُصلَى عليه مادام في مصلاه، مالم يحدث، تقول: اللهم صلَ عليه، اللهم أرحمهُ ولا يزال في صلاة ما انتظر الصلاة".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: نوێژی هەر پیاوێك بە کۆمەڵ بەسەر نوێژەکەیماڵەوە و بازاڕیدا بیست و پێنج چەندانەیە ئەوە ئەگەر دەستنوێژێکی چاکی گرت، پاشان دەرچوو بەرەو مزگەوت، تەنها بۆ نوێژیش نەبێت نەچێت هیچ هەنگاوێك نانێت پلەیەك بەرز نەبێتەوە پێی و تاوانێکی پێنەسڕێتەوە، ئەگەر نوێژیشی کرد بەردەوام فریشتە سڵاواتی لەسەر ئەدەن تا لە سوژدەگاکەیدا بێت و دەستنوێژی نەشکابێ دەڵێن: "خوایە لێی خۆش بە، خوایە بەزەییت پێیدا بێتەوە، بەردەوامیش وەك ئەوە وایە لە نوێژدا بێت تا چاوەڕێی نوێژ بکات".

## ئەوەی دەچێتە نوێژ تا دەگەڕێتەوە لە نوێژدایە

هەرکەس لەماڵ دەرچێ بەنیازی نوێژکردن بۆ دوور بچێ یا نزیك تا دەگەڕێتەوە لە نوێژدایەو هەموو ئەو ماوەیەی کە لە ماڵ چۆتە دەرەوە تا دەگەڕێتەوە بە نوێژ بۆی تۆمار دەکرێ.

**عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "القاعد على الصلاة كالقانت، ويكتب من المصلين، من حين يخرج من بيته حتى يرجع الى بيته".**[2] واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا

---

[1] متفق عليه. البخاري ٦٢٠ ومسلم ٦٤٩ ورياض الصالحين ١٠٦٥.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٤٤٣٧ وصحيح ترغيب ٢٩٧ و ٤٥٤.

(سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەوەی دادەنیشێو چاوەڕێی نوێژ دەکات وەك پیاوێکی ملکەچو فەرمانبەر وایەو لە نوێژخوێنان تۆمار دەکرێ، لەوکاتەوە لە ماڵ هاتۆتە دەرەوە هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی".

## نوێژخوێن بەهەموو هاتوچۆیەکی مزگەوت مەنزڵگایەکی لە بەهەشت پێدەبەخشرێ

هەرکەس روو لە مزگەوت بکات لە پاداشتا خودا بۆ میوانەکانی مەنزڵگاو کۆشکێك ساز دەکات لە بەرامبەر هەر هاتوچۆیەکی. ئەگەر میوانی کەسانێك لە رووياندا خانەخوێ روو گەش بکات خۆشی لێ نەیەت میوانە بەڕێزەکانی خانەی خودا کۆشك و تەلاریان پێشکەش دەکرێت لە لایەن خاوەن ماڵەوە.

پیاوچاکانێك لە مێژووی پرشنگداری ئیسلامدا بەخشیشی زێڕو زیویان بەخشیوەتە میوانەکانیان هەرکەس زیاتری خواردبێت لە میواندارياندا زیاتر زێڕو زیویان وەرگرتووە لە لایەن خانەخوێوە. پێغەمبەری خواش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە لایەن خوداوە راسپێراوە هەرکەس بێتە مزگەوت و بگەڕێتەوە خودا کۆشكو تەلارێکی پێدەبەخشێت لە گەوهەر و دووڕو یاقوت دیوارەکانی چنراوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "من غدا إلى المسجد أو راح، أعد الله له في الجنة نُزُلًا كلما غدا أو راح".** [1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەرکەس بچێتە مزگەوت یان لە مزگەوت بگەڕێتەوە خودا مەنزڵگایەکی "لە کۆشك و تەلاری بەهەشت"، پێ دەبەخشێت لە بەرامبەر هەر چوون و گەڕانەوەیەکیدا.

## خاوەنی گەورەترین پاداشت لە نوێژدا کێیە؟

گەورەترین پاداشت لەناو تەواوی نوێژخوێناندا بۆ دوو تاقمە ئەوەی ماڵی لە مزگەوتەوە دوورەو لە رێگەی دوورەوە دێتە مزگەوت، ئەوەیش چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا بانگ ئەدات.

---

[1] متفق عليه. رواه البخاري رقم (٦٣١)، ومسلم رقم (٦٦٩)، ورياض الصالحين، رقم ١٠٥٣.

**عن أبي موسى (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "إن أعظم الناس اجراً في الصلاة أبعدهم اليها ممشىً، فأبعدهم، والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الإمام اعظم أجراً من الذي يُصلى ثم ينام".** [1] واتە: لە ئەبی موساوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی بێگومان گەورەترین پاداشت لە نوێژدا بۆ ئەو کەسەیە لە دوورترین شوێنەوە هاتبێتە نوێژ و ئەوجا دوورترین، ئەوەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا نوێژەکەی دەکات لەگەڵ پێش نوێژدا پاداشتی گەورەتری هەیە لەوەی نوێژەکەی دەکاتو دەخەوێ". واتە: چاوەڕوانی نوێژی بە کۆمەڵ ناکات.

[1] متفق عليه، البخاري ٦٢٣ ومسلم ٦٦٢، رياض الصالحين ١٠٥٧.

# نوێژ و فریشتەکان

## نوێژ ئەرکێکی خواییە لەسەر فریشتەکان

فریشتەکان فەرمانبەرداری خودان و هەموو فەرمانێکی خودا ئەنجام ئەدەن و تەمەڵی لێ ناکەن و لێی دواناکەون بەڵکو لە جێبەجێکردنی فەرمانی خودا چوست و چالاك و گیان لەسەر دەستن، بەتایبەتیش نوێژ کە گەورەترین ئەرکی خوداییە.

فریشتەکان نوێژ دەکەن و نوێژخوێنیان خۆش دەوێت و نزاو داوای خێریان بۆ دەکەن و لە خودا بۆیان دەپاڕێتەوە، بەشداریی نوێژیان لەگەڵ دەکەن و شاهیدیان بۆ ئەدەن لە ڕۆژی دواییداو لە نوێژیشدا لەگەڵیان ئامین دەکەن.

**عن حكيم بن حزام قال: "بينما رسول الله ﷺ في اصحابه اذ قال لهم: اتسمعون مااسمع؟ قالوا: ما نسمع من شيء قال: إني لأسمع أطيط السماء، ولا تلام إن تئط، وما فيها موضع شبر إلا وعليه ملك ساجد أو قائم".**[1]واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە فەرمووی وابوو پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لەناو هاوڕێکانیدا بوو پێی فەرموون ئەرێ ئەیبیستن ئەوەی کە من ئەیبیستم؟ وتیان هیچ نابیستین، فەرمووی بێگومان من گوێم لە قرچە قرچی ئاسمانە، لۆمەش ناکرێ کە قرچە قرچی بێت، چونکە شوێنی بستێك نییە کە فریشتەیەك لە کڕنوشدا یان لە سوژدەدا یان بە پێوە نەبێت. **"وذكر إن في كل سماء بيتا يعبد فيها اهلها ويصلون اليه والذي في السماء الدنيا يقال له بيت العزة".**[2] واتە: إبن كثير (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باس دەکات کە لە هەموو ئاسمانەکان خانویەك هەیە، خەڵکی ئەوێ خواپەرستیی تیادا دەکەن و نوێژی تیادەکەن، ئەو خانووەی کە لە ئاسمانی دونیادایە پێی دەوترێت **"بيت العزة"**.

**اخرج بن جرير من طريق خالد بن عرعرة إن رجلاً قال لعلي (رضي الله عنه) ما البيت المعمور؟ قال: بيت في السماء يقال له الضراح وهو بحيال الكعبة من فوقها،**

---

[1] رواه الطبراني في المعجم الكبير رقم (٣١٢٢)، قال فيه الألباني "صحيح على شرط مسلم" سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٨٥٢.

[2] عالم الملائكة الأبرار الدكتور عمر سليمان الأشقر ص٣٢.

**حرمته في السماء كحرمة البيت في الأرض، يصلى فيه كل يوم (سبعون الف) من الملائكة، و لا يعودون فيه ابداً"**.[1] واته: إبن جرير له ڕێگەی خالیدی کوڕی عەرعەرەوە گێڕاویەتیەوە کە پیاوێك لە فەرماندەی موسڵمانان پرسی لە عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) بەیتولمەعمور چیە؟ فەرمووی: خانویەکە لە ئاسمان پێی دەوترێت **"الضراح"** لە ئاستی کەعبە لەسەرەوەیە، ڕێز و پلە و پایە لە ئاسمان وەکو پلەو پایەی کەعبە وایە لە زەوی هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تیادا دەکەن جارێکی کەش ناچنەوە ناوی و بەریان ناکەوێت".

**ومن رواية قتادة، قال: ذكر لنا ان النبي محمد ﷺ قال يوما لاصحابه: "هل تدرون ما البيت المعمور؟ قالوا: الله ورسوله أعلم، قال: فأنه مسجد في السماء، تحته الكعبة: لو خر لخر عليها.."**.[2]واتە: لە گێڕانەوەی قەتادەدا هاتووە فەرموویەتی: بۆی باسکردین کە پێغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) بە هاوڕێکانی فەرموو: ئایا دەزانن (بەیتولمەعمور) چییە؟ وتیان خواو پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرمووی: مزگەوتێکە لە ئاسمان کەعبە لە ژێریدایە، ئەگەر بکەوێتە خوارەوە بەر کەعبە دەکەوێت.

## فریشتەکان ریز دەبەستن بۆ نوێژکردن

کاری بێ سەرو بەرەو پەرت و بڵاوو بێ بەرنامەو شێواو و تێکەڵ و پێکەڵ و شپرزە لە لای خوا وەرگیراو نییە یان هەر نەبێت خێرو بەرهەم و پاداشتی کەمترە، بۆیە فریشتەکانیش بە ریزو بە کۆمەڵ نوێژ دەکەن.

فریشتەکانیش لە کۆشش و هەوڵی بەردەوامدان بەبێ ماندووبوون و بەبێ پشوو، بەبێ خەو و خۆراك بۆ زیاترو زیاتر پەرستن و سوپاس و ستایشی خوای باڵادەست، بە چاکترین شێوە. بە کام شێواز خێری زۆرترە، کام پەرستن و لە کام کاتدا خێرو پاداشتی زۆرە، نوێژی بە کۆمەڵیش خێری بیست و پێنج یان بیست و حەوت جار چەندانەیە. هەر بۆیە گرنگترین جۆری پەرستشی فریشتەکان نوێژکردنە و نوێژیش بەکۆمەڵ.

---

[1] قال فيه الشيخ ناصرالدين الألباني. ورجاله ثقات غير خالد بن عرعرة وهو مستور.

[2] عالم الملائكة الأبرار ص٢٣ وقال الألباني وجملة القول إن هذه الزيادة (حيال الكعبة) ثابتة بمجموع طرقها.

عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: إن من السموات سماء، ما فيها موضع شبر إلا وعليه جبهة ملك اوقدماه قائماً ثم قرأ "وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ * وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ" (الصافات: ١٦٠ ـ ١٦٦). واته: له عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) فەرموویەتی له ئاسمانەكاندا ئاسمانێك هەیە شوێنی بستێك نییە كه ناوچەوانی یان هەردوو قاچی فریشتەیەكی لەسەر نەبێت پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە "ئێمە خۆمان ریزبەند دەكەین بۆ نوێژ"و "ئێمە خۆمان له پەسەندی ئەوداین".

عن حذيفة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "فُضِّلنا على الناس بثلاث: جُعلت صُفوفنا كصفوف الملائكة، وجُعلت لنا الأرض كلُها مسجداً، وجعلت تربتها لنا طهوراً إذا لم نجد الماء، وأعطيتُ هذه الآيات من آخر سورة البقرة من كنز تحت العرش لم يُعطها نبي قبلي".[١] صحيح، واته: له حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لیٚ بێت) فەرموویەتی پلەو پایەمان بەرزە بەسەر خەڵكیدا بە سیٚ شت: ریزەكانی نوێژمان وەكو ریزی فریشتەیە، هەموو زەویمان بۆ كراوەتە مزگەوتو گڵو خۆڵەكەیمان بۆ پاككراوەتەوە، كه ئاومان دەست نەكەوتو ئەو ئایەتانەی كۆتایی (سورەتی بەقەرە)م پیٚ بەخشراوە كه له خەزێنەی ژێر عەرشن به هیچ پێغەمبەرێكی پێش من نەبەخشراوە.

## فریشتەكان بەشداریی نوێژی بەكۆمەڵ دەكەن

فریشتەكان لەگەڵ بڕواداران بەشداریی هەموو كارێكی خێر دەكەن بەتایبەتی نوێژ كه چاكترین كاری چاكەو باشترین جۆری پەرستنە، لەگەڵیان نوێژ دەكەن بە كۆمەڵ و داوای بەزەیی و ڕێزو سۆزی خوایان بۆ دەكەن.

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "يتعاقبون فيكم ملائكة بالليل، وملائكة بالنهار، ويجتمعون في الصلاة الصبح وصلاة العصر، ثم يعرج الذين باتوا فيكم، فيسألهم الله وهو اعلم بهم: كيف تركتم عبادي؟ فيقولون:

---

[١] رواه مسلم رقم (٥٢٢)، صحيح الجامع الصغير وزيادته ٤٢٢٣.

**تركناهم وهم يُصلون، وأتيناهم وهم يصلون".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیّ بیّت) فەرمووی پیّغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: فریشتە بە شەو و بە رۆژ دوابەدوای یەك دیّن بۆ لاتان لە نویّژی بەیانی و نویّژی عەسردا بەیەك دەگەن، پاشان ئەوانەیان شەو لەگەڵتان بوون سەردەکەونەوە بۆ ئاسمان و خودا پرسیاریان لیّدەکات کە خۆشی چاکتر ئاگاداریانە: چۆن بەندەکانی منتان بەجیّ هیّشت دەڵیّن: بە جیّمان هیّشتن ئەوان نویّژیان دەکرد و چووین بۆ لایان ئەوان هەر نویّژیان دەکرد.

هەروەها وتنی ئامینی فریشتەکان لەگەڵ نویّژخویّنان بەڵگەیە لەسەر بەشداریکردنی فریشتەکان لە نویّژی بە کۆمەڵدا **"جماعة"**.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "تفضل صلاة الجمع صلاة احدكم وحده بخمس وعشرين جزاً، وتجتمع ملائكة الليل وملائكة النهار في صلاة الفجر". صحيح** [2]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیّ بیّت) پیّغەمبەری خوا (سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی: "نویّژی بە کۆمەڵ خیّرترە لە نویّژی یەکیّکتان بە تەنیا بە بیست و پیّنج بەش، فریشتەی شەوو رۆژ لە نویّژی بەیانیدا کۆدەبنەوە".

خوا دەفەرمویّت: **"وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ"** (الصافات١٦٠) واتە: فریشتەکان دەفەرمون "بیّگومان ئیّمە خۆمان ریزبەند دەکەین و ریز دەبەستین بۆ نویّژ".

**وعن جابر بن سَمُرَة (رضي الله عنه)، قال: خَرَجَ علينا رسول الله فقال الا تَصُفُّون كما تصُفُّ الملائكة عند ربها؟ فقال: يارسول الله وكيف تصُفُ الملائكة عند ربها؟ قال: "يُتِمون الصفوف الأول ويتراصون في الصف".**[3] واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە (رەزای خوای لیّ بیّت) فەرمووی: پیّغەمبەر هات بۆ لامان (سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی ئەریّ ریز نابن وەکو فریشتەکان لە لای پەروەردگاریان ریز دەبەستن؟ وتمان: ئەی پیّغەمبەری خوا فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان چۆن ریز دەبن؟ فەرمووی: "ریزی یەکەم تەواو دەکەن و لە ریزدا ریّك دەوەستن".

---

[1] متفق عليه. رواه البخاري رقم (٥٣٠)، ومسلم رقم (٦٣٢)، ورياض الصالحين رقم ١٠٥٠.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٩٧٤. و ٤٢١٦ بهذا اللفظ "فضل صلاة الجمع".

[3] رواه مسلم ٤٣٠، رياض الصالحين ١٠٨٢.

## فریشتەکان شاهیدیی بۆ نوێژخوێنان ئەدەن

فریشتەکانی خوا شاهێدن بەسەر بەندەکانی خواوە، هەر کارو کردەوەیەك بکەن ئەوان شاهێدی راستەقینە و بێ فرۆفێڵن و شاهێدی ناحەق نادەن.

بەشداری نوێژ و یادی خوداو کۆڕی زیکر دەکەن و لەسەر هەموو پەرستن و کردارە چاکەکانی خواپەرستان دەڵێن خودایە ئێمە بینیمان نوێژیان دەکرد کاتێك چوینە سەردانیان لە نوێژدا بوون، کاتێکیش بەجێمان هێشتن لە نوێژدا بوون.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "يتعاقبون فيكم ملائكةٌ بالليل وملائكة بالنهار. ويجتمعون في صلاة الفجر وصلاة العصر, ثم يعرج الذين باتُوا فيكم فيسألهم ربهم "وهو أعلم بهم" كيف تركتم عبادي؟ فيقولون تركناهم وهم يصلُون وأتيناهم وهم يصلون".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: بە دوای یەکدا دێن بۆ لاتان، فریشتەکانی شەو و فریشتەکانی رۆژ لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر کۆدەبنەوە ئینجا ئەوانەیان شەو لەلاتان بوون بەرز دەبنەوە، پەروەردگارت لێیان دەپرسێ خۆشی باشتر دەزانێ، چۆن بەندەکانی منتان بەجێهێشت؟ دەڵێن بەجێمان هێشتن نوێژیان دەکرد, کە چووینە لاشیان هەر نوێژیان دەکرد.

## نوێژخوێنان خۆشەویستی فریشتەکانن

فریشتەکان بڕوادارنو بڕوادارانیشیان خۆش دەوێت، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی ئیمان خۆشەویستیە وەکو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی ناچنە بەهەشت تا بڕواتان نەبێت، بڕواشتان نابێت تا یەکترتان خۆش نەوێت.

فریشتەکان بڕوادارن و بێ فەرمانیی خوا ناکەن، هەر فەرمانێك لە لایەن خواوە بێت بێ سێ و دوو ئەنجامی ئەدەن, لێرەوە دەڕوانینە ئەم فەرمودەیە کە خوا فەرمان دەکات بە فریشتەکان بڕوادارانیان خۆش بوێت.

---

[1] متفق عليه. البخاري ٥٣٠ ـ ومسلم ٦٣٢ لفتح ٥٥٥. ونضرة النعيم النعيم ج٦. ص٢٥٥٤. رقم ١٦ / وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٨٠١٩.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إن الله تبارك وتعالى إذا احب عبداً نادى جبريل: إن الله قد أحب فلاناً فأحبه، فيحبه جبريل. ثم ينادى جبريل في السماء: إن الله قد أحب فلاناً فأحبوه، فيحبه أهل السماء، ويوضع له القبول في الأرض".**[1] واته: له ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) فەرمووییەتی پیٚغەمبەری خوا (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرمووی: "بیٚگومان خوای پاك و بیٚگەرد ئەگەر کەسیٚکی خۆش ویست بانگی جبریل دەکات: بەڕاستیی من فلاٚن کەسم خۆشدەویٚت تۆش خۆشت بویٚ، جبریلیش خۆشی دەویٚت، ئینجا جبریل بە ئاسماندا بانگ دەکات خوا فلاٚن کەسی خۆش دەویٚ، ئیٚوەش خۆشتان بویٚ، خەلٚکی ئاسمانیش خۆشیان دەویٚ و لەسەر زەویش جیٚگەدارو مایەی ڕەزامەندیی دەبیٚت.

لەم بارەشەوە پیٚغەمبەر (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) دەفەرمویٚت وەکو جابر (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەیگیٚڕیٚتەوە: **"إذا قام احدكم يصلى من الليل فليستَك فإن احدكم إذا قرأ في صلاته وضع ملك فاه على فيه، ولا يخرج من فيه شىء إلادخل فم الملك".**[2] واته: ئەگەر یەکیٚکتان هەلٚدەستیٚ شەونویٚژ دەکات، بە سیواك بیکات، چونکە کە یەکیٚکتان لە نویٚژدا قورئان دەخویٚنیٚ فریشتەیەك دەمی دەخاتە سەر دەمی ئەو، هیچ شتیٚك لە دەمی دەرناچیٚ کە نەچیٚتە دەمی فریشتەکەوە.

لە فەرمودەیەکی تر پیٚغەمبەر (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) دەفەرمویٚت: **"إذا قام الرجل يتوضأ ليلاً أو نهاراً فأحسن الوضوء واستنَّ ثم قام فصلى أطاف به الملك ودنامنه، حتى يضع فاه على فيه، فما يقرأ إلا في فيه، وإذا لم يستن أطاف به، ولايضع فاه على فيه".**[3] واته: ئەگەر کەسیٚك هەلٚدەستیٚ و دەستنویٚژ دەگریٚ و سیواك بکات ئینجا هەستیٚ نویٚژ بکات فریشتە بە دەوریدا دەسووریٚتەوە و لیٚی نزیك دەبیٚتەوە تا دەمی دەخاتە سەر دەمی، هەرچی دەخویٚنیٚ دەچیٚتە دەمیەوە، خۆ ئەگەر سیواك نەکات فریشتەکە بە دەوریدا دەسووریٚتەوە، بەلاٚم دەم ناخاتە سەر دەمی.

---

[1] رواه البخاري ٧٠٤٧ ومسلم ٢٦٣٧. عالم الملائكة الأبرار ص٥٣

[2] صحيح/ صحيح الجامع الصغير وزيادته٧٢٠.

[3] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٧٢٣.

## فریشتەکان بەزەیی و لێبوردنی خودا داوا دەکەن بۆ کەسێك بۆ نوێژکردن دەچێتە مزگەوت

فریشتەکان لە پێشوازیی نوێژخوێناندان، میوانەکانی ماڵی خوداو دوعاو نزای خێریان بۆ دەکەن، بۆیان دەپاڕێنەوە، داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەن لە خودا. هەر چۆن لە دوارۆژدا لە دەوروبەری دەرگاکانی بەهەشت و لە کاتی چوونە ناو بەهەشت لە پێشوازییانداو دەستەو نەزەریان وێستاون فەرمویان دەکەن و بە جوانترین شێواز سەلامیان لێدەکەنو مژدەو مزگێنییان پێ ئەدەن پیرۆزباییان لێدەکەنو دەرگاکانی بەهەشتیان بۆ والاکردوون.

**قال رسول الله ﷺ: إن الملائكة تصلي على الذي يأتى المسجد للصلاة فتقول: "اللهم صلِّ عليه، اللهم ارحمهُ مالم يؤذ فيه مالم يحدث فيه".** [1] واتە: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی فریشتە داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی خوا دەکەن بۆ ئەو کەسەی دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژ، دەڵێن: "خودایە لێی خۆش بە خودایە بەزەییت پێیدابێتەوە" تا بێ دەستنوێژ نەبێت.

## فریشتەکان بەزەیی و لێ بوردەیی خوا داوا دەکەن بۆ کەسێك پابەندی سوژدەگاکەی بێت

هەرکەس دوای تەواوبوونی لە نوێژ سوژدەگاکەی بەجێنەهێشتو لەسەر بەرماڵو بەردەنوێژو تاتەبەردەکەی دانیشت ئەوە سوننەتی پێغەمبەری ئەنجامداوە فریشتەکان داوای بەزەییو لێخۆشبوونی خودای بۆ دەکەن و هەروەکو لە نوێژدا بێت حیسابی بۆ دەکرێ هەمان خێری نوێژکردنەکەی بەو دانیشتنە بۆ دەنووسرێ.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "الملائكة تُصلى على أحدكم مادام في مصلاهُ الذي صلى فيه، ما لم يُحدث تقول: اللهم اغفر له، اللهم ارحمهُ".** [2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە

---

[1] رواه مسلم رقم (٦٤٩).

[2] رواه البخاري (٤٣٤) ومسند احمد رقم ٨١٠٦ ورياض الصالحين ١٠٦٢. وصحيح الجامع الصغير و زيادته ٦٧٢٧ بهذا اللفظ. مالم يحدث ويَعّم. صحيح أبي داود ٤٨٨.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "فریشتەکان سەڵاوات ئەدەن لەسەر هەر یەکێکتان "واتە داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی خوای بۆ دەکەن"، تا لە سوژدەگاکەیدا بێت کە نوێژی تیادا کردووە بە دەستنوێژەوە دەڵێن: خودایە لێی خۆش بە، خودایە بەزەییت پێیدا بێتەوە".

قال عبدالرحمن السلمي (رحمه الله): "فأريد أن أموت وأنا في مسجدي".[1] واتە: عبدالرحمن (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ئەمەوێت لەناو مزگەوتەکەمدا بمرم".

## فریشتەکان داوای بەزەیی و لێخۆش بوونی خوا دەکەن بۆ ریزی یەکەمی نوێژ

هەرکەس بێتە نوێژ فریشتەکان پێشوازیی لێدەکەن و نزاو پاڕانەوەی بۆ دەکەن بە تایبەتیش ریزی پێشەوە کە پیرۆزترین و بەفەڕترین ریزەکانی نوێژە، کەسانی ریزی پێشەوە زوو هاتوونە مزگەوت، نزیکترن لە پێشنوێژ، دەستپێشخەرییان کردووە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی خوایی و جێبەجێکردنی سوننەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) زیادە کۆششێکیان کردووە، بە هۆیەوە بوونە شایستەی پاداشتی زیاتر.

**عن البراء (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "إن الله وملائكته يصلون على الصف الأول".**[2] واتە: لە بەڕڕائەوە (رەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: خوداو فریشتەکانیش داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی خودا دەکەن بۆ ریزی یەکەمی نوێژ.

**وفي سنن الترمذي "إن الله وملائكته يصلون على الصف المتقدم".**[3] "والصفوف المقدمە".[4] واتە: لە کتێبی سونەنی پێشەوا (تیرمیزی)دا فەرمودەکە بەمشێوەیە هاتووە: "بەراستیی خوداو فریشتەکان سەڵاوات و درود ئەدەن لە ریزی پێشەوە. لە ریوایەتێکدا "لە ریزەکانی پێشەوە".

---

[1] تأريخ الخلفاء الراشدين. الحسن. ص٢٠٠ للصلابي.

[2] صحيح الجامع ٢/ ١٣٣ / وصحيح أبي داود ٦٦٤، وصحيح الجامع الصغير وزيادته ١٨٣٩.

[3] صحيح الجامع ٢/ ١٣٢.

[4] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٨٤٢.

عن أبي امامة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "إن الله وملائكته يصلون على الصف الأول سوُّوا صفوفكم وحاذوا بين مناكبكم، ولينوا في أيدي إخوانكم، وسُدُّوا الخلل، فأن الشيطان يدخل فيما بينكم مثل الحذف".[1]واته: له ئەبی ئومامەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) پیٚغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرمووی: "بیٚگومان خواو فریشتەکانی سەڵاوات ئەدەن لەسەر ریزی یەکەمی نویٚژ، ریزەکانتان ریٚك بکەنو شانتان ریٚکی یەك بکەن، نەرمونیان بن بەدەست براکانتانەوە و کەلیٚنەکان پڕ بکەنەوە، بەڕاستیی شەیتان لە نیٚوانتانەوە دەچیٚتە ژوور وەکو بەرخە سیخنەی یەمەنی.

وعن البراء (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "إن الله وملائكته يصلون على الصف المقدم والمؤذن يغفر له مدّ صوته، ويصدقه من سمعه من رطب ويابس, و له مثل أجر من صلى معه".[2]واته: پیٚغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بیٚت) فەرموویەتی: "خواو فریشتەکان سەڵاوات ئەدەن لە ریٚزی پیٚشەوەی نویٚژ، بانگبیٚژ تا دەنگی بڕوا داوای لیٚخۆشبوونی بۆ دەکریٚ، هەرچی گوێیان لیٚبیٚ لە تەڕو وشك شایەتی راستی بۆ ئەدەن، پاداشتیشی وەکو پاداشتی ئەوانەیە نویٚژی لەگەڵدا دەکەن.

## فریشتەکان لەگەڵ پیٚش نویٚژ و نویٚژخویٚناندا (ئامین) دەکەن

هەمیشە ژمارەیەك لە فریشتە پاك و بیٚگەردەکانی خودا ئامادەی نویٚژی بڕواداران دەبن لەسەرانسەری دونیادا هەرکات سوڕەتی فاتیحەیان تەواو کرد فریشتەکانیش بەیەك دەنگ لەگەڵ نویٚژخویٚناندا ئامین دەکەن. پیٚغەمبەری خودا کە لە خویٚندنی سوڕەتی فاتیحە تەواو دەبوو بە دەنگی بەرز دەیفەرموو (ئامین) بە هاوەڵە بەڕیٚزەکانیشی دەفەرموو بڵیٚن (ئامین)، فریشتەکانیش (ئامین) دەکەن. وەکو لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە:

[1] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٨٤٠.

[2] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٨٤١.

**قال رسول الله ﷺ: "إذا قال احدكم في الصلاة "آمين" والملائكة في السماء "آمين" فوافق أحدهما الآخر غفر له ما تقدم من ذنبه".**[1] واته: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەگەر یەکێکتان لە نوێژدا وتی "ئامین"و فریشتەکانیش لە ئاسمان وتیان "ئامین"و ئەو دوو ئامینکردنە هاوکات بوون، خوا لە گوناهی رابردووی خۆش دەبێت. لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: **"فقولوا: "آمين يحبكم الله".**[2] واتە: بڵێن ئامین خودا خۆشی دەوێن. "ئامین" واتە: گیرابیت، یان خودایە لێمان وەربگرە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "إذا أُمّن الامام فأمِّنوا، فإنه من وافق تأمين الملائكة غفر له ماتقدم من ذنبه".**[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە: بێگومان پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەگەر پێشنوێژ ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکەن، بەڕاستیی هەرکەس ئامینەکەی هاوکات و چوونیەك بێت لەگەڵ ئامینی فریشتەکان خوا لە گوناهی رابردووی خۆش ئەبێت".

**وعن إبن جريح عن عطاء قال: "قلت له كان إبن الزبير يؤمن على إثر أم القرآن قال نعم، ويؤمن من وراءه حتى ان للمسجد للجَّةَ".**[4] واتە: لە ئیبن جریج لە **عطاء**وە فەرمووی پێم وت: ئەرێ ئیبن زوبەیر ئامینی دەکرد لە دوای "أم القرئن"ەوە کە (سوڕەتی فاتیحە)یە وتی: بەڵێ، بەدوایدا ئامین دەکرا هەتا گرمەو ناڵەی مزگەوتەکە وەکو شەپۆلی دەریا وابوو.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله: "إذا قال احدكم في الصلاة: آمين, وقالت الملائكة في السماء: آمين فوافقت احداهما الأخرى، غفر له ماتقدم من ذنبه". صحيح**[5] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە وتی (ئامین)

---

[1] رواه الشيخان البخاري رقم ٧٤٨ ومسلم رقم ٤١٠ والنسائي والارواء ٣٤٤.

[2] رواه البخاري ٧٤٧، ومسلم رقم ٤١٠، وأبو عوانة ١٦٨٥، صفة صلاة النبى ص٧٣.

[3] صحيح : اخرخه البخاري ٧٨٠ ومسلم ٤١٠ وصحيح فقه السنة ج١ ص٥٤٧.

[4] صحيح أخرجه عبد الرزاق ٢٦٤٠ والشافعي في مسنده ٢٣٠ وصحيح فقه السنة ج١ ص٥٤٧.

[5] صحيح سنن أبي داود ٨٦٥ ــ ٨٦٦، وصحيح الصغير وزيادته ٧٠٤.

فریشتەکانیش وتیان (ئامین) و هاوکات و بەرامبەر بوون، خوا لە گوناهی لەوەپێشی خۆش دەبێت.

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول ﷺ: "إذا قال الإمام: غير المغضوب عليهم ولاالضالين فقولوا آمين، فأنه من وافق قولهُ قول الملائكة غفر له ماتقدم من ذنبه". صحيح** [1]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێت): "کە پێش نوێژ وتی: "**غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ**"، ئێوەش بڵێن "ئامین"، چونکە هەر کەس ئامینەکەی هاوکاتی ئامینی فریشتە بێت، خوا لە گوناهی رابردووی خۆش دەبێت.

---

[1] صحيح الجامع الصحيح وزيادته ٧٠٧.

# نوێژ و پێغەمبەرەکان

## نوێژ لەسەر هەموو پێغەمبەرەکان فەرز بووە

ئەگەر شایەتمان بڕوابوونی ڕاست و دروست و بێ پاساوو بەڵگەنەویستی دڵەو دەربڕینە بە زمانو ئەنجامدانی پایەکان، ئەگەر زەکات لە ماڵدایەو ئەگەر جیهاد بە لاشەو ماڵە، نوێژیش پەرستشێکی دەروونی و لاشەییە، بڕوادار پەیوەست دەکات بە خواوە هەرچەند نوێژخوێن بە لاشە لەسەر زەوی و لەگەڵ مرۆڤەکانە بە ڕۆح و گیان لەگەڵ فریشتەکان لە جیهانی بەرز و بڵندی خودایەو بەرەو عەرشی خودا بەرز بۆتەوە.

نوێژ پەرستشی لاشەیە، پەرستشی گیانە، پاك خاوێنییە، وەرزشی لاشەیە، گوێڕایەڵی خودای جیهانیانە، سوننەتی سەرجەم پێغەمبەرانە لە ئادەمەوە تا خاتەم.

پێغەمبەرەکانیش لە هەموو کەس زیاتر پابەندی بەرنامەو فەرمانی خودا بوون لە هەموو کەس دەروون پاکوخاوێنتر بوونو پەیوەندیی دەروونیو گیانییان لەگەڵ خودا بەهێزتر بووە، لەم ڕوانگەشەوە نوێژ تاجی سەر سەری هەموویان بووەو هیچ پێغەمبەرێکی خودا نەبووە نوێژ خاڵی سەرەکیو چەق و کاکڵەو ناوەڕۆکی بەرنامەکەی نەبووبێت، یەکەم خاڵو یەکەم بەندی جێبەجێکردنو وەرچەرخانی گەلەکان بووە لە یەکەم هەنگاوی تەوبەکردن و ڕووکردنە خوایان.

خوا دەفەرموێت: **"أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ من ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَممَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسرائيل وَممَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا إذا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَن خَرُّوا سُجَّداً وَبُكِيّاً"** (مريم: ٥٨). واتە: ئەوانەی خودا بەهرە گەلی خۆی بەسەردا ڕشتون لە تەواوی پەیامبەران لە نەوەی ئادەم و لەوانەی لەگەڵ نوح هەڵمان گرتن و لە نەوەی ئیبراهیم و ئیسرائیل لەوانەش ڕێنوێنیمان کردن و هەڵمانبژاردن، هەر کات نیشانەو بەڵگەی خودایان بەسەردا بخوێنرایەوە بە سوژدە دەچوون و بە کوڵ دەگریان.

**عن إبن عباس قال: قال رسول الله ﷺ: "أمنی جبريل عند البيت مرتين صلى بي الظهر حين مالت الشمس قدر الشراك وصلى بي العصر حين كان ظل كل شيء مثله، وصلى بي المغرب حين افطر الصائم، وصلى العشاء حين غاب الشفق، وصلى بي الفجر حين حرم الطعام والشراب على الصائم، وصلى بي الغد الظهر**

**حين كان ظل كل شىء مثله، وصلى بي العصر حين صار ظل كل شىء مثليه، وصلى بي المغرب حين أفطر الصائم وصلى بي العشاء حين ذهب ثلث الليل، وصلى بي الغداة بعدما أسفر، ثم التفت اليَّ، فقال يا محمد، الوقت فيما بين هذين الوقتين، هذا وقت الأنبياء قبلك".**[١] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی جبریل لە لای کەعبە دووجار پێشنوێژیی بۆ کردم، نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم کاتێك خۆر لار بووەوە بە ئەندازەی قەیتانێك، نوێژی عەسری پێکردم کاتێك سێبەری هەر شتێك بە ئەندازەی خۆی لێهات، نوێژی شێوانی پێکردم ئەوکاتە ڕۆژوەوان بەربانگ دەکاتەوە، نوێژی خەوتنانی پێکردم کە سووریی کەناری ئاسمان ئاوا بوو، نوێژی بەیانی پێکردم ئەوکاتەی ڕۆژوەوان خواردن و خواردنەوەی لێ حەرام دەبێت.

جاری دووهەم: بۆ سبەینێ نوێژی نیوەڕۆی پێکردم ئەو کاتەی سێبەری هەر شتێك بە ئەندازەی خۆی لێدێت، نوێژی عەسری پێکردم کە سێبەری هەر شتێك دوو ئەوەندەی خۆی لێهات، نوێژی شێوانی پێکردم ئەو کاتەی ڕۆژوەوان بەربانگ دەکاتەوە، نوێژی خەوتنانی پێکردم کاتێك سێیەکی شەو بەسەرچوو, نوێژی سبەینێ بەیانی بۆ کردم کە زەردە هەڵات، ئینجا لای لێ کردەوەو فەرمووی: ئەی (موحەممەد)! کاتی نوێژەکان لە نێوان ئەم دوو کاتەدایە، ئەمەش کاتی "نوێژی" پێغەمبەرەکانی پێش تۆیە.

هەروەها لە فەرمودەی گەشتی ئاسمان **"اسراء و معراج"**ی پێغەمبەردا هاتووە: **".... ثم فُرضت علّى الصلاة خمسين صلاة كلَّ يوم، فرجعتُ، فمررتُ على موسى، قال: بم أُمرتَ قال: أمرتُ بخمسين صلاة كل يوم، قال إن أُمَّتك لاتسطيع خمسين صلاة كل يوم، وإنى والله: قد جربتُ الناس قبلك، وعالجتُ بني إسرائيل اشد المعالجة فارجع الى ربك، فاسأله التخفيف لامتك، فرجعتُ فوضع عني عشراَ... الى آخر الحديث".**[٢]واته:.. پاشان پەنجا نوێژم لەسەر پێویست کرا لەهەر

---

[١] فەرمودەکە صەحیحە بە سەرجەم ڕێگاکانیەوە کە لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە گێڕدراوەتەوە.

[٢] رواه البخاري ٣٢٠٧ ومسلم ١٦٤. والسيرة النبوية ج١ ص٣٩٠ ـ ٣٩١ للصلابي.

شەوو رۆژێکدا، گەڕامەوە، بە لای (موسا)دا تێپەڕیم فەرمووی: فەرمانی چیت پێکراوە؟ وتم: فەرمانم پێکراوە بە کردنی پەنجا نوێژ لە شەوو رۆژێکدا.

فەرمووی ئوممەتەکەی تۆ توانای پەنجا نوێژی نییە لە شەوو رۆژێکدا، بە خوا من خەڵکم تاقی کردۆتەوە لە پێش تۆدا ئەوپەڕی ئەزموون و هەوڵ و پێکەوەژیانم هەبووە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل، بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت، داوای لێ بکە بۆ ئوممەتەکەتی ئاسان کات، گەڕامەوە، دە نوێژی لەسەر لابردم.. بەو شێوەیە کەم کرایەوە تا هاتە سەر پێنج نوێژ، ئەم فەرمودەش بەڵگەیە لەسەر فەرز بوونی نوێژ لەسەر موسا و گەلەکەی، هەروەها کاتێك پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) گەڕایەوە لە ئیسراو میعراج بە درێژیی چۆنیەتی گەشتەکەی لە مەککەوە بۆ قودس و لەوێوە بۆ ئاسمان گێڕایەوە، لەو فەرمودەیەدا فەرمووی: **"... إني صليتُ الليلة العشاء في هذا المسجد، وصليت به الغداة، وأتيتُ فيما دون ذلك بيت المقدس، فَنُشر لي رهطٌ من الأنبياء، منهم ابراهيم وموسى وعيسى وصليت بهم، وكلَّمتهم، .... الى الآخر الحديث".** [1]

واتە: بێگومان نوێژی خەوتنانم لەم مزگەوتە کرد، نوێژی بەیانیشم لەم مزگەوتە کرد، لەو بەینەداو لەوەش کەمتر چوومە "بيت المقدس" (مزگەوتی قودس) لە فەڵەستین کۆمەڵێ لە پێغەمبەرانم بۆ کۆکرایەوە، لەوانەش ئیبراهیم و موسا و عیسا، پێشنوێژیم بۆ کردن گفتوگۆشم لەگەڵ کردن. لێرەشدا بە روونی دیارە کە پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لێ بێت) جۆرێکی تایبەتی نوێژیان کردووە.

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ لقد رأيتنى في الحجر وقريش تسألنى عن مسرايَّ، فسألتنى عن أشياء من بيت المقدس لم أثبتها، فكربتُ كرباَما كربتُ مثله قط، فرفعه الله لي انظر اليه، مايسألوني عن شيء الا أنبأتهم به، وقد رأيتنى في جماعة من الأنبياء، فإذا موسى قائم يصلى فإذا رجل صعدٌ ضربُ كأنه من رجال شنوءة, وإذا عيسى إبن مريم قائم يصلى, أشبه الناس به صاحبكم ـ يعنى نفسه ـ فحانت الصلاة ـ فأُممتهم، فلما فرغت من الصلاة قال قائلُ: يامحمد! هذا مالك صاحب النار، فسلم عليه فالتفتُّ اليه، فبدأنى**

---

[1] السيرة النبوية، للصلابي، ج١ ص ١٩٣.

**بالسلام"**.[1] واته: له ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚت) پیٚغەمبەری خوا (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرمووی: "دەتبینیم له کەعبەدام و قورەیشیش پرسیارم لیٚ دەکەن دەربارەی شەورِەویەکەم، پرسیاری شتانیٚکتان لیٚکردم له "بیت المقدس" باش له خەیالّم نەچەسپی بوون، ئەوەندە نارِەحەت و دلّتەنگ بووم ویٚنەی ئەوەم بەسەر نەهاتبوو، دەستبەجیٚ خودا (بیت المقدس)ی بۆ بەرز کردمەوەو سەیریم کرد، پرسیاری هەر شتیٚکیان لیٚ بکردمایه خیٚرا هەوالّم ئەدانیٚ، بیٚگومان منت دەبینی لەناو کۆمەلّیٚ له پیٚغەمبەران, ئەو کات موسا نویٚژی دەکرد پیاویٚکی تۆکمەو به شان و شەوکەت بوو دەتوت پیاوی شنوئەیه، هەر لەویٚ (عیسا)ش نویٚژی دەکرد بەپیٚوە زۆرتر له من دەچوو، کاتی نویٚژ هات پیٚشنویٚژیم بۆ کردن که لیٚ بوومەوە له نویٚژ پیٚم وترا ئەی (موحەممەد) ئەوە مالیکه کاربەدەستی دۆزەخ سەلامی لیٚ بکه ئاورِم دایەوە ئەو لەپیٚشدا سەلامی لیٚ کردم".

## وەسیەتی پیٚغەمبەرەکان به نویٚژکردن

پیٚغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لیٚ بیٚت) له هەموو کەس دلّسۆزترو خەمخۆرتر بوون بۆ گەلەکانیان، بەلّکو له هەموو مرۆڤەکان زیاتر بەتەنگ گەلو هۆزی خۆیانەوە بوون, هەر خیٚرو بیٚرو خۆشییەکی گەورەو بچوکیان له ئاسمان یان له ریٚسمان لەسەر زەوی یان له ژیٚر زەوی شك بردبیٚت گیان لەسەر دەست هەولّ و کۆششیان کردووە شەوو رۆژیان دەم یەك داوە, خەو و خۆراکیان له خۆ تیٚك داوە بۆ ئەوەی گەلەکانیان بەهرەمەند بکەن.

ئەگەر بۆ خیٚر و بیٚری دونیا ئاوا خۆیان ماندوو کردووەو شەونخونییان کردووە، چەند قات زیاتر بۆ چاکه و پاداشتی دوارۆژی خۆیان و گەلەکەیان هەولّیان داوەو له پیٚناویدا هەزاران کویٚرەوەری و دەردیسەریو دەربەدەریو به سکیٚك تیٚرو به سەدان برسی، بەگژاچوونی فیرعەونەکان، نەمرودەکان ـ کۆلکەخوا دەستکردەکان ـ خەباتکردن ـ له پیٚناوی خوادا مردن. بەبیٚ هاورِیٚ و رەفیق، خرانه ئاو و کلّپەی ئاگرو مەنجەنیق،

[1] مختصر مسلم ـ ٨، والسيرة النبوية للصلابي ج١ ص٩١٣, وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٥١٣٥.

سەربڕینی کوڕەی نازدارو جوان لە پێناو ئاسوودەیی گەل و نیشتمان، خۆفڕێدانە ئاوو ئاگری بێ ئامان بۆ خۆشبەختی مرۆڤو ئادەمیەکان لە هەردوو جیهان.

نوێژیش گرنگترین جۆری پەرستن بووە کە پێغەمبەرەکان ئەنجامیان داوە وەسیەتیشیان بۆ گەل و هۆزو خزم و شوێنکەوتەو دۆستانیان کردووە پابەندبن پێوەی و زایەی نەکەن.

لە وەسیەتی ئیبراهیم، **قال تعالى: "رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاء"** (إبراهيم :٤٠). واتە: پەروەردگارم کارێ بکە منیشو فرزەندانیشم سوور بین لەسەر نوێژکردن، پەروەردگارا نزامان گیراکە.

خودا دەربارەی وەسیەتی ئیسماعیل دەفەرموێت: **"وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيّاً"**. (مریم: ٥٥). واتە: ئیسماعیل فەرمانی بە کەسوکارو خزمانی دەکرد نوێژ بکەن، ئەو جێگەی رەزامەندیی پەروەردگاری خۆی بوو.

خواوەند دەربارەی وەسیەتی لوقمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: **"يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ"** (لقمان: ١٧). واتە: رۆڵەکەم نوێژێ بە چاکی بکەو هانی کاری چاکە بدەو بەر لە کاری خراپ بگرە، خۆڕاگربە لەوەی بە سەرت دێت، ئەمە لەو کارانەیە مۆڵەتی نەکردنی نییە و هەر دەبێ بکرێت.

پێغەمبەری خوا لە فەرمودەی راست و دروست و پیرۆزی خۆیدا باسی وەسیەتی (عیسا)ی کردووە (سەلامی خوای لێ بێت) کە برِگەی سەرەکی وەسیەتەکە "نوێژکردنە".

## نوێژ ئەرکێکی خودایی بووە لەسەر نوح پێغەمبەر (عليه السلام)

نوێژکردن لەسەر نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرز بووە خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: **"أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ مِن ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسرائيل وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا إذا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَن خَرُّوا سُجَّداً وَبُكِيّاً"** (مریم: ٥٨). واتە: ئەوانەی خودا بەهرەگەلی خۆی بەسەردا رشتون لە تەواوی پەیامبەران لە نەوەی ئادەم و لەوانەی لەگەڵ نوح هەڵمان گرتن و لە نەوەی ئیبراهیم و ئیسرائیل، لەوانەش رێنمونیمان کردن و هەڵمانبژاردن،

هەر کات نیشانەو بەڵگەی خودایان بەسەردا بخوێنرایەوە بە سوژدەدا دەچوون و بە کوڵ دەگریان. هەروەها لە فەرموودەی بابەتی پێشوودا باسمان کردو لێرەش دەبێتە بەڵگە بۆ ئەم باسە کە لە کۆتاییدا فەرمووی: **"هذا وقت الأنبياء قبلك"**. واتە: ئەمەش کاتی نوێژکردنی پێغەمبەرانی پێش تۆیە.

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر ئیبراهیم پێغەمبەر ( عليه السلام )

کاتێك ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) هاوسەرە بەرێزو خۆشەویستەکەیو منداڵە جگەرگۆشەکەی لە نزیك ماڵی خودا "کەعبە" بەجێهێشت بە فەرمانی خوداو رووی لە غەریبی کرد، نزاو پاڕانەوەی لە خودا بۆ کردن و فەرمووی: **"رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ.."**. **(إبراهيم ٣٧)**. واتە: پەروەردگاری ئێمە من هەندێ لە نەوەو وەچەکانم نیشتەجێ کردووە لە دۆڵێکی بێ کشتوکاڵ و شینا وەرد و لە نزیك ماڵە پیرۆزەکەی تۆ دەسا پەروەردگاری ئێمە کاریان بۆ ئاسان بکەو وایان لێ بکە نوێژەکانیان بکەن.

هەروەها لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: **"وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئاً وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ"** (الحج: ٢٦). واتە: ئەو دەمەی بۆ ئیبراهیممان رەخساند شوێنی رووگە "ماڵی خوا" کە نەکەی هاوبەشم بۆ بڕیار بدەی، ماڵی من خاوێن بکەرەوە بۆ هەڵسووراوان و وێستاوانو کڕنوشبەرو سوژدەبەران.

قەتادە (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی دەربارەی **"..وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ.."**. واتە: پاکی بکەرەوە لە هاوبەشدانان و بتپەرستان. **"والقائمين" (أي المصلين)**. نوێژخوێنان".[1]

هەروەها دەفەرمووێت: **"... وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ"**. (البقرة: ١٢٥). واتە: ئیبراهیمو ئیسماعیلمان راسپارد کە ماڵەکەم پاك و خاوێن بکەنەوە بۆ ئەوانەی بە دەوریدا دەسووڕێنەوە و ئەوانەی بەنیازی پەرستن دەمێننەوە کڕنوشبەران و سوژدەبەران.

---

[1] تعظيم قدر الصلاة، ص٤٠. وزبدة التفسير، ص٤٣٧.

هەر دروستکردنی مزگەوتی پیرۆزی کەعبە بەڵگەیە لە خواپەرستی و نوێژکردنی و خانەوادەکەی لە نزاو پاڕانەوەکانیشدا دەیفەرموو: **"رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاء"**. (إبراهيم:٤٠). واتە پەروەردگارا! بمکە بە نوێژخوێن هەروەها نەوەکانیشم، پەروەردگاری ئێمە نزاو پاڕانەوەمان لێوەرگرە.

خوداش نزاکەی لێ گیرا کردو وەڵامی دایەوەو پێی فەرموو: **".. إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَاماً.."**. واتە: بێگومان من تۆم کردە پێشنوێژ و پێشەوای خەڵکیی لە کاری دونیاو دواڕۆژیاندا، کە بۆ ئیش و کاری دواڕۆژ کرابێتە پێشەوا بۆ کاری دونیا زۆر شایستەترە بکرێتە پێشەوا، چۆن لە هەڵبژاردنی (أبوبكر الصديق)دا (ڕەزای خوای لێ بێت) بە خەلیفە فەرمویان پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) ماوە، پێشنوێژیی پێسپاردووە کە کاری دین و دواڕۆژمانە چۆن نابێ پێشەوای کاری دونیامان بێت.

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر ئیسماعیل پێغەمبەر (عليه السلام)

ئیسماعیل پێغەمبەری پێغەمبەرزادە (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر فەرمانی خودا و وەسیەتی باوکی و ڕشتەی باب و باپیری خۆی پابەندی نوێژ بووە و بە چاکترین شێوە ئەنجامی داوە, تەنانەت وەکو لە باسی سەربڕینەکەیدا باسکراوە کە پێشتر نووسیمان لەو دەمەشدا بابی بەنیازی سەربڕینی بوو داوای لە باوکی کرد لە سوژدەدا سەری بڕێت.

خوا دەفەرموێت: **"وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَّبِيّاً * وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيّاً"**. (مريم: ٥٤ ـ ٥٥). واتە: یادی ئیسماعیل بکەرەوە لە قورئاندا و باسی بکە بێگومان ئەو ڕاست بوو لە پەیمان و بەڵێنداو پێغەمبەری ڕاسپاردبوو، ئەو فەرمانی بە خێزان و خانەوادەی دەکرد بە نوێژکردن هەروەها ئیسماعیل (سەلامی خوای لێبێت) لە ترسناکترین هەنگاوەکانی ژیانیدا لە دیمەنی ماڵئاوایی لە ژیانی دونیاو بەڕێکەوتن بەرەو دواڕۆژ بۆ خۆی پلانی مەرگی خۆی بۆ باوکی دەکێشێ خوا دەفەرموێت: **"فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ"**. (الصافات ١٠٣). واتە: "کاتێك هەردووکیان تەسلیمی فەرمانی خودا بوون و لەسەر ڕوو تخێڵی کرد لەسەر ڕوو ڕای کێشا".

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئانی پیرۆز دەفەرمون ئیسماعیل بە باوكی فەرموو باوكە سەرمبڕە لە كاتێكدا سەرم لە سوژدەدا بێت.

## نوێژ ئەركێكی خوایی بووە لەسەر ئیسحاق و یەعقوب پێغەمبەر ( علیه السلام )

دەربارەی نوێژكردنی ئیسحاق پێغەمبەر و یەعقوب پێغەمبەری كوڕی (سەلامی خوایان لێ بێت) خوا دەفەرموێت: **"وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَالِحِينَ * وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاء الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ) (الأنبياء : ٧٢ ـ ٧٣)**. واتە: ئیسحاقمان بە ئیبراهیم بەخشی و یەعقوبیش لە زێدەبەش، هەموویانم كردە میرخاس و پیاوچاك و كردمانە پێشەوا، كە هەر بە فەرمانی ئێمە شارەزایی و ڕێنوێنی مەردوم بكەن بە هەمووشیانمان ڕاگەیاند لە كاری چاك نەوەستن، نوێژەكانیان بە چاكیی بكەن و زەكات بدەن.

## نوێژ ئەركێكی خوایی بووە لەسەر زەكەریا پێغەمبەر ( علیه السلام )

زەكەریاش وەكو پێغەمبەرێكی خودا هەموو ڕێگەیەكی نزیك بوونەوە لە خوداو پەرستشی ئەوەی گرتۆتەبەر كە نوێژكردنیش لە بەهێزترین و چاكترینی ئەو ڕێگایانەیە، خودا دەفەرموێت دەربارەی نوێژكردنی زەكەریا: **"فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ.."**. (آل عمران ٣٩). واتە: فریشتە بانگیان لە زەكەریا كرد لەكاتێكدا ئەو لە میحرابەكەدا نوێژی دەكرد **"في المحراب، انه المسجد أو قبلة المسجد"**.[1] واتە: میحراب یان مزگەوتە یان قیبلەی مزگەوتە، دەربارەی واتای **"محراب"**یش زانایان فەرمویانە بە سێ شێوە ڕاڤە دەكرێ:

١ ـ لەبەر ئەوەیە پێشنوێژ تەنها دەبێتەوەو دوور دەكەوێتەوە لە خەڵكی وەكو دەڵێن "فلان حرب لفلان". واتە: ڕقی لێیەتی و لێی دوورە.

---

[1] زاد المسير ج١ ص٣١٠.

٢ ـ المحراب **"في اللغة: اشرف المكان"** واتە: بەڕێزترینو پایەدارترین شوێن، چاکترین و بەرزترین شوێنی مزگەوتیش شوێنی پێشەوایە.

٣ ـ المحراب "من المحراب" لە حەربەوە وەرگیراوە بە واتای جەنگە، چونکە نوێژخوێن و بە تایبەتیش پێشنوێژ لەگەڵ شەیتان دەجەنگێ و سەنگەری لە شەیتان گرتووە, میحرابیش سەنگەری دژایەتیکردنی شەیتانە.

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر داود پێغەمبەر (علیه السلام)

کاتێك داود پێغەمبەر **(علیه السلام)** لە حوکمێکیدا ئیشتبای کرد، ویستی تەوبە بکات هیچ یاساو چەپکە گوڵێکی لە نوێژ و سوژدە بردن بە چاکتر نەزانی بیکاتە دەستپێکی تەوبەکەی، خوا دەربارەی دەفەرموێت: **"فاستغفر ربه وخرَّ راكعاً وأناب"**. (ص: ٢٤) واتە: "داود" **(علیه السلام)** داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری کردو بە کڕنوشدا کەوت و گەڕایەوە لای خوا.

**عن عبدالله بن عمرو قال: قال رسول الله ﷺ "أحب الصلاة الى الله صلاة داود، كان ينام نصف الليل ويقوم ثلثه، وينام سدسه"**.[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی "چاکترین و خۆشترین نوێژ بە لای خوداوە نوێژی داودە، عادەتی وابوو نیوەی شەو دەخەوت و سێ یەکی شەو نوێژی دەکرد، شەش یەکی شەو دەخەوت.

**قال ثابت البناني: "كان داود عليه السلام قد جزأ ساعات الليل والنهار على أهليه، فلم يكن ساعة من ليل أو نهار الا وانسان من آل داود قائم يصلى فيها، قال: فعمهم تبارك وتعالى في هذه الآية: "اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ"**. (سبأ: ١٣). واتە: **(ثابت البناني)** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: داود (سەلامی خوای لێ بێت) کاتەکانی شەو و ڕۆژی دابەش کردووە بەسەر خانەوادە و خێزانیدا، هیچ کاتێك لە شەو و ڕۆژدا نییە کە کەسێك لە خانەوادەو شوێنکەوتوانی داود لە نوێژدا نەبێت، فەرمووی خودا هەموویانی خستۆتە ژێر ڕکێفی ئەم ئایەتەوە:

---

[1] إسناده صحيح/ متفق عليه البخاري ١٠٧٩، ومسلم ١١٥٩ وتعظيم قدر الصلاة ص٤٦.

خانەوادە و ئالی داود بە کردەوە سوپاسگوزاریی دەکەن، کەم کەس لە بەندەکان سوپاسگوزاریی دەکەن.

**وعن الحسن قال: قال نبی الله داود (علیه السلام): "الهي لو ان لكل شعرة مني لسانين يسبحانك الليل والنهار والدهر ما وفيت حق نعمة واحدة".**[1] واتە: لە حەسەنەوە فەرمووی پێغەمبەری خوا داود فەرموویەتی: "خوایە ئەگەر هەر مویەکم دوو زمانی هەبوایە پەسنی و بێگەردی تۆیان بکردایە بە درێژایی رۆژگار و بە شەو و رۆژ هەقی یەك بەهرەیان نەداوە".

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر سلێمان پێغەمبەر (علیه السلام)

سلێمانی شازادەی پێغەمبەرزادە (سەلامی خوایان لێ بێت)، پێغەمبەری کوڕی پێغەمبەر، پاشای کوڕی پاشا، دەوڵەمەندی کوڕی دەوڵەمەند، کاربەدەستی کوڕی کاربەدەست، حوکمڕانی کوڕی حوکمڕان، کە رەوە ئەسپەکەی سەرقاڵیان کرد نوێژی عەسری ساوا بوو "درەنگ کەوت".

عیکریمە (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی ئەو رەوە ئەسپەی سلێمانی کوڕی داودیان سەرقاڵ کرد ژمارەیان بیست هەزار ئەسپ بوو.[2]

خودا دەفەرموێت: **"إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي"**. (ص: ٣٢). واتە: سلیمان فەرمووی "خۆشەویستی و ئەوینی رەوە ئەسپەکەم یادی خودای لە بیر بردم، تا خۆر لە ئاسۆ نەدیو بوو".

لە دەمی خۆرئاوابووندا وەبیری کەوتەوەو بە خویدا چۆوەو نوێژەکەی ئەنجام دا. ئەو نوێژەش سلیمان درەنگی خست نوێژی عەسر بوو.

**عن أبي الأحوص عن علي قال: "الصلاة التي فرط فيها سليمان صلاة العصر".**[1] واتە: لە **(أبي الأحوص)**ەوە لە عەلیەوە فەرمووی: ئەو نوێژەی سلێمان درەنگی خست نوێژی عەسر بوو.

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج٢ ص٤٠٦.

[2] إسناده صحيح تعظيم قدر الصلاة ص٤٢.

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر یونس پێغەمبەر (علیه السلام)

ئەو سەردەمەی یونس پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لە شاری نەینەوا "موصل" دووچارو گیرخواردوی گەلێك بووە گوێیان بە قسەی نەداوە و بڕوایان پێ نەهێناوە، تەنانەت کە زۆر تینی بۆ هات چاوەڕێی نەکرد خودا بە سروش و نیگای خۆی فەرمانی بداتێ نەینەوا بەجێ بهێڵێت، بەڵکو دەمەوئێوارەیەك بە داخ و پەژارەیەکی زۆر و دڵ شکاویەوە شاری بەجێهێشت، بەرەو دەریا ڕێگەی گرتەبەر و لە ڕۆخی دەریا بە هەناسەی ساردو دڵی پڕ لە ناسۆرەوە کەشتی بارهەڵگری پەیدا کردو سوار بوو، ڕێگەی غەریبی و هات و نەهاتی گرتەبەر تا لە قووڵایی دەریا و لە ناو تاریکی شەوەزەنگ و گرمەو ناڵەی شەپۆلی ترسناك و سامناك و بێئامانی دەریادا بە فیت و دەسیسەی قوبتان و ڕێبوارەکان یونسیان هەڵدایە ناو دەریاو لەناو دەریاشدا بووە پاروی چەوری نەهەنگ، بەڵێ فیلەتەن هەڵی لوشی.

لەو بێدەرەتانی و بێ کەسیەدا بێجگە لە خودا کەس ئاگاداری حاڵی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە نەبوو، ئەویش تەنها پەنای بۆ خودا بردو بە پەنهانی چاکترین کردەوەی خۆی کردە تکاکار کە نوێژ بوو و بە کوڵێش پاڕایەوەو فەرمووی:[1] **"فنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ"**. (الأنبياء: ٨٧). واتە: فەرمووی هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق بێجگە لە تۆو تەنهاو تەنها نوێژم بۆ تۆ کردووەو دەیکەم بەڕاستیی من لە ستەمکارانم، تۆش پاك و بێگەردی.

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا **"فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُسَبِّحِينَ"**. واتە: بێگومان ئەگەر یونس لە نوێژخوێنان نەبوایە.[2] **"لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ"**. واتە: لە زگی نەهەنگەکەدا دەمایەوە تا ڕۆژی زیندوبوونەوە. واتە نە خۆی دەمرد و نە نەهەنگەکە، گیانلەبەر و گیاندارەکان هەموو دەمردن و زیندوو دەبونەوە، ئەوان هەر زیندوو دەبون.

قەتادەش (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: **"فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُسَبِّحِينَ"**. واتە: ئەگەر یونس (سەلامی خوای لێ بێت) لە کاتی خۆشی و

---

[1] إسناده صحيح، تعظيم قدر الصلاة ص٤١.

[2] إسناده حسن.

ئاسوودەییدا زۆر نوێژی نەکردایە (لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ) (الصافات: ١٤٤). واتە: سکی نەهەنگەکەی بۆ دەبووە گۆڕ هەتا ڕۆژی دوایی.[١]

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر شوعەیب[٢] پێغەمبەر (عليه السلام)

هیچ پەرستنێك و ئەرکێکی شەرعی وەکو نوێژ ریشەکێشی خراپەکاری و ستەمکاری و کردار و ئاکارو هەڵویست و گفتاری نابەجێ و قێزەون ناکات، هەر بۆیەش لە شەوو ڕۆژێکدا چەند جار دووبارە دەبێتەوە و ماوە نادات بڕوادار فریای خراپە بکەوێت و نزیك بتە چەپەڵ و بێفەڕەکان بکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: "قَالُواْ يَا شُعَيْبُ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا..". (هود: ٨٧). واتە: گەلی مەدیەن وتیان بە شوعەیب (عليه السلام) ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات بە ئێمە رابگەیەنیت واز لەو بتانە بێنین کە باب و باپیرمان پەرستویانن؟ ئەمەش بەڵگەیە کە کافرو بتپەرستەکان هیچ کردەوەو پەرستنێکی شوعەیبیان بە ئەندازەی نوێژ بەلاوە گەورەو گرنگ نەبووە، بۆیە روویان لە شوعەیب (عليه السلام) کرد و پێیان وت وادیارە نوێژەکەت فەرمانت پێدەکات واز لە بتەکانمان بێنین. هەروەکو لە قورئانیشدا هاتووە ".. إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ..". واتە: بێگومان نوێژ کۆتایی دێنێ بە داوێن پیس و ستەمکاری و خراپەکاری و بنەبڕیان دەکات.

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر موسا پێغەمبەر (عليه السلام)

یەکەم ئەرکێکی شەرعی کە خودا موسا راسپارد بە نەوەی ئیسرائیلی رابگەیەنێت نوێژکردن بوو دوای بڕواهێنان، خوا دەفەرموێت: (وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتاً وَاجْعَلُواْ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ) (يونس: ٨٧). واتە: موسا و براکەیان تێگەیاندو سروشمان دانێ بۆ هۆزو گەلی خۆتان چەند ماڵێك ئامادە بکەن و ماڵەکانتان بکەنە پەرستگەو نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەن مژدە بدە بە ئیمانداران.

---

[١] تعظيم قدر الصلاة ص٤٨.

[٢] تعظيم قدر الصلاة ص٤٨.

هەروەها لە چونە فەلەستین پێی فەرموون: "..  وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ..". واتە: هەر لە دەروازەی شار چونە ژوورەوە روو بە سوژدە بچنەژوورەوە و بڵێن خوایە لێمان خۆشبە.

هەروەها خوا فەرمان بە خودی موسا دەکات بۆ ئەوەی هەمیشە خودای لە یاد بێت و لە ئەندێشە و بیری دەرنەچێت دەبێ نوێژ بکەین، وەکو دەفەرموێت: ".. فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى * إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي". (طه: ١٤). واتە: گوێ رادێرە بۆ سروشی خودایی، بێگومان من خودام و هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نییە جگە لە من، هەر من بپەرستەو بۆ یادکردنەوەی من نوێژ بکە.

لە باسی شەورەوی و بەرزکردنەوەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت لە بەشێکی فەرمودەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە: "وقد رأيتنى جماعة من الأنبياء، فإذا موسى قائم يصلي".[1] واتە: "جبریل کۆمەڵێ پێغەمبەری نیشاندام لەو دەمەیدا موسی بە پێوە نوێژی دەکرد".

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر مەریەمی پاك داوێن ( خوا لێی رازیی بێت )

یەکەم ئەرك و وەسیەتی خوا بۆ مەریەمی بێگەردو پاك داوێن نوێژکردن و سوژدە بردنە لەگەڵ کۆمەڵی نوێژخوێنان و سوژدەبەران هەتا خەڵکی زیاتر گەورەیی و خێری نوێژی بە کۆمەڵ بزانن و چاکی و داوێن پاکی خۆی و کورەکەی ببینن.

خودا دەفەرموێت: "يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ". (آل عمران: ٤٣). واتە: "ئەی مەریەم تۆ فەرمانبەردار وگەردن کەچی فەرمانی پەروەردگارت بەو سوژدەو کڕنوشی بۆ بەرە لەگەڵ کڕنوشبەران".

**قال مجاهد: "قامت حتى تورمت قدماه"**. واتە: "مەریەم (رەحمەتی خوای لێ بێ) ئەوەندەی شەونوێژ کردبوو تا پێیەکانی ئاوسابوون.[2]

---

[1] صحيح الجامع الصغير و زيادته ٥١٣٥.

[2] رهبان الليل، ج١، ص٣٦١.

مەریەم کە دایکی بەخشیویە مزگەوتو لە ئەستۆی خۆی گرتبوو پێش لە دایکبونی کە بیکاتە خزمەتکارو مجێوری مزگەوتو دواتریش بەڵێنو وادەی خۆی بردە سەرو مەریەمی کردە کۆتری مزگەوت.

## نوێژ ئەرکێکی خوایی بووە لەسەر عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)

خودای باڵادەست لە داستانی عیسادا (سەلامی خوای لێ بێت) باس دەکات کە عیسا بە منداڵی و لەسەر بێژنگ قسەی کرد و فەرموی خودا دەمکاتە پێغەمبەر و وەسیەتی بۆ کردوم بە نوێژکردن تا لە ژیاندا مابم وەکو دەفەرمویێت: **"قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّه آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيّاً * وَجَعَلَنِي مُبَارَكاً أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيّاً"**. (مريم: ٣٠ ـ ٣١). واتە: بێگومان من بەندەی خودام و کتێبم بە خەڵات ئەداتێ و منی کردۆتە پێغەمبەر، لە هەر کوێش بم پێو قەدەمم پیرۆز دەکاو رای سپاردوم تا زیندوم نوێژ بکەم و زەکات بدەم.

**عن قيس بن أبي حازم (رضي الله عنه): "رأى بلالُ (رضي الله عنه) رجلاً يصلى، لايتم ركوعاً ولا سجوداً فقال بلال: ياصاحب الصلاة: "لو مت الآن، مامتّ على ملة عيسى إبن مريم عليه الصلاة والسلام"**.[1] واتە: لە قەیسی کوڕی ئەبی حازم (رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی بیلال پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد، بەڵام کڕنوش و سوژدەی تەواو نەدەکردن، بیلال فەرمووی ئەی بابای نوێژخوێن ئەگەر ئێستا بمری لەسەر دینی عیسای کوڕی مەریەم نەمردووی (سەلامی خوایان لێ بێت).

هەروەها لە فەرمودەی شەوڕەوی پێغەمبەردا هاتووە بە دریژی کە ئەمە دیمەنێکێتی: **"... وإذا عيسى إبن مريم قائم يصلي.."**.[2] واتە: "لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەم بەپێوە نوێژی دەکرد". پێشتریش مەریەم لە لایەن دایکیەوە نەزر کرابوو، پێشکەش کرابوو بە میحراب و مزگەوت، بە خزمەتکارو خزمەتگوزار.

---

[1] إسناده صحيح، تعظيم قدر الصلاة رقم ٩٤٣ ص٥٨٧.

[2] صحيح/ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٥١٣٥.

## نوێژ ئەركێكی خوایی بووە لەسەر یەحیا پێغەمبەر (علیه السلام)

تەواوی پێغەمبەران كە خودا رەوانەی كردون بۆ رێنمایی‌و چاوڕوونی بەرەی ئادەمی، ئامۆژگاری و وەسیەتی پێویست و سوودبەخشیان بە گەلەكەیان راگەیاندووە، هەر كارو گوفتارو فەرمانێكیان بە چاك و سوودبەخش زانیبێ لە راگەیاندن‌و بەرچاوڕوونی كەمتەرخەمیان نەكردووە، بەڵكو شەو و رۆژو چوار وەرزی ساڵ بێ پشوو ماندووییەناسانە هەوڵی راگەیاندنیان داوە، بە ئاشكراو نهێنی، بە تاك‌و كۆمەڵ.

**عن الحارث الأشعري (رضي الله عنه) ان النبي ﷺ قال: "إن الله أمر يحيى بن زكريا بخمس كلمات: ان يعمل بها، ويأمَرَ بني إسرائيل ان يعملوا بها، وأنه كاد ان يُبطى بها وجاء فيه: فقال يحيى: أخشى إن سبقتنى بها أن يخسَفَ بي, أو أُعذبَ، فأجتمع الناس في بيت المقدس فامتلأ وقعدوا على الشرف فقال: إن الله أمرني بخمس كلمات ان اعمل بهن وآمركم ان تعملوا بهن: وإن الله امركم بالصلاة، فإذا صليتم فلا تلتفتوا فان الله ينصبُ وجهه لوجه عبده في صلاته مالم يلتفت".**[1]

واتە: لە حاریسی ئەشعەرییەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "خوا فەرمانی بە یەحیای كوڕی زەكەریا كرد بە پێنج وتە، كە كردەوەیان پێ بكات و فەرمانیش بە نەوەی ئیسرائیل بكات كاری پێبكەن. خەریك بوو سستیی تیادا بكات".

یەحیا فەرموویەتی: ئەترسم فریانەكەوم ئەنجامی بدەم بە زەویدا رۆچم یان سزا بدرێم, خەڵكی كۆ كردەوە لە "بیت المقدس" مزگەوتە پیرۆزەكە هەتا پڕبوو ئەوجا لە شوێنێكی بەرز وەستاو فەرمووی: خوا فەرمانی پێ كردوم بە پێنج وتە كە كاریان پێ بكەم و فەرمانیش بە ئێوە بكەم كە كاری پێبكەن:

خوا فەرمانی پێكردم بە نوێژكردن، جا كە نوێژتان كرد لە نوێژەكەدا لا مەكەنەوە، بەڕاستیی خوا روو لە رووی بەندەكەی دەكات لە كاتی نوێژەكەیدا ئەگەر لا نەكاتەوەو روو وەرنەگێڕن.

[1] صحيح: رواه الترمذي رقم (٢٨٦٣)، وقال: حسن صحيح/ صحيح الترغيب ٥٥٣، صحيح قصص الرسول، ج٣، ص١٣ ـ ١٤.

# هەموو شتێك نوێژ دەكات

هەموو دروستكراوەكانی خودا بە جۆرێك لە جۆرەكان پابەندی شەرعی خودان و گوێڕایەڵی خودان و ملكەچی بەرنامەی خودان بە شێوازێك كە لەگەڵ سروشتی خۆیاندا دەگونجێ هەر یەكێ لە دروستكراوەكان بە زمانی حاڵی خۆی و بە جۆری سروشتی خۆی پەسەندی و پاك و بێگەردی خودا دەكات و نوێژی خۆی ئەنجام ئەدات و لە خوا غافڵ و بێ ئاگا نییە.

دەربارەی نوێژو پابەندبوونی دروستكراوەكان بە یادی خودا لە قورئاندا خوا دەفەرموێت: **"أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأرض وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ"**. (النور: ٤١) واتە: تۆ نەتدیوە كە هەر شتێ لە ئاسمانەكان و زەمیینداو ئەو باڵندانەش كە لە هەوادا لەنگەر دەگرن پەسەنی و پاكی خوای خۆیان ئەزانن و نوێژی خۆیان ئەنجام ئەدەن، خوا ئاگادارە لە كردارەكانیان.

توێژەرەوانی قورئانی پیرۆز دەفەرمون **"الصلاة" لبني آدم و "التسبيح" لغيرهم من الخلق**. واتە: نوێژ هی ئادەمیانە و (تسبیحات) پەسەنی و پاك و بێگەردی هی دروستكراوەكانی ترە. لە مانای "قد علم" دوو وتە هەیە:

١ ـ **"قد علم الله صلاة المصلي وتسبيحهُ" (قاله الزجاج)**. واتە: خودا نوێژو پەسەنی و دەربڕینی پاك و بێگەردی نوێژخوێنان پەسەنكاران دەزانێت.

٢ ـ **"انه المصلي والمسبح"**: مەبەست ئەوەیە (نوێژخوێن)و (تەسبیحاتخوێنەكە) ئەزانێ چی دەڵێت[1] كە ئەمەش دوو رای لەسەر هەیە:

یەكەم: نوێژخوێن و پەسەنكار چونیەتی نوێژ و پەسەنكاری خۆیان دەزانن.

دووهەم: نوێژخوێن دەزانێ كە نوێژ و تەسبیحات و پەسەنی هەر بۆ خوایە.

هەروەها خودا دەفەرموێت: (**وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأرض طَوْعاً وَكَرْهاً وَظِلالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ) (الرعد: ١٥)** واتە: بۆ خودا سوژدە دەبات هەرچی لە

---

[287] ئەمە "زجاج" كە زانایەكی زمانی عەرەبییە دەیڵێت.

ئاسمانەکان و زەمیندا هەیە بە خۆیەش و ڕەزامەندییەوە یان بە ناچاری و زۆرەملیێ، سێبەرەکانیشیان بە ئێواران و بەیانیان سوژدە دەبەن.[1]

## رووەکە خشۆکەکان و درەختە قەددارەکان سوژدە دەبەن

سوژدە کە پایەی هەرەگەورەی نوێژە رەمزی خواپەرستی و گوێڕایەڵییە و نوێژیش بەبێ سوژدە مانایەکی نییە، خودا دەفەرموێت: **"وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ"** (الرحمن: ٦). واتە: رووەکە خشۆکەکان و درەختە قەددارەکان سوژدە دەبەن.

سوژدەش نوێژەو گوێڕایەڵی و سەرلەڕێدابوونە. پابەند بوونە بە بەرنامەی دروستکەرو راهێنەری بونەوەر، پابەندبوونە بە پرۆگرامی بوونەوەرو هۆگربوون و خۆ گونجاندنە لەگەڵ سەرجەم دروستکراوەکان و بە هوتاف و ئاوازی یەك خوایی، هەر شتە بە زوبانی حاڵی خۆی و بەو شێوازەی خودا فێری کردووەو لەسەر رام بووە.

## دووڕوو نوێژ دەکات

کەسی دەغەڵ و دووڕوو کە بە دەم خۆی بە موسڵمان نیشان ئەدات و بە دڵیش کافرو بێ دینەو بەزیوو دڵ پڕلە قینە. بە ئاشکرا موسڵمانەو خەریکی کاری ناشرینە. لە دونیا و دوارۆژ بەشی لەعنەت و نەفرینە. دەستنوێژ دەگرێت نوێژ دەکات لە ناچاریدا کردەوەی چاك دەکات. ئەگەر خەڵکیی دیار بوو قەرەباڵغ بوو کڕنوش و سوژدەی درێژ دەبات ـ گەر چۆڵیش بوو سەیری ئەم لاو ئەو لا دەکات. تەمەڵی و دەغەڵی دەکات کارکردەی رەنجەڕۆیە بە تەمای خوا نییە چاوی لە تۆیە بەرژەوەندچییە باری بۆ کەس نییە. سەی نەهێنگرە، وادەی نییە، زمانی ناپارێزێ لە درۆ ـ وەفای نییە، نە بۆ من و نە بۆ تۆ، ئەمانەتی لەلا دانێ نایبینیەوە، مەگەر لە پەسلانێ، قسە زلە، بە دەمارە ـ سینگ دەرپەڕێنە، وەك لیژنەدارە, هەزار بارە، لە دونیا بەشی فسکە فسك و جاسوسی لادێ و شارە، لەو دونیاش خەجاڵەت بارە، لەگەڵ ئەوەشدا نوێژ

[1] هەروەها لە سورەتی النحل ئایەتی ٤٩ و سورەتی الحج ئایەتی ١٨ و دووبارە النحل ئایەتی ٤٨ هەمان بابەت باس دەکات.

دەکا، شەربەتی تێکەڵ بە ژەهرەمارە، مەردومی پێ لەخشتە دەبات، خۆشی پێ بێدین دەکا.

**قال رسول الله ﷺ: "ألا أخبركم بصلاة المنافق؟ ان يؤخر العصر حتى إذا كانت الشمس كثرب البقرة صلاها".**[1] صحيح واتە: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێت) ئەفەرموێ: "ئەرێ هەواڵتان بدەمێ دەربارەی نوێژی دووڕووەکان؟ نوێژی عەسر دوادەخات هەتا خۆر وەکو چارەکە بەزی[2] مانگای لێدا ئینجا نوێژەکەی دەکات.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ليس صلاةٌ أثقل على المنافقين من صلاة الفجر والعشاء ولو يعلمون مافيها لأتوهُما ولو حَبواً".**[3]

واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: هیچ نوێژێك گرانتر نییە لەسەر دووڕووەکان لە نوێژی بەیانی و خەوتنان ئەگەر بیانزانیایە چی خێرێکیان تیایە بە گاگۆڵکە و لەسەر چنگ بۆی دەهاتن, کەواتە بەتەمەڵی و بەناچاری نوێژی بەیانییان دەکرد، خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: **".. وَإِذا قَامُواْ إِلَى الصَّلَاةِ قَامُواْ كُسَالَى..".** ئەگەر هەڵدەستان بۆ نوێژ بە تەمەڵی هەڵدەستان.

## نوێژ لەسەر جنۆکە فەرزە

پێغەمبەری ئیسلام خودا هەڵی بژاردووەو ڕەوانەی کردووە بۆ سەرجەم ئادەمیزادو جنۆکە بەبێ جیاوازیی، لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە دەکات کە جنۆکەکان بڕوایان هێناوەو گوێیان لە قورئانخوێندنی پێغەمبەر گرتووە، وەکو لە سوڕەتی **"الجن"** بە ڕوونی باسکراوە.

بڕوابوونیش بە قورئان هەموو ئەو ئایەتانەش دەگرێتەوە کە باسی نوێژ و نوێژکردن دەکات و بە پایەی دین و کۆڵەکەی ئیسلام دانراوە و هەرکەس ئەنجامی نەدا زانایان بۆچوون و تێڕوانینی سامناك و ترسناکیان هەیە لەسەری **"قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ**

---

[1] رواه الحاكم رقم (٧٠٢)، صحيح الجامع الصغير و زيادته ٢٦٠٦

[2] مەبەست ئەوەیە کە گۆشتەکە بە کاڵی لە ژێر بەزەکەوە دیارە، خۆریش ئاوا بە کاڵی دەردەکەوێت.

[3] "متفق عليه" البخاري ٦٢٦، ومسلم ٦٥١. ورياض الصالحين ١٠٧٣

نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قرآناً عَجَباً * يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَداً".الجن (١ ـ ٢). واته: ئاگاداریم بۆ هاتووه كه پیڕێك له جنۆكه گوێیان گرتووەو وتویانه ئێمه گوێمان له قورئانێكی سەرسوورهێنەر بووه، ڕێنیشاندەری چاكەیه باوەڕمان پێهێناوەو هاوبەش بۆ پەروەردگارمان بڕیار نادەین، "وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْساً وَلَا رَهَقاً". (الجن: ١٣). واته: ئێمه كاتێك گوێمان له ڕێنومای "قورئان" بوو، باوەڕمان پێهێنا، هەركەس بڕوا به پەروەردگاری خۆی بێنێ نه لەكەم بوونی چاكەكانی و نه له دەستدرێژی دەترسێ.

هەروەها خوا دەفەرموێت: "..إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَّوْقُوتاً". واته: بەڕاستیی نوێژ لەسەر بڕواداران پەیوەست بووه به كاتی دیاریكراوەوه.

هەروەها دەفەرموێت: "وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ" (الذاريات: ٥٦). واته: پەری و مرۆڤەكانم تەنها بۆ پەرستنی خۆم دروست كردووه.

دەربارەی زانای پایەبەرز عەبدولعەزیز كوڕی سەلمان، موحەممەدی كوڕی دەفەرموێت: باوكم كه به شەو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ لەناو خانوەكەدا دەنگه دەنگی زۆر دەبیسترا و هاژەی ئاو زۆر دەبیسترا. فەرمووی دەمانبینی جنۆكەكان بەخەبەر دەهاتن و شەونوێژیان لەگەڵ دەكرد.[1]

دیاره ئادەمیزادیش كاتێك به موسڵمان و ئیماندار دەناسرێ كه نوێژ بكات و بڕوای پێی بێت، له هیچ زانایەكیش نەبیستراوه كه جنۆكه موسڵمان بن، بەڵام نوێژنەكەر بن.

## گاورو جولەكەكانیش نوێژ دەكەن

ئەگەر مانگاپەرست و بتپەرست و دارو بەردپەرستەكان نوێژ بكەن و به فەوتانی نوێژەكانیان خۆیان به قەرزاربار بزانن، چۆن دەبێت كەسانێك نوێژ نەكەن كه لەسەر پەیڕەوی دینی خۆیان كه له ئاسمانەوه سەرچاوەی گرتووه. نوێژ له هەموو دینه ئاسمانیەكان و بانگەوازه خواییەكاندا پایەی سەرەكی بووه و گاورو جولەكەش له پێش ئیسلامیشدا هەر نوێژیان كردووەو چەندەها پەرستگەو كەنیسەو مزگەوت و كڵێسایان ساز كردووه بۆ نوێژكردن و خواپەرستی، تەنانەت گۆڕو گڵكۆی پێغەمبەرەكان و

[٢٩٢] صلاح الأمة، ج٢ ص٤٤١

پیاوچاکەکانیشیان کردۆتە پەرستگە و سوژدەگا. خوا دەفەرمویّت: **"وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتاً وَاجْعَلُواْ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ"**. **(يونس: ٨٧)**. واتە: "وەحی" نیگامان کرد بۆ موساو براکەی کە لە میسر چەند خانوویەك درووست بکەن بۆ گەلەکەتانو خانوو و ماڵەکانتان بکەنە رووگەو شوێنی پەرستنو نوێژەکانتان بە چاکی بکەنو مژدە بدە بە بڕواداران.

پێغەمبەر دەفەرموێت: **"لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد"**. واتە: نەفرینی خودا لە جولەکەو گاورەکان، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکردە مزگەوت و پەرستگە لەسەر نوێژکردنی جولەکەو گاورەکان بەڵگە زۆرە، تەنانەت ئێستاش هەر پابەندن بە جۆرێك لە نوێژکردنەوە. بوونی مزگەوتو پەرستگاو کەنیسەو کڵێسا بەڵگەیە لەسەر گرنگیدانیان بە نوێژو خواپەرستی بە شێوازێك لە شێوازەکان.

**كان النبي ﷺ "نهى رجلاً وهو جالس معتمد على يده اليسرى في الصلاة قال: انها صلاة اليهود"**.[1] **وفي حديث آخر "هي قعدة المغضوب عليهم"**.[2] واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بێت) قەدەغەی کرد لە پیاوێك کە دانیشتبوو تینی دابوە سەر دەستی چەپی لە نوێژدا پێی فەرموو ئەوە نوێژی جولەکەیە.

لە فەرمودەیەکی تردا فەرمووی ئەوە دانیشتنی ئەوانەیە کە خوا غەزەب و خەشم و قینی لێگرتون "کە جولەکەن".

**وعن شداد بن أوس قال: قال رسول الله ﷺ: "خالفوا اليهود، فانهم لايصلون في نعالهم ولافي خفافهم"**.[3] واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بیّ) فەرمووی: "پێچەوانەی جولەکە بکەن ئەوان نوێژیان بە نەعل و خوف و کالەوە نەدەکرد".

---

[٢٩٣] رواه البيهقي والحاكم (١٠٠٧) وصححه ووافقه الذهبي، وهو مخرج مع الذي بعده في الارواء. ٣٨٠. صفة الصلاة النبي، ص١٢٢.

[٢٩٤] رواه البيهقي والحاكم (١٠٠٧) وصححه ووافقه الذهبي، وهو مخرج مع الذي بعده في الارواء. ٣٨٠. صفة الصلاة النبي، ص١٢٢.

[٢٩٥] صحيح / صحيح الجامع الصغير، رقم ٦٨٢٢ و ٣٢١٠. الارواء، ٣٨٠. المشكاة، ٩١٤.

تا ئێستاش گاورو جولەکەکان بۆ فەڕو پیرۆزی هەموو کارێکیان بە نوێژو نزاو پاڕانەوە دەست پێ دەکەن، ئەوانەش کە لە نزیکەوە تێکەڵاویان دەکەن لە ئیش و کاریاندا زۆر چاك راستی ئەم قسەیە دەزانن.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) قال كان رسول الله ﷺ: "نهى أن يجلس الرجل في الصلاة، وهو معتمد على يده اليسرى, وقال إنها صلاة اليهود".** [1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) قەدەغەی کردووە لە کەسێك لە نوێژدا دانیشێ و خۆی بدات بەسەر دەستی چەپیداو فەرموویەتی بێگومان ئەوە نوێژی جولەکەیە".

## هاوبەشدانەرەکانیش نوێژ دەکەن

هاوبەشدانەرەکان کە لەگەڵ خوادا بت و دارو بەردو جۆرەها شتیان پەرستوە یان هەر وازیان هێناوە بە یەکجاری و هەر بتیان پەرستوەو وتویانە خودا پێوستی بە پەرستنی ئێمە نییە.

جۆرە نوێژێکیان کردووە کە هەر شایستەی بتەکانە خوا دەفەرموێت: **"وَمَا كَانَ صَلاَتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاء وَتَصْدِيَةً فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ". (الأنفال: ٣٥).** واتە: نوێژیان لە ماڵی خودادا هەر بریتییە لە چەپڵەو فیکە لێدان، بچێژن سزا بە هۆی بێباوەڕیتانەوە.

هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوە بوو: هاوبەشدانەرەکان بە دەوری کەعبەدا دەسوورانەوەو چەپڵەیان لێ ئەداو فیکەیان دەکێشاو رومەتی خۆیان دەخستە سەر زەوی. (وەکو ئیبن عومەر فەرموویەتی). [2]

**قال إبن الجوزي وفي التصدية قولان:**

**١ ـ "أنها التصفيق" قاله إبن عمر وإبن عباس والحسن والمجاهد وقتادة والجمهور قال إبن قتيبة يقال صدى: إذا صفق بيديه.**

---

[1] صحيح سنن أبي داود رقم ٦٥٩.

[2] زاد المسير، ج٣ ص٢٦٧ ـ٢٦٨.

٢ ـ **إن التصدية، صدهم الناس عن البيت الحرام قاله سعيد بن جبير. وزعم مقاتل ان النبي ﷺ كان إذا صلى في المسجد الحرام، قام رجلان من المشركين من بني عبدالدار يمنيه فيصفران، ورجلان عن سياره فيصفقان، فتختلط على النبي ﷺ صلاته وقراءتهُ فقتلهم الله ببدر.**[1]

واته: **إبن الجوزي** دەربارەی "التصدیه" فەرموویەتی دوو را هەیە:

١ ـ مەبەست پێ چەپڵەلێدانە، ئەمەش رای عەبدوڵڵای کوڕی (عەمر)و عەبدوڵڵای کوڕی (عەباس) و حەسەنی بەسری و موجاهدو قەتادەو زۆربەی زانایانە، (**إبن قتيبة**) فەرموویەتی: دەوترێ "صدی" ئەگەر چەپڵە لێبدات.

٢ ـ "**التصدية**" رێ گرتنە لە خەڵکی لە چوونە کەعبەیماڵی خودا سەعیدی کوڕی جوبەیر وای فەرموە، موقاتیل وای بۆ چووە کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) هەرکات بچوایەتە کەعبە بۆ نوێژ دوو پیاو لە هاوبەشدانەران لە بەنی عەبدولدار لە لای راستیەوە فیکەیان لێئەدا، دوو پیاویش لە لای چەپیەوە چەپڵەیان لێئەدا، ئەویش نوێژەکەو قورئانخوێندنەکەی لێ تێك دەچوو، هەتا لە جەنگی بەدردا هەموویان کوژران.

**فان قيل: كيف سمي المكاء والتصدية صلاة؟ فعنه جوابان ذكرهما إبن الأنباري:**

**١ ـ انهم جعلوا ذلك مكان الصلاة.**

**٢ ـ ان من كان المكاء والتصدية صلاته، فلا صلاة له.**[2] واتە: ئەگەر بوترێ چۆن فیکەو چەپڵە بە نوێژ ناوبراوە، دوو وەڵامی هەیە، (**إبن الأنباري**) باسی کردووە:

١ ـ ئەوەیان لە جیاتی نوێژ کردووە.

٢ ـ هەرکەس فیکەو چەپڵە نوێژەکەی بێت هەر نوێژی نەکردووە.

(غاندی) مانگاپەرستی شۆڕشگێڕ دەڵێ: "**بغير الصلاة كان يتحتم عليَّ ان اصبح معتوهاً أو ابلها**".[1] واتە: بەبێ نوێژکردن مسۆگەرە گەلۆرو وڕ دەبم.

---

[1] زاد المسير، ج٣ ص٢٦٨.

[2] زاد المسير، ج٣ ص٢٦٨ ـ ٢٦٩.

وابو ذر (رضي الله عنه) **"كان يصلى لله قبل اسلامه بثلاث سنوات"**.[٢] واته: ئەبوزەڕ (ڕەزای خوای لێ بێت) سێ ساڵیش پێش ئەوەی موسڵمان بێت نوێژی کردووە. ئاگرپەرستەکانیش نوێژیان دەکرد، **"وكان أهل إيران يستقبلون في صلاتهم النار"**.[٣] واتە: خەڵکی ئێران لە نوێژەکانیاندا روویان لە ئاگر دەکرد.

## نوێژ و "معراج" بەرز بوونەوە بۆ ئاسمان

نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە ئاسمان فەرز کرابیت، پێغەمبەری خودا پێش فەرزبوونی نوێژیش هەر نوێژی کردووە، بەڵام لە لایەن خوداوە لەسەر خۆیو ئوممەتەکەی فەرز نەکرابوو، نوێژی خەوتنانی لەگەڵ هاوڕێکانی کرد، لە مزگەوتی (ئەقصا)یش نوێژی لەگەڵ کۆمەڵێ لە پێغەمبەران کردو لە ئاسمانیش نوێژی لەسەر فەرز کرا، کە گەڕایەوە مەککەش نوێژی بەیانی لەگەڵ کردن و مژدەی فەرزبوونی نوێژی دانێ.

هەروەکو دەفەرموێت لە باسی گەشتی گەردوون و ئاسمانیدا: **"ثم فُرضت عليَّ الصلاة خمسين صلاة كل يوم.."**.[٤] واتە: پاشان پەنجا نوێژم لەسەر فەرز کراوە.

نوێژ تاکە پایەی ئیسلامە لە ئاسمانیش ئەنجام ئەدرێ و مزگەوتی بۆ دروست کراوە لە هەموو ئاسمانەکان لەو مزگەوتانەش ناویان هاتووە لە قورئاندا: **"بيت المعمور"** لە ئاسمانی حەوتەم و **"بيت العزة"** لە ئاسمانی یەکەم، ئاسمانی دونیا. هەندێ لە زانایان دەفەرموون نوێژ بەرزبوونەوە واتە (معراج)ی بڕوادارو نوێژخوێنە.

(إبن القيم) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"مثل القلب مثل الطائر، كلما علا بعد عن الآفات، وكلما نزل احتوشته الآفات"**.[٥] واتە: دڵ وەکو باڵدار وایە تا زیاتر بەرز بێتەوە دوورتر دەکەوێتەوە لە بەڵاو گرفت، تا زیاتر نزم بێتەوە زیاتر دووچاری گرفتو بەڵاو ترسناکی دەبێت.

---

[١] دع القلق وابدأ الحياة/ دايل كارنيجي.

[٢] السيرة النبوية للصلابي، ج١ ص٢٥٦. قصة اسلام أبي ذر.

[3] السيرة النبوية ج١، ص٢٢، للصلابي.

[٤] السيرة النبوية للصلابي، ج١ ص٣٩٠.

[5] رهبان الليل ج١، ص٤٢.

## به هۆی نوێژەوە لە گەشتی ئاسماندا پێغەمبەر بیلالی لە بەهەشتا بینی

نوێژ گیان و دەروونی ئادەمیزاد پەیوەستی عەرشی خودا دەكات، هەر لە دونیادا گیانیان نیشتەجێی بەهەشت دەكات و "روح" و گیانیان جێگە دەگرن بۆ لاشەو گیانیان كاتێك جووت دەبنەوەو ئاوێتەی یەكتر دەبن. هەر لەم جیهانەو گیانی نوێژخوێنان دەفڕێت بۆ ناو بەهەشت. لەم بارەوە ئەم فەرمودەیە بخوێنەوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال لبلال: "يابلال حدِّثني بأرجى عمل عَملتَهُ في الإسلام، فانى سمعت دُقَّ نعليك بين يديَّ في الجنه، قال: ما عملتُ عَمَلاً أرجى عندي من أنيِّ لَم أتطهر طهوراً في ساعةٍ من ليل أو نهارٍ إلاصليتُ بذلك الطهور ماكتب لي ان أُصليَ".**[١] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بە بیلالی فەرمووی: ئەی بیلال پێم بڵێ ئومیدت بە كام كردەوەت زۆرە كە لە ئیسلامدا كردبێت، بەڕاستیی گوێم لە تەقەی پێڵاوەكانت بوو لە پێشمەوە لە بەهەشتدا، فەرمووی هیچ كردەوەیەكم نییە ئەوەندە ئومێدم پێی هەبێت جگە لەوەی هیچ دەستنوێژێكم نەگرتووە نە بە شەو، نە بە رۆژ حەتمەن بەو دەستنوێژەوە ئەوەندی خوا بەنسیبی كردبێت نوێژم پێ كردووە.

---

[١] متفق عليه واللفظ للبخاري رقم ١١٤٩ ومسلم رقم ٢٤٥٨، رياض الصالحين رقم ١١٤٦.

# نوێژو تەوبە

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە دوای تەوبە داوای جێبەجێکردنی کرابێت

بۆ ئەوەی تەوبە گیرابیت و خوا پەشیمانی لە بەندەکانی وەرگرێت دەبێت تەوبەکار یەکسەر پەنا بۆ نوێژکردن بەرێت و نابێ تەمەڵی و تەوەزەلی تیادا بکات و کاتەکانی زایە بکات.

خوا دەفەرموێت: **"فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُم.."**. **(التوبة ٥)**. واتە: ئەگەر بێبڕوایان تەوبەیان کرد و نوێژەکانیان بە چاکیی کردو زەکاتیاندا، ڕێگەیان بەردەن و دەستیان لێ هەڵگرن. لێرەدا دەردەکەوێت ئەگەر تەوبەیان کردو نوێژیان بە چاکیی نەکرد ڕێگەیان بەرمەیەن و بەری ڕێگەیان پێ بگرن.

هەروەها دەفەرموێت: **"فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ.."**. **(التوبة ١١)**. واتە: ئەگەر تەوبەیان کردو نوێژیان بە چاکیی ئەنجام داو زەکاتیاندا ئیتر برای دینی ئێوەن. لەم ئایەتە پیرۆزەشەوە دەردەکەوێت : ئەگەر تەوبەیان کردو نوێژیان نەکرد برای دینی ئێوە نین.

هەرکەس تەوبەی کردبێ لە خزمەت پێغەمبەردا دوای بڕیاردانی داوای نوێژی لێ کراوە پێش هەموو خواپەرستیەك مەگەر لەحاڵەتی نائاسایدا وەکو چیرۆکی (ئوسەیریم) کە لە جەنگی ئوحددا موسڵمان بوو یەکسەر جیهادی کردو شەهید بوو. فریا نوێژکردن نەکەوتو پێغەمبەریش شاهیدی موسڵمانبوونەکەی بوو و شاهیدی بەهەشتیشی بۆ دا.[1] هەروەها خوا لە سوڕەتی **"المجادلة"**دا دەفەرموێت دەربارەی ئەوانەی فەرمانێکی خوا ئەنجام نادەن کە بۆی دیاری کردون **".. فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ.."**. **(المجادلة ١٣)** ئەگەر ئەو فەرمانەتان بۆ ئەنجام نەدرا[2] خودا تەوبەیان لێ گیرا دەکات دە نوێژەکان بە چاکیی بکەن.

---

[1] السيرة النبوية، للصلابي، ج٢، ص١١٧.

[2] دەبوو کە چونە خزمەتی پێغەمبەر بۆ چپەکردن دیارییەکیان پێ بوایە، هەتا هەموو دەم خۆی پیانەکەن و بەمەبەست و ئەدەبەوە بچن.

## نوێژ رچەشکێن و ڕێخۆشکەری تەوبەیە

بۆ ئاشتبوونەوەو ئاشتەوایی و داوای لێخۆش بوون لە هەر کەسێك دەبێ مرۆڤ چەند ڕێگەیەکی گەنجاو بگرێتە بەر چەند هۆکارێکی ڕێگە خۆشکەر رەچاو بکات.

بابای تاوانبارو گوناهکاریش لەو دەمەیدا دەیەوێت بگەڕێتەوە لای خواو تەوبە بکات و پەشیمانی دەربرێت دەبێ چەند خاڵێك لەبەرچاو بگرێتو ئەنجامیان بدات هەتا خوا دەست بەڕوویەوە نەنێت لەوانەش:

**عن علي (رضي الله عنه) قال حدثني أبوبكر (رضي الله عنه) وصدق أبوبكر أنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "مامن عبد يذنب ذنباً فيُحسن الطهور ثم يقوم فيُصلي ركعتين, ثم يستغفر الله الا غفر له (ثم قرأ هذه الآية: "وَالَّذِينَ إِذا فَعَلُواْ فَاحِشَةً أو ظَلَمُواْ أَنْفُسَهُمْ... الى آخر الآية".** [1]واتە: لە عەلییەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی ئەبوبەکر بۆی باس کردم (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەبوبەکریش ڕاست دەکات، فەرمووی: "گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەڵامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: هەر بەندەیەك کە تاوانێك بکات، خێرا دەستنوێژ بگرێت ئینجا هەستێ دوو ڕکات نوێژ بکات، پاشان داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات حەتمەن خوا لێی خۆش دەبێت ئینجا ئەم ئایەتەی خوێند، واتە: ئەوانەی بەدڕەوشتیەك دەکەن یان ستەمیان لە خۆیان کرد.. هەتا کۆتایی ئایەتەکە.

**عن أبي بكر (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "مامن عبد يذنب ذنباً فيتوضأ، فيحسنُ الطهور ثم يقوم فيصلى ركعتين، ثم يستغفر الله بذلك الذنب، إلا غفر الله له".** [2] صحيح. واتە: لە ئەبی بەکرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت: "هیچ بەندەیەك نییە کە گوناهێك بکات و خێرا دەستنوێژ بگرێ, چاك خۆی پاك بکاتەوە ئینجا هەستێ دوو ڕکات نوێژ بکات، ئینجا داوای لێخۆشبوون بکات بۆ ئەو گوناهە، ئیللا خوا لێی خۆش دەبێت"

---

[1] حديث حسن.صحيح سنن الترمذي ٣٣٣ نقلاً عن صحيح وصايا الرسول ح٢ ص ٦٩٢.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٧٣٨.

## نوێژو تەوبەکاران

تەوبەکاران دوای پەشیمان بونەوەیانو رووکردنە خوا، یەکەم کار پێی هەڵساون نوێژکردن بووە.

سەعید نورسی رەوانەی کۆڕی بڕیکاران کرا لە تورکیا کە پێیان دەوترا "المبعوثون" لەوێ فەرمووی: **"أيها المبعوثون، إنكم لمبعوثون ليوم العظيم"**. واتە: ئەی زیندوخوازان ئێوە بێگومان زیندوودەکرێنەوە لە رۆژێکی گەورەدا، لە فەرو بەرهەمی ئەم بەیانە شەست کەس لە "نواب"کان تەوبەیان کردو بەردەوام بوون لەسەر نوێژکردن.[1]

عەبدوڵڵای کوڕی سەعید رەزایی (خوای لێ رازی بێ) یەکێك بووە لە نووسەرەکانی نیگای خوا (كاتب الوحي) دواتر پاشگەز بووەوە لە ئیسلام، ماوەیەکی زۆر بەبێ دینی مایەوە، لە کاتی فەتحی مەککەدا چاری نەما داوای پەنادانی لە عوسمانی کوڕی عەففان کرد، ئەویش پەنای دا، وتی ببەرە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەمەوێ تەوبە بکەم ئەویش لەگەڵ خۆیدا بردییە خزمەتی پێغەمبەر لە کاتێکدا خەڵکیی پۆل پۆل دەهاتن بەیعەتیان ئەدا بە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت). پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: رای وەستێنە، ئەویش لەلایەکەوە رای گرت، کە هەموو خەڵك تەواو بوون و بەیعەتیان دا، ئەوجا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: بیهێنەو دەستی خستە ناو دەستییەوەو بەیعەتی لێوەرگرت هیچی بە رووودا نەدا، عوسمان (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ عەبدوڵڵات خستە کۆتایی هەمووانەوە؟ فەرمووی: "ئەرێ پیاوێکتان تیادا نەبوو شمشێرێکی لە گەردنی بدایە". وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەی بۆ بەسیلەی چاو هێمایەکت بۆ نەکردین؟ پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "پێغەمبەرەکان چاویان خیانەت ناکات".[2] یان پێغەمبەر خەڵکی بە هێماو ئیشارەت ناکوژێ.

---

[1] صلاح الأمة ج٣ ص٤٩٦.

[2] السيرة النبوية للصلابي ج٢، ص٢٢٦.

ئیبن هیشام (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: بە چاکیی موسڵمان بووەو لەوەودوا عومەر (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) کردیە کاربەدەستیو هەندیٚ کاری پیٚسپارد، هەروەها عوسمانیش (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) هەندیٚ کاری پیٚسپارد.[1]

ئیبن کثیر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی سەعید لە نویٚژی بەیانیداو لە سوژدەدا گیانی دەرچووە یان یەکسەر لە دوای تەواو بوونی لە نویٚژەکە مردووە.[2]

بتپەرستیٚك موسڵمان بوو، کاتیٚك شەو هات بینی هەرکەس چووە سەر پیٚخەفی خۆی بە نیازبوون بخەونو پیٚی وتن ئەریٚ ئەو خوایەی ئیٚوە بە منتان ناساند بە شەو دەخەویٚ!! وتیان خوایەکی گەورەو ڕاگری بوونەوەر ناخەویٚ، وتی: بەڕاستیی ئیٚوە بەندەیەکی خراپن، پەروەردگارتان ناخەویٚو ئیٚوە دەخەون".[3]

## نویٚژ بری خیٚرو ماڵ بەخشین دەکەویٚت

پەیداکردنی ماڵ و سامان کاتیٚکی دەویٚتو ماندووبوونیٚکی پیٚویستە، نویٚژیش بەهەمان شیٚوە کاتیٚك و ماندوبونیٚکی دەویٚت، هەروەها ئەوکاتەی نویٚژ دەیگریٚت پارە و سامانیٚکی تیادا پەیدا دەکریٚت، بەڵام بابای موسڵمان و خواناس تەرخانی دەکات بۆ نویٚژو چیٚژی گیانیی، بۆیە خودا هەردوولای پیٚدەبەخشیٚت چیٚژو لەزەت لە ڕۆحیەکە و خیٚری ماڵ بەخشینەکەش.

**عن أبي ذر (رضي الله عنه)، عن النبي ﷺ قال: "يُصبح على كل سلامي من احدكم صدقة، ونهى عن المنكر صدقة, ويجزىء من ذلك ركعتان يركعُهما من الضحى".**[4] واتە: لە ئەبی زەڕەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) لە پیٚغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربیٚت) فەرمووی: هەموو بەیانییەك خیٚرکردنیٚك واجبە لە بری هەموو جومگەی هەر یەکیٚکتان، هەموو (سبحان الله)یەك خیٚریٚکە، فەرمان کردن

---

[1] السيرة النبوية للصلابي ج٢، ص٥٢٦، نقلا عن إبن هشام.

[2] السيرة النبوية للصلابي ج٢، ص٥٢٦، نقلا عن.. "البداية والنهاية" إبن كثير.

[3] (رهبان الليل ج٢، ص٥٩).

[4] رواه مسلم ٧١٩. ورياض الصالحين ١١٤٠.

بەچاکە خێرێکە، رێگە گرتن لە خراپە خێرێکە, بری هەموو ئەمانە دەکەوێت دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو.

**وقال رسول الله ﷺ: "فضل صلاة الليل على صلاة النهار كفضل صدقة السر على صدقة العلانية".**[1] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "خێر و پلەو پایەی شەونوێژ بەسەر نوێژی رۆژدا وەك خێر کردنی پەنهانی و ئاشکرا وایە".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من كان له سعة ولم يضحِّ، فلا يقربنَّ مصلانا".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیّ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: "هەر کەس دەوڵەمەند بێ و قوربانی نەکات با نزیك شوێن نوێژەکەشمان نەکەوێت".

دەربارەی "نوێژی مردوو"یش دەفەرموێت: **"من صلى على جنازة، ولم يتبعها، له قيراط، فإن تبعها فله قيراطان".** صحيح[3] واتە: هەرکەس نوێژی لەسەر تەرمێك کردو شوێنی نەکەوت خێری قیراتێکی هەیە "واتە: کێوێکی گەورە" ئەگەر شوێنی کەوت بۆ سەر گۆڕستان خێری دوو قیراتی هەیە "واتە: دوو کێوی گەورە".

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: من شهد الصلاة حتى يصلى عليها فله القيراط ومن شهدها حتى تدفن فله قيراطان: قيل وما القيراطان؟ قال مثل الجبلين العظيمين".** صحيح [4] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیّ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بێت) فەرموویەتی: هەرکەس ئامادەی نوێژی مردوو بێت تا نوێژەکەی لەسەر دەکات ئەوا قیراتێك خێری هەیە، هەر کەس تا ئەسپەردە کردنی ئامادەبێت دوو قیرات خێری هەیە، وترا دوو قیرات چیە؟ فەرمووی وەکو دوو کێوی گەورەیە.

---

[1] رواه الطبراني في (الكبير) باسناد حسن رقم (١٠٣٨٢)، الترغيب ٩٢٨. نقلاً عن صحيح وصايا الرسول ج١ ص ٤٣٨.

[2] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦٤٩٠.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٦٣٥٥.

[4] أخرجه مسلم ٩٤٥. وصحيح فقه السنة، ج١، ص٦٣٩ ـ٦٤٠.

## نوێژی هەینی بری ئاژەڵ سەربڕین دەکەوێت

بانگەوازی خوایی لە هەموو ڕۆژێکی هەینیدا بە جیهاندا پەخش دەکرێت بۆ بڕواداران و داوایان لێ دەکرێ و پێیان دەوترێت ئەی بڕوادارینە ئەگەر بانگتان لێکرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینیدا بە تاڵوکەو چوستو چالاك بچن بەدەمیەوە و واز لە مامەڵەو کڕین و فرۆشتن بێنن, چونکە خێری گەورە لەوەدایە.

**قال رسول الله ﷺ: "إذا كان يوم الجمعة كان على كل باب من أبواب المسجد ملائكة يكتبون الناس على قدر منازلهم الأول فالأول، فإذا جلس الامام طووا الصحف وجاءوا يستمعون الذكر، ومثل المُهَجِّر كمثل الذي يُهدى بدنه ثم كالذي يُهدى بقرة، ثم كالذي يُهدى الكبش، ثم كالذي يُهدى الدجاجة، ثم كالذي يهدي البيضة".** [1]واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: کە ڕۆژی هەینی دێت لەسەر دەرگای مزگەوتەکان فریشتە ناوی خەڵکی دەنووسن بە گوێرەی دوورو نزیکی ماڵەکانیان پۆلێنیان دەکەن یەك لە دوای یەك، هەرکە ئیمام دانیشت ئەوانیش لاپەڕەو وەرقەکانیان دەپێچنەوە و دێن گوێ دەگرن لە یادی خوا، جا نمونەی ئەوەی زوو دێت وەکو ئەوەیە وشترێکی کردبێتە خێر، ئینجا وەکو مانگایەکی کردبێتە خێر، ئینجا وەکو بەرانێکی کردبێتە خێر، ئینجا وەکو مریشکێکی کردبێتە خێر، ئینجا وەکو هێلکەیەکی کردبێتە خێر.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "من اغتسل يوم الجمعة غسل الجنابة ثم راح فكأنما قّرب بدنة، ومن راح في الساعة الثانية فكأنما قرب بقرة ومن راح في الساعة الثالثة فكأنما قرب كبشاً أقرن ومن راح في الساعة الرابعة فكأنما قرب الدجاجة ومن راح في الساعة الخامسة فكأنما قرب بيضة فإذا خرج الامام حضرت الملائكة يستمعون الذكر".** [2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "هەر کەس ڕۆژی هەینی خۆی بشوات وەکو خۆشتنی لەشگرانی ئینجا بڕوا بۆ نوێژی هەینی وەکو وشترێکی کردبێ بە خێر، هەرکەس لە کاتی دووهەمدا بڕوات وەکو مانگایەکی کردبێ

---

[1] متفق عليه، البخاري رقم (٣٠٣٩)، ومسلم رقم (٨٥٠) واللفظ له، صحيح وصايا الرسول، ج١ ص٤٠٠.

[2] صحيح/ أخرجه البخاري، ٨٨١، ومسلم، ٨٥٠، صحيح فقه السنة، ج١، ص٥٧٧،

بە خێر، هەرکەس لە کاتی سێهەمدا بڕوات وەکو بەرانێکی شاخداری کردبێ بە خێر، هەرکەس لە کاتی چوارەمدا بچێت وەکو مریشکێکی کردبێ بە خێر، هەرکەس لە کاتی پێنجەمدا بچێت وەکو هێلکەیەکی کردبێ بە خێر، کە پێشنوێژ دەرچوو بۆ نوێژی هەینی فریشتەکان دێن گوێی لێدەگرن.

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ (على كل باب من ابواب المسجد ملكان، يكتبان الأول فالأول فكرجل قدم بدنة، وكرجل قدم بقرة، وكرجل قدم شاة، وكرجل قدم طيراً، وكرجل قدم بيضة، وإذا قدم الإمام طويت الصحف".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "لەسەر هەموو دەرگاکانی مزگەوت دوو فریشتەی لێیە، یەك یەك دەینووسن، هەروەکو پیاوێك وشترێکی پێشکەش کردبێ، پیاوێك مانگایەکی پێشکەش کردبێ، پیاوێك مەڕێکی پێشکەش کردبێ، پیاوێك باڵندەیەکی پێشکەش کردبێ.

هەر لە بەرنامەی پەروەردەی پێغەمبەردا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) کە قوربانیەکەی خۆی لە شوێنی نوێژی جەژنەکەی سەردەبڕی:

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) قال: "كان ينتحرُ أضحيتهُ بالمصلى".**[2]
صحيح، واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) قوربانیەکەی دوای نوێژی جەژن هەر لە شوێنی نوێژەکەی سەر دەبڕی. دیارە ئەو کاتە لە مزگەوتا نوێژیان نەکردووە، بەڵکو لە دەرەوەی شارو لە دەشتا کردوویانە.

## دوو رکات نوێژ بری ( ٣٦٠ ) خێر دەکەوێت

نوێژی چێشتەنگاو خێرو فەڕی زۆرەو پێغەمبەری خودا بە درێژایی تەمەنی پیرۆزی خۆی لە دەستی نەداوە و وەسیەتی کردووە بۆ هاوڕێ بەڕێزەکانیشی کە نوێژی چێشتەنگاو نەفەوتێنن، هەروەها باسی ئەوەی فەرمووە کە هەموو جومگەی ئادەمیزاد

[1] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٤٠٣٢، وصحيح الترغيب، ٧١٠.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٥٠٢٠.

دەبێ ڕۆژی خێرێکیان بۆ بکرێت لە جێی ئەو هەموو خێرە دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو پڕی دەکاتەوە. لەلاشەی ئادەمیزادا (٣٦٠) جومگە هەیە ئەو دوو رکاتە خێری سێ سەدو شەشت خێری هەیە.

**عن أبي ذرٍّ (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "يُصبح على كل سلامى من احدكم صدقة: فكل تسبيحة صدقة، وأمرٌ بالمعروف صدقة، ونهي عن المنكر صدقة، ويجزيء من ذلك ركعتان من الضحى".**[1] واتە: لە ئەبی زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "کە بەیانی بوەوە لەسەر هەموو جومگەی هەر یەکێکتان خێرێك پێویستە، هەموو (سبحان الله)یەك خێرێکە، فەرمان کردن بە چاکە خێرێکە، ڕێگرتنو قەدەغەکردنی خراپە خێرێکە، بری هەموو ئەمانە دەکەوێت، دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو".

**عن بريدة (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "في الإنسان ستون وثلاثمائة مفصل، فعليه ان يتصدق عن كل مفصل منها صدقة: النخاعة في المسجد تدفنها، والشىء تُنحيهِ عن الطريق فان لم تقدر، فركعتا الضحى تجزيء عنك".**[2] واتە: لە بورەیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: لە مرۆڤدا سێ سەدو شەست جومگە هەیە، لەسەریەتی "ڕۆژانە" بۆ هەر جومگەیەك خێرێك بکات، شاردنەوەی چڵم و بەڵخەمێك لە ژێر خاکی مزگەوتا، لابردن و فرێدانی شتێك لەسەرە ڕێدا، ئەگەر هەر نەیتوانی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بۆت بری دەکەوێ.

**وعن أبي ذر (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "يصبح على كل السُلامى من إبن آدم صدقة، تسليمه على من لقيه صدقة، وأمره بالمعروف صدقه، ونهيه عن المنكر صدقة، واماطة الأذى عن الطريق صدقة، بَضعُهُ اهله صدقة، ويجزىء من ذلك كله ركعتان من الضحى، قالوا: يارسول الله أحدُنا يقضى شهوته وتكون له**

---

[1] رواه مسلم ٧٢٠، أخرجه أبو داود ١٢٨٥ واحمد (٥٢١٥١٣)، رياض الصالحين رقم ١١٤٠، وصحيح وصايا الرسول ج١ ص٤٥٣.

[2] صحيح /صحيح الجامع الصغير وزيادته ٤٢٣٩.

**صدقة؟ قال: أرأيت لو وضعها في غير حلِها ألم يكن يأثم".**[1]واتە: لە ئەبی زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بیت) فەرمووی: "بەیانی دێتەوە بەسەر هەموو جومگەیەکی نەوەی ئادەمدا خێرێك، سەلام کردنێ لە کەسێك پێی دەگات خێرێکە، فەرمان کردن بە چاکە خێرێکە، ڕێگرتنی لە خراپەیەك خێرێکە، لابردنی شتێك ئازارو پیسیەك لەسەر ڕێگا خێرێکە، جووت بوون لەگەڵ هاوسەرەکەی خێرێکە، دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بری هەموو ئەمانە دەکەوێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا یەکێکمان ئارەزوی ئەنجام ئەدا بۆی دەبێتە خێر؟ فەرمووی ئەی ئەگەر بینیت لە حەڵاڵدا دای نەنا ئایا گوناهبار نابێت".

**وعنه (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "يصبح على كل سلامي من احدكم صدقة، فكل تسبيحة صدقة، وكل تحميدة صدقة، وكلُّ تهليلة صدقة، وكل تكبيرة صدقة، وأمر بالمعروف صدقة، ونهى عن المنكر صدقة، ويجزى من ذلك ركعتان يَركعهما من الضحى".**[2] واتە: هەروەها لە ئەبی زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: بەیانی دەبێتەوە هەموو جومگەی یەکێکتان خێرێکی لەسەرە، هەموو (سبحان الله)یەك خێرێکە، هەموو (الحمدلله)یەك خێرێکە، هەموو "لا اله الا الله"یەك خێرێکە، فەرمان کردن بەچاکە خێرێکە، ڕێگرتن لە خراپە خێرێکە، بری هەموو ئەمانە دەکەوێت دوو رکات نوێژ بکەیت لە چێشتەنگاودا.

## تەوبەکارو نوێژ

عەبدوڵڵای کوڕی سەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکێك بووە لە نووسەرەکانی نیگای خوای گەورە (**کاتب الوحي**) کە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهات، دواتر ئەو پیاوە پاشگەز بووەوە لە ئیسلام، ماوەیەکی زۆر بەبێ دین مایەوە، لە کاتی فەتحی مەککەدا چاری

[1] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٨٩٦.

[2] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٨٠٩٧ ـ ٨٠٩٨. ومختصر مسلم ٣٦٤. وصحيح أبي داود ١١٦٤. والجامع الصحيح من أحاديث النساء ١٩٤.

نەما داوای پەنادانی لە عوسمانی کوڕی عەففان کرد، ئەویش پەنای دا، وتی بمبەرە خزمەتی پێغەمبەر (سەلاٚتو سەلامی خوای لەسەر بێت)، دەمەوێ تەوبە بکەم، ئەویش لەگەڵ خۆیدا بردیە خزمەتی پێغەمبەر لە کاتێکدا خەڵکی پۆل پۆل دەهاتن بەیعەتیان ئەدا بە پێغەمبەر.

پێغەمبەری خوا فەرمووی رایوەستێنە، ئەویش لە لایەکەوە رایگرت، کە هەموو خەڵك تەواو بوونو بەیعەتیان دا، ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی بیهێنەو دەستی خستە ناو دەستییەوەو بەیعەتی لێوەرگرت، هیچی بەڕودا نەدا. عوسمان (رەزای خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ عەبدوڵلاٚت خستە کۆتایی هەموویانەوە. فەرمووی: ئەرێ پیاوێکتان تیادا نەبوو شمشێرێکی لە گەردنی بدایە. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەی بە تیلەی چاو هێمایەکت بۆ نەکردین. پێغەمبەریش فەرمووی: پێغەمبەرەکان چاویان خیانەت ناکات،[1] یان پێغەمبەر خەڵکی بە هێماو ئیشارەت ناکوژێ.

ئیبن هیشام (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی ئەو پیاوە بە چاکیی موسڵمان بووەوەو لەوەودوا عومەر (رەزای خوای لێ بێ) کردیە کاربەدەستو هەندێ کاری پێسپارد. هەروەها عوسمانیش (رەزای خوای لێ بێ) هەندێ کاری پێسپارد.[2]

ئیبن کەسیر (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "عەبدوڵلاٚی کوڕی سەعید لە نوێژی بەیانیدا و لە سوژدەدا گیانی دەرچوو، یان یەکسەر لە دوای تەواوبوونی لە نوێژەکە مرد.[3]

---

[1] السيرة النبوية للصلابي، ج٢، ص٢٢٦.

[2] السيرة النبوية، للصلابي، ج٢، ص٥٢٦، نقلا عن إبن هشام.

[3] السيرة النبوية للصلابي، ج٢، ث٥٢٦، نقلا عن البداية والنهاية إبن كثير.

# نوێژ و شەفاعەت

## نوێژ تکا (شەفاعەت) بۆ خاوەنەکەی دەکات

هەموو کردەوەیەکی چاکە ئەندازەیەك خواپەرست لە خوا نزیك دەخاتەوە، بەو ئەندازەیەش لە شەیتان دووری دەخاتەوە. نوێژ کە چاکترین کردەوەیەکە بڕوادار ئەنجامی بدات، لە هەموو کردەوەو چاکەکانیش زیاتر موسڵمان نزیك دەکاتەوە لە خوا و تکاشی بۆ دەکات.

**عن عبادة بن الصامت (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا حافظ العبد على صلاته فأقام وضوءها وركوعها وسجودها والقراءة فيها، قالت له: حفظك الله كما حفظتني، وصعد بها الى السماء ولها نور حتى تنتهي الى الله عز وجلّ فتشفع لصاحبها".**[1] واتە: لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "هەر کات بەندەی خودا نوێژەکەی پاراست و زایەی نەکرد و دەستنوێژ و کڕنوش و سوژدە و قورئان خوێندنەکەی بە چاکیی ئەنجام دا، نوێژەکەی پێی دەڵێ: خودا بتپارێزێت وەکو منت پاراست و بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان و روناکیەکی هەیە هەتا دەیباتە لای خودا، ئەوجا تکای بۆ دەکات".

## نوێژخوێن وەبەر تکای پێغەمبەر دەکەوێت

پێغەمبەری خودا لە سەدان فەرمودەی راست و پیرۆزی خۆیدا فەرمانی کردووە بە نوێژکردن. ئەو هەموو هەڵنان و هەرەشەکردنە بۆ بەرژەوەندیی دونیاو دوارۆژی خۆیانە هەتا وەبەر تکای پێغەمبەر بکەون و سەرفرازی دونیاو دوارۆژ بن.

**عن فاطمة بنت الحسين ان رجلاً قال: يارسول الله ادع الله ان يجعلني من اهل شفاعتك! قال: اعني بكثرة السجود.**[2] واتە: لە فاتیمەی کچی حسێنەوە گێڕدراوەتەوە کە پیاوێك بە پێغەمبەری وت: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە کە خودا

---

[1] حسن : أخرجه الطبراني في الكبير. نقلا عن صحيح وصايا الرسول، ج٢، ص٦٩٩.

[2] تعظيم قدر الصلاة، ص٣٠٩، رقم ٣١٩.

وەبەرتکای تۆم بخات لەگەڵ تکابۆکراوان! فەرمووی: "دەی کۆمەکیم بکە بە سوژدە بردنی زۆر".

لەو روانگەشەوە کە نوێژ عەهدو پەیمانە وەکو لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە **"العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر"**. واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندایە نوێژە، هەرکەس وازی لێهێنا بێباوەڕە. بە گوێرەی مانای ئەم فەرمودەیە.

## نوێژنەکەر بێبەش دەبێت لە تکای پێغەمبەر لە رۆژی دواییدا

نوێژنەکەر وەبەر تکای پێغەمبەر ناکەوێت لە رۆژی دواییدا، ئەو فەرمودەی پێشتر باسکرا بەڵگەیە لەسەر شەفاعەت کردنی پێغەمبەر بۆ نوێژخوێنان، کەواتە نوێژنەکەر لێی بێبەش دەبێت.

عەهدو پەیمان نوێژکردنە، لە فەرمودەی پێغەمبەردا واباسکراوە **"العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة، فمن تركها فقد كفر"**.[1] واتە: پەیمانی نێوان ئێمەو ئەوان "ئێمەو بێبڕوایان" نوێژە، هەر کەس وازی لێهێنا بێباوەڕە.

خواش دەفەرموێت: **"لَا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَنِ عَهْداً"**. (مريم: ٨٧). واتە: شەفاعەت بەدەست ناهێنن مەگەر کەسێك لە لای خوا پەیمانی وەرگرتبێت، پەیمانەکەش نوێژە هەر کەس خاوەنی ئەو پەیمانە نەبێت وەبەر تکای پێغەمبەر ناکەوێت.

[1] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٤١٤٢.

# نوێژ و سەروەت و سامان و ماڵ و خێزان

## نوێژ لە بەرامبەر سەروەت و سامان و بازرگانی و خێزان و ماڵدا

نوێژ ئەرکێکی خواییە لەسەر هەموو بڕواداریك بە هەژارو دەوڵەمەندو خاوەن ماڵ و سامان و خاوەن خێزان و منداڵ و دەست کورت و بێ ماڵ و سامان و رەبەن و وەجاخ کوێر.

بوونی هەر کامێك لەو بەهرە خواییە دونیاییانە یان نەبوونی هەر کامێکیان نابێتە لەمپەڕو رێگری نوێژ، هیچ پەیوەندییان نییە بە نوێژکردن و نوێژ نەکردنەوە، بەڵکو نوێژکردن لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا هەر فەرزە و نەکردنی تاوان و بێ فەرمانی خوایە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من كان له سعة ولم يضح، فلا يقربنَّ مصلانا".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "هەر کەس زۆری هەبێت و قوربانیی نەکات با نزیکی مزگەوت و سوژدەگاکەمان نەکەوێت".

خوا دەفەرموێت: **"رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ". قال سفيان: "يشترون ويبيعون فلا تشغلهم عن مواقيت الصلاة".**[2] واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: (مەردانێك کە بازرگانیو مامەڵە دووریان ناخاتەوە لە یادی خوا). سوفیانی سەوری "ڕەحمەتی خوای لێ بێت" دەڵێت: دەکڕن و دەفرۆشن و سەرقاڵیان ناکەنو وازیان پێ ناهێنن لە کاتەکانی نوێژ.

هاوڕێکانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) ژمارەیەکیان زۆر دەوڵەمەند بوون، بەڵام لە نوێژو مزگەوت دوانەکەوتون و کەمتەرخەمییان نەکردووە، بەڵکو نوێژیان لە هەموو سەروەت و سامانیان پێ چاکتر بووە هەروەکو لە چیرۆك و بەسەرهاتی ژیانیاندا دەبینرێ.

---

[1] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦٤٩٠.

[2] إسناده صحيح / تعظيم قدر الصلاة ٥٢

## نوێژ بەڕێزترو سەنگینترە لە بازرگانی و ماڵ و سامان و منداڵ

نوێژ بە لای خواوە، بە لای پێغەمبەری خواوە بەڕێزترو بەنرخترە لە بازرگانی و ماڵ و سامان و سەروەتی دونیاو تەنانەت منالّی جگەرگۆشەش.

خوا دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ"**. (المنافقون: ٩). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و منالّتان سەرقالّتان نەکاتو وازتان پێ نەهێنێ لە یادی خوا، هەر کەس وابکات ئەوانە لە زیانلێکەوتوانن.

**عن الضحاك قال في قوله جل ثناؤه "عَن ذِكْرِ اللَّهِ"، "الصلوات الخمس".**[1] واتە: زەححاك فەرموویەتی مەبەست لە یادی خوا، پێنج فەرزەی نوێژە.

**عن إبن جريج قال: "في "عَن ذِكْرِ اللَّهِ" قال سمعت عطاء يقول هى المكتوبة"**[2] واتە : لە ئیبن جەریجەوە فەرموویەتی دەربارەی **"عَن ذِكْرِ اللَّهِ"** لە ئایەتەکەدا گوێم لە عەتاء بوو دەیفەرموو ئەوە نوێژە فەرزەکانە.

**وقال سفيان في قوله تعالى: "رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ". قال كانوا يشترون ويبيعون فلا تشغلهم عن مواقيت الصلاة.**[3] واتە: سوفیان فەرموویەتی: دەربارەی ئەو ئایەتە ئەوا کڕین و فرۆشتن و مامەڵە بێ ئاگاو غافڵی نەدەکردن لە نوێژکردن.

**عن إبن جريج: عن عطاء في قوله: "رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ" (النور: ٣٧) "أي عن الصلاة المكتوبة"**. واتە: ئیبن جەریج لە عەتاوە گێڕاویەتیەوە، لە راڤەی ئەو ئایەتەدا فەرموویەتی: **"عَن ذِكْرِ اللَّهِ"**. واتە: لە نوێژە فەرزەکان.

بۆیەش بازرگانی و ماڵ و سامان و کڕین و فرۆشتن و مامەڵە نوێژی لەبیر نەبردونەوە، چونکە نوێژیان بەلاوە گرنگتر بووە لە تەواوی ئەو شتانە.

لە جابرەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر چوینەتە غەزای کۆمەڵێك لە جوهەینە، شەڕێکی گەرمیان لەگەڵ کردین کاتێ نوێژی

---

[1] إسناده لين، تعظيم قدر الصلاة رقم ٤٦

[2] إسناده صحيح تعظيم قدر الصلاة رقم ٤٨

[3] إسناده صحيح تعظيم قدر الصلاة رقم ٥٢

نیوەڕۆمان کرد بتپەرستەکان وتیان ئاوڕێکی باشمان لێ بدانایەوە و پەرتەوازمان بکردنایە، جبریل ئەم هەواڵەی دا بە پێغەمبەر، پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆی باس کردین فەرمووی: بتپەرستەکان وتویانە: ئەمانە کاتیی نوێژیاندا کە لە منداڵەکانی خۆیان زیاتر نوێژیان خۆش دەوێ.. واتە: ئەو کاتە دەستیان لێ دەوەشێنین، (جابر) دەفەرمووێ: لە کاتی نوێژەکەدا بووین بە دوو ریز بتپەرستەکانیش لە نێوان ئێمەو قیبلەدا بوون. لەگەڵ پێغەمبەر نوێژمان دابەست لەگەڵیدا چوینە کڕنوش، بەڵام کە کڕنووشی برد بەس ریزی یەکەم سوژدەیان لەگەڵ برد کە هەستانەوە ئینجا ئێمە سوژدەمان برد، ئینجا ریزی یەکەم هاتە دواوە و ریزی دووهەم چووە پێشەوە لە جێی ریزی یەکەم وەستان کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) (الله أكبر)ی کرد ئێمەش (الله اكبر)مان کردو لەگەڵ پێغەمبەر کڕنوش و سوژدەمان برد ریزی یەکەم بەپێوە بوون ئینجا ئەوانیش سوژدەیان برد و بەیەکەوە دانیشتین بۆ تەحیات و لەگەڵ پێغەمبەردا سەلامان دایەوە.[1]

## بەرز راگرتنی نوێژ بەسەر کارو پیشەی خێزاندا

پێغەمبەری خودا زۆر گرنگیی بەماڵ و خێزان و کارو پیشەی ماڵ و خێزانی داوەو خەمی لێ خواردون و یارمەتی داون. **عن الأسود بن يزيد، قال: سألت عائشة: ماكان النبي ﷺ يصنع في اهله؟ قالت: "كان في مهنة اهله، فإذا حضرت الصلاة قام إلى الصلاة".**[2] واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە ئەگێڕنەوە فەرموویەتی پرسیارم لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کرد: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە ماڵەوە چی دەکرد لەگەڵ خێزانەکانی؟ فەرمووی: "بە ئیش و کاری خێزانەکانیەوە خەریك دەبوو کە کاتی نوێژ دەهات دەڕۆیشتە نوێژ".

پێشەوا تەبەرانی لە عەنبەسەی کوڕی ئەزهەرەوە فەرمووی: "حارسی کوڕی حەسسان ژنی گواستەوە کە لە هاوەڵان بوو، پێی وترا: هاتوویە نوێژ کە ئەمشەو ژنت

---

[1] رواه مسلم، صلاح الأمة ج٢ ص٣٥٦.

[2] رواه البخاري رقم ٦٠٣٩ / وبلفظ اخرجاه في المفصل ج١١ ص٥٠٥.

گواستۆتەوە؟ فەرمووی واللە ژنێك ڕێگەی نوێژی بەیانیم لێ بگرێت بە جەماعەت ژنێکی خراپە!.

## ماڵو سامان بۆ خزمەتکاریی‌و فیداکاریی نوێژە

بڕواداری ڕاستەقینە دەبێ بخوات بۆ ئەوەی بژی، دەبێ موسڵمان کاروکاسبی و بازرگانی و مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتن‌و مایەو قازانجی بۆ ئەوە بێ خوا لە خۆی ڕازی بکات، خواش بەبێ نوێژ لە بەندەکانی ڕازی نابێت.

دەستمایەی موسڵمان‌و قازانجی موسڵمان بۆ مەحکەمەی خوداو سەربەرزی‌و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگاری خواپەرستییەو گەورەترین خواپەرستییش نوێژە.

**عن أبي واقد الليثي (رضي الله عنه) قال، قال رسول الله ﷺ: "ان الله عزوجل يقول: إنا انزلنا المال لإقامة الصلاة وإيتاء الزكاة".**[1]واتە: لە ئەبی واقیدی لەیسییەوە فەرمووی، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: خواوەندی شکۆدار و بە دەسەڵات دەفەرموێت: "ماڵمان بۆیە ناردووە هەتا نوێژ بە چاکی بکەن‌و زەکات بدەن".

هەروەها خوا دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ". (الجمعة: ٩).** واتە: "ئەی گەلی باوەڕداران، کە بانگهێشتی نوێژ کران لە ڕۆژی هەینیدا، ئێوە بە چوست‌و چالاکی و بەرەو یادی خودا بچن‌و کڕین‌و فرۆشتن واز لێ بێنن، ئەمە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن".

**وكان النبي ﷺ يقول: "خيركم خيركم لأهله، وانا خيركم لاهلي، وكان إذا صلى العصر دار على نسائه واستقرى أحوالهن".**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: "چاکترینتان باشترینتانە بۆ خێزانی، منیش

---

[1] صحيح أخرجه احمد والبيهقي في الشعب بسند صحيح، صحيح وصايا الرسول ج٣، ص٦٤٩. صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٧٨١.

[2] المفصل، ج١١، ص٥٠٦.

باشترینتانم بۆ خێزانم، هەرکاتێکیش نوێژی عەسری بکردایە بەسەر خێزانەکانیدا دەگەڕا و لێیان نزیك دەبووەو هەواڵی دەپرسین".

**عن أبي أضحى: كان مسروق يقوم فيصلى كأنه راهب: "وكان يقول لاهله، هاتوا كل حاجة لكم، فأذكروها لى قبل ان اقوم إلى الصلاة".** [1] واتە: لە ئەبی ئەضحاوە ئەگێڕنەوە، مەسروق (رەحمەتی خوای لێ بێت) هەڵدەستا بۆ نوێژ وەکو خواپەرستە گۆشەگیرەکان، بە خێزانی دەوت، چیتان پێویستە بیڵێن و باسی بکەن پێش ئەوەی هەستم بۆ نوێژ. یان پەردەیەکی هەڵئەدا لە نێوان خۆی و خانوەکەیدا دەستی دەکرد بە نوێژکردن و ئەوانی واز لێ دەهێنا سەرقاڵی دونیا بوون. هاوسەرەکەی دەڵێ ئەوەندەی شەونوێژ دەکرد قاچەکانی ئاوسابوون، منیش زۆر جار بۆی دەگریام و بەزەییم پێدا دەهاتەوە.

[1] صلاح الأمة ج٢ ص٣٧٥.

# نوێژ مۆڵەتی نەکردنی نییە

## نوێژ لە هیچ شوێنێك مۆڵەتی نەکردنی نییە

یەکێك لە بەخششە تایبەتییەکانی پەروەردگار بۆ پێغەمبەری گەورەمان (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کردنی سەرانسەری جیهانە بە مزگەوتو پاککردنەوەی زەوییە بە شێوەیەك نوێژ لە هەموو شوێنێکی ئەم زەوییە دروستەو مۆڵەتی نەکردنی نییە، لە شارو لە دێ و لە ئاوەدانی و چۆڵەوانی، لە ماڵ و مزگەوت، لە وشکایی و لە دەریاکانا، لەسەر جادەو ڕێگاوبان، لە بۆشایی ئاسمان، لەسەر هەسارەکان، لەسەر یەك بەیەکی ئاسمانەکان، تەنانەت لە کەنیسەو کڵێساکان، بە سواری وڵاخ و سەیارەو کەشتی و پاپۆڕو تەیارە و پەروانەی ئاسمان، مەگەر شوێنێکی پیس و پەڵۆخ کە شەرع ڕێگە نەدا نوێژی تیادا بکرێت لەبەر پیسی.

فریشتەکان لە ئاسمان نوێژ دەکەن و مزگەوتی تایبەتییان هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو ئاسمانیان کردۆتە سوژدەگا.

ئادەمی و جنۆکە بڕوادارەکان لە زەوی نوێژ دەکەن، بە سەدان هەزار مزگەوتیشیان دروست کردووەو لەگەڵ ئەوەشدا لەهەموو کون و قوژبنێکی ئەم دونیایەدا دروستە نوێژ بکەن.

نوێژ لە ئاسمان فەرز بووە هەتا خەڵکی ئەرز و ئاسمان بزانن لەسەر هەموویان فەرزەو نەکردنی نییە لە باسەکانی دواییدا بۆمان روون دەبێتەوە کە لە هەموو موڵکی خوادا دروستە نوێژ بکرێ و مەگەر شوێنێك خواو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) جیایان کردبێتەوە لەبەر هۆیەك.

## نوێژکردن لەماڵەوە

نوێژکردن لە ماڵەوە سوننەتی پێغەمبەرە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بە تایبەتی نوێژی ئافرەتان، بۆ ئافرەتان باشترو خێرترە لە ماڵەوەو لە شوێنی تایبەتی نوێژکردنیاندا نوێژە فەرزەکانو سوننەتەکانیان بکەن، بەڵام بۆ پیاوان سوننەتەو چاکترو خێرترە بچنە مزگەوت بۆ نوێژە فەرزەکانیان، بەڵام نوێژی سوننەت لە ماڵەوە خێری زیاترە بۆیان.

**عن زيد بن ثابت (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "صلوا أيها الناس في بيوتكم، فانّ أفضل الصلاة صلاة المرء في بيته إلاّ المكتوبة".**[1] واتە: لە زەیدی کوڕی سابتەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "ئەی خەڵکینە نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە بکەن، بەڕاستیی باشترین نوێژ نوێژی کەسێکە لە ماڵەوە بیکات، بێجگە لە نوێژە فەرزەکان".

**عن أنس (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "صلّوا في بيوتكم، ولا تتركوا النوافل فيها".**[2] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: لە ماڵەکانتاندا نوێژ بکەن، واز لە سوننەتەکان مەهێنن لە ماڵەوە، نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوە خێریان زیاترە.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "صلاة أحدكم في بيته أفضل من صلاته في مسجدي هذا إلاّ المكتوبة".**[3] واتە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: نوێژی هەر کامێکتان لە ماڵەوە چاکترە لە نوێژکردنی لەم مزگەوتەی مندا، بێجگە لە فەرزەکان.

دەربارەی سوننەتی نوێژی ئێوارە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی وەکو لە کەعبی کوڕی عەجرەوە گێڕدراوەتەوە **"عليكم بهذه الصلاة في بيوتكم، (يعني سنة المغرب)"**. واتە: ئەم نوێژە لە ماڵەوە بکەن، واتە سوننەتی دوای نوێژی ئێوارە.

**عن صهيب بن النعمان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "فضل صلاة الرجل في بيته على صلاته حيث يراه الناس كفضل المكتوبة على النافلة".**[4] واتە: نوێژی کەسێك لە ماڵەوە چاکترە لە نوێژێکی کە خەڵك ببیبنێ بە ئەندازەی چاکی نوێژە فەرزەکان بەسەر سوننەتەکاندا.

---

[1] صحيح جامع الصغير وزيادته ٣٧٧٩ ج٢ ص٧٠٥.

[2] صحيح جامع الصغير وزيادته ٣٧٨٦ ج٢ ص٧٠٦.

[3] صحيح الجامع، ج٢، ص٧١٠، ٣٨١٤، صحيح أبي داود ٩٥٩.

[4] صحيح الجامع، ج٢، ص٧٧٧، ٤٢١٧، وصحيح الترغيب ٤٤١.

**عن أبي سعيد (رضي الله عنه) أنّ رسول الله ﷺ "كان لا يصلي قبل العيد شيئاً فإذا رجع إلى منزله صلى ركعتين".**[1] واته: له ئەبی سەعیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ: له پێش نوێژی جەژندا نوێژی نەدەکرد، بەڵام که دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

بۆ ئافرەتانی بڕواداریش وا چاکترو خێرتره له ماڵەوە نوێژەکانیان بکەن هەر چەند ڕێگەی مزگەوتیشیان لێ نەگیراوە.

**قال رسول الله ﷺ "صلاة المرأة في بيتها أفضل من صلاتها في حجرتها، وصلاتها في مخدعها أفضل من صلاتها في بيتها".**[2] **عن إبن مسعود (رضي الله عنه).** واته: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: نوێژی ئافرەت له ماڵەوە باشتره له نوێژی هەیوانی ماڵەکەی[3]، نوێژی له ژووری تایبەتی خۆیدا باشتره له نوێژی ماڵەوەی.

**ناصر الدين الألباني** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) له کتێبی **(ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير وزيادته، المجلد الأول الجزء الثاني ص٣٢٥ ـ ٣٢٦ ـ ٣٢٧)** بیست و سێ فەرمودەی سەحیحی هێناوە لەسەر کردنی نوێژی سوننەت له ماڵەوە.

له فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"إذا حضر أحدكم الصلاة في مسجده فليجعل لبيته نصيباً من صلاته فإنّ الله جاعل في بيته من صلاته خيراً "**[4] **صحيح.** واته: ئەگەر یەکێکتان ئامادەی نوێژ بوو له مزگەوتەکەیدا با بەشی ماڵەوەش دانێ له نوێژەکەی، چونکه خوا خێری له نوێژی ماڵەوە خستووە.[5]

---

[1] نفس المصدر، ج٢، ص٨٧٧، ٤٨٥٩.

[2] صحيح الجامع الصغير، ج٢، ص٧١٣، ٣٨٣٣، وصحيح أبي داود ٥٧٩، وصحيح الترغيب ٥٧٩.

[3] عون المعبود، ١٩٤.

[4] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٤٨٨.

[349] ئەم باسه له زۆربەی سەرچاوەکاندا هەیەو به درێژی و به بەڵگەی زۆرەوە باسکراوە، هەروەکو له (فتح الباري)شدا هاتووە (بەرگی دووهەم لاپەڕە ٨٢ وە لاپەڕە ٩٥).

## گۆڕستانە ئەوماڵەی نوێژی تێدا نەكرێت

گۆڕستان شاری خامۆشانەو مردووەكان لە قۆناغێكی رۆیشتن و بەرەو دوارۆژچوندان، قۆناغی ژینی دونیایی كە مەیدانی خواپەرستییە كۆتایی پێهاتووە، ئەوان لە گڵكۆی خۆیاندان، جۆرێك لە ژیان بەسەر دەبەن كە خودا نەبێت كەس رووی راستەقینەی نازانێت كاتی خواپەرستییان كۆتایی پێهاتووە، تەنانەت دروست نییە زیندووەكانیش لە شاری كپ و خامۆشی ئەواندا نوێژ بكەن، بۆیە پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت ماڵەكانتان مەكەنە گۆڕستان و نوێژیان تێدا بكەن.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "صلّوا في بيوتكم ولا تتخذوها قبوراً".**[1] واتە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "لە ماڵەكانتاندا نوێژ بكەن و مەیانكەنە گۆڕستان".

هەروەها دەفەرموێت **"صلّوا في بيوتكم ولا تتخذوها قبوراً، ولا تتخذوا بيتي عيداً و صلّوا عليّ وسلّموا فان صلاتكم تبلغني حيثما كنتم"**.[2]واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "نوێژ لە ماڵەكانتاندا بكەنو مەیانكەنە گۆڕستان، ماڵەكەی منیش مەكەنە نەزرگە، سەڵاواتم لەسەر بدەنو سەلامم لێ بكەن، بەڕاستیی سەڵاواتەكانتان نیشانم دەردێ لەهەر كوێ بن".

لە چەند فەرمودەی تری راستدا ئەو باسە كراوە وەكو **"لا تتخذوا بيوتكم قبوراً"**.[3] واتە: ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان، واتە نوێژیان تێدا بكەن.

وە دەفەرموێت: **"لا تتخذوا بيتكم قبوراً، صلّوا فيها"**.[4] واتە: ماڵەكانتان مەكەنە گۆڕستان، نوێژیان تێدا بكەن.

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ج٢، ص٧٠٦، ٣٧٨٤.

[2] نفس المصدر، ج٢، ص٧٠٦، ٣٧٨٥ و ٧٢٢٦.

[3] نفس المصدر، ٧٢١٦، صحيح.

[4] نفس المصدر ٧٢١٧، صحيح.

هەروەها دەفەرمویت **"لا تجعلوا بیوتکم مقابر، إن الشیطان ینفر من البیت الذي یقرأ فیه سورة البقرة"**[1]. واتە: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، بێگومان شەیتان دوورەپەرێزە لەو ماڵەی سورەتی (**البقرة**)ی تێدا دەخوێنرێت.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە فەرموودەیەکی (صحیح) راستدا دەفەرموێت: **"اجعلوا من صلاتکم في بیوتکم ولا تتخذوها قبوراً"**.[2] واتە: لە نوێژەکانتان بۆ ماڵەوەش دانێن و مەیانکەنە گۆڕستان.

## نوێژ لە مزگەوت

نوێژکردن لە ماڵی خوا خێری زۆر زیاترە لە نوێژکردن لە ماڵی خۆمان، بەڵکو خودا پاداشتی زۆر گەورەی بڕیار داوە بۆ ئەو کەسانەی دەچنە مزگەوت بۆ نوێژکردن.

**عن أبي هریرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "من غدا إلی المسجد أو راح أعدّ الله له في الجنة نزلاً کلّما غدا أو راح". متفق علیه**.[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەر کەس بڕوا بۆ مزگەوت یان بێتەوە خودا مەنزڵگایەکی بۆ ئامادە دەکات بە هەموو هاتوچۆیەکی.

ڕۆیشتن بۆ مزگەوت بۆ نوێژکردن تاوان دەسڕێتەوەو پلە بەرز دەکاتەوەو شاهیدی ئیمانی بۆ دەدرێت و رووناکی تەواوی پێ ئەبەخشرێ لە رۆژی دواییدا.

هەروەها ئافرەتانیش بانگهێشتی مزگەوت کراون بۆ نوێژکردن و دەرگای تایبەتیشیان لە مزگەوت بۆ دیاریکراوە.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ "لو ترکنا هذا الباب للنساء"**. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەو دەرگایەمان واز لێ بێنایە بۆ ئافرەتان".

---

[1] نفس المصدر ٧٢٢٧، صحیح، و أحکام الجنائز، ص ٢١٢.

[2] صحیح الجامع الصغیر وزیادته، ١٥٤، وریاض الصالحین، ١١٣٦.

[3] رواه البخاري رقم (٦٣١)، ومسلم رقم (٦٦٩)، ریاض الصالحین، ص٣٤٠، رقم ١٠٥٣.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: "كنَّ نساء المؤمنات يشهدن مع النبي ﷺ صلاة الفجر متلفعات بمروطهن ثم ينقلبن إلى بيوتهن حين يقضين الصلاة، لا يعرفهن أحد من الغلس".**[1] واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ئێمە ژنانی ئیماندار لەگەڵ پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئامادەی نوێژی بەیانی دەبووین، خۆیان بە سەرپۆشەکانیان دەپێچایەوە ئینجا دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان دوای تەواوکردنی نوێژ کەس نەی دەناسین لە تاریکی و ڕوونیدا.

## نوێژ لە قەرەباڵغیدا

نوێژ لە قەرەباڵغیدا خێری زۆرە، نوێژی بە کۆمەڵ خێری بیست و پێنج یان بیست و حەوت چەندانەی نوێژی بەتەنهایە.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفذ بسبعٍ وعشرين درجة"**[2]. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "نوێژی بەکۆمەڵ خێری زیاترە لە نوێژی تەنها بە بیست و حەوت پلە".

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "صلاة الرجل في جماعة تُضَعَّفُ على صلاته في بيته وفي سوقه خمساً وعشرين ضعفاً".**[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "نوێژی پیاو بە کۆمەڵ خێری زیاترە بەسەر نوێژی ماڵەوە و بازاڕدا بە بیست و پێنج جار".

**عن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: "من صلى العشاء في جماعة، فكأنما قام نصف الليل ومن صلى الصبح في جماعة فكأنما صلى الليل كله".**[4] واتە: لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)

---

[1] صحيح أخرجه البخاري، ٥٥٣، ومسلم، ٢٣٠، صحيح فقه السنة ج١ ص٢٤٩.

[2] متفق عليه، البخاري رقم ٦١٩، مسلم رقم ٦٥٠، واللفظ له، ورياض الصالحين، ١٠٦٤.

[3] متفق عليه، البخاري رقم ٦٢٠، ومسلم رقم ٦٤٩، واللفظ للبخاري. رياض الصالحين، ١٠٦٥.

[4] رواه مسلم ٦٥٦، والترمذي ٢٢١، ورياض الصالحين ١٠٧١.

فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: "هەرکەس نوێژی خەوتنان بە کۆمەڵ (جەماعەت) بکات، هەروەکو ئەو شەوە نیوەی شەونوێژی کردبێت، هەر کەسێکیش نوێژی خەوتنان و بەیانی بە کۆمەڵ کردبێت وەکو هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێت وایە.

## نوێژ لە چۆڵەوانیدا

نوێژ لە چۆڵەوانیدا بە شێوەیەك بە پەنهانی بێت یان لە چاوی خەڵكی نادیاربێت و تەنها خودا ئاگاداری بێت بۆن و رەنگی هیچ روپامایی و ریابازییەکی لێ نەیەت پاداشتی زۆرتر و چەند بەرامبەرە.

**عن صهيب (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "صلاة الرجل تطوعاً حيث لا يراه الناس تعدل صلاته على أعين الناس خمساً وعشرين".**[١] واتە: لە سوهەیبەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "نوێژی سوننەتی (خۆبەخشی) کەسێك بە جۆرێك کەس نەیبینێت بەرامبەر نوێژی لەبەرچاوی خەڵكی بیست و پێنج چەندانەیە".

هەروەها دەربارەی خێری زیاتری نوێژی پەنهانی و بە تەنها پێغەمبەرمان (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"صلاة الرجل في جماعة تزيد على صلاته وحده خمساً وعشرين درجة، فإذا صلاّها بأرض فلاة، فأتمّ وضوءها وركوعها وسجودها بلغت صلاته خمسين درجة".**[٢] واتە: "نوێژی پیاوێك (کەسێك) بە کۆمەڵ خێری زیاترە لە نوێژە تەنهاییەکەی بە بیست و پێنج پلە، خۆ ئەگەر نوێژەکەی لە چۆڵەوانیدا کرد بە دەستنوێژو کڕنوش و سوژدەی تەواوەوە خێری نوێژەکەی دەگاتە پەنجا پلە.

**عن رجل قال: قال رسول الله ﷺ "تطوع الرجل في بيته يزيد على تطوعه عند الناس، كفضل صلاة الرجل في جماعة على صلاته وحده".**[٣] واتە: لە پیاوێکەوە گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی:

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ج٢، ص٧١١، رقم ٣٨٢١.

[2] نفس المصدر، ج٢، ص٧١١، رقم ٣٨٢٤.

[3] صحيح، صحيح الجامع الصغير وزيادته ن ٢٩٥٣، صحيح الترغيب، ٤٤١.

"نوێژی سوننەتی کەسێك لە ماڵەوە خێری زیاترە لە نوێژی سوننەتی لە لای خەڵکی، وەکو خێری نوێژی کەسێك بە کۆمەڵ بەسەر نوێژەکەیدا بەتەنها".

## نوێژ لە کاتی ترس و جەنگدا

نوێژ یەکەم پایەو یەکەم ئەرکی شەرعییە کە لە جەنگ و جیهادو رووبەڕووبوونەوەی دوژمن و شەڕی دەستەویەخەشدا مۆڵەتی نەکردنی نییە، هەر بۆیەش لە شەرعی پیرۆزی ئیسلامدا چارەسەرو بەرچاوڕۆشنی کراوە بۆ نوێژکردن لەو حاڵەتەداو بەرنامەیان بۆ داڕژاوەو ناوی لێنراوە (نوێژی ترس) کە بە چەندەها شێوە دروستە کردنی و پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) خۆشی چەندەها جار لە غەزا و جەنگەکانیدا ئەنجامی داوە.

خودا دەفەرموێت: **"حَافظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانتِينَ * فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أو رُكْبَاناً"**.[1] واتە: "پارێزگاریی لە نوێژەکان بکەن بە تایبەتیش نوێژی ناوەڕاست (عصر) بۆ خودا گەردنکەچ بوەستن ئەگەر ترس هەبوو بە پیادە یان بەسواری هەر نوێژەکان بکەن".

زۆربەی زانایان بێجگە لە (ابي يوسف)ی قوتابی (ابي حنيفه) دەفەرموون دروستەو ڕێگەپێدراوە هەتا رۆژی دوایی، راستە ئایەتەکان روویان لە پێغەمبەرە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، بەڵام لەگەڵ هەموو ئوممەتیانەو هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر تایبەت کردنیان بە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ).

خوا دەفەرموێت: **"وَإذا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ"**.[2] واتە: ئەگەر تۆ لەگەڵیان لە سەفەردا بووی و خۆت نوێژت بۆ دابەستن با هەندێکیان بە چەکەوە نوێژ لە دوای تۆوە دابەستنو با چەکەکانیان هەڵگرن.

پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"صلّوا كما رأيتموني أصلي"**.[1] واتە: "نوێژ بکەن وەکو من دەبینن نوێژ دەکەم".

---

[1] البقرة / ٢٣٨_٢٣٩.

[2] النساء / ١٠٢.

هاوڕێیانی پێغەمبەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) بە یەکدەنگی ئەم نوێژەیان کردووە کەس لاریی لێی نەبووە.

پێشەوا (عەلی) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە جەنگی (صفين)دا ئەم نوێژەی کردووە.[2]

ئەبو موسای ئەشعەریش لە ئەسفەهان نوێژی ترسی کردووە. هەروەها حوزەیفەی یەمانی ئەم نوێژەی کردووە لە تەبەرستان، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسیشی لەگەڵ بووە.[3]

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) خەباتگێڕانی کردووە بە دوو بەش، بەشی یەکەم یەك ڕکاتیان لەگەڵ پێغەمبەر کردووە، ئینجا خۆیان ڕکاتەکەی تریان کردووەو ڕۆیشتوون بۆ حەرەسیات و بەشەکەی تر هاتوون ڕکاتی یەکەمیان لەگەڵ ڕکاتی دووهەمی پێغەمبەر کردووەو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) سەلامی داوەتەوەو ئینجا ئەوان خۆیان ڕکاتەکەی تریان تەواو کردووە.[4]

بە زۆر شێوەی تریش پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئەم نوێژەی کردووە.

ئەگەر دوژمن لە ڕووی ڕووگە (قبلە)وە بوو بێت بە جۆرێك کراوە و ئەگەر دوژمن لە ڕووی ترەوە بوو بێت بەشێوەی تر کراوە، فەرمودەی زۆریش هەیە لەبارەی چۆنیەتی کردنی نوێژی ترسەوە.[5]

هەندێ لە پێشین و زانایانی تریش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ڕایان وایە کە نوێژی ترس یەك ڕکاتە بە بەڵگەی: **حديث إبن عباس (رضي الله عنه) قال: "فرض الله جلّ وعلا الصلاة على لسان نبيكم ﷺ في الحضر أربعاً وفي السفر ركعتين وفي الخوف ركعة".**[6]

---

[1] صحيح رواه البخاري رقم (٦٠٥).

[2] صحيح فقه السنة، ج١، ص٤٩٨.

[3] صحيح فقه السنة، ج١، ص٤٩٨.

[4] حسن أخرجه أبو داود ١٢٤١، والنسائي ٢/١٣٧، صحيح فقه السنة، ج١، ص٥٠١.

[5] وەکو: "صلاة رسول الله (ﷺ) بذي القرد" صحيح أخرجه النسائي، ٣ / ١٦٩. وإبن حبان، ٢٨٧١، وأحمد ١ / ٢٣٢، بدون (لم يقضوا). وحديث حسن أخرجه أبو داود، ١٢٤١، وحديث رقم ١٢٤٦.

[6] صحيح أخرجه مسلم ٦٨٧، وأبو داود ١٢٤٧، وأحمد ١ / ٢٣٧، وصحيح فقه السنة، ج١، ص٥٠٠.

له کتێبی (مغني المحتاج)دا هاتووه که نوێژی ترس به شانزه شێوه دهکرێت.[1]

پێشهوا ئهبوبهکر ئیبن ئهلعهرهبی (رهحمهتی خوای لێ بێت) باسی کردووه که چهسپاوه پێغهمبهر (سهڵاتو سهلامی خوای لێ بێ) نوێژی ترسی چهندهها جار کردووه به شێوازی جیاواز ههتا گهیشتۆته بیست و چوار شێواز، که شانزهیان چهسپاون و زانراون.[2]

پێغهمبهری خوا (سهڵاتو سهلامی خوای لێ بێ) لهگهڵ هاوڕێکانیدا نوێژی نیوهڕۆی به کۆمهڵ کرد له گهرمهی جهنگو کوشتاردا لهگهڵ هۆزی جوههینه، که شهڕێکی زۆر گهرمو بههێزیان دهکرد.

جابر (رهزای خوای لێ بێت) دهربارهی جهنگی پێغهمبهرو هاوهڵهکانی لهگهڵ هۆزی جوههینهدا دهفهرموێت: شهڕێکی گهرمیان لهگهڵ کردین، کاتێ نوێژی نیوهڕۆمان کرد بتپهرستهکان وتیان ئهگهر دهستێکی باشمان لێ بوهشاندنایه باش بوو، جیبریل ئهم ههواڵهی دایه پێغهمبهر (سهڵاتو سهلامی خوای لێ بێ)، ئهویش بۆ ئێمهی باس کرد، جابر دهفهرموێت: (بتپهرستهکان) وتیان ئهوان نوێژێکیان له پێشهوهیه که له منداڵهکانیان خۆشهویستتره به لایانهوه، کاتێ عهسر هات، پێغهمبهر (سهڵاتو سهلامی خوای لێ بێ) کردینییه دوو ریز بتپهرستهکان له نێوان ئێمهو رووگهدا بوون، پێغهمبهر (سهڵاتو سهلامی خوای لێ بێ) نوێژی دابهست، ئێمهش لهگهڵیدا نوێژمان دابهست، کڕنوشی برد ئێمهش کڕنوشمان برد، سوژدهی برد بهس ریزی یهکهم لهگهڵیدا سوژدهیان برد، ریزی یهکهم چونه پێشهوه له جێی ریزی یهکهم وهستان، پێغهمبهر (سهڵاتو سهلامی خوای لێ بێ) "الله أکبر"ی کرد بۆ رکاتی دووهم ههموو "الله أکبر"مان کرد لهگهڵیدا کڕنوشمان برد، ئینجا ریزی یهکهم سوژدهی لهگهڵ برد و ریزی دووههم به پێوه بوو کاتێك ریزی دووههم سوژدهی برد ههموومان بهیهکهوه دانیشتین بۆ تهحیات و لهگهڵ پێغهمبهردا سهلاممان دایهوه.[3]

---

[1] مغني المحتاج، ج١، ص٤٠٩.

[2] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٥٧.

[3] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٥٦.

## نوێژ له كاتی دەستەویەخەبوون لەگەڵ دوژمن دا

ئەگەر جەنگ گەرم بوو یان موجاهیدان لەگەڵ دووژمندا دەستەویەخەبوونو ترس زۆر بوو نەیانتوانی بە کۆمەڵ نوێژ بکەن بە نۆرەو بەسەرە دەچن نوێژەکەیان دەکەن، ئەگەر بەو شێوەیەش نەتوانرا هەرکەس نوێژی خۆی دەکات چۆن بۆی گونجا بە پێوە، بە دانیشتنەوەو بە سواری و ئەگەر نەیانتوانی کڕنوش و سوژدەبەرن بە هێما ئەنجامیان ئەدەن، بەڵام بۆ سوژدە زیاتر هێما دەکات بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: **"فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أو رُكْبَاناً"**. **(البقرة/ ٢٣٩)**. واتە ئەگەر ترستان هەبوو بە پیادە یان بەسواری نوێژەکان هەر بکەن.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) قال: "فإن كان الخوف أشدّ من ذلك صلوا رجالاً قياماً على أقدامهم، أو ركباناً مستقبلي القبلة أو غير مستقبليها "**[١] **زاد البخاري: قال نافع: لا أرى عبدالله بن عمر قال ذلك إلاّ عن رسول الله ﷺ**. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی ئەگەر ترس لەوەش زیاتر بوو نوێژ بکەن بە پیادەو بە پێوە، لەسەر لاقەکانتان، یان بە سواری بەرەو روگە یان رووشتان لە رووگە نەبێت، بوخاری ئەمەشی بۆ زیاد کردووە (نافع فەرموویەتی بڕوا ناکەم عەبدوڵڵای کوڕی عومەر شتی وا لە خۆوە بفەرموێت لە پێغەمبەرەوە نەبێت. لەو حاڵەتانەشدا ناتوانن کڕنوش و سوژدەبەرن هەر بە هێما ئەنجامیان ئەدەنو نوێژەکەش ناگێڕنەوە.[٢]

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە نوێژی ترس لە ماڵەوەش دەکرێت ئەگەر ترسەکە زۆر بوو لە کافری ستەمکار یان لە موسڵمانی دەستدرێژکەر یان دڕندە یان لافاو یان ئاگر یان شتی تر.[٣] بەڵام زانایان جیاوازیی رایان هەیە ئاخۆ چوار رکات بکات وەکو ماڵەوە یان یەك رکات یان دوو رکات، وەکو نوێژی ترس لە جەنگدا.

---

[1] صحيح أخرجه البخاري، ٤٥٣٥، وإبن ماجه، ١٢٥٨، ومالك ٤٤٢.

[2] مغني المحتاج، ج١، ص٤١٣.

[3] لەسەر ئەم رایەن پێشەوایان مالك و أبو حنيفة, رای بەناوبانگی پێشەوایان شافعی و أحمد رەحمەتی خودا لە هەموویان، ج١، ص٥٠٣، صحيح فقه السنة.

## نوێژ لە وشکایی و دەشت و چیا

لە وشکایی و دەشت و چۆڵ و چیادا نوێژ فەرزە، بەڵکو خێریشی زیاترە لە نوێژی بەرچاو و قەرەباڵغی.

**قال رسول الله ﷺ "صلاة الرجل في جماعة تزيد على صلاته وحده خمساً وعشرين درجة، فإذا صلاّها بأرض فلاة، فأتمّ وضوءها وركوعها وسجودها بلغت صلاته خمسين درجة"**.[1] واتە: "نوێژی پیاوێك (کەسێك) بە کۆمەڵ خێری زیاترە لە نوێژە تەنهاییەکەی بە بیست و پێنج پلە، خۆ ئەگەر نوێژەکەی لە چۆڵەوانیدا کرد بە دەستنوێژ و کڕنوش و سوژدەی تەواوەوە خێری نوێژەکەی دەگاتە پەنجا پلە".

**وعن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "يعجب ربكم من راعي الغنم في رأس شظية بجبل يؤذّن بالصلاة ويصلي فيقول الله عزّ وجلّ: أنظروا إلى عبدي هذا يؤذن ويقيم الصلاة يخاف مني، قد غفرت لعبدي وأدخلته الجنة"**. واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەی فەرموو: "پەروەردگارتان خۆشی دێت لە شوانی مێگەلێك لەسەر لوتکەی چیایەك بانگ دەفەرموێت و نوێژەکەی دەکات، خودا دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەی من بکەن بانگ دەفەرموێت و بە چاکی و ڕێکوپێکی نوێژەکەی دەکات لە من دەترسێت، بەڕاستیی لەو بەندەیەم خۆش بووم و دەیخەمە بەهەشتەوە.

## نوێژ لە ناو ئاو و دەریاکاندا

کاتێك ئادەمیزاد سواری پشتی دەریا دەبێت ماوەیەکی زۆر لە ناو کەشتی و پاپۆڕدا دەمێنێتەوە دەبێت نوێژەکانیان بکەن بە هەر جۆرێك بۆیان دەلوێ، دەبێ بە ئاوی سوێری دەریا دەستنوێژ بگرن و نوێژەکانیان ئەنجام بدەن، بەسەر بردنی ژیان بۆ ماوەیەك لە ناو دەریادا نابێتە بیانووی نوێژ نەکردن.

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ج٢، ص٧١٣، رقم ٣٨٢٤. وحديث رقم ٣٨٧١.

**سئل النبي ﷺ عن الصلاة في السفينة؟ فقال: "صلِّ فيها قائماً، إلاّ أن تخاف الغرق".**[1] واته: پرسیار له پێغەمبەر کرا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی نوێژی ناو پاپۆڕ و کەشتی؟ فەرمووی: "به پێوه نوێژی تیادا بکه مەگەر له نقوم بوون بترسی".

## نوێژ له هەواو بۆشایی ئاسماندا

ئەوانەی له فڕۆکەو ڕۆکێت و مانگی دەستکردو هەر شتێکی تردا له بۆشایی ئاسمان و هەوادا بمێننەوه پێویسته له کاتی دیاریکراودا نوێژەکانیان ئەنجام بدەن به جیا بێت یان به کۆکراوەیی و کورتکراوەیی بێت، تەنانەت ئەگەر به هۆی زانیارییەوه ئادەمیزاد چووه سەر هەسارەکان و یان لەسەر ڕووبەری مانگ دابەزی دەبێ نوێژەکانی ئەنجام بدات، ئەوەش یەکێکه له نهێنییەکانی فەرز بوونی نوێژ له ئاسمان.

باسمان کرد له فەرموودەی ڕاستدا هاتووه که فریشتەکان له ئاسمان نوێژ دەکەن و سەریان له سوژدەدایه به پێوەنو له کڕنوشدان.

هەروەها له باسی (بیت المعمور)دا هاتووه که ڕۆژیی حەفتا هەزار فریشته دەچنه ناو ئەو کۆشکه ناوازەوه که مزگەوتی فریشتەکانەو هەر ئەو جارەش بەریان دەکەوێت نایەنەوه دەرەوه، بۆ ڕۆژی دوایی حەفتا هەزاری تر دەچنه ناوی.

---

[1] أخرجه البزار ٦٨، وغيره، و صفة صلاة النبي (ﷺ) ص٧٩، وصححه، وصحيح فقه السنة ج١، ص٣١٧.

# نوێژ مۆڵەتی نەکردنی نییە بۆ کەس

له دوای باوەڕهێنانی مرۆڤ و هاتنه ناو بازنەی ئیسلام و رازی بوون به خوایەتی خواو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو پێشڕەوایەتی ئیسلام، بۆ هەموو ئەرك و فەرمانێکی مۆڵەت و پشودان هەیە، تەنها نوێژ نەبێت که نەکردنی نییە مۆڵەتی نەکردن له هیچ شوێن و کاتێکداو بۆ هیچ کەسێك نییە، نه له شار و نه لادێ، نه پیر و نه گەنج، نه ساغ و نەخۆش ـ ژن و پیاو، نیشتەجێ و ڕێبوار، دەوڵەمەندو هەژار، شەل و کوێر، خوێندەوارو نەخوێندەوار، به پێوە، به راکشان، لەسەر لا، لەسەر شان، به دڵ، به زمان، به ئاو، به گڵ، به دەم، له ناو ئاو، له ئاسمان، له وشکایی، له بناری دۆڵ و چیاکان، له چۆڵەوانی، له بیابان، به هێمای چاوان.

تەنهاو تەنها مەرجی فەرزبوونی نوێژ لەسەر هەر یەکێك پێگەیشتن و ژیرییه "البلوغ و العقل"، هەرکەس ئەم دوو مەرجەی تیادا هاتەجێ نوێژی لەسەر فەرزه لەهەر شوێنێك و له هەر کات و زەمانێکدا بێت.

## نوێژکردن به پێوه

ئەرکێکی شەرعییه دەبێ نوێژ بەپێوه بکرێت و دروست نییه کردنی نوێژی فەرز به دانیشتنانەوه مەگەر بۆ کەسانێك نەتوانن بەپێوه بوەستن لەبەر بیانویەکی شەرعی وەکو نەخۆشی و دەردەداری و ترسی زۆر و هەر گرفتێکی تر که راوەستان به پێوه له تواناییدا نەبێت یان به راوەستان زەرەرو زیانێکی دینیی لاشەیی گەورەی تووش بێت.

ڕاوەستان له کاتی نوێژدا واته نوێژکردن به پێوه پایەی نوێژه، که به ئەنجام نەدانی نوێژەکه بەتاڵ دەبێتەوەو به سوژدەی سەهوش پڕ نابێتەوه، خوا دەفەرموێت: **"وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ"**. (البقرة/ ٢٣٨). واته: بۆ خودا به گەردنکەچی بووەستن.

**وقال النبي ﷺ لعمران بن حصين (رضي الله عنه): "صلّ قائماً فان لم تستطع فقاعداً فان لم تستطع فعلى جنب"**[1]. واته پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ

---

[1] صحيح أخرجه البخاري، ١١١٧، وأبو داود ٩٣٩، والترمذي ٣٦٩.

بێ) فەرمووی بە عیمرانی کوڕی حصین (ڕەزای خوای لێ بێت: "بە پێوە نوێژ بکە ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەتتوانی لەسەر تەنیشت"، تەنانەت کەسێك هەر نەتوانێ دانیشێ دەبێ بە پێوە نوێژەکەی بکات. واتە: دەیتوانی راوەستێ، بەلاّم نەیدەتوانی دانیشێ.

**عن أم قيس بنت محصن: أن رسول الله ﷺ لما أسن وحمل اللحم اتخذ عموداً في مصلاه يعتمد عليه".**[1] واتە: لە ئوم قەیس کچی محصنەوە پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ) کاتێ چووە تەمەنەوە و گۆشتی گرت کۆڵەکەیەکی لە سوژدەگاکەیدا دانابوو خۆی سەر ئەدا.

**عن عيمران بن حصين (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى قائماً فهو أفضل".**[2] واتە لە عیمرانی کوڕی حصینەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێ پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس بەپێوە نوێژ بکات باشترە".

**وعنه أيضاً (رضي الله عنه: قال رسول الله ﷺ: "صلاة الرجل قائماً أفضل من صلاته قاعداً، وصلاته قاعداً على النصف من صلاته قائماً، وصلاته نائماً على النصف من صلاته قاعداً".**[3] واتە: هەر لە عیمرانی کوڕی حصینەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی نوێژی پیاوێك بە پێوە باشترە لە نوێژەکەی بە دانیشتنەوە، نوێژەکەی بە دانیشتنەوە نیوەی خێری نوێژی بە پێوەی هەیە، نوێژەکەی بە راکشانەوە نیوەی خێری نوێژی دانیشتنی هەیە". وقال: **"صلاة القاعد نصف صلاة القائم"**[4]. واتە هەروەها دەفەرموێت: "نوێژ بە دانیشتنەوە نیوەی خێری نوێژی بە پێوەی هەیە". پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەو شەوەی تیایدا مرد بە پێوە نوێژی کرد.[5]

---

[1] أخرجه أبو داود، ٩٤٨، وصححه الألباني صحيح فقه السنة ج١، ص٣١٧.

[2] صحيح، صحيح الجامع، ٦٣٦٣.

[3] صحيح، صحيح الجامع الصغير رقم ٣٨٢٥.

[4] صحيح، صحيح الجامع الصغير، رقم ٣٨٢٨.

[5] موسوعة الأخلاق الإسلامية، ج١، ص٢٣٢.

## نوێژکردن بە دانیشتنەوە

بۆ هەرکەسێك نەتوانێ بە پێوە نوێژ بکات، شەرع مۆڵەتی ئەدات بە دانیشتنەوە نوێژەکەی بکات، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە (أُحد)دا بە دانیشتنەوە پێشنوێژی بۆ کردن لەبەر ئەو هەموو خوێنەی لە لەشی ڕۆیشتبوو.[1]

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: "سقط النبي ﷺ عن فرس فجحش شقه الأيمن، فدخلنا عليه نعوده، فحضرت الصلاة، فصلى بنا قاعداً فصلينا وراءه قعوداً".**[2] واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ئەسپ کەوتە خوار لای ڕاستی ڕوشاو بریندار بوو، چوین بۆ سەردانی، کاتی نوێژ هات، بە دانیشتنەوە نوێژی بۆ کردین، ئێمەش لە دوایەوە بە دانیشتنەوە نوێژمان کرد.

هەروەها دەفەرموێت: **عن عمران بن حصين (رضي الله عنه) قال: سألت رسول الله ﷺ عن صلاة الرجل قاعداً، فقال ﷺ: إن صلى قائماً فهو أفضل، ومن صلى قاعداً فله نصف أجر القائم، ومن صلى نائماً فله نصف أجر القاعد.**[3] واتە: لە عیمرانی کوڕی حصینەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێت: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی نوێژی پیاو بە دانیشتنەوە فەرمووی (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئەگەر بە پێوە نوێژ بکات ئەوە باشترە، کەسێکیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکات نیوەی خێری دەگات، کەسێکیش بە ڕاکشانەوە نوێژ بکات نیوەی خێری دانیشتووی دەگات. ئەمەش بەڵگەیە، کە نوێژ بە دانیشتنەوە دروست نییە بۆ کەسێك بتوانێ بە پێوە بیکات، بە ڕاکشانەوە دروست نییە بۆ کەسێك بتوانێت بە دانیشتنەوە نوێژ بکات.

[1] السيرة النبوية للصلابي، ج٢، ص١١٨ / و ١١٠ ــ ١١١.

[2] صحيح أخرجه البخاري، ٣٧٨، ومسلم ٤١١، وصحيح فقه السنة ج١، ص٣٧٤.

[3] صحيح أخرجه البخاري ١١٥، والترمذي ٣٧١، والنسائي ٣/ ٢٢٣، وإبن ماجه ١٢٣١، صحيح فقه السنة، ج١، ص٣١٥.

**قال أنس (رضي الله عنه: "خرج رسول الله ﷺ على ناس وهم يصلون قعوداً (من مرض) فقال: إن صلاة القاعد على النصف من صلاة القائم".**[1] واته: ئەنەس (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) چووە دەرەوە بۆ لای خەڵكانێك بە دانیشتنەوە نوێژیان دەكرد (لەبەر نەخۆشی) فەرمووی نوێژی دانیشتوو بە نیوەی نوێژی كەسێكە بە پێوە بیكات.

خەتابیو هەندێ لە زانایان فەرموویانە مەبەست بە فەرموودەكەی عیمران نوێژی فەرزە، زۆربەی زانایانیش فەرموویانە بۆ سوننەتە، چونكە راوەستان لە نوێژی فەرزدا پایەی نوێژەو بەبێ راوەستان نوێژ دروست نییە مەگەر لەنا چاریدا، بەڵام لە نوێژی سوننەتدا رێگە دراوە بە دانیشتنەوە بكرێت، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەتی كردووە.

**عن عائشة (رضي الله عنها) "أن النبي ﷺ لمّا بدَّن وثقُل كان أكثر صلاته جالساً".**[2] واته: لە عائیشەوە (رەزای خوای لێ بێت) گێڕداوەتەوە كە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) كاتێ لاشەی پتەوو قورس بوو بەشی زۆری نوێژەكانی بە دانیشتنەوە بوو.

هەركەس بە دانیشتنەوە نوێژ بكات لەبەر بیانوویەكی شەرعی هیچ لە پاداشتی كەم نابێتەوە، هەروەها پێغەمبەری خوداش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) هیچ لە پاداشتی كەمتر نابێتەوە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەتی كردووە.

**قال رسول الله ﷺ: "من مرض أو سافر كتب له ماكان يعمل صحيحاً مقيماً".**[3] واته: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەركەس نەخۆش بێت یان سەفەری بێت ئەوەی بۆ دەنوسرێت كە بە لەش ساغی و نیشتەجێی كردوویەتی". بەڵام هەركەس بەبێ هیچ بیانوێكی شەرعی نوێژە سوننەتەكانی بە

---

[1] صحيح أخرجه إبن ماجه، ١٢٢٩، وأحمد رقم (١٣٢٥٩) ٣ / ٢١٤، وصفة صلاة النبي، ص٧٨، وصحيح فقه السنة، ج١، ص٣١٥.

[2] صحيح أخرجه مسلم ٧٣٢، وصحيح فقه السنة ج١، ص٣١٥.

[3] رواه البخاري، ٢٩٩٦.

دانیشتنەوە کرد لەو حاڵەتەدا نوێژەکەی دروستە، بەڵام نیوەی خێری و پاداشتی هەمان نوێژی هەیە ئەگەر بە پێوە بیکات.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قال رسول الله ﷺ: "صلاة الجالس على النصف من صلاة القائم".**[1] واتە لە عائشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "نوێژی کەسێك بە دانیشتنەوە نیوەی خێری نوێژی کەسێکی هەیە بە پێوە بیکات".

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: "كان لا يدع قيام الليل، وكان إذا مرض أو كسل صلى قاعداً".**[2] واتە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) وازی لە شەونوێژ نەدەهێنا، خۆ ئەگەر نەخۆش بووایە یان لەشی بێ هێز بووایە بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد.

## نوێژکردن بە ڕاکشانەوە

نوێژ، نەکردنی نییە و نابێ موسڵمان بیر لە نەکردنی بکاتەوە، هەر بۆیەش لە شەرعدا چارەسەر دانراوە بۆ کەسانێك کە نەتوانن بە پێوە نوێژ بکەن یا بە دانیشتنەوە بیکەن، ئەگەر بە دانیشتنەوە نەیانتوانی بە ڕاکشانەوە دەبێ نوێژەکەیان بکەن. نوێژ بە ڕاکشانەوە دروستە بۆ کەسێك بیانوێکی شەرعی هەبێت و نەتوانێ بە پێوەو نەتوانێ بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، جیاوازیش نییە لە نێوان فەرز و سوننەت. فەرموودەیەکی عیمران کوڕی حصین کە دەفەرموێت **"من صلى نائماً فله نصف أجر القاعد".**[3] واتە: هەرکەس بە ڕاکشانەوە نوێژ بکات نیوەی پاداشتی ڕاوەستاوی هەیە.

هەرکەس بە ڕاکشانەوە نوێژی کرد سوننەتە لەسەر لای ڕاست و ڕووی بکاتە ڕووگە هەر چۆن لە کاتی خەوتندا سوننەتە.

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٣٨١٦، وصفة الصلاة.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٤٨٤٩، وصحيح أبو داود، ١١٨٠.

[3] صحيح أخرجه البخاري، ١٠٦٥، والترمذي ٣٧١، والنسائي ١٣٦٢، وإبن ماجه، ١٢٣١، صحيح فقه السنة، ج١، ص٣١٥.

**عن عمران بن حصين (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى قائماً فهو أفضل، ومن صلى قاعداً فله نصف أجر القائم ومن صلى نائماً فله نصف أجر القاعد".**[1] واتە: لە عیمرانی کوڕی حصین (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس بە پێوە نوێژ بکات چاکترە، هەرکەسیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکات خێری نیوەی پاداشتی ئەو کەسەیە بە پێوە نوێژی کردووە، هەرکەسیش بە راکشانەوە نوێژ بکات خێری نیوەی خێری ئەو کەسەیە بە دانیشتنەوە نوێژی کردووە".

## نوێژکردن بە زمان

خوێندنی سوڕەتی فاتحە (فەرزە) بە دەربڕینی وشەکانی لە هەموو نوێژێکی فەرزو سوننەتدا لە نوێژە ئاشکراکاندا یان لە نهێنییەکاندا بێت، ئەمەش رای زانایانی پێشەوا: (سەوریو مالیكو شافعیو ئەحمەد لە رای بەناوبانگیدا) بەو شێوەیەش گێڕدراوەتەوە لە عومەری کوڕی خەتتابو عوسمانی کوڕی ئەبی العاصەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) بە بەڵگەی: **عن عبادة بن الصامت (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب".**[2] واتە: لە عبادەی کوڕی صامتەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "نوێژی دروست نییە هەر کەسێ سوڕەتی فاتیحەی تیادا نەخوێنێت".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "من صلى صلاة لم يقرأ فيها بفاتحة الكتاب فهي خداج، هي خداج، هي خداج، غير تمام".**[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس نوێژێك بکات کە سوڕەتی فاتیحەی تیادا نەخوێنرابێت ئەوە

---

[1] صحيح، صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٦٣٦٣.

[2] صحيح أخرجه البخاري ٧٥٦، ومسلم ٣٩٤، وغيرهما، صحيح فقه السنة، ج١، ص٣١٩.

[3] صحيح أخرجه مسلم ٤١، وأبو داود ٨٢١، والنسائي٩٨١، والترمذي ٣١٢، وإبن ماجه ٨٣٨، وصحيح فقه السنة، ج١، ص٣١٩.

ناتەواوە، ئەوە ناتەواوە، ئەوە ناتەواوە، تەواو نییە"، هەر نوێژێکیش ناتەواو بێت لە لای خوا وەرناگیرێت، چونکە هەر بەناو نوێژە.

ئەگەر کەسێکیش هیچ قورئان نەزانێ بە هۆی تازە موسڵمان بوونییەوە یان بە هۆی فێر نەبوون و نەشارەزایی و گرانی فێربوونی زمانی قورئان، ئەوە ئەگەر غەیری سورەتی فاتیحەی لەبەر بوو دەیخوێنێت هەتا فێر دەبێت، ئەگەر هەر قورئانی نەدەزانی ئەوکاتە **"سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلاّ بالله "**.[1] ئەم دەقە دەخوێنێ کە یادی خودایە.

## نوێژکردن بە دڵ

هەرکەس نوێژی بە زمان بۆ نەکرا و بە دەم وشە و رستەکانی نوێژی بۆ دەرنەدەبڕا دەبێ بە دڵ نوێژەکەی هەر بکات و بەو بیانوانەوە نابێ واز لە نوێژ بێنێت، بەڵکو دەبێ بە دڵ بیر لە وشەو رستەکان بکاتەوە و هەرچیشی بۆ ئەنجام نەدرا بە هێما ئەنجامی ئەدات.

ئەم نوێژکردنەش واتە بە دڵ بۆ ئەم حاڵەتانەیە:

**یەکەم:** بۆ کەسێك نەخۆش بێت یان دەم و زمان و گەروو و ئەو ئەندامانەی کاری نەشتەرگەریان بۆ کرابێت و نەتوانێ قسە بکات.

**دووەم:** بۆ کەسی کەڕولاڵ کە نەتوانێ وشەو رستەکان دەربڕێت و عەقڵی بە نوێژ بشکێ و ئەو شتانەی پەیوەندییان بە نوێژ و دەستنوێژەوە هەیە بئاوزێ.

**سێیەم:** نوێژ بۆ کەسێك زۆر نەخۆش بێت و نزیکی سەرەمەرگ بێت، بەڵام بە دڵ ئاگای لە خۆی بێت، دەبێ بەدڵ نوێژەکان بکات با روشی لە رووگە نەبێت.

[1] أخرجه أبو داود، ٨٣٢، وغيره، وحسنه الألباني، الإرواء ٣٠٣.

# نوێژکردن بە سواری

## نوێژ بە سواری وولاخ

هەرکەس گوێبیستی ئایەتی سوژدە بێت و بیەوێت سوژدەبەرێت، دەشێ سوژدە بەهێما بەرێت بەسەر ولاخەکەیەوە.

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی سوژدە بردن بەسەر ولاخەوە؟ فەرمووی (**اسجد وأوْمِ**)[1] واتە: سوژدەبەرە بە هێما کردن. هەروەها کڕنوش بردن لەسەر ولاخ لە کۆمەڵێك لە پێشینی ئوممەت بە ڕاست و دروستی گێڕدراوەتەوە لە هاوەڵانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) و غەیری ئەوانیش.

**عن عبدالله بن عامر (رضي الله عنه) أنّ أباه أخبره "أنه رأى النبي ﷺ صلى السبحة بالليل من السفر على ظهر راحلته حيث توجهت به".**[2] واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عامرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) باوکی هەواڵی داوەتێ کە: "پێغەمبەری (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بینیوە نوێژی سوننەتی کردووە بە شەو لە سەفەرو گەشتوگوزار لەسەر پشتی ولاخەکەی ڕووی پێ لە هەر کوێ کردبێت". نوێژکردن بە سواری سەیارە و بە سواری تەیارە و پاپۆڕ و هەر ئامێرێکی تر هەمان حوکمی سواری ولاخی هەیە.

**عن جابر (رضي الله عنه) قال: "كان النبي ﷺ يصلي على راحلته حيثما توجهت به، فإذا أراد أن يصلي المكتوبة نزل فاستقبل القبلة".**[3] واتە لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت: "پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بەسەر ولاخەکەیەوە نوێژی دەکرد ڕووی بۆ هەر لایەك بووایە، بەڵام ئەگەر بیویستایە نوێژی فەرز بکات دادەبەزی و ڕووی لە ڕووگە دەکرد".

---

[1] رواه إبن أبي شيبة، ٤٢١٠، بسند صحيح، صحيح فقه السنة، ج١، ص٤٥٠.

[2] صحيح أخرجه البخاري، ١١٠٤، ومسلم ٦٨٩، بنحوه، وصحيح فقه السنة ج١، ص٤٩١

[3] صحيح، صحيح الجامع الصغير وزيادته، رقم ٤٩٦٥.

دەربارەی نوێژ بە سواری کەشتی و پاپۆڕو بەلەم و هەموو ئامێرێکی سواری لە ناو ئاودا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"صل قائما ً إلاّ أن تخاف الغرق"**.[1] واتە: "بە پێوە نوێژ بکە، مەگەر لە نقوم بوون بترسی". لە سەفەردا گەشتیار دەتوانێ نوێژی سوننەت بکات بە سواری سەیارە، فڕۆکە، کەشتی و وێنەیان بە سواری و واجب نییە روو بکاتە رووگە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خوایان لێ بێت) بەسەر وڵاخەکەیەوە نوێژی دەکرد بە شەو لە سەفەردا و گوێشی نەئەدایە رووی بەرەو کوێیەو دەیفەرموو: **"كان رسول الله ﷺ يسبح (يعني يصلي) على الراحلة قبل أي وجه توجه، ويوتر عليها غير أنه لا يصلي عليها المكتوبة"**.[2] واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نوێژی دەکرد بەسەر وڵاخەوە رووی لەهەر کوێ بووبێ، نوێژی تاك (وتر)یشی لەسەر دەکرد ئەوەندە هەبوو نوێژی فەرزی لەسەر نەدەکرد.

**وعن عامر بن ربيعة (رضي الله عنه) قال: "رأيت رسول الله ﷺ وهو على الراحلة يسبح يومئ برأسه قبل أي وجه توجه، ولم يكن رسول الله ﷺ يصنع ذلك في الصلاة المكتوبة"**.[3] واتە: لە عامر کوڕی رەبیعەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "پێغەمبەری خوام بینی (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بەسواری وڵاخەوە نوێژی دەکرد بەسەر هێمای دەکرد بەرەو هەر لایەك بووایە، بەڵام لە نوێژی فەرزدا وای نەدەکرد". خوای گەورەش دەفەرموێ: **"فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ"**.[4]

**"كان يركع ويسجد على راحلته إيماءً برأسه ويجعل السجود أخفض من الركوع"**.[5] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کڕنوش و سوژدەی بەسەر وڵاخەکەیەوە بە هێما دەبرد، سوژدەکەی هەندێ نزمتر دەکرد لە کڕنوشەکەی.

---

[1] صحيح، صحيح الجامع الصغير وزيادته، رقم ٣٧٧٧.

[2] صحيح رواه البخاري، ١٠٩٨، ومسلم، ٧٠٠، وصحيح فقه السنة ج ١، ص٣٠٧.

[3] رواه البخاري، ١٠٩٧. صحيح فقه السنة ج١، ص٣٠٥.

[4] البقرة / ١١٥.

[5] واه أحمد رقم ١١٧١٩، والترمذي وصححه. وصفة صلاة النبي، ص٥٠، الطبعة ١٤.

## نوێژکردن بە دەستنوێژگرتن بە ئاو

نوێژ فەرزەو بەبێ دەستنوێژیش دروست نییە، کەواتە دەستنوێژ فەرزە هەر دەبێ بە ئاوی روت و رەهاش بێت و نابێ ئەو ئاوە هیچ ناوێکی تری هەڵگرتبێت وەکو گوڵاو یان ماستاوو هەر شتێکی تری لەو جۆرە.

خوا دەفەرمویێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُواْ إذا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاة فاغْسلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيِنْ.."**.[١] واتە: "ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەر کات هەستان بۆ نوێژکردن روخسارتان و دەستەکانتان لەگەڵ ئانیشکەکان بشۆرن و دەستی تەڕ بە سەرتاندا بێنن و قاچەکانتان لەگەڵ گۆزنگەپێکان بشۆرن..." .

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "لا تقبل صلاة أحدكم إذا أحدث حتى يتوضأ"**.[٢] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی "نوێژی یەکێك کە بێدەستنوێژ بێت وەرناگیرێت هەتا دەستنوێژ نەگرێت" .

**عن إبن عباس (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله ﷺ: "انما أمرت بالوضوء إذا قمت الى الصلاة"**.[٣] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خوایان لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی "بێگومان فەرمانم پێ کراوە بەدەستنوێژگرتن هەر کات هەستام بۆ نوێژ" .

## نوێژکردن بە "تەیەمموم"

هەرکات موسڵمانێك ویستی دەستنوێژ بگرێت و ئاوی دەست نەکەوت نابێ واز بێنێ و نوێژەکەی نەکات، بەڵکو لە جێی ئاو خۆڵ و تۆزی گڵێکی پاك بەکاردێنێ، خوا دەفەرموێ: **فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً"**.[٤] واتە: ئەگەر ئاوتان دەست

---

[1] المائدة / ٦.

[2] صحيح أخرجه البخاري، ١٣٥، ومسلم ٢٢٥، وغيرهما.

[3] صحيح أخرجه الترمذي، ١٨٤٨، وأبو داود، ٣٧٦٠، والنسائي، ١ / ٧٣، وصحيح الجامع ٢٣٣٣.

[4] المائدة / ٦، والنساء / ٤٣.

نەکەوت با گڵێکی پاك بەکار بێنن. ئەو کاتە تۆزی گڵ بەکار دێنێت تەنها بۆ روخساری و هەردوو دەستەکەکانی. تەنانەت ئەگەر بۆ خۆ شتنیش ئاوی دەست نەکەوت دەشێ تۆزی گڵ بەکار بێنێ، وەکو لە فەرموودەکەی عیمرانی کوڕی حصیندا (رەزای خوای لێ بێت) هاتووە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بە پیاوێکی فەرمووە کە تووشی لەشگرانی هاتبوو **"عليك بالصعيد فانّه يكفيك"**.[1] واتە: گڵ بەکار بێنە هەر ئەوەت بەسە.

## نوێژی خەوتوو لە یادچوو

مرۆڤی موسڵمان بە خەوتن یان لەیادچوون و لەبیرچونەوە نوێژی لە کۆڵ نابێتەوە و لەسەری لا ناچێت، بەڵکو خەوتوو هەرکات بەخەبەر هات نوێژەکەی دەکات، لەبیرچوش هەر کات وەبیری هاتەوە دەستبەجێ نوێژەکەی دەکات بەبێ دواخستن.

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "من نسي صلاة فليصليها إذا ذكرها، لا كفارة لها الاّ ذاك"**.[2]واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس بیری چوو نوێژێك بکات هەر کات بیری هاتەوە یەکسەر بیکات و لەسەری لاناچێت بەوە نەبێت".

پێغەمبەر و هاوڕێکانی (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە سەفەرێکدا خەویان لێ کەوت بەیانی لە گەرمای خۆر بەخەبەرهاتن، کە خۆر هەڵاتبوو، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: **"ليس في نوم تفريط، انما التفريط على من لم يصلِّ الصلاة حتى يجيء وقت الصلاة الأخرى، فمن فعل ذلك فليصلها حين ينتبه لها فإذا كان من الغد فليصلها عن وقتها..."**.[3]واتە: لەخەو بەخەبەرنەهاتن کەمتەرخەمی نییە، بەڵکو کەمتەرخەمی لەسەر ئەو کەسەیە کە نوێژێك لە نوێژەکان ناکات هەتا کاتی نوێژەکەی تر دێت، هەرکەس وای لێهات با نوێژەکەی بکات،

---

[1] متفق عليه.

[2] صحيح أخرجه البخاري، ٥٧٢، ومسلم ٦٨٤، وصحيح فقه السنة ج١، ص٢٥٣.

[3] صحيح رواه مسلم ٦٨١.

هەركات بەخەبەر هات، ئەگەر كەوتە بەیانی هەمان نوێژی ڕۆژی دوایی لە كاتی خۆیدا بكات". واتە: فەوتاوەكە كاتی هەمان نوێژ تێك نادا لە ڕۆژی سبەینێ دا.

**عن أبي سعيد الخدي (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "من نام عن الوتر أو نسيه فليصل إذا أصبح أو ذكره".**[1] واتە: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەلاَتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەر كەس بۆ نوێژە وەترەكەی خەوی لێكەوت با كە بەیانی كردەوە یان بیری هاتەوە یەكسەر بیكات".

## نوێژكردن بە پێلاوەوە

پێغەمبەری خوا (سەلاَتو سەلامی خوای لێ بێ) بە پێلاوەوەو بەبێ پێلاو نوێژی كردووە، ئەمەش گرنگی نوێژ دەسەلمێنێت هەتا كەسانێك لە ئوممەتی نەلێن پێلاومان بە گران بۆ دادەكەنرێ یان لە كاتی ترس و بیم و ناڕەحەتی و ئیش و كارو كاروانچیەتی زۆر حاڵەتی تردا پێلاو داكەندن بكەنە بیانوی نوێژنەكردنیان، هەر بۆیە زانایان فەرموویانە هەركەس ویستی بە پێلاوەوە نوێژ بكات با سێ جار پێلاوەكەی لە زەوی بخشێنێ و نوێژی پێوە بكات.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: "كان يصلّي في نعله".** واتە: لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "پێغەمبەر (سەلاَتو سەلامی خوای لێ بێ) بە پێلاوەوە نوێژی دەكرد".

## نوێژی بریندار

زۆرێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (سەلاَتو سەلامی خوای لێ بێ) بە برینداری نوێژیان كردووە، جاری وا هەبوو خوێنیش بە جلەكانیانەوە بووە یان لە نوێژدا تیریان لێ دراوە و پێكراون و نوێژەكەشیان نەبڕیوە و نەشیان گێڕاوەتەوە، لە ڕاستترین وتەی

---

[1] صحيح أخرجه الترمذي، ٤٦٥، وأبو داود، ١٤٣١، وإبن ماجه، ١١٨٨، وأحمد ٤٤/٣، والإرواء، ١٥٣/٣، وصحيح فقه السنة ج١، ص٢٩٤، وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٥٩، وقال العراقي إسناده صحيح.

زاناکاندا خوێنبەربوون دەستنوێژ ناشکێنێ ئەمەش ڕێبازی شافعی و مالیکە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).[1]

لە فەرمودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵڵا لە جەنگی (**ذات الرقاع**)دا هاتووە کە کابرایەکی کۆچەری ڕاکشاو یاریدەدەرەکەش هەستاو دەستی کرد بە نوێژ، پیاوێك لە دوژمن ڕمێکی پێوە ناو پێکای، سێ تیری لێدا ئەوجا کڕنوش و سوژدەی بردو نوێژەکەی تەواو کردو هاوڕێکەی بەخەبەر هێنا، کابراش ڕێی کرد کاتێکیش کۆچەرییەکە خوێنەکەی پێوە بینی وتی: (سبحان الله) ئەوە بۆ یەکەم تیر خەبەرت نەکردمەوە؟ وتی لە سوڕەتێکدا بووم دەمخوێند حەزم نەکرد بیبڕم[2]، پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) پێی زانی و ئینکاریشی لێنەکرد. خۆ ئەگەر بە بەتاڵی بزانیایە ئاگاداری دەکردن و پێی دەفەرموون کە بەتاڵە.

پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك بریندار کرا بە برینەکەوە نوێژی کرد کە خوێنی لێ ئەتکا.[3] بەهەرحاڵ زاناکان ڕای جیاوازیان هەیە لەم بارەیەوە، ئێمە مەبەستمان ئەوەبوو کە برینداریی نابێتە بیانوو بۆ فەوتاندنی نوێژ.

بە هەواڵی بێگومانو بەڵگەنەویست گێڕدراوەتەوە کە خەباتگێڕان بریندار بوون و خوێنیش لە برینەکانیان دەڕژاو نوێژەکانیشیان دەکردو جلەکانیشیان خوێنی پێوە بووە، بۆیە شێخ حەسەنی بەسری (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "بەردەوام موسڵمان بە برینەکانیانەوە نوێژیان کردووە".[4] هەروەها هەر برینداریو نەخۆشییەك کە پزیشكو حەکیمەکان قەدەغەی بەکارهێنانی ئاوی لێ بکەن، لەو حاڵەتەدا بەکارنەهێنانی ئاو نابێتە هۆی فەوتاندنو زایەکردنی نوێژەکە، بەڵکو بە تەیەموم نوێژەکە دەکات ئەگەر بەکارهێنانی خۆڵو گڵیشی لە تواناDا نەبوو دەبێ نوێژەکە هەر بکات لە کاتی خۆیدا.

[1] صحيح فقه السنة، ج١، ص١٤١.

[2] صحيح فقه السنة، ج١، ص١٤١، وقال إسناده ضعيف، وصححه الألباني في صحيح أبي داود، ١٩٣، زانایان قسەی زۆریان لەسەر کردووە.

[3] صحيح فقه السنة، ج١، ص١٤١.

[4] صحيح فقه السنة، ج١، ص١٤١.

## نوێژی نەخۆش

نەخۆش هەر چۆن لە توانایدا بێت دەبێ نوێژەکەی بکات بە پێوە، بە دانیشتنەوە، بە راکشانەوە، بە دەم یان بەدڵ، لەسەر تەنیشت یان لەسەرپشت، ئەگەر نەتوانێ روەو روگە بیکات دەبێ هەر نوێژەکەی بکات و زایەی نەکاتو نەیفەوتێنێ.

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: "لقد رأيتنا وما يتخلف عن الصلاة الاّ منافق قد علم نفاقه أو مريض، ان كان المريض ليمشي بين رجلين حتى يأتي الصلاة"،وقال: "ان رسول الله ﷺ علمنا سنن الهدى، وان من سنن الهدى الصلاة في المسجد الذي يؤذن فيه".**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "بەڕاستیی خۆمانم لە بیردێ دووڕوو نەبووایە، لە نوێژ دوانەدەکەوت، ئەویش دەزانرا دووڕووە یان نەخۆش، هەتا ئەگەر نەخۆش بیتوانیایە لە نێوان دوو پیاودا بڕوات و بێتە نوێژ دەهات، فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فێری سوننەتی رێنومایی دەکردین لە سوننەتی رێنوماییش نوێژکردنە لە مزگەوتێکدا بانگی تێدا بدرێت". ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر پابەند بوون بە نوێژی جەماعەتو مزگەوتیشەوە، نەك هەر بە نوێژکردنەوە.

تەنانەت پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کاتێك نەخۆش کەوت نەیتوانی بێتە مزگەوت بۆ پێشنوێژی فەرمووی: **"مروا أبا بكر فليصل بالناس"**[2] واتە ئەبوبەکر راسپێرن پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات.

**وعن عائشة (رضي الله عنهما) "كان لا يدع قيام الليل وكان إذا مرض أو كسل صلى قاعداً".**[3] واتە: لە عائیشەوە (رەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) "شەونوێژی واز لێ نەدەهێنا هەرکاتیش نەخۆش بووایە یان بێ هێز بووایە بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد".

---

[1] صحيح أخرجه مسلم، ٦٥٤، وأبوداود، ٥٥٠، والنسائي، ١٠٨/٢، وإبن ماجه، ٧٧٧، صحيح فقه السنة، ج١، ص٥٠٦.

[2] صحيح أخرجه البخاري، ٦٦٤، ومسلم ٤١٨، و صحيح فقه السنة، ج١، ص٥١٣.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٤٨٤٩، وصحيح أبي داود، ١١٨٠.

له عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: "پیاوی وا هەبوو دوو کەس دەچوونە بن باڵی هەتا لە ریزی نوێژدا رایان دەوەستاند".[1]

هەروەها گێڕدراوەتەوە کە ئەبی عبدالرحمن **السُّلَّمي** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە کۆڵ دەهێنرا بۆ مزگەوت بۆ نوێژ.[2] پێشی دەفەرموون: بە نەخۆشی لە قوڕو بارانیشدا بمبەن بۆ مزگەوت.[3]

## نوێژی کوێر (نابینا)

نابینا نوێژی لەسەرەو کوێریی چاوان نابێتە بیانوو بۆ نوێژ نەکردن، بەڵکو دەبێ وەکو چاوساغ بە ئاو و بە گڵ، بە پێوە و بەدانیشتنەوەو بەڕاکشانەوە، بەدەم و بەدڵ دەبێ نوێژەکەی هەر بکات و مۆڵەتی نەکردنی نییە لە شەرعی پیرۆزی ئیسلامدا.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: "أتى النبي ﷺ رجل أعمى فقال يا رسول الله انه ليس لي قائد يقودني الى المسجد فسأل رسول الله ﷺ أن يرخص له فيصلي في البيت، فرخص له، فلما ولى دعاه، فقال: هل تسمع النداء بالصلاة؟ فقال نعم، قال فأجب".**[4] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "پیاوێکی نابینا هاتە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)و وتی ئەی پێغەمبەری خوا کەس نییە دەستم بگرێ و چاوساغم بێت بۆ مزگەوت داوای کرد پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) مۆڵەتی بدات لە ماڵەوە نوێژ بکات، ئەویش مۆڵەتیدا کاتێ پشتی هەڵکرد بانگی کرد فەرمووی: "ئایا گوێت لە بانگە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: بە دەنگییەوە بچۆ".

---

[1] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٣.

[2] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٣.

[3] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٣.

[4] صحيح أخرجه مسلم ٦٥٣، والنسائي، ١٠٩/٢، وغيرهما، وصحيح فقه السنة، ج١، ص٥٠٦، ورياض الصالحين.

**وعن عبدالله ـ وقيل عمرو بن قيس المعروف بابن أم مكتوم المؤذن (رضي الله عنه) أنه قال: يا رسول الله ﷺ ان المدينة كثيرة الهوامِّ والسباع، فقال رسول الله ﷺ: "تسمع حيَّ على الصلاة حيَّ على الفلاح، فحيهلا".**[1] واتە: لە عەبدوڵڵا ـ یان ـ وتراوە عەمری کوڕی قەیس ناسراو بە (إبن أم مکتوم)ی بانگبێژ (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بەڕاستیی شاری مەدینە مارو مێروو دڕندەی زۆرە، پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی گوێت لە **(حيَّ على الصلاة) (حيَّ على الفلاح)**ە هەر دەبێ بێیت". بەڵکو بە پەلەو بە هەڵەداوان بچۆ بە دەمییەوە.

**وعن عائشة (رضي الله عنها) أن النبي ﷺ: "استخلف إبن أم مكتوم على المدينة يصلي بالناس".**[2] واتە: لە عائشەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، عەبدوڵڵا (ابن أم مکتوم)ی کردە جێنشین بەسەر شاری مەدینەوە هەتا پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات.

**عن محمد بن الربيع أن عتبان بن مالك كان يؤم قومه وهو أعمى وأنه قال: "يا رسول الله ﷺ انها تكون الظلمة والسيل وأنا رجل ضرير البصر فصلِّ يا رسول الله في بيتي مكانا أتخذه مصلى، فجاءه رسول الله ﷺ فقال: أين تحب أن أصلي؟ فأشار الى مكان من البيت فصلى فيه رسول الله ﷺ".**[3]واتە: لە موحەممەدی کوڕی ڕەبیعەوە ئەگێڕنەوە عوتبانی کوڕی مالیك پێشنوێژی بۆ کەسوکاری خۆی دەکرد کوێریش بوو، فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بەڕاستیی تاریکی دەبێت و لافاو دەبێت منیش پیاوێکی نابینام ئەی پێغەمبەری خوا وەرە لە شوێنێکی ماڵەکەمدا نوێژێك بکە با ئەو شوێنە بکەم بە شوێنی نوێژ و نوێژی لێ بکەم، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "کوێت پێخۆشە نوێژی لێ بکەم؟ بەدەست هێمای بۆ شوێنێکی ماڵەکە کرد، پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نوێژی لەو شوێنە کرد".

---

[1] رياض الصالحين، ١٠٦٧، وأبو داود ٥٥٣، باسناد حسن، والنسائي، ٢ / ١٠٩، وإبن ماجه، ٧٩٢، باسناد صحيح.

[2] صحيح لغيره، إبن حبان، ٣١٣٤، وأبو يعلى، ٤٤٥٦، صحيح فقه السنة، ج١، ص٥٢٤.

[3] حديث عتبان بن مالك الذي رواه البخاري ٤٢٥، ومسلم ٣٣، وصحيح فقه السنة ج١، ص٥١٣.

ئیبنو سەعید گێڕاویەتییەوە لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەسووری کوڕی خوزەیمەوە، فەرمووی: عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) هات بۆ لای سەعیدی کوڕی یەربووع بۆ ماڵەوە سەرەخۆشی لێ کرد بە بۆنەی لەدەستدانی چاویەوە و فەرمووی واز لە نوێژی هەینی و نوێژی بە کۆمەڵ مەهێنە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئەویش فەرمووی چاوساغم نییە، فەرمووی: ئێمە چاوساغت بۆ دەنێرین، منالێکی یەخسیری بۆ نارد.[1]

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: "أتى النبي ﷺ رجل أعمى، فقال: يا رسول الله ﷺ ليس لي قائد يقودني الى المسجد، فسأل رسول الله ﷺ أن يرخص له فيصلي في بيته، فرخص له فلما ولى دعاه فقال له: هل تسمع النداء بالصلاة؟ قال نعم قال: فأجب".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "پیاوێکی کوێر هاتە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاوساخێکم نییە دەستم بگرێ بۆ مزگەوت، داوای لە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کرد کە مۆڵەتی بدات لە ماڵەوە نوێژ بکات، ئەویش مۆڵەتی دا، کاتێ ڕۆیشت بانگی کردو پێی فەرموو ئەی گوێت لە بانگی نوێژە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی دەبێ وەڵامی بدەیتەوە و بچێت بەدەمییەوە.

سەعیدی کوڕی موسەییب دەرمانی چاوئێشەکەی بەکارنەهێناو فەرمووی ئازاری چاوم ئاسانترە لە ئازاری فەوتانی جەماعەتی نوێژی بەیانی و خەوتنان.[3]

## نوێژی شەل

شەلی و گێڕی و قاچ قرتان و بڕینەوەی قاچ لە هەر شوێنێکی لاقدا بڕابێتەوە نابێتە مۆڵەتی نوێژ نەکردن تەنانەت ئەگەر هەردوو قاچیشی بڕابێتەوە نوێژ هەر فەرزە نابێ بڕ و بیانوی نەکردنی نوێژ خولیای بیر و ئەندێشەی بێت و تەنانەت هەر بیریشی لێ بکاتەوە، زانایان دەفەرموون: ئەگەر شوێنی شۆردن لە قاچەکان هەندێکی قرتابوو یان

---

[1] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٦.

[2] رواه مسلم ٦٥، ورياض الصالحين، ١٠٦٦.

[3] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٢.

براوبووەوە دەبێ باقییەکەی بشوات، ئەگەر هەمووی قرتابوو یان براوبووەوە سوننەتە سەری شوێنی براوەکە دەستی تەڕی بەسەردا بێنێت.

زۆرجار هاوەڵانی پێغەمبەرو دوای ئەوانیش موجاهیدانو خەباتگێڕانی ئیسلام، قاچیان پەڕیوە لە جەنگداو هەر نوێژیشیان کردووە. نموونە لەم بارەوە زۆرەو لە کتێبە شەرعییەکانو مێژووییەکاندا باسکراوە.

## نوێژی کەڕولاڵ

کەسی کەڕولاڵ کە توانای بیستنو قسەکردنی بەباشی نەبێت، یان هەر نەتوانێ بەهیچ شێوەیەك قسە بکات، نوێژی لەسەر پێویستەو بە گوێرەی توانای دەبێ ئەنجامی بدا، ئەگەر لە توانای خۆی کەمتەرخەمی کرد، گوناهبار دەبێت.

هەموو کەسێکی لاڵ یان کەڕ نوێژی لەسەرە بە مەرجێ (باڵغ و عاقڵ بێت) واتە پێگەیشتبێت و ژیر بێت. پێویستە سەرپەرشتیارەکەی فێری بکات بە نووسین یان هێما، هەرکات پانزەساڵی لێ تەواو بوو یان خەوی ئارەزوئامێزی بینی یان موێکی زبر لە دەوری کۆئەندامی نێرینەو مێینەی روابیت، هەر کات توانای فێربوونی هەبوو لەهەر جۆرێکی فێربوون وەکو نووسین یان هێما یان هەر جۆرێکی تر وەکو خودا دەفەرموێت: **"فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ "**.[1] واتە: پارێز لە نافەرمانی خوا بکەن بە گوێرەی توانا.

ئەگەر هیچ فێر نەدەبوو چۆنی لێ زانی ئاوا، هەر راوەستان و کڕنوش و سوژدەکان بەرێ ئەوەندەی دەزانێ لەوە بەرپرسە، خوا دەفەرموێت: **"وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً"**.[2] واتە: ئێمە کەس سزا نادەین لەسەر گوناهو تاوان هەتا نوێنەریان بۆ نەنێرین.[3] هەروەها پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"إذا**

---

[1] التغابن / ١٦.

[2] الإسراء / ١٥.

[3] مجموع فتاوى، إبن باز، ج١٠، ص٣٦٩ ـ ٣٧٠.

**أمرتكم بأمر فاتوا منه ماستطعتم".**[1] واتە: ئەگەر فەرمانێکم پێکردن بە کردنی شتێك بە گوێرەی تواناتان ئەنجامی بدەن.[2]

## نوێژی خوێندەوار و نەخوێندەوار

نوێژ فەرز دەبێت و دەبێتە پێویست و ئەرکێکی شەرعی هەر کات ئادەمیزاد ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

موسڵمان بێت، ژیر بێت، پێگەیشتوو "بالغ" بێت. چونکە ئەم دینە دینی هەموو کەسە، بەڵام ئەرکە شەرعییەکان بە گوێرەی تواناو لەبارابوون داوای جێبەجێکردنیان کراوە، بۆ نموونە هەموو کەس نابێتە جەنگاوەرو موجاهید بەڵکو ئەوانەی لە توانایاندایە.

نوێژیش لەسەر منداڵو شێتو کافر واجب نییە، بەڵام ئەگەر منداڵ یان شێت نوێژیان کرد رێگەیان لێناگیرێ، بەڵکو هان دەدرێن و رێگەیان بۆ خۆش دەکرێ و ئامۆژگاری دەکرێن، بە مەرجێ پاك بن.

ئەم دینە دینی خوێندەوارو نەخوێندەوارە، چونە بەهەشت بە شەهادە و خوێندەواری نییە، بەڵکو بە شوێنکەوتنی دینە، ئەوجا ئەگەر کەسانێك دیندار و خوێندەوار و خاوەن پلەو پایەش بن رێز و پلەیان باشترە.

لە گەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نەخوێندەوارییە، لە قورئاندا لە چەند ئایەتدا باسی نەخوێندەواری پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کراوەو بە **(النبي الأمي)** ناوی هاتووە. نەخوێندەواری نابێتە بیانوی ناموسڵمان بوون یان نوێژنەکردن، پێشەوا غەزالی (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی **(إحياء)**دا دەفەرموێت هاوەڵانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە سەدا حەفتایان نەخوێندەوار بوون.

---

[1] بخاري ٦٧٤٤.

[2] الرخص الفقهية في ضوء الكتاب والسنة، ص٢٨٤، تحت عنوان : من لم يحسن فرض القراءة.

## نوێژ لەسەر راخەر و بەبێ راخەر

نوێژ فەرزە و خودا پێویستی کردووە نەکردنی بۆ دانەناوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: هەموو سەرزەویم بۆ کراوەتە مزگەوت بۆم پاکژ کراوە لەهەر کوێدا نوێژ بوو نوێژەکەتان بکەن، لەسەر راخەر و بەرماڵ و بەردە نوێژ، لە مزگەوت، لە ماڵەوە، لەسەر زەوی وشك، گەرنا لەسەر زەوی تەڕو قوڕ.

عن ميمونه: **"كان يصلي على الخمرة"**.[١] صحيح. واتە: لە مەیمونەوە ئەگێڕنەوە: "پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نوێژی لەسەر پارچە قوماش دەکرد".

**وعن إبن عباس (رضي الله عنهما) "كان يصلي على بساط "**.[٢] صحيح. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە: "پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر راخەر نوێژی دەکرد". هەروەها پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر زەوی وشك و تەڕ نوێژی کردووە.

لە باسی گەڕان بەدوای شەوی (**ليلة القدر**)دا هاتووە کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) سوژدەی لەسەر قوڕ بردبوو و شوێنەوارەکەی بە ناوچاوانییەوە دیاربوو.[٣]

لە کتێبی (المفصل)دا، عبدالكريم زيدان دەفەرموێت: هەر کەس نەیتوانی سوژدە لەسەر زەوی بەرێ بە شێوەیەك نەتوانێ دابیتەوە سەر زەوی، بەڵام دەیتوانی سوژدە لەسەر شتێك بەرێ لەبەردەمیدا بۆی دادەنرێت وەکو راخەر و بەرد دروستە سوژدەی لەسەر بەرێ، ئەگەر نەتوانێ لەوە زیاتر سەری دابخات.[٤]

**"كان تميم الداري (رضي الله عنه) اشترى حلة بألف فكان يصلى فيها"**[٥]. واتە: تەمیمی داری (رەزای خوای لێ بێت) پارچەیەك قوماشی جوانی کڕی بە هەزار، نوێژی تێدا دەکرد.

---

[1] صحيح الجامع الصغير ٤٩٦٣، صحيح أبي داود، ٦٦٦.

[2] صحيح الجامع الصغير ٤٩٦٤، صحيح أبي داود، ٦٦.

[3] فتح الباري، ج٢، ص٥٥، باب ١٣٥.

[4] المفصل، ج١، ص٢٣٢.

[5] (رهبان الليل، ج١، ص٣٩٦).

## نوێژی دەوڵەمەند

ئەگەر هەژاری و نەبوونی و کەساسی و دەست کورتی بیانو نەبێت بۆ نوێژ نەکردن ئەوە دەوڵەمەندی هەر بیانو نییە و لە کەس وەرناگیرێ قسەی لەبارەوە بکات.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"من كان له سعة ولم يضح فلا يقربن مصلانا"**[1]. صحيح عن أبي هريرە. واتە: هەرکەس هەیەتی و دەوڵەمەندەو قوربانیی ناکات با نزیکی سوژدەگاو پەرستگای ئێمە نەکەوێت.

خودا دەفەرموێت: **"رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ"**.[2]واتە: پیاوانێکن لە نوێژو یادی خودا بێئاگایان ناکات نە بازرگانی و نە کڕین و فرۆشتن.

سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی راڤەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: **(كانوا يشترون ويبيعون فلا تشغلهم عن مواقيت الصلاة)**.[3] واتە: ئەوانە کڕین و فرۆشتن و مامەڵەیان دەکردو لە کاتی نوێژەکانیش بێئاگا نەدەبوون.

لە هاوەڵانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) زۆرێك دەوڵەمەند هەبوون وەکو خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەففان و موصعەبی کوڕی عومەیرو ئەبوسوفیان (رەزای خوایان لێ بێت)و زۆری تریشو هەرگیز یەك نوێژیشیان نەفەوتاندووە.

## نوێژی هەژار

هەژاری هیچ بیانویەك نییە بۆ نوێژ نەکردن، پێغەمبەرەکان زۆریان هەژار بوونو نوێژیشیان لەسەر هەڵنەگیراوە، هاوڕێکانی پێغەمبەر زۆریان هەژار بوون لە خاوەنماڵو سامانو بازرگانەکان زیاتر لێبڕاوبوون بۆ خواپەرستی و بە تایبەتیش نوێژکردن، کۆمەڵە هاوڕێی ناو کەپرەکە (**أهل الصفة**) کۆمەڵێ هاوڕێی بەڕێزی پێغەمبەر بوون و وەفدو غەوارەش لەگەڵیان دەمانەوە ئەوانەش دەهاتن بۆ موسڵمان بوون[4]، ئەبو هورەیرە

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٦٤٩٠.

[2] النور / ٣٧.

[3] إسناده صحيح، تعظيم قدر الصلاة، رقم ٥٢.

[4] السيرة النبوية، للصلابي، ج١، ص٥٢١.

لێپرسراویان بووەو ئەو بردونییە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)و پێی ناساندون.[1] هەندێ جاریش رێکەوتوە کەسانی دەوڵەمەندیش چونە ناو کەپرەکەو ماونەتەوە ئەوانەی زۆر حەزیان لە خواپەرستی و دەست بەردان لە دونیا و رووکردنە دوارۆژ بووە.

## نوێژی نیشتەجێ

بابای نیشتەجێ ئەگەر (بالغ) پێگەیشتوو (عاقل) ژیر بێت نوێژی لەسەر فەرزە، نوێژەکانیش بەتەواوی دەکات واتە چوار رکاتییەکان هەر بە چواری دەکات و نوێژی هەینیشی لەسەر فەرزە تەنانەت کۆمەڵێ لە زانایان ئەفەرموون: نوێژی جەماعەتیشی لەسەر فەرزە.

لە کاتێکا نوێژ لەسەر سەفەری و گەشتیارو نەخۆش و جەنگاوەرو سوارو پیادە فەرز بێ، چۆن دەبێ نیشتەجێ لەسەری فەرز نەبێ.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) هەڕەشەی زۆری کردووە، نەك لەو کەسەی نوێژ ناکات، بەڵکو لەو کەسەی تەمەڵیشی تیادا دەکات یان لە کاتی خۆی دوای دەخات، بە دووڕوو دەغەڵی داناون، لە چەندەها فەرمودەدا باسی خێری نوێژی فەرز لە مزگەوت و بە جەماعەت کراوەو لە هەمان کاتیشدا باسی زیادە خێریشی کردووە بۆ ئەو کەسانەی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە دەکەن و لە هەندێك لەو فەرمودانەدا فەرموویەتی: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان و نوێژە سوننەتەکان بەرنەوە بۆ ماڵەوە، زیاد لەوەش شەونوێژو چەندەها سوننەتی تریش هەن لە ماڵەوە دەکرێن، پێغەمبەری خواش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ماڵەوە ئەوەندەی شەونوێژ کردبوو هەتا هەردوو بنەپێی ئاوسابوون، ئامۆژگاری ئافرەتانیشی کردووە نوێژەکانیان لە ماڵەوە بکەن خێرترە زۆرێك لە ئافرەتان یان پیاوانی کەمئەندام لە ماڵەوە مزگەوت و شوێنی تایبەتیان هەبووە بۆ خواپەرستی.[2]

---

[1] السيرة النبوية، للصلابي، ج١، ص٥٢٢.

[2] هەموو ئەو بابەتانە و زۆری تریش بە بەڵگەوە لەم نوسراوەی بەردەستدا هەیە.

ابن الجوزي (رەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەگێڕێتەوە: کە (ابن الدغنة) ئەبوبەکری لە پەنای خۆیدا گێڕایەوە مەککە پێی وت دەبێ لە ماڵی خۆتا بە نهێنی خواپەرستی بکەی، ئەویش بە گوێی کرد ماوەیەك بە نهێنی لە ماڵەکەی خۆیدا بە نهێنی خواپەرستی کردو بە ئاشکرا نوێژی نەکردو هەر لە ماڵەوەش قورئانی دەخوێند، پاشان ئەبوبەکر وای بەچاکزانی لە ماڵەوە مزگەوتێکی کرد لە تەنیشت خانوەکەی خۆی و نوێژی تیادا دەکرد و قورئانی تیادا دەخوێند هەتا قەرەباڵغ بوو، ژن و منالّی هاوبەشدانەرەکان دەهاتن گوێیان لیٚ دەگرت، دواتر هاوبەشدانەرەکان دەستیان کرد بە پیلان گێڕان.[1]

## نوێژی گەشتیار و ڕێبوار

سەفەرو ڕێبواری و کاروان و گەشتوگوزار نابێتە ڕێگر لە نوێژکردن، بەڵام ڕێگە دراوە نوێژی چوار رکاتی بکرێتە دوو رکات بە جیاوازیی رای زانایان لەسەر کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکاتی ئاخۆ فەرزە؟ یان سونەتەو مۆڵەتی شەرعە؟.[2]

قال تعالى: **"وَإذا ضَرَبْتُمْ فِي الأرض فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ"**.[3] واتە ئەگەر گەڕان بە زەویداو گەشتوگوزارتان کرد گوناهتان لەسەر نییە کە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە ئەگەر دەترسان کافرەکان توشی بەڵاتان بکەن.

هەروەها فەرمودەی ئیبنو عومەر دەکەینە بەڵگە: **"صحبت رسول الله ﷺ في السفر فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله، وصحبت أبابكر (رضي الله عنه) فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله، وصحبت عمر (رضي الله عنه) فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله، ثم صحبت عثمان (رضي الله عنه) فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله، وقال الله: "لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ"**. (الأحزاب:

---

[1] صفة الصفوة، ج١، ص٥٧.

[2] سەیری ئەم جیاوازییە بکە لە: صحيح فقه السنة، ج١، ص٤٧٣.

[3] النساء / ١٠١.

٢١). "[1] واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: "هاوڕێیەتی پێغەمبەرم کردووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە گەشتو سەفەردا لە دوو ركات زیاتری نەدەکرد هەتا کۆچی دوایی کردووە، هاوڕێیەتی ئەبوبەکرم کردووە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە دوو رکات زیاتری نەدەکرد هەتا مردووە، هاوڕێیەتی عومەرم کردووە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە دوو رکات زیاتری نەدەکرد هەتا مرد، هاوڕێیەتی عوسمانم کردووە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە دوو رکات زیاتری نەدەکرد هەتا مرد، خوا دەفەرموێت: بۆ ئێوە هەیە سەرمەشق وەرگرتن لە پێغەمبەر".

**عن علي (رضي الله عنه) قال: "ماكان فينا فارس يوم بدر غير مقداد، ولقد رأيتنا وما فينا إلا نائم، إلا رسول الله ﷺ تحت الشجرة يصلي ويبكي حتى الصبح".**[2] واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لە ڕۆژی بەدردا سوارمان لەگەڵ نەبوو، بێجگە لە میقداد، بەڕاستیی ئێمەت دەبینی کەسمان نەدەبینی نەخەوتبێ، بێجگە لە پێغەمبەر خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ژێر درەختێکدا هەتا بەیانی شەونوێژی دەکردو دەگریا.

## نوێژی منداڵ

بابای موسڵمان پیاو بێت یان ژن بۆ ئاگادارکردنیان لە هەر کارێکی خراپ دەبێ وەسیەت بکات بۆ نەوەکانیو وەچەکان و خزمەکان و خۆشەویستانی و ئاگاداریان بکاتەوە لە زەرەرو زیانی ئەنجامی خراپی ئەو کردارە، هەروەها بۆ هەموو کارێکی چاکیش پێویستە وەسیەت بکات بۆ خزم و کەس و کارو دۆستانی، بەتایبەتیش کوڕو کچی خۆی کە چاوی لێ بکەن، چاکترین کردەوەی موسڵمانیش نوێژە هەروەکو لە باسی نوێژدا بەڵگەمان لەسەر هێناوەتەوە، لەم ڕوانگەشەوە پێغەمبەر خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئامۆژگاری ئوممەتەکەی کردووە کە منداڵەکانیان لە هەنگاوە سەرەتاییەکانی ژیانیاندا فێری نوێژ بکەن.

---

[1] صحيح أخرجه مسلم، ٦٨٩، وصحيح فقه السنة، ج١، ص٤٧٨.

[2] رهبان الليل، ج١، ص٣٤١ـ ٣٤٢.

لەسەر بێژنگ بە گوێیدا بدەن و پێی بڵێن **"حي على الصلاة"** رابە بڕۆرە نوێژێ. کە گەورەتریش بوو دەفەرموێت: **"مروا الصبي بالصلاة إذا بلغ سبع سنين، وإذا بلغ عشر سنين فاضربوه عليها"**.[١] واتە: "فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان نوێژ بکەن کە گەیشتنە حەوت ساڵان، کە گەیشتنە دە ساڵی لەسەر نوێژ لێی بدەن".

هەروەها دەفەرموێت: **"مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين، واضربوهم عليها وهم أبناء عشر سنين وفرقوا بينهم في المضاجع"**.[٢] واتە: "فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان نوێژ بکەن کە تەمەنیان حەوت ساڵە، لەسەر نوێژ لێیان بدەن کە بوونە دە ساڵانو جێگەشیان بۆ جیا بکەنەوە".

**عن سَبْرَةَ بن مَعْبَدٍ الجُهَنِيِّ (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "علموا الصبي الصلاة إبن سبع سنين واضربووه عليها إبن عشر"**.[٣] واتە: لە سەبرەی کوڕی مەعبەدی جوهەینەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "منداڵ فێری نوێژ بکەن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، لە تەمەنی دە ساڵیدا لەسەر نوێژ لێیان بدەن".

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) قال: "صليت مع النبي ﷺ فقمت الى جنبه عن يساره، فأخذني فأقامني عن يمينه، وقال إبن عباس: وأنا يومئذ إبن عشر سنين"**.[٤] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (رەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: "لەگەڵ پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نوێژم کرد لە تەنیشتیەوە لە لای چەپیەوە وەستام دەستی گرتم و لە لای راستی خۆیەوە رای وەستاندم و عەبدوڵڵا فەرمووی ئەو کاتە من تەمەنم دە ساڵ بوو".

پێشەوا عەلی (رەزای خوای لێ بێت) یەکەم کەس بوو بڕوای هێنا بە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)و یەکەم کەسیش بوو نوێژی کرد.[٥] پێغەمبەری خوا

---

1 صحيح، صحيح الجامع الصغير وزيادة، ج٢، ص١٠٢١، رقم ٥٨٦٧.

2 حسن، صحيح الجامع الصغير وزيادة، ج٢، ص١٠٢١، رقم ٥٨٦٨، وأبو داود، ٤٩٥، ونضرة النعيم، ج٦، ص٢٥٥٦، رقم ٢٣..

3 رواه الترمذي، ٤٠٧، وقال حديث حسن صحيح، ونضرة النعيم، ج٦، ص٢٥٥٥

4 صلاح الأمة، ج٧، ص٥٧.

5 صلاح الأمة، ج٧، ص٥٥.

ریزی نوێژی بۆ منداڵن دیاری کردووه لەسەردەمی خۆیداو خۆشی حەسەنو حسەینی بە منالّی بردۆتە نوێژ.

## نوێژکردنی گەورە

هەموو زانایان یەك دەنگن کە هەر کەس پێگەیشت (بالغ بوو) نوێژی لەسەر فەرزە نێر بێ یان مێ، بە مەرجێ ژیریش بێت و شێتیش نەبێت، بەڵام پێش بالغ بوون لەسەری فەرز نییە و بە نەکردنی تاوانبار نابێت. موحەممەدی کوڕی یوسف فەرموویەتی سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێ) بە شەو هەڵیدەستاندین بۆ شەونوێژو دەیفەرموو: "گەنجو لاوەکان، هەستن نوێژ بکەن هەتا گەنجو جوانن".[1]

**قال رسول الله ﷺ: "رفع القلم عن ثلاث: عن النائم حتى يستيقظ، وعن الصبي حتى يكبر، وعن المجنون حتى يعقل".**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "پێنووس بەرز کراوەتەوە لە سێ کەس، لە خەوتوو هەتا بەخەبەر دێت، لە منداڵ هەتا گەورە دەبێت، لە شێت هەتا ژیر دەبێتەوە".

کە دەفەرموێت پێنووس بەرز کراوەتەوە: واتە گوناه و تاوانیان لەسەر نانووسرێ. ئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە لەسەر فەرزبوونی نوێژ لەسەر گەورە، هەموو ئەو هەڕەشەو سزایانەی لە نوێژنەکەر کراوە بۆ نوێژنەکەری گەورەو پێگەیشتووەو پەیوەندیی بە منالّەوە نییە بە تایبەتی کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة"**. واتە: "لە نێوان پیاوی بڕوادارو کافردا نوێژ نەکردن هەیە". لێرەدا باسی پیاو دەکات کە مەبەستی کەسی پێگەیشتووە نێر یان مێ.

خوا دەفەرموێت: **"رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ..."**.[3] واتە: پیاوانێکن نە بازرگانی و نە کڕین و فرۆشتن لە یادی خوا و نوێژ

---

[1] (رهبان الليل، ج١، ص٥٠٩).

[2] أخرجه أبو داود، ٤٣٩٨، وإبن ماجه، ٢٠٤١، صحيح فقه السنة، ج١، ص٢٣٤

[3] النور /٣٧.

بێئاگایان ناکات "ئەمەش تەفسیر کردن و توێژینەوەی سوفیانی سەورییە (رەحمەتی خوای لیٚ بێت)". [1]

## نوێژکردنی نێرینە

خوا دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ..."**.[2] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کە هەستان بۆ نوێژکردن روخسارتان بشۆرن. وشەی (**آمَنُواْ**) لە زمانی عەرەبیدا نێرینەیە هەرچەندە بە (**تغليب**)[3] ئافرەتانیش دەگرێتەوە.

هەروەها هەموو دەقە قورئانیو فەرمودەکان بۆ نێرو مێیە، بەڵام بە شێوەی بەکارهێنانی نێرینە دارِژاون، وەکو: **"... وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ"**. [4] واتە: بە چاکی نوێژ بکەنو مەبنە هاوبەشدانەر وشەی (**وَأَقِيمُوا**) و (**وَلَا تَكُونُوا**) لە زمانی عەرەبیدا بۆ نێرینە بەکاردێت، بەڵام لێرەدا مەبەستی هەردوو رەگەزی نێرو مێیە.

لە مانگ و ساڵ و تەمەنیشدا پیاو زیاتر خواپەرستی دەکات لە ئافرەت بە گشتی، چونکە ئافرەتان مانگی چەند رۆژێك خواپەرستییان بۆ ناکرێت، هەروەها لە ژیانداو سروشتی دروست بوونیان نێرینە بە گشتی زیادە توانایەکی تیایە لە ئافرەت.

خوا دەفەرموێت: **"رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ..."**. [5] واتە: پیاوانێکن نە بازرگانی و نە کڕین و فرۆشتن یادی خواو نوێژکردنیان لە بیر ناباتەوە.

---

[1] تعظيم قدر الصلاة، رقم ٥٢.

[2] المائدة / ٦.

[3] (تغليب) واتە بەکارهێنانی دوو شتی جیاواز کە هاوبەشن لە چەند لایەنێکەوە بەناوی ئەوەیانەوە کە زیاتر زاڵە لە هاوبەشەکەدا، وەکو ووشەی (والدين) یان (أبوين) بۆ دایك و باوك.

[4] الروم / ٣٥.

[5] النور /٣٧.

سەدو بیستو چوار هەزار پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێ بێت) کە سەرجەمیان پیاو بوون نوێژیان لەسەر فەرز بووە، دوای ئەوانیش هاوەڵ و هاوڕێو خزمو کەسو کارو خانەوادەو شوێنکەوتوانیان لە موسڵمانان نوێژیان کردووە.

هەر نێرو مێیەك دوای بڕواهێنان ئەو دوو مەرجەی تیابوو (بلوغ) پێگەیشتن، (عقل) ژیری، ئەوە نوێژی لەسەر فەرزە بەیەکدەنگی هەموو ئوممەت و سەرجەم زانایانی ئیسلام.

## نوێژی ئافرەت

نوێژ ئەرکێکی خوایی و شەرعییە لەسەر نێر و مێ، ژنان و پیاوان بەبێ جیاوازیی هەر کات مەرجی فەرز بوونی نوێژیان تێدا هاتەدی هەموو ئەو دەقانەی روو لە پیاوانە ئافرەتانیش بەگشتی دەگرێتەوە مەگەر لە تایبەتمەندیەکاندا. خوا دەفەرموێت: **"وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ"**.[١] واتە: ئافرەتان نوێژەکان بکەن و زەکات بدەن.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "صلاة المرأة في بيتها أفضل من صلاتها في حجرتها، وصلاتها في مخدعها أفضل من صلاتها في بيتها"**.[٢]واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: نوێژی ئافرەت لە ماڵەوەی باشترە لە نوێژی لە ژووری خۆیدا، نوێژکردنی لە ژووری پەردەداری خۆیدا باشترە لە نوێژی لە ژووری خەوتنیدا. هەروەها دەفەرموێت: **عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا صلت المرأة خمسها وصامت شهرها وحصنت فرجها وأطاعت زوجها، قيل لها ادخلي الجنة في أي أبواب الجنة شئت"**.[٣]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی "ئەگەر ئافرەت پێنج فەرزەی کرد و مانگەکەی بەڕۆژو بوو، داوێنی

---

[1] الأحزاب / ٣٣.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادة، ٣٨٣٣.

[3] رواه إبن حبان وغيره، حديث حسن صحيح، صحيح الجامع، ٦٦١.

خۆی پاراست و گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی کرد پێی دەوترێ بڕۆرە بەهەشتەوە لە کام دەرگاوە دەتەوێت.

لە فەرموودەی راست (صحيح)دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی تەڵاقدا پاشان لەسەر دوو تەڵاق گێڕایەوە لای خۆی بە فەرمانی جیبریل و فەرموو بووی پێی: **"إنها صوّامة قوّامة، وهي زوجتك في الجنة ".**[1]واتە: "بەڕاستیی حەفسە زۆر بەڕۆژوو و زۆریش شەونوێژ دەکات ئەو هاوسەری تۆیە لە بەهەشتدا". تەنانەت ئافرەتان لە مزگەوتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەرگای تایبەتییان هەبوو.

**قال رسول الله ﷺ: "لو تركنا هذا الباب للنساء".**[2]واتە: ئەگەر ئەو دەرگایەمان بۆ ئافرەتان واز لێ بێنایە باش بوو. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرموێت: دوای ئەو فەرمودەی پێغەمبەر جارێکی تر لەو دەرگایەوە هاتوچۆم نەکرد.

**وقال ﷺ "لأن تصلي المرأة في بيتها خير لها من أن تصلي في حجرتها، ولأن تصلي في حجرتها خير لها من أن تصلي في الدار، ولأن تصلي في الدار خير لها من أن تصلي في المسجد"**[3]. واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسە بێت) فەرموویەتی: "ئەگەر ئافرەت لە ماڵەکەیدا نوێژ بکات خێری زیاترە کە لە ژووری دانیشتنەکەیدا بیکات، نوێژەکەی لە ژووری دانیشتنەکەیدا بکات خێرترە بۆی لەناو خانووەکەیدا بیکات، لە هەرکوێی خانوەکەیدا بیکات خێرترە تا لە مزگەوت بیکات".

**معاذة بنت عبدالله العدوية: كانت (رحمها الله) ـ تلميذة لعائشة (رضي الله عنها) ـ فبوركت لأم المؤمنين، وكانت (رحمها الله) ـ تصلي الليل الطويل فكانت تكل الرجال وهي لاتكل".**[4] واتە: موعازەی کچی عەبدوڵڵای عەدەویە (رەحمەتی خوای لێ بێ) قوتابیو شاگردی عائیشەی دایکی بڕواداران بوو، فەڕو پیرۆزی لە دایکی

---

[1] صلاح الأمة، ج٧، ص١٦٦، وصححه إبن حجر في الإصابة، ٢٧٣/٤، وصححه الألباني.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٥٢٥٨، وصحيح أبي داود، ٤٨٣.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٥٠٣٩.

[4] رهبان الليل ج٢، ص١٠.

موسڵمانانەوە بووە بەشی، موعازە بە درێژایی شەو نوێژی دەکرد، پیاوان ماندوو دەبوون پەکیان دەکەوت، بەڵام ئەو ماندوونەبوو پەکی نەدەکەوت.

خەدیجەی دایکی بڕواداران پێش فەرزبوونی نوێژ لەگەڵ پێغەمبەردا شەونوێژی دەکرد، هاوەڵەکانیش بە هەمان شێوە، هەتا بەری پێیان ئاوسابوو، خەدیجە خاتوون پێش فەرزبوونی نوێژ کۆچی دوایی کرد.

## نوێژی دەسەڵاتدارو کاربەدەست

کاربەدەستی موسڵمان نەك هەر نوێژی فەرزە، بەڵکو نوێژکردن مەرجە بۆ کاربەدەستو هەڵبژاردنی بە گەورەو دەسەڵاتدار: تەنانەت دەبێ خۆی پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات لە شوێنی خۆیداو وتاری هەینی و وتاری جەژنەکان و رۆژگیران و مانگ گیران و نوێژەبارانە بخوێنێتەوەو پێشنوێژیەکەشیان بۆ بکات.

پێغەمبەری پێشەوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) خۆی هەڵدەستا بە وتارخوێندنەوەو پێشنوێژی کردن بۆ بڕواداران، کاتێکیش نەخۆش کەوت و نەیتوانی بەو کارانە هەڵسێ فەرمووی "مروا أبابكر فليصل بالناس" واتە: بە ئەبوبەکر بڵێن پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات. تەنانەت لە نوێژی مردووشدا پێشەوا دەبێ خۆی پێشنوێژی بکات ئەگەر خزمە نزیکەکانی مردووەکە خۆیان پێش نەکەوتن.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کە پێغەمبەرو دەسەڵاتدارو کاربەدەست و سەرۆك دەوڵەت بوو هەتا دەیتوانی خۆی پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، دواتریش ئەبوبەکری دانا لەسەرەمەرگیشیدا، کۆتا وەسیەتی دەربارەی نوێژکردن و پارێزگاریی کردن بوو لە نوێژ، ئەبوبەکریش (رەزای خوای لێ بێت) لەسەردەمی حوکمی خۆیدا لەسەر سوننەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بەردەوام بوو کۆتا وەسیەتی نوێژ بوو وە دەیفەرموو: "هەر کەس پێنج فەرزەی نوێژ بکات ئەو هەر بەیانی دەکاتەوە لە پەنای خواداو ئێوارە دەکاتەوە لە پەنای خوادا ".[1]

پێشەوا عەلی (رەزای خوای لێ بێت) زۆر گرنگی بە نوێژ داوە تەنانەت کاتێ کە خەلیفە بوو هەرچی لە بەیتولمالدا بوو دەری هێناو دای بە کەسانی شایستە هەتا

---

[1] ١٠٠ قصة عن أبي بكر الصديق، ص٩٣.

خەزێنە هیچی تیا نەماو بەتاڵ بوو پاشان فەرمانی کرد ئەرزەکەیان ئاوڕشێن کردو شتیان کە تەواو بوو ئینجا هەستا لە ناو خەزێنە شۆراوەکەدا دوو رکات نوێژی کرد!!

سلێمانی کوڕی عەبدولمەلیك دەستپێکی خەلافەت و حوکومڕانییەکەی بە زیندووکردنەوەی نوێژکرن لە کاتی خۆیدا دەست پێ کردو کۆتاییەکەیشی بە دانانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز.[1] دادپەروەرترین کاربەدەست و حوکمڕان.

هارون رەشید (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە هەموو شەوو رۆژێکدا سەد رکاتی سوننەتو خۆبەخشی کردووە هەتا لە دونیا دەرچو مەگەر نەخۆش بووبێت[2].

پاڵەوانی گەورەی ئیسلام سەلاحەددین (رەحمەتی خوای لێ بێت) زۆر سوور بووە لەسەر نوێژی جەماعەت، تەنانەت رۆژێك باسی ئەوەی کرد چەندەها ساڵە بە کۆمەڵ نەبێ نوێژی نەکردووە، گەر نەخۆشیش بووایە پێشنوێژی بانگ دەکرد و زۆری لە خۆی دەکرد هەتا هەڵدەستاو نوێژی بەکۆمەڵ لەگەڵ دەکرد زۆریش پاپەندی سوننەتەکان بووە[3]. تەنانەت کاربەدەستی موسڵمان ئەگەر نوێژی نەدەکرد گوێڕایەڵی دروست نییە.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "سيكون عليكم أمراء يؤخرون الصلاة عن مواقيتها، ويحدثون البدع، قال إبن مسعود: فكيف أصنع؟ قال: تسألني يا إبن ام عبد كيف تصنع؟ لا طاعة لمن عصى الله". صحيح**[4] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەودوا فەرمانڕەواتان دەبن نوێژ دوا دەخەن لە کاتی خۆیداو بیدعەو داهێنراو دادەهێنن، ئیبن مەسعود فەرمووی: چی بکەم؟ پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی کوڕی (ئوم عبد) پرسیارم لێدەکەی چی بکەی؟ گوێڕایەڵی نییە بۆ کەسێك لە خوا یاخی بێت.

هەروەها لە عوبادەی کوڕی سامتەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: **"ستكون أمراء تشغلهم أشياء، يؤخرون**

---

[1] صلاح الأمة ج٦، ص٨٠.

[2] صلاح الأمة ج٦، ص٨١.

[3] صلاح الأمة ج٦، ص١٩١.

[4] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٣٦٦٤.

**الصلاة عن وقتها، فاجعلوا صلاتكم معهم تطوعاً".**[1] واتە: لە مەودوا ئەمیرو کاربەدەستی واتان دەبێت کە شتگەلێك سەرقاڵیان دەکات نوێژ لە کاتی خۆیدا دوا دەخەن، نوێژەکانتان لەگەڵیان با سوننەت بێ. واتە: زوترو لە کاتی خۆیدا فەرزەکە بکەنو دواتر نوێژەکە وەکو سوننەت دووبارە بکەنەوە لەگەڵ کاربەدەستەکەدا.

واتە: نوێژەکانتان لە کاتی خۆیدا بکەن جا ئەگەر نوێژتان لەگەڵ ئەوان دووبارە کردەوە بە نیازی سوننەت لەگەڵیدا نوێژ بکەن وەکو لەم فەرمودەی تردا باشتر روونی کردۆتەوە.

**قال رسول الله ﷺ: "انها ستكون عليكم بعدى أمراء، يشغلهم أشياء عن الصلاة لوقتها، حتى يذهب وقتها، فصلّوا الصلاة لوقتها. قال رجل: إن أدركتها معهم أصلي معهم قال: نعم إن شئت".**[2] صحيح. عن عباده بن الصامت. واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڕاستیی لەمەودوا لە دوای من فەرمانڕەواتان دەبن شتگەلێ سەرقاڵیان دەکەن لە نوێژکردن لە کاتی خۆیدا، پیاوێك وتی: ئەگەر بە نوێژدا گەیشتم لەگەڵیاندا نوێژیان لەگەڵ بکەم. فەرمووی: بەڵێ ئەگەر ویستت.

## نوێژی بەندکراو لە بەندیخانەدا

بەندیخانەو بەندکران نابێتە بەڵگەو نابێتە مۆڵەت بۆ نوێژ نەکردن، بەڵکو هەروەکو کەسێکی دەرەوەی بەندیخانە هەتا بتوانێ بە شێوەی ئاسایی بە دەستنوێژەوەو بە پێوە لە کاتی دیاریکراودا نوێژەکان دەکات، ئەگەر واش نەیتوانی و مۆڵەت نەدرا هەر چۆنێك بۆی کرا نابێ دەغەڵی و تەمەڵی تیادا بکات بە دەستنوێژ، بە تەیەمموم، بە گڵ، بە پێوە، بە دانیشتنەوە، بە راکشانەوە، لەسەر لا، بەزمان و بەدڵ ـ دەتوانێ لەبەر ناچاری نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بە کۆکراوەیی بکات، هەروەها نوێژی ئێوارەو خەوتنان بەیەکەوە بکات. تەنانەت ئەگەر ترسی چوانی و بەسەرچونی کاتی نوێژەکەی هەبوو ڕێگەش نەدەدرا بە ئازادیش بچێ بۆ دەستنوێژگرتن دەتوانێ لە عەسرێکی درەنگدا

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٣٦١٧.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ٢٤٢٩. وصحيح أبي داود ٤٥٩.

دەستنوێژ بگرێو دەستنوێژەکەی بپارێزێ دوای ئەوەی نوێژی عەسرو نیوەڕۆی بەیەکەوە بە کۆکراوەیی کرد نزیکی ئێوارەیەو لەپاش کەمێکی تر نوێژی ئێوارە دەبێت ئەو کات نوێژی ئێوارەو خەوتنان بەیەکەوە بکات، ئەو کاتە لە شەو و رۆژێکدا دوو جار دەستنوێژ دەگرێ: دەستنوێژێك بۆ نوێژی بەیانی، دەستنوێژێکیش بۆ چوار نوێژەکەی تر، لەسەرانسەری مێژووی ئیسلامدا نەبیستراوە کە لە بەندیخانەدا نوێژیان فەوتاندبێت یان فەتوا بۆ کەسێك درابی نوێژ نەکات لە بەندیخانەدا یان تەنانەت نوێژێکیش لە کاتی خۆیدا دوابخات، بەڵکو بە تەیەمموم دەیکات و دوای رزگار بوون دەیگێڕێتەوە.

## نوێژ بەبێ دەستنوێژی بەردەوام[1]

دەستنوێژ مەرجی سەرەکی نوێژەو هەر کات کەسێك ویستی نوێژ بکات واجبە لەسەری دەستنوێژ بگرێ و بەبێ دەستنوێژ نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام لە کاتی ناچاریدا کە بڕوادار هەموو رێگەیەك بگرێتە بەر، بەڵام نەتوانێ دەستنوێژ بگرێت بە هۆی دەست نەکەوتنی ئاوو دەست نەکەوتنی خۆڵ و تۆز وەکو بەندیخانە، یان دەست و قاچ بەستراو یان لەکاتی نەتوانینی بەکار هێنانی ئاو بۆ دەستنوێژ و خۆڵ و تۆز بۆ تەیەممومم وەکو برینداری زۆر لە دەست و دەم و چاودا، یان لە کاتی رانەگیران و نەپاراستنی دەستنوێژ وەکو نەخۆشی میزەچرکەو لێ بوونەوەی بەردەوام یان پیسی رانەگرتن یان هاتنی خوێنی نەخۆشی بە بەردەوامیی بۆ ئافرەت لەو حاڵەتانەدا، کە حاڵەتی نائاساین و لە دەسەڵاتی مرۆڤدا نین بە گوێرەی تواناو لەگەڵ بەگەڕخستن و بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانادا دروستە بەبێ دەستنوێژ نوێژەکەی بکات. بەڵام لە هەندێ لەو حاڵەتانەدا هەر دەبێ دەستنوێژ بگرێ لە کاتی هاتنی وەختی نوێژەکەدا، بەڵام ئەگەر دەستنوێژەکەی شکا، بۆی هەیە نوێژەکەی پێوە بکات لەبەر ناچاریی. بەڵام ئەو ئافرەتەی خوێنی نەخۆشی هەیە بۆ ماوەیەك یان بەردەوام دەبێ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە و پەڕۆ یان لۆکە یان هەر شتێکی پاك بەکار بێنێ و بەخۆیەوە هەڵی گرێ و لە کاتی تازە کردنەوەی دەستنوێژەکانیدا بیگۆڕێ یان بیشوات و دای نێتەوە[2].

---

[1] صحيح فقه السنة، ج١، ص٢١٦ ــ ٢١٨.

[2] لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەم بابەتە باس کراوە، بۆ نموونە، سەیری بەرگی ١٠ / لاپەڕە ٢٢٤ی (مجموع فتاوى، إبن باز) بکە، والمفصل، ج١ / ص١٧٢.

به بەڵگەی فەرمودەی خوا لە قورئاندا "**فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ**".[١] واتە: بە گوێرەی توانا خۆ بپارێزن لە سزای خوا. هەروەها ئەو کەسەش میزە چرکە و با لێبوونەوەی بەردەوامی هەیە، بۆ هەموو نوێژێ دەستنوێژ دەگرێتەوە لەگەڵ تازە کردنەوەی دەستنوێژەکەدا ئەو کەسەی میزە چرکەی هەیە پەڕۆ یان لۆکە یان هەرشتێکی تر بەکار دێنێ هەتا میزەکە بەر لەشی نەکەوێت لە کاتی هاتنە خوارەوەیدا، ئەمانەش پێیان دەوترێ (**الحدث الدائم**) واتە: بێدەستنوێژی بەردەوام.

لە کتێبی (**صحيح فقه السنة**)دا دەڵێ ئەو ئافرەتەی خوێنی نەخۆشی هەیە بە بەردەوامی بۆ هەموو نوێژێ پێویست نییە دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژەکەی نەشکا.

ئوم حەبیبە (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەو جۆرە خوێنە، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) پێی فەرموو: بە ئەندازەی خوێنی حەیزەکە بمێنەرەوە پاشان خۆت بشۆ و نوێژەکانت بکە[٢]. صحيح.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: "جاءت فاطمة ابنة أبي حبيش الى النبي ﷺ فقالت: يا رسول الله ﷺ إني امرأة استحاض فلا أطهر افأدع الصلاة؟ فقال: لا، إنما ذلك عرق، وليس بحيض فإذا أقبلت حيضتك فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغسلي عنك الدم ثم صلي".**[٣] صحيح. واتە لە عائشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی فاتیمەی کچی ئەبی حوبەیش هاتە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)و وتی ئەی پێغەمبەری خوا من ئافرەتێکم خوێنی نەخۆشیم هەیەو پاك نابمەوە، ئایا واز لە نوێژەکانم بێنم؟ فەرمووی نەخێر ئەوە دەمارەو خوێنی حەیز نییە، ئەگەر ماوەی حەیزەکەت هات واز لە نوێژ بێنە، ئەگەر ماوەکە بەسەر چوو خۆت بشۆو خوێنەکە لە خۆت بشۆرەوە و پاشان نوێژ بکە.

---

[1] التغابن/ ١٦.

[2] أخرجه مسلم، وأبو داود ٢٧٩، والنسائي، صحيح فقه السنة، ج١ / ص٢١٦.

[3] أخرجه البخاري ٢٢٦، ومسلم ٣٣٣ وغيرهما، صحيح فقه السنة، ج١ / ص٢١٦ـ ٢١٧.

پێغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ) مۆڵەتی ئەم ئافرەتەی دا کە نوێژەکانی بکات با بەردەوامیش خوێنی هەبێ و بۆی رانەگیرێ بێجگە لە کاتی بێنوێژییەکەی.

هەروەها پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ) بە حەمنەی کچی جەحشی فەرموو: **"انها ركضة من ركضات الشيطان فتحيّضي ستة أيام أو سبعة في علم الله ثم اغتسلي، حتى إذا رأيت انك قد طهرت واستنقيت فصلي أربعاً وعشرين ليلة أو ثلاثاً وعشرين وأيامهن وصومي، فإن ذلك يجزيكِ، وكذلك فافعلي في كل شهر كما تحيض النساء وكما يطهرن لميقات حيضهن وطهرهنّ".** [1] واتە: ئەوە فیت و دەستی شەیتانە، شەش رۆژ بە حەیز دانێ یان حەوت رۆژ لە یاسای خوا کە بۆ ئافرەتانی داناوە، پاشان خۆت بشۆرە هەتا خۆت بەپاك دەزانی و بێگومانی و بیست و چوار شەو یان بیست و سێ شەو بە رۆژەکانییەوە نوێژ بکەو رۆژوو بگرە، ئەوە بۆت بری دەکەوێ، هەموو مانگێ ئاوا بکە وەکو چۆن ئافرەتان بێنوێژ دەبن و پاك دەبنەوە لە کاتی بێنوێژی و پاکبوونەوەدا.

## نوێژ بەبێ دەستنوێژی گەورەو بچوکەوە

ئەگەر موسڵمانێك کەوتە حاڵەتێکەوەو لە شوێنێکدا قەتیس ماو نە ئاوی دەستکەوت بۆ دەستنوێژو نە گڵی دەست کەوت بۆ تەیەموم، یان ئاو و گڵ هەبوو، بەڵام دەسەڵاتی بەکارهێنانی نەبوو وەك بەندیخانە لەم حاڵەتەدا کە بابای موسڵمان خۆشتنیشی لەسەرەو واتە لەشگران و بێدەستنوێژە، نوێژەکەی دەکات و ناشیگێڕێتەوە لەسەر راسترین ئەو دوو رایەی لەم بارەوە هەیە کە رێبازی پێشەوا شافعی و پێشەوا ئەحمەدو هاورێکانیانە (رەحمەتی خوایان لێ بێ) هەروەها ئیبنوحەزمیش لەسەر هەمان رەئیەو ئیبن تەیمییەش (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەو رەئییەی هەڵبژاردووە. [2]

[1] أخرجه أبو داود ٢٨٧، والشافعي في الأم ١ / ٥١، وإبن ماجه ٦٢٢، والترمذي، الطهارة، باب ٩٥، وسنده لين، وقد حسنه الألباني في الإرواء، ٢٠٥ صحيح فقه السنة / ج١ / ص٢١٧.

[2] صحيح فقه السنة، ج١، ص٢٠٠.

## بەڵگەشیان هێناوەتەوە:

١ ـ بە فەرمودەی خوا **"فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ"**.[١] واتە: خۆپارێز بن لە نافەرمانی خوا بەگوێرەی توانا، نوێژنەکردنیش گەورەترین نافەرمانی خوایە.

٢ ـ خوا دەفەرموێت: **"لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا"**.[٢] واتە: خودا داواکاری و ئەرکێك ناخاتە سەر بەندەکانی کە لە توانایاندا نەبێت.

٣ ـ بە فەرمودەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) **"إذا أمرتكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم"**.[٣] واتە: ئەگەر فەرمانم پێدان کارێك بکەن بە گوێرەی توانا جێبەجێی بکەن.

چونکە لەو حاڵەتەدا ئەوەندەی لە توانایدایە ئەنجامی داوە و کەمتەرخەمی نەکردووە، ئەوەش لە توانایدا نییە ئەو لێی بەرپرسیار نییە، بەوەش ئەوەی ئەرکی شەرعیی سەرشانییەتی ئەنجامی داوە، هەرکەسیش ئەرکی سەرشانی ئەنجام بدا گێڕانەوەی لەسەر نییە.[٤]

٤ ـ **عن عائشة (رضي الله عنه) قالت: "بعث رسول الله ﷺ أسيد بن حضير ـ وأنا سامعة ـ في طلب قلادة أضلتها عائشة، فحضرت الصلاة فصلوا بغير وضوء، فأتوا النبي ﷺ فذكروا ذلك له فأنزلت آية التيمم "**.[٥] صحيح. واتە: لە عائشەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: "پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئوسەیدی کوڕی حوزەیری نارد بە پەیسەری ملوانکەکەی عائیشە کە وونی کردبوو ـ منیش گوێم لێ بوو ـ کاتی نوێژ هاتە پێش بەبێ دەستنوێژ نوێژیان کرد، هاتنەوە بۆ پێغەمبەریان گێڕایەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ئایەتی تەیەموم هاتە خوار، ئەمەش بەڵگەیە کە دروستە بۆیە پێغەمبەر بێدەنگ بوو.

---

[1] التغابن/ ١٦.

[2] البقرة / ٢٨٦.

[3] صحيح فقه السنة ج / ص٢٠٠.

[4] المصدر نفسه.

[5] أخرجه البخاري، ٥٨٨٢، ومسلم، ٧٩٥.

**و عن عائشة (رضي الله عنها) استعارت من أسماء قلادة فهلكت فبعث رسول الله ﷺ رجالا في طلبها فوجدوها فادركتم الصلاة وليس معهم ماء فصلو بغير ماء ووضوء، فلما أتوا رسول الله ﷺ شكوا اليه ذلك، فأنزل الله عزوجل آية التيمم".** [١]

واتە: عائیشەی دایکی بڕواداران (ڕەزای خوای لێ بێ) ملوانکەیەکی لە ئەسماء خواستبوو، لێی وون بوو، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) چەند پیاوێکی بەدوادا نارد، دۆزییانەوە، کاتی نوێژ هات، ئاویان پێ نەبوو بەبێ دەستنوێژ نوێژیان کرد، کاتێ گەڕانەوە بۆ پێغەمبەریان باسکرد، ئەوکاتە خوا ئایەتی تەیمومی ناردە خوارەوە.

---

[1] أخرجه البخاري في التيمم: "باب إذا لم يجد ماء ولا ترابا"، ٣٣٦ ومسلم ٣٦٧ وأحمد ٢٣٧٧٨".الرخص الفقهية في ضوء الكتاب والسنة. ص٢٧٤ـ ٢٧٥.

# نوێژی به کۆمەڵ

دینی پیرۆزی ئیسلام و پێغەمبەری پێشەوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) زۆر گرنگییان به نوێژی بەکۆمەڵ داوه، موسڵمانانیان هەڵناوه لەسەر ئەنجامدانی، چونکه دینی ئیسلام نەدینێکی دونیایی روتەو نەدینێکی قیامەتی روته، بەڵکو دینی دونیاو دوارۆژه هیچیان بێ ئەوی تریان وەرناگیرێ، گۆشەگیری له ئیسلامدا دروست نییەو سوننەت نییه هەروەکو پاڵدانەوەو خۆ له مزگەوت حەشاردانی شەوو رۆژ کار نەکردن و بوونه بار بەسەر خەڵکییەوه دروست نییەو حەرامه.

نوێژی به کۆمەڵ به دوو کەس ئەنجام ئەدرێت جا ئەو دوو کەسه دوو پیاو یان دوو ئافرەت یان پیاوێك و ئافرەتێك یان منالێك و پیاوێك وه منالێك و ئافرەتێك، ئەگەر زیاتریش بن خێری زیاتره.

کردنی نوێژ به جەماعەت جێبەجێکردنی فەرمانی خواو پێغەمبەره (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، بەڵکو سوننەت و ئاکاری تەواوی پێغەمبەرەکان بووه (سەلامی خوایان لێ بێ).

نوێژی جەماعەت بیست و حەوت، یان بیست و پێنج جار خێری زیاترەو پاداشتی زۆرتره له نوێژی تەنیا. نوێژی به کۆمەڵ بەتایبەتی له مزگەوتدا هاودەمی فریشتەکانەو بەشداریکردنی هەرەوەزێکه که فریشتەو ئادەمیه خواپەرست و باشەکان تیایدا بەشدارن.

فریشتەکان سەڵاوات ئەدەن له ریزی نوێژی به کۆمەڵ و داوای بەزەیی خوایان بۆ دەکەن و لەگەڵیاندا نوێژ دادەبەستن و ئامینیان لەگەڵ دەکەن و کڕنوش و سوژده دەبەن و نزاو پاڕانەوەی خێریان بۆ دەکەن، که گەڕانەوه ئاسمانیش شاهێدی خێریان بۆ ئەدەن بەتایبەتی فریشتەی ئێواران و بەیانیان دەڵێن خودایه که ئێمه چوین نوێژیان دەکرد که هاتینەوه هەر نوێژیان دەکرد واته هەر له نوێژدان و بێئاگا نین.

به نوێژی بەکۆمەڵەوه هەواڵی دۆست و خزم و ناسیاوو خۆشەویستان دەزانی، ئەوانیش هەواڵی تۆ دەزانن، ئاگاداریش دەبی له هەواڵو دەنگو باسی هاوبیرو هاودینەکانتو به خۆشیان خۆشحاڵ دەبێو بەشداریی مژدەو مزگێنیو شادییان دەبێ ـ بەبیستنی هەواڵی ناخۆشو خەفەت ئامێزیشیان، خەفەتبار دەبێ، بەشداری

خەموپەژارەی هاورێبازەکانت دەکەی و هەوڵی چارەسەری کێشەو گرفتیان ئەدەی، بەشداریی ئاشتبوونەوەو ئاشتەواییان دەکەی، پرسەو ماتەمینیان لەگەڵ دەگێڕی، سەردانی نەخۆشیان دەکەی، یارمەتی هەتیوو بێوەژن و هەتیوبارو لێقەوماویان دەدەی. هەموو ئەو کارانە بەشێکن لە خواپەرستی و پاداشتیان لەسەر وەردەگیرێ.

ئەو کەسەی دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت) هەر بە خۆئامادەکردن و دەستنوێژ شۆردن لەماڵەوە تاوان وگوناهی لێ هەڵدەوەرێ و بە هەموو هەنگاوێك چاکەی بۆ دەنوسرێ و بەوی تریش گوناهی لێ دەسڕێتەوەو پلەی بەرز دەبێتەوە.

بە رۆیشتنی بۆ نوێژی بە کۆمەڵ هەست دەکات دەچێتە ماڵی خواو دەبێتە میوانی خواو میوانیش لە لای خوا زۆر بەڕێزە و شایستەی لا لێکردنەوە و ڕێزلێنانە.

کەسی بەشداربوو لە نوێژی بەکۆمەڵ هەست دەکات لە خوای خۆی نزیکە بە هۆی جێبەجێکردنی فەرمانەکەی و بەشداری نوێژی بە کۆمەڵ و خۆخستنە ماڵەکەی و هەڵوەرینی ئەو هەموو گوناهو تاوانەی بە هۆی هاتنە مزگەوت و دەستنوێژ و نوێژە بە کۆمەڵەکەی بۆی سڕاونەتەوە، هەست دەکات خوا خۆشی دەوێ بۆیە گوناهی بۆ دەسڕێتەوە و چاکەی بۆ دەنوسێ، هەست دەکات بە چوونی بۆ مزگەوت بەرەوپیری پەروەردگاری خۆی دەچێ و خواش زیاتر لێی نزیك دەبێتەوە.

ئەگەر ئەنجامدانی ئەو نوێژە بەکۆمەڵە لە مزگەوت بوو هەست دەکات لە شوێنێکی ئەمینە، لە شوێنێکی پاك و خاوێنە، لەگەڵ کەسانێکە بۆ مەبەستی چاك و کردەوەی چاك کۆبۆتەوە, چاوەڕێی چاکەیان لێدەکرێ، چونکە مزگەوت بۆ خوایە تەنها فەرمانی خوا تیادا ئەنجام ئەدرێ، خواش فەرمان بە خراپە ناکات. لە ماڵی و لە خوێنی و لە گیانی و لە شەرەف و ناموسی ئەمینە. چونکە مزگەوت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ پەرچ و لەمپەری تێدا نییە شەرمی ناوێ لە دەرگادانی تێدا نییە، فەرمووی ناوێ ماڵی هەمووانە. نیشانەی ئیمانە، هۆڵی کۆبوونەوەی موسڵمان و فریشتەکانە، لەوێ بەزەیی خوادا دەبارێ، خەڵکیی لەوێ ئارام دەکرێن لە لایەن خواوە, نەرم و نیانن، کەس بۆی نییە دەنگ بەرز بکاتەوە, کەس کەسی پێ دەرناکرێ.

نوێژی بە کۆمەڵ موسڵمان فێری ئەدەب و ڕێز و گوێڕایەڵی پێشەواو فەرماندەی خۆیان دەکات، نابێ کەس پێش پێشەوا بکەوێ, نابێ کەس بجوڵێ و دەنگ بەرز

بکاتەوەو لە خەڵکیی تورە بێ, چاوبەرز کاتەوە و سنگ دەرپەڕێنێ و بۆنی ناخۆش بەکاربێنێ و پیازو سیر و شتی بۆن ناخۆش بخوات، نابێ تف و پیسی لە مزگەوتا فڕێ بدات، دەبێ هەموو هۆکاری چاك و بەسوودو خزمەتگوزار بەکاربهێنرێ بۆ میوانە بەڕێزەکانی خوای پەروەردگار، لە نوێژی بە کۆمەڵدا یەکسانیو یەکریزیو تەبایی بڕواداران دیمەنێکی ناوازەیەو وێنەی نییە، هەژارو دەوڵەمەند، کەسدارو بێ کەس، گەورەو بچوك، نێرو مێ، پاشاو گەدا، موسڵمانی سەد ساڵەو نۆ موسڵمان و تازە تۆبەکار هەموو لە یەك ریزدان و شان بەشانی یەکتر دەوەستن، عەرەب و عەجەم ـ سوورو سپی و رەش بەدڵی پڕ ئیمان بە رووی گەش, کەس پێش کەس ناکەوێ, کەس هەنگاو بەسەر کەسدا نانێ، کەس ناچێتە پێشەوەو خەڵکی بۆ دواوە پاڵ نانێ. روو بەیەك رووگە، روو لە یەك خوا ـ خاوەنی یەك دین و بەرنامە، یەك کتێب پەیڕەوە، یەك کەس پێشنوێژەو ئیمامە.

بەیەکەوە نوێژ دادەبەستن، کڕنوش و سوژدە دەبەن رادەوەستن ـ رقەبەرایەتی و کێبەرکێ ناکەن خاوەنی یەك بیرو هەستن ـ نەشێتن، نەپیسن، نەمەستن، یەك ریزن یەك مەبەستن، کاردەکەن نوێژ دەکەن ناوەستن, دوژمنی خراپەن لە شەیتان پەستن، بە فەرمانی پێشەوای خۆیان دادەنیشن هەڵدەستن, گوێ لە مستن، خۆ پەرست نین خواپەرستن، یەك لاشەن، یەك گیانن، یەك هەست و نەستن، کەس تەمەڵی ناکا دواناکەوێ, کەس پەلە ناکا پێش ناکەوێ ـ کەس بێ ئاگاداری هەڵناستێو نانەوێ, گوێ لەسەر هەستن، کەس ناخەوێ، کەس سەرپێچی ناکا نارەوێ, بە رۆژی روون بێ یا لە تاریکی شەوێ. کە نوێژیش تەواو بوو و هەموویان بەیەکەوە بەڕاست و چەپا سەلام ئەدەنەوە, هەتا بە عالەمی بسەلمێنن کە راستکاران و چەپکاران لە ئێمە سەلامەتن، نوێژ فێری کردین دەبێ زەرەرو زیانمان بۆ کەس نەبێ، ئەمە مشتێ لە خەرواریێ، لە سوودی نوێژی بە کۆمەڵ.

## گەورەیی و پلە و پایەی نوێژی بە کۆمەڵ

نوێژی بە کۆمەڵ سوننەتی پێغەمبەرەکان و رەوشت و رێبازی فریشتەکان و داب و ئاکاری پیاوچاکان و خواپەرستانە، هەر نوێژێك بە کۆمەڵ بکرێ خێری زیاترە لە بیست و حەوت یان بیست و پێنج نوێژ کە بە تەنها بکرێ، تەنها وتنی ئامینێك لەگەڵ پێش

نوێژدا بكرێ دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەكان و لێخۆش بوونی خوا، خوای گەورە سەیری ریزەكانی نوێژ دەكات و خۆی و فریشتەكانی سەڵاواتیان لەسەر ئەدەن، فریشتەكان داوای لێخۆشبوون و بەزەیی خوایان بۆ دەكەنو خوداش لێیان خۆش دەبێتو رەزامەندی خۆی دەكاتە خەڵاتیان.

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) أن رسول الله ﷺ قال: "صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة".**[١] واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "نوێژی بە كۆمەڵ باشترەو خێری زیاترە لە نوێژی تاك بە بیست و حەوت پلە".

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نە لە ماڵەوەو لە نیشتەجێی و نە لە سەفەرو گەشت و گەڕان و نە لە كاتی جەنگ و ترس و بیمدا نوێژی بە كۆمەڵی واز لێنەهێناوەو مۆڵەتی بە كەس نەداوە كەمتەرخەمی تێدا بكات.

سەڵاحەددین (رەحمەتی خوای لێ بێت) زۆر سوور بووە لەسەر كردنی نوێژ بە كۆمەڵ ئەگەر نەخۆشیش بووایە پێش نوێژی بانگ دەكرد و بە زۆر هەڵدەستاو نوێژەكەی بە كۆمەڵ دەكرد.[٢]

پێشەوا تەبەرانی (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە عەنبەسەی كوڕی ئەزهەرەوە گێڕاویەتەوە كە فەرموویەتی حارسی كوڕی حەسسان كە هاوڕێی بووە ژنی هێنا، وتیان دێیتە نوێژی بەیانی كە ئەمشەو ژنت گواستۆتەوە؟ فەرمووی: واللە ژنێك رێی نوێژی بەیانیم لێ بگرێ ژنێكی خراپ و بەدە.[٣]

سەعیدی كوڕی موسەییب (رەحمەتی خوای لێ بێت) چاو ئێشەی گرتبوو وتیان دەرمانی تێكە، بەڵام نابێ بۆ جەماعەتی خەوتنان و بەیانی بچێت فەرمووی: دەرمانی وا بەكار ناهێنم.[٤]

---

[١] متفق عليه، البخاري ٦١٩ ومسلم ٦٥٠.

[٤٩٥] ـ صلاح الأمة، ج٦، ص١٩١.

[3] صلاح الأمة، ج٦ / ص٣٦٢.

[4] صلاح الأمة، ج٦ / ص١٩١.

کەسی وا هەبووە نەخۆش بووە بە کۆڵ یان دوو کەس چونە بن باڵی هێناویانە بۆ مزگەوت.[1]

پێشەوا عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) بە ڕێگەدا دەڕۆیشتو بانگی دەکرد (نوێژ، نوێژ)، خەڵکی هەڵدەستاند بۆ نوێژی بەیانی، هەموو ڕۆژێ ئەمە کاری بوو، تەنانەت ئەو ڕۆژەش کە بریندار کرا بەهەمان شێوەی کردووە.[2]

لە ئەبی حەرمەلەوە لە ئیبنو موسەییبی گێڕاوەتەوە فەرموویەتی: (نوێژی جەماعەتم لێ نەفەوتاوە ماوەی چل ساڵە)، لەلایەکی تریشەوە فەرموویەتی: (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنم لە دەست نەچووە ماوەی پەنجا ساڵە، ماوەی پەنجا ساڵە لە نوێژدا سەیری پشتە ملی کەسم نەکردووە.[3] واتە: لە ڕیزی یەکەم نەبێ نوێژم نەکردووە.

أبو عبدالرحمن السلمي (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە نەخۆشی مەرگدا بوو لە مزگەوت چاوەڕێی نوێژی دەکرد، ڕازی نەبوو و ئامادەش نەبوو لەسەرەمەرگو گیانەڵادا مزگەوت بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە ماڵەوە و نوێژە بە کۆمەڵەکەی بفەوتێنێ.[4]

خوای پاکو بێگەرد هەر کارێکی پێخۆش بوو لە بکەری ئەو کارە خۆش دەبێ، نوێژی جەماعەت یەکێکە لەو کارانەی خوا پێی خۆشە.

**عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "إن الله ليعجب من الصلاة في الجميع".**[5] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: بەڕاستیی خودا نوێژی جەماعەتی زۆر پێخۆشە.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت: **"إن الرجل إذا صلى مع الإمام كتب له قيام الليلة". صحيح.**[6] واتە: بەڕاستیی ئەگەر پیاوێك

---

[1] صلاح الأمة، ج٦ / ص١٩١.

[2] صلاح الأمة، ج٦ / ص٣٦٧.

[3] صلاح الأمة، ج٦ / ص٣٧٣.

[4] صلاح الأمة، ج٦ / ص٣٦٣.

[5] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٣١.

[6] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٦١٥. بە ڕیوایەتێکی تریشی هاتووە بەهەمان واتا بە ژمارەی ٢٤١٧.

لەگەڵ پێشنوێژدا نوێژی کرد هەتا بڵاوەی لێ دەکات خێری یەك شەو شەونوێژی بۆ دەنوسرێ.

## نوێژی بەکۆمەڵ خێری ( یان ) چەندانەیە

هەموو کارێکی بەکۆمەڵ و بەدەستەو جەماعەت خێری زۆرترە لە کاری تەنهاو تاکە کەسی. بێجگە لە شەونوێژ و خێرکردن و چەند شتێکی تر، نوێژی فەرز بەکۆمەڵ بکرێت خێرو پاداشتی زۆر زیاتر لە نوێژی بەتەنها.

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) إن رسول الله ﷺ قال: "صلاة الجماعة افضل من صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة".**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "نوێژی بەکۆمەڵ خێرترە لە نوێژی بەتەنها بە بیست و حەوت پلە".

**وعن إبن هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "صلاة الرجل في الجماعة يُضعف على صلاته في بيته وفي سوقه خمساً وعشرين درجة، وذلك إذا توضأ فأحسن الوضوء ثم خرج إلى المسجد لايخرجه إلى للصلاة، لم يحط خطوة إلى رفعت له بهادرجة، وحطت عنه بهاخطيئة، فإذا صلى لم تزل الملائكة تصلى عليه مادام في الصلاة، مالم يحدث تقول: اللهم صل عليه، اللهم ارحمهُ، ولايزال في الصلاة ماانتظر الصلاة".**[2] **واللفظ للبخارى.**

واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "نوێژی پیاوێك بەکۆمەڵ بەسەر نوێژی ماڵەوەو بازاڕیدا بیست و پێنج پلەیە، ئەوەش بە جوانی دەستنوێژی گرت، ئینجا دەرچوو بۆ مزگەوت تەنها لەبەر نوێژیش هاتبووە دەرەوە، یەك هەنگاو نانێت کە پلەیەك پێی بەرز نەبێتەوە و تاوانێکی لێ نەسڕێتەوە، کە نوێژیشی کرد بەردەوام فریشتە سڵاواتی لەسەر ئەدەن هەتا لە سوژدەگاکەیدا بێت بێ دەستنوێژ نەبووبێت

---

[1] متفق عليه البخاري ٦١٩ ومسلم٦٥٠، رياض الصالحين رقم ١٠٦٤.

[2] البخاري ٦٢٠، ـ مسلم ـ ٦٥٠ / رياض الصالحين رقم ١٠٦٥.

دەڵێن: "خودایە لێی خۆش بە، خودایە بەزەییت پێدا بێتەوە، هەر لە نوێژیشدا هەتا چاوەڕێی نوێژ بکات".

**عن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "من صلى العشاء في الجماعة فكأنما صلى نصف الليل، ومن صلى الصبح في الجماعة فكانما صلى الليل كله".**[1] واتە: لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: هەرکەس نوێژی خەوتنان بە کۆمەڵ بکات هەروەکو نیوەی شەوەکە شەونوێژی کردبێت وایە، هەرکەسیش نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات هەروەکو هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێت وایە.

وە لە ریوایەتی پێشەوا **"الترمذي"** داهاتووە: **عن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من شهد العشاء في الجماعة كان له قيام نصف ليلة، ومن صلى العشاء والفجر في الجماعة كان له كقيام ليلة".**[2] واتە: لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "هەرکەس ئامادەی نوێژی خەوتنانی بێ بە کۆمەڵ، وەکو نیوەی شەو، کە شەونوێژی کردبێ، هەرکەس ئامادەی نوێژی خەوتنان و بەیانی بێت و بە کۆمەڵ ئەو دوو نوێژە بکات وەکو هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێ وایە".

## نوێژی بە کۆمەڵ سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەرە لە نوێژی فەرز و سوننەتدا

پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) هەرگیز لە نوێژی بە کۆمەڵ دوانەکەوتووە لە ماڵەوە، نە لە سەفەرو گەشتوگوزار تەنانەت لە جەنگ و جیهادو غەزای کافرانیش دا، لە گەشتی ئاسمان و شەوڕەوی و بەرزبوونەوەشیدا.

---

[1] رواه مسلم ٦٥٦ والترمذي ٢٢١ وأبو داود ٥٥٥ ورياض الصالحين ١٠٧١ وصحيح فقه السنة ج١ ص٥٠٥.

[2] رواه الترمذي ٢٢١ وقال حديث حسن الصحيح.

عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: من سره أن يلقى الله تعالى غدا مسلما فليحافظ على هؤلاء الصلوات حيث ينادي بهن فان الله شرع لنبيكم ﷺ سنن الهدى، ولو أنكم صليتم في بيوتكم كما يصلي هذا المتخلف في بيته لتركتم سنة نبيكم لضللتم، ولقد رأيتنا وما يتخلف عنها إلا منافق معلوم النفاق، ولقد كان الرجل يؤتى به يهادي بين الرجلين حتى يقام في الصف".[1] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەرکەس پێی خۆشە سبەینێ بە موسڵمانەتی بە حزووری خوا بگات، با پارێزگاریی لەو نوێژانە بکات، کە بانگیان بۆ ئەدرێت، بێگومان خوا بۆ پێغەمبەرەکەتان ڕەفتاری ڕێنوماکەری دارِشتوە، ئەو نوێژانە ڕەفتاری ڕێنوماکەرن، ئەگەر ئێوە نوێژەکانتان لەماڵەوە بکەن وەکو ئەو کەسەی خۆی مەلاس دەدات لە ماڵەکەیدا، ئەوە وازتان هێناوە لە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان، ئەگەر وازیشتان لە سوننەتی پێغەمبەرەکەتان هێنا گومڕا دەبن، دەمانبینی کەسمان لێیان دوا نەدەکەوت مەگەر دووڕوێك بەئاشکرا دووڕوییی بکات، تەنانەت پیاوی وایان دەهێنا خۆی بەسەر دوو کەسدا داوە هەتا لە ریزەکەدا رادەوەستا.

هاوەڵانی پێغەمبەرو شوێنکەوتوانیان و زانایان و پیاوچاکان و خواپەرستان ئەو سوننەت و ڕێ و ڕەوشتەیان فەرامۆش نەکردووە بەڵکو زۆر زیاتر لەوەی بەخەیاڵیدا بێت گرنگییان پێداوە، فەرماندەی شاری مەککە کە لە لایەن پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دانرابوو ناوی (**عتّاب بن أسيد الأموي**) بوو هەڕەشەی کوشتن و لە گەردندانی کردبوو لە هەرکەس (خۆی بە موسڵمان بزانێ)و دوابکەوێت لە نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوت.[2]

## نوێژی بە کۆمەڵ باوەڕدار دەپارێزێت لە شەیتان و فەوتان

هەموو پەرستنێك بە ئەندازەی کاریگەری لەسەر گیان و دەروونی ئادەمیزاد دەبێتە قەڵغان و سوپەر بۆ پاراستنی موسڵمان لە پیلانی شەیتان، هەر چۆن پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی (ڕەزای خوایان لێ

---

[1] رواه مسلم رقم (٦٥٤) ٤٥٣/١. رياض الصالحين ١٠٦.

[2] صلاح الأمة، ج٢/ ص٣٦٧.

بێت) فەرموو: "**احفظ الله يحفظك**". واتە: "سنووری شەرعی خوا بپارێزە خودا دەتپارێزێ". بە نوێژنەکردنیش گەورەترین کەلێن لە سنووری خوا دەبێت.

**عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "مامن ثلاثة في قرية و لابدو لا تقام فيهم الصلاة الاّ قد استحوذ عليهم الشيطان فعليكم بالجماعة، فانما يأكل الذئب من الغنم القاصية"**[1]. واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: "هەر سێ کەسێك لە گوندێك یان دەوارنشینێکدا بە کۆمەڵ نوێژ نەکەن، حەتمەن شەیتان سوار سەریان بووەو زاڵ بووە بەسەریاندا، ئاگاتان لە (کۆمەڵی موسڵمانان) بێت، بێگومان گورگ بزنی لاکەوتەو پەڕاگەندە دەخوات".

## گرنگی دان بە نوێژی بە کۆمەڵ و ریزەکانی نوێژ

پێغەمبەری ئیسلام (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) زۆر گرنگی داوە بە نوێژی بە کۆمەڵ، تەنانەت لە سەفەرو جەنگ و غەزاو ترس و نەخۆشیشیدا وازی لێ نەهێناوەو کەمتەرخەمی تیا نەکردووە، بەڵکو ڕێگەی داوە بە ژن و منداڵ و کەسانێکی تریش کە لە زۆر ئەرکی شەرعی چاوپۆشییان لێ کراوەو باری سەر شانیان ئاسان کراوە بێنە مزگەوت و نوێژەکانیان بە کۆمەڵ بکەن و بەشداری ئەو خێرە گەورە بکەن ئەگەر نەشیان توانی دەتوانن لە ماڵەوە نوێژەکانیان بە کۆمەڵ بکەن، هەروەها لە دەشت و دەرو شاخ و چیاو بیابان.

## فریشتەکان بەشداریی نوێژی بە کۆمەڵ دەکەن، خۆشیان لە ئاسمان بە کۆمەڵ نوێژ دەکەن

لە گەشتی شەوڕەوی‌و بەرزبوونەوەدا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) نوێژی بە کۆمەڵی کرد بۆ پێغەمبەرەکان لە قودس (سەڵاتو سەلامی خوای لێ

---

[1] رواه أبو داود، ٥٤٧ باسناد حسن، ورياض الصالحين، ١٠٧٠، ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير وزيادته، رقم ٢٥.

بێت)، تەنانەت ئەوەندە گرنگی دراوە بە نوێژی بەکۆمەڵ پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) مۆڵەت‌و ئیزنی شەل‌و کوێرو نەخۆش‌و دوورە مزگەوتیشی نەداوە لە نوێژی بە کۆمەڵ دواکەوێت، هەتا کار گەیشتۆتە ئەوەی پێغەمبەر هەڕەشەی ماڵ سووتان و ماڵ بەسەردا روخانی کردووە لەوانەی تەممەڵی و کەمتەرخەمییان کردووە لە نوێژی بە کۆمەڵ.

دەربارەی کەسێکیش نوێژی بەتەنها کردبێت و دواتر نوێژی (الجماعە) بەکۆمەڵ ساز کرا پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) پێی فەرمووە: **"صلِّ الصلاة لوقتها فان أدركت معهم فصلِّ ولا تقل إني صليت فلا أصلي".**[1] صحیح. واتە: نوێژ لە کاتی خۆیدا بکە، ئەگەر فریای نوێژی جەماعەتیش کەوتی لەگەڵیان بە کۆمەڵ نوێژ بکەو مەڵێ نوێژم کردووەو نایکەمەوە.

تەنانەت هەندێ لە پێشەوایان فەرمویانە ئەگەر بە هۆی روبارو چەم و ئاوەوە نەدەگەیشتیە پێشنوێژ هەتا جەماعەتی لەگەڵ بکەیت لەوبەری دەریاکەوە نوێژی لە دواوە دادەبەستی بەنیازی نوێژی بە کۆمەڵ هەرچەند کەشتی و بەلەمیش بەناو ئاوەکەدا بڕوات، پێشەوایان (مالیك و شافعی) (رەحمەتی خوایان لێ بێت) خاوەنی ئەم رایەن، شێخ حەسەنی بەصریش فەرموویەتی (لا بأس أن تصلي وبينك وبينهم نهر). واتە: هیچی تیا نییەو خراپ نییە کە نوێژ بەجەماعەت بکەیت لە دوای پێشنوێژێکەوە لە نێوانتاندا روبار هەبێت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "أحسنوا إقامة الصفوف في الصلاة"**[2] (صحیح). واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: **"**جوان ریزەکانی نوێژ رێك بخەن**"**.

**عن جابر بن سمرة (رضي الله عنه) قال: "قال رسول الله ﷺ ألا تصفون كما تصف الملائكة عند ربها يتمون الصلاة بالصفوف الأول ويتراصّون في الصف".** واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و

---

[1] صحيح الجامع الصغير، ٣٧٧١.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته، ١٩٥، صحيح الترغيب ٤٩٩.

سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: "ئەریّ ریز نابن وەکو فریشتەکان ریز دەبەستن لە لای پەروەردگاریان؟ نویّژ دەکەن بە تەواوکردنی ریزی یەکەم و ریّك و پیّك وەستان لە ریزدا".

## نویّژی بە کۆمەڵ قەڵغانە لە ئاگری دۆزەخ

نویّژی بەکۆمەڵ خاوەنەکەی لە خوا نزیك دەکاتەوە و پلەی بەرز دەکاتەوە و خیّری چەند قات بۆ دەنوسریّ و بەر لیّخۆشبوونی خوا دەکەویّ.

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى الله أربعين يوما في جماعة يدرك التكبيرة الأولى كتب له براءتان: براءة من النار، وبراة من النفاق".**[1] واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: پیّغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: "هەرکەس چل نویّژ بە جەماعەت بکات لەبەر خوا فریای (الله أكبر)ی نویّژدابەستن بکەویّت، دووربوون لە دوو شتی بۆ دەنووسریّ: بیّبەش و دووربوون لە ئاگرو دووربوون لە دووڕوویی".

## پەیوەست بوون و دابڕان لە خودا بە پەیوەست بوون و دابڕانی نویّژەوەیە

**عن إبن عمر (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "أقيموا الصفوف وحاذوا بين المناكب وسدوا الخلل، ولينوا بأيدي إخوانكم ولا تذروا فرجات للشيطان، ومن وصل صفاً وصله الله ومن قطع صفاً قطعه الله".**[2] واتە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لیّ بیّت) کە پیّغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: ریزەکانی نویّژ ریّك بخەن، شانتان لە ریّکی یەك بیّت، کەلەبەرەکان پڕ بکەنەوە، نەرم بن بەدەست براکانتانەوەو کونو کەلەبەر مەهیّڵنەوە بۆ شەیتان، هەرکەس ریزیّك پەیوەست بکات، خوا پەیوەستی دەکات بە خۆیەوە، هەرکەسیش ریزیّك بپچڕیّنیّت خوا لە خۆی دادەبڕیّت.

---

[1] صلاح الأمة، ج٢/ ص٣٣١. وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٦٣٦٥. وقال حديث حسن. والترغيب ٤٠٧.

[2] حديث حسن أخرجه أبو داود ٦٦٦ والنسائي ٢ / ٩٧، صحيح فقه السنة، ج١، ص٥٣٦.

**عن عائشة (رضي الله عنها) أن رسول الله ﷺ قال: "إن الله تعالى وملائكته يصلون على الذين يصلون الصفوف ومن سدّ فرجة رفعه الله بها درجة"**[١]. واته: له عائشه‌وه (ره‌زای خوای لیّ بیّت) پیّغه‌مبه‌ری خوا (سه‌لاّت‌و سه‌لامی خوای لیّ بیّ) فه‌رمووی "خوا و فریشته‌كان سه‌لاّوات ئه‌ده‌ن له‌سه‌ر ئه‌وانه‌ی ریزه‌كانی نویّژ په‌یوه‌ست ده‌كه‌ن هه‌ركه‌سیش كه‌له‌به‌ریّك پڕ بكاته‌وه له ریزی نویّژدا خوا پله‌یه‌ك به‌رزی ده‌كاته‌وه".

## پله‌و پایه‌ی ریزه‌كانی نویّژ

ڕیزبوون له كاتی نویّژدا سوننه‌ت‌و ره‌وشت‌و ئاكاری پیّغه‌مبه‌ره‌كان‌و فریشته‌كان‌و حه‌واری‌و هاوه‌ڵی پیّغه‌مبه‌ره‌كانه، خوداش پاداشتی تایبه‌تی و ناوازه‌ی داناوه‌و بڕیاری داوه بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له ریزی نویّژدا خۆیان جۆش داوه. پیّغه‌مبه‌ری خوا (سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بیّت) ئاماژه‌ی پیّ كردووه له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا:

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "لو يعلم الناس مافي النداء والصف الأول، ثم لم يجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا"**.[٢]واته: له ئه‌بی هوره‌یره‌وه (ره‌زای خوای لیّ بیّت) پیّغه‌مبه‌ری خوا (سه‌لاّت‌و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بیّت) فه‌رموویه‌تی: "ئه‌گه‌ر خه‌ڵك بیانزانیایه چی خیّریّك له بانگ‌و ریزی یه‌كه‌می نویّژدا هه‌یه، ئینجا ده‌ستیان لیّ گیر نه‌بووایه به تیروپشك نه‌بیّت، تیروپشكیان بۆ ده‌كرد".

**عن جابر بن سمرة (رضي الله عنهما) قال: خرج علينا رسول الله ﷺ فقال: الا تصفون كما تصف الملائكة عند ربها؟ فقلنا: يارسول الله كيف تصف الملائكة عند ربها قال: يتمون الصفوف الأول، ويترابصون في الصف"**.[٣]واته: له جابری كوڕی سه‌مووره‌وه (ره‌زای خوایان له‌سه‌ربیّت) فه‌رمووی: پیّغه‌مبه‌ر (سه‌لاّت‌و سه‌لامی

---

[1] سنن إبن ماجه ٩٩٥، ومسند أحمد ٢٤٦٣١، ومستدرك الحاكم باسناد حسن، عالم الملائكة الأبرار، ص٥٥

[2] متفق عليه، البخاري ٥٩٠ ومسلم ٤٣٧، ورياض الصالحين ١٠٨٣.

[3] رواه مسلم ٤٣٠ ورياض الصالحين ١٠٨٢.

خوای لەسەر بێت) هاتە ناومان فەرمووی ئەرێ بۆ ریز نابن وەکو فریشتەکان ریز دەبەستن لای پەروەردگاریان، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن فریشتە ریز دەبەستن لای پەروەردگاریان؟ فەرمووی: ریزی یەکەم تەواو دەکەن‌و لە ریزەکانیشدا رێك‌و پێك دەوەستن؟.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "سووا صفوفكم فان تسوية الصفوف من تمام الصلاة".**[1] واتە: لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (سەلاّت‌و سەلامی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: ریزەکانتان رێك بخەن، بێگومان رێکخستنی ریزەکان بەشێکە لە تەواوکردنی نوێژ.

**وفي رواية البخاري: "فان تسوية الصفوف من إقامة الصلاة".** واتە: بێگومان رێك‌و پێك خستنی ریزەکانی نوێژ، بەشێکە لە چاك ئەنجامدانی نوێژ.

تەنانەت ریزەکانی نوێژ ئەوەندە جێگەی گرنگی پێدانە لە شەرعی ئیسلامدا کە پێغەمبەری خودا بەدەستی پیرۆزی خۆی نوێژخوێنەکانی ریز دەکرد.

**روى مسلم أن رسول الله ﷺ "كان يسوّي صفوفنا حتى كانما يسوى بها القداح حتى رأى أنا قد عقلنا عنه ثم خرج يوما فقام حتى كاد يكبر، فرأى رجلا باديا صدره من الصف، فقال: عباد الله، لتسون صفوفكم أو ليخالفن الله بين وجوهكم".**[2] واتە: پێغەمبەر (سەلاّت‌و سەلامی خوای لێ بێت) ریزەکانی نوێژی بۆ رێك دەخستین. وەك رێکخستنی تیرەکان لەناو تیرداندا، هەتا زانی فێربووین و لێی حالّی بووین، پاشان رۆژێکیان هات‌و هەستا بۆ نوێژ، خەریك بوو (الله أكبر) بکات‌و نوێژ دابەستێ بینی پیاوێك سنگی دەرپەڕاندووە لە ریزەکەدا، فەرمووی: بەندەکانی خودا هەردەبێ ریزەکانتان رێك‌و پێك بکەن، یان خودا جیاوازیی دەخاتە نێوان روخسارتان. یان دووبەرەکی دەخاتە نێوانتانەوە.[3]

---

[1] مسلم ٤٣٣، ورياض الصالحين ١٠٨٧.

[2] رواه مسلم ٤٣٦، ١٢٨، ورياض الصالحين ١٠٨٩.

[3] فتح الباري، ٢٠٧/٢.

**عن البراء (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ قال: "ان الله وملائكته يصلون على الصفوف المقدمة"**[1]. واته: له بەڕائەوه (رەزای خوای لیّ بیّ) له پیّغەمبەری خواوه (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّ) فەرمووویەتی: "بیّگومان خواو فریشتەکان سەلاّوات ئەدەن لەسەر ریزەکانی پیّشەوه".

**عن جابر رضي الله عنه عن النبي ﷺ "أن من تمام الصلاة إقامة الصف"**.[2] واته: له جابرەوه (رەزای خوای لیّ بیّ) له پیّغەمبەرەوه (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بیّت) بیّگومان له تەواوکەری نویّژه ریّککردنی ریزەکانی نویّژ.

له فەرمودەی تردا هاتووه که پیّغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بیّت) قەشەنگیو جوانی نویّژی بەستۆتەوه به ئەندازەی ریّكو پیّکی ریزەکانی نویّژ، وەکو دەفەرمویّت: **"أقيموا الصفوف في الصلاة، فإن إقامة الصف من حسن الصلاة"**.[3] واته: ریزەکانی نویّژ ریّكو پیّك بکەن، بەڕاستیی جوانیو رەونەقی نویّژ له ریّكو پیّك کردنی ریزەکاندایە.

## کەمتەرخەمی له نویّژی به کۆمەڵ

پیّغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بیّت) هەڕەشەی زۆر توندی کردووه لەو کەسانەی کەمتەرخەمیو ساردو سڕییان نواندوه له کردنی نویّژی به کۆمەڵ.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "والذي نفسي بيده لقد هممت أن آمر بحطب فيحطب ثم آمر بالصلاة فيؤذن لها، ثم آمر رجلا فيؤم الناس، ثم اخالف الى رجال فاحرق عليهم بيوتهم، والذى نفسي بيده لو يعلم أحدهم انه يجد عرقا سمينا أو مرماتين حسنتين لشهد العشاء"**.[4] واته: له ئەبی هورەیرەوه (رەزای خوای لیّ بیّ) پیّغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّ)

---

[1] صحيح/ صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٨٤٢. صحيح الترغيب ٤٩٣.

[2] صحيح / صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٢٢٥.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١١٨٨.

[4] صحيح أخرجه البخاري ٦٤٤ ومسلم ٦٥١ وصحيح فقه السنة ج١، ص٢٠٦.

فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە بەڕاستیی خۆم ئامادە کرد بڕیار بدەم کە چیلکەو دار کۆبکرێتەوە ئینجا فەرمان بکەم بانگ بدرێ ئینجا فەرمان بکەم بە پیاوێك پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکاتو خۆشم خۆم داهەنگێوم بۆ پیاوانێك ماڵەکانیان بە سەردا بسوتێنم، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە.... ئەگەر یەکێکیان گرتکێکی چەور یان دوو سنجوق کە سنجوقێنیان پێ بکات دەهاتە نوێژی خەوتنان.

**وعن أبي سعيد الخدری (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ "رأى في أصحابه تأخرا، فقال لهم: تقدموا فأتموا بي، وليأتم بكم من بعدكم، لا يزال قوم يتأخرون حتى يؤخرهم الله".**[1] واتە: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) کەمتەرخەمی و دواکەوتنی بینی لە هاوەڵەکانیداو پێی فەرموون وەرنە پێش نوێژم لە دواوە بکەن با ئەوانەی دواتانەوەش نوێژ لە دوای ئێوەوە بکەن، بەردەوام کەسانێك خۆ دوا دەخەن هەتا خواش دوایان دەخات.

## شەیتان بە هۆی کەلێنی ریزەکانی نوێژەوە گێچەڵو زێفەر بە موسڵمانان دەبات

بە گوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) شەیتان بە بۆشایی لاشەی ئادەمیزاد و بەناو خوێنبەرو خوێنهێنەرەکاندا دێو دەچێ لە هەر شوێنێکدا دەرفەت بێنێ دەستی خۆی دەوەشێنێ.

**عن أنس (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "رصوا صفوفكم وقاربوا بينها، وحاذوا بالأعناق فوالذي نفسي بيده إني لأرى الشيطان يدخل من خلل الصف، كانها الحذف".**[2] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: ریزەکانتان رێك بخەنو لێکیان نزیك بخەنەوە، گەردنتان رێك لە ئاستی یەك بێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە من شەیتان دەبینم لە کەلەبەری ریزەکانەوە دێو دەچێ دەڵێی بەرخە رەشە گولەی یەمەنییە.

---

[1] رواه مسلم ٤٣٨.

[2] صحيح رواه أبوداود باسناد على شرط مسلم ٦٦٧ وإبن حبان ٣٨٧ ورياض الصالحين ١٠٩٢.

**عن البراء (رضي الله عنه) قال رسول ﷺ: "أقيموا صفوفكم، وتراصوا، فإني أراكم من خلف ظهري".**[1] واته: له بەڕائەوه (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ڕیزەکانی نوێژەکانتان ڕێكو پێك بكەن، چونكه من له پشتەوه دەتانبینم". فەرمودەی پێشتر که وترا شەیتانەکان ناوکەنتان نەکەن وەکو (**حذف**) وترا ئەی پێغەمبەری خوا (**حذف**) چییه؟ فەرمووی بەرخی رەشی سیخنه له ئەرزی یەمەنە. ئەم زیادەیەش له فەرمودەی ژماره (١١٩٢ ـ **صحيح الجامع الصغير وزيادته**)دا هاتووه. له فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: **"أقيموا صفوفكم وتراصوا فوالذي نفسي بيده إني لأرى الشياطين بين صفوفكم كانها غنم عفر".**[2] صحیح واته: ریزەکانتان ڕێك بخەنو راست راوەستن، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەسته، من شەیتان دەبینم له نێوان ریزەکانتاندا دەڵێی بەرخی سپییه (**عفراء**) أي **بيضاء**: سپی روت.

---

[1] صحيح سلسلة الأحاديث الصحيحة ١١٩٣ وصحيح أبي داود ٦٧٣.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١١٩٤. وصحيح أبي داود ٦٧٣.

# نوێژی هەینی

نوێژی هەینی یەکێکە لە نوێژە فەرزەکانو هەفتەی یەك جارەو دەبێ لەیەك شوێندا ئەنجام بدرێت، مەگەر لە ناچاریو لەبەر بێ جێگەیی لە چەند شوێنێکدا بکرێت. رۆژی هەینی گەورەترین رۆژی هەفتەیە، نوێژەکەشی بە هەمان شێوە گەورەیە:

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "لاتطلع الشمس ولا تغرب على يوم أفضل من يوم الجمعة".**[1] **صحيح لغيره.** واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: خۆر هەڵ نایەت و ئاوا نابێت بە سەر رۆژێکدا گەورەتربێت لە رۆژی هەینی. ئەبوهورەیرە فەرموویەتی "شاهد" رۆژی هەینیەو "مشهود" رۆژی عەرەفەیە.[2]

لە رۆژی هەینیدا ئادەم دروست کراوە، چۆتە بەهەشتو دەرکراوە لە بەهەشتو هەر لە هەینیدا تەوبەی لێ وەرگیراوە، تیایدا مردووەو هاتنی رۆژی دوایی لە رۆژی هەینی روو دەداتو زۆر شتی تریش وەکو لەم فەرمودەدا باس کراوە:

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "خير يوم طلعت عليه الشمس يوم الجمعة، فيه خُلق آدم، وفيه أدخل الجنة، وفيه أخرجه منها، وفيه تيب عليه، وفيه مات، وفيه تقوم الساعة، وما من دابة الا وهي يوم الجمعة مصيخة حتى تطلع الشمس شفقا من الساعة، الا إبن آدم، وفيه ساعة لايصادفها مؤمن وهو قائم يصلي فيسأل الله فيها شيئا الا أعطاه إياه".**[3] صحيح، واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "چاکترین رۆژێك خۆری لێ هەڵ بێت رۆژی هەینیە، لەو رۆژەدا ئادام دروست کراو خرایە بەهەشتو لەبەهەشت وەدەرنراوە، تەوبەی لێ وەرگیراوەو تیایدا مردووەو هەر لە هەینیدا قیامەت بەرپا دەبێت، هیچ گیانداریێك نییە لە رۆژی هەینیدا

---

[1] صحيح فقه السنة ج١، ص٥٧٠. أخره احمد وعبدالرزاق، وإبن حبان ٢٧٥٩ والبغوى ١٠٦٢ وله شواهد.

[2] صحيح فقه السنه ج١، ص٥٧٠.

[3] صحيح فقه السنة ج١، ص٥٧١. أخرجه مسلم ٨٥٤ مختصرا وأبوداود ١٠٤٦ والرتمذي ٤٩١.

گوێ قلاخ و گوێ لەسەر هەست نەبێت هەتا خۆر هەڵدێت لە ترسی بەرپابوونی قیامەت بێجگە لە نەوەی ئادەم، لەو ڕۆژەدا کاتێك هەیە بڕوادار تووشی کاتی ئاوا نایەت کە لە نوێژدا بێتو لە خوا داوا بکات بۆ هەر شتێ بێگومان خوا پێی دەبەخشێ"، سوننەتە لەم ڕۆژەدا سەڵاوات دان، خۆ شۆردن، خۆبۆنخۆش کردن، دوعا کردن، جلی جوان لەبەرکردن.

## نوێژی هەینی تاوانەکان دەسڕێتەوە

نوێژی هەینی فەرزەو پلەی نوێژیش لە ئیسلامدا دوای بڕواهێنانە بە خواو لە هەموو پایەکانی ئیسلامو لە هەموو ئەرکە شەریعەکان گەورەترە.

خوای گەورە دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ "**. (الجمعة: ٩). واتە: هۆ بڕوادارینە ئەگەر بانگێشتی نوێژێ کران لە ڕۆژی هەینیدا بە چوستو چالاکیەوە بچن بەدەم یادی خواوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من توضا فاحسن الوضوء ثم أتى الجمعة، فاستمع وانصت، غفر له ما بينه وبين الجمعة وزيادة ثلاثة أيام، ومن مس الحصى فقد لغا".**[١]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: هەرکەس دەستنوێژێکی چاك بگرێتو پاشان بچێتە نوێژی هەینی، گوێ بگرێ و بێدەنگ بێت چاوپۆشی لێ دەکرێ لەم هەفتەیەوە هەتا ڕۆژی هەینی داهاتوو سێ ڕۆژی زیادەش، هەرکەسیش دەست لە بەردە وردە بدات (لە کاتی وتارو نوێژی) هەینیدا ئەوە کاری بێ سوودی کردووە.

**وعنه عن النبي ﷺ قال: "الصلوات الخمس والجمعة الى الجمعة ورمضان الى رمضان، مكفرات ما بينهما إذا اجتنبت الكبائر".** [٢] واتە: هەر لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت)

---

[1] رواه مسلم ٨٥٧ ورياض الصالحين ١١٤٨.

[2] مسلم ٢٣٣و رياض الصالحين ١١٤٩.

فەرموویەتی: پێنج فەرزەی نوێژو هەینیەك بۆ هەینیەكی تر و ڕەمەزانێك بۆ ڕەمەزانێكی تر هەرچی لە نێوانیاندا بێت دەیسڕنەوە ئەگەر خۆپارێزرێت لە تاوانی گەورە.

**عن سلمان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "لايغتسل رجل يوم الجمعة، ويتطهر ماستطاع من طهر ويدهن من دهنه أو يمس من طيب بيته، ثم يخرج فلا يفرق بين اثنين، ثم يصلي ما كتب له، ثم ينصت إذا تكلم الإمام، الا غفر له مابينه وبين الجمعة الآخرى".**[1] واتە: لە سەلمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: ئەگەر كەسێك خۆی بشوات ڕۆژی هەینیو بە گوێرەی توانا خۆی پاكو خاوێن كاتو ڕۆن لەسەر بداتو خۆی بۆنخۆش بكات لە ماڵەوە، پاشان بڕواتو دوو كەس لێك نەكاتو ئینجا ئەوەندەی بە نسیبی بێ نوێژ بكات، پاشان بێدەنگ بێت كاتێك پێشەوا قسەی كرد خوای گەورە لە تاوانەكانی ئەو هەینییەی خۆش دەبێت.

## نوێژی هەینی كۆبونەوەی هەموو شارە

ڕای زۆربەی زانایان وایە كە دەبێ هەموو خەڵكی شارێك لەیەك مزگەت نوێژی هەینی بكەن چۆن لەسەردەمی پێغەمبەر (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێت) هەموو خەڵكی مەدینە لە مزگەوتی پێغەمبەردا نوێژی هەینیان ئەنجام داوە، زۆر بە دەگمەنیش وابووە كەسێك ئامادەی نوێژی هەینی نەبووبێت تەنانەت لە ئافرەتو منداڵنیش كە لەسەریان فەرز نەبووە. بەڵام هەندێ لە زانایان فەرموویانە ئەگەر مزگەوتێك جێگەی نەما دروستە نوێژی هەینی لە مزگەوتێكی تر ئەنجام بدرێت.

هەتا هەموو خەڵكی شار یەكتربینینو ئاگاداری هەواڵی یەكتر بنو بەو قەرەباڵغیو بە ئامادەبوونی ئاپۆڕای خەڵكەكەش هەیبەتو شكۆیەك لە شاردا دەبینرێ، كە ورەی باوەڕدان بەرزو بڵند دەكات.

---

[1] البخاري ٨٤٣ و رياض الصالحين ١١٥٤.

## فريشتەكان بەشداريی نوێژی هەينی بە كۆمەڵ دەكەن

فريشتەكان وەكو بەشداريی نوێژەكانی تر دەكەن بە هەمان شێوەش بەشداريی نوێژی هەينی دەكەن وەكو لە چەند فەرمودەيەكی پێغەمبەردا هاتووە (سەلاَتو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەوانەش:

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: إذا كان يوم الجمعة كان على كل باب من ابواب المسجد ملائكة يكتبون الأول فالأول فإذا جلس الامام طووا الصحف وجاءوا يستمعون الذكر.**[١] واتە: لە ئەبی هورەيرەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرموويەتی پێغەمبەری خوا (سەلاَتو سەلامی خوای لیٚ بێت) هەركە رۆژی هەينی هات لەسەر هەر دەرگايەك لە دەرگاكانی مزگەوتەكان فريشتەيەك لە دوای يەك ناو دەنووسن، هەركە وتاربێژ دانيشت پەڕەكانيان دەپێچنەوەو دێن گوێ لە يادی خوا دەگرن.

## وازهێنان لە نوێژی هەينی تاوانە

وازهێنان لە نوێژی هەينی و نەكردنی بە عەمدەن يەكێكە لە تاوانە گەورەكانو نيشانەی دەغەڵیو دووڕووييەو ئەو كەسە دڵی مۆری غەفڵەتو بێئاگايی پيادەنریٚ.

**عن إبن عمر وابي هريرة (رضي الله عنهما) سمعا رسول الله ﷺ يقول وهو على اعود منبره: "لينتهين أقوام عن ودعهم الجمعات، أو ليختمن الله على قلوبهم، ثم ليكونن من الغافلين".**[٢]واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرو ئەبو هوريرەوە گوێيان لە پێغەمبەری خوا بوو (سەلاَتو سەلامی خوای لەسەر بێت) دەيفەرموو كە لەسەر پلەی مينبەرەكەی بوو كەسانێك دەبیٚ وازبێنن لە نەكردنی نوێژی هەينی يان خودا مۆر بەسەر دڵيانا دەنێت ئەوجا دەچنە ريزی غافڵو بێئاگايانەوە.

**وعن أبي الجعد الضمري قال: قال رسول الله ﷺ: "من ترك ثلاث جمع تهاونا بها، طبع على قلبه".**[٣] واتە: لە ئەبی جەعدی زەمرييەوە فەرمووی پێغەمبەری خوا

---

[1] أخرجه البخاري ٣٢١١ ومسلم ٨٥٠. صحيح فقه السنة ج١، ص٥٧٧.

[2] أخرجه مسلم ٨٦٥ء إبن ماجة ٧٩٤ والدارمي ١٥٧٠ وصحيح فقه السنة ج١ ص٥٧٣.

[3] أخرجه أبوداود ٤٣٩٨ وإبن ماجة ٣٠٤١ والنسائي رقم (١٦٥٦) والدارمي وأحمد وصحيح فقه السنة ج١ن ص٥٧٤، وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٥١٤٢.

(سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: هەرکەس سێ نوێژی هەینی نەکاتو بە کەمی بزانێ، خوا مۆر لە دڵی ئەدات.

**وعن إبن مسعود أن النبي ﷺ قال: لقوم يتخلفون عن الجمعة: "لقد هممت ان آمر رجلا يصلي بالناس ثم احرق على رجال يتخلفون عن الجمعة بيوتهم".**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: بە کەسانێك لە نوێژی هەینی دوا دەکەوتن، بە خەیاڵمدا هات فەرمان بە پیاوێك بکەم پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات. ئینجا ماڵەکان بسوتێنم بەسەر ئەو پیاوانەدا لە ماڵەوەن نایەنە نوێژی هەینی.

[1] أخرجه مسلم ٨٦٥ و إبن ماجة ٧٩٤ والدارمي ١٥٧٠ وصحيح فقه السنة ج١ ص٥٧٣.

# نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە

نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە کە لە ئاسمان فەرز کرا بێتو یەکەم پایەی ئیسلامە لەسەر بێژنگ پێشنیار دەکرێو لەسەر تەرمی مردووەکان ئەنجام دەدرێو لە رۆیشتنە سەفەرو گەڕانەوەو لە خۆشیو مزگێنی خۆشیدا دەکرێتو رودانی دیاردە سروشتییەکانو لە کاتی ترسو بیمو تەنگانەدا ئەنجام دەدرێت بۆ هێوەرکردنەوەی ئادەمیزاد، یەکەم پایەی ئیسلام بڕوادار لە شپرزەییو دڵەڕاوکێ دەرباز دەکات، یەکەم پایەی ئیسلام هۆی ئاسوودەیی گیانو دەروونی پێغەمبەر بوو، هەروەها بە بیلبیلەو گلێنەو رووناکی چاوی خۆی داناوەو یەکەم پایەی ئیسلامە خراپە بنبڕ دەکات ریشەکێشی دەکات، یەکەم پایەی ئیسلامە لە شەوو رۆژدا پێنج جار فەرز بێت و پێنج جار یان شەش جار[1] بانگی بۆ بدرێت.

نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە رۆشتنو خۆئامادەکردنو چاوەڕوانی کردنی تاوان دەسڕێتەوەو پلە بەرز دەکاتەوە، یەکەم پایەی ئیسلامە تەمەڵی کردنو کەمتەرخەمی کردن لە ئەنجامدانیدا نیشانەی دووڕوویییە.

یەکەم پایەی ئیسلامە عیسا لەگەڵ هاتنە خوارەوەی و دابەزینی ئەنجامی ئەدات.

یەکەم پایەی ئیسلامە پێغەمبەرەکان لە گۆڕداو لە ژیانی بەرزەخ ئەنجامی ئەدەن.

یەکەم پایەی ئیسلامە لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت لە رۆژی دواییدا. یەکەم پایەیە بە پەیمانو بەڵێن لەگەڵ خوادا ناوی برابیت، هەروەها نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە بە بڕبڕاگەو موراغەو عەمودی فەقەری دین ناوبرابیت.

نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە نوورو روناکییە لە رۆژی دواییداو تکاکارە بۆ خاوەنەکەی و یەکەم کردەوەیە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێتو کۆتا وەسیەتی پێغەمبەر بووەو هەرکەس بە چاکیی ئەنجامی بدات هەموو دینی جێبەجێ کردووە، بە پێچەوانەشەوە هەرکەس ئەنجامی نەدا هەموو دینی خۆی رووخاندووەو کاولی کردووە بەسەر یەکدا.

---

[1] ئەگەر نوێژی بەیانی دوو بانگی بۆ بدرێت.

نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە هەموو پێغەمبەرەکان ئەنجامیان داوەو وەسیەتیان بۆ خێزانو نەوەکانیان کردووە جێبەجێی بکەنو زایەی نەکەن.

هەروەها یەکەم پایەی ئیسلامە، دوای مردنیش پێغەمبەرەکان ئەنجامیان داوە لە ناو گۆڕدا.

یەکەم پایەی ئیسلامە هەموو بوونەوەرو هەموو جیهانی گیاندارو گۆیاو بێ زمانو رەقو تەڕ، بەرزو نزم، ئادەمی و فریشتەو پەری هەریەك بە جۆرێك ئەنجامی ئەدەن.

نوێژ دیاریترین پایەی دینە کە بڕوادارانی پێ دەناسرێتەوە لە رۆژی دواییدا و لە کافرو دووڕووەکان جیا دەکرێتەوە.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لەسەرەتای هاتنی نیگادا داوای کردنی کراوە

نوێژ یەکەم ئەرکی شەرعیو یەکەم پایەی ئیسلامە دوای بڕواهێنان کە خوا فەرمانی کردووە بە جێبەجێکردنی. پێش کۆچکردنی پێغەمبەرو هاوەڵە بەرێزەکانی بۆ مەدینە لەسەر موسڵمانان تەنها نوێژ فەرز بووە، نە جیهادو نە زەکاتو نە حەجو نە رۆژوو فەرز نەبووە، بەڵام نوێژ فەرز بووە تەنانەت پێش گەشتی شەوڕەویو بڵندبوونەوەی پێغەمبەر نوێژیان کردووە. گەشتەکەش کە رۆشتنی پێغەمبەر بوو لە شاری مەککەوە بۆ شاری قودسو لەوێشەوە بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمانەکان کە فەرزبوونی نوێژ لە گرنگترینی روداوەکانی ئەم گەشتە ناوازەیە بوو ئەویش یەك ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەرو هاوڕێکانی بوو بۆ شاری مەدینە[1] هەر هەمان بەسەرهات بەڵگەیە لەسەرکردنی نوێژ پێش گەشتی ئاسمانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت)، چونکە لە دوای گەڕانەوەی فەرموی: "**صليت الليلة العشاء في هذا المسجد وصليت به الغداة، واتيت فيما دون ذلك بيت المقدس، فنشر لي رهط من الأنبياء منهم: إبراهيم وموسى وعيسى وصليت بهم......**".[2] واتە: فەرمووی

---

[1] السيرة النبوية، للصلابي ج١، ص٣٩١.

[2] السيرة النبوية، للصلابي ج١، ص٣٩١.

"نوێژی خەوتنانم لەم مزگەوتەدا کردو نوێژی بەیانیشم هەرلەوێ کرد، لەو بەینەشدا چومە بەیتول مەقدیس، کۆمەڵێ لە پێغەمبەرانم بۆ کۆکرایەوە لەناو یاندا ئیبراهیم و موسا و عیسا هەبوو، پێشنوێژیم بۆ کردن....".

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) پێش گەشتی شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان نوێژی کردووەو بەردەوامیش بووە لەسەری و لە شیوو دۆڵەکانی دەوروبەری مەککە بە دزییەوە نوێژی کردووە.

هاوەڵەکانیشی لەسەرەتای هەڵهاتنی خۆری ئیسلامدا پێڕی پێشینی هاوەڵان بەهەمان شێوە بە دزییەوە نوێژیان دەکرد.

ئیبنو ئیسحاق (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی یەکەم نێرینە کە موسڵمان بوو باوەڕی بە پێغەمبەر هێنا (سەلامی خوای لێ بێ) عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو، نوێژیشی لەگەڵ پێغەمبەر کردو بڕواشی پێ هێنا کە ئەو تەمەنی دە ساڵان بوو لە پێش ئیسلامیشدا هەر لە ماڵی پێغەمبەردا بوو.[1]

هەروەها ئیبنو عەبباسیش (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "یەکەم کەس نوێژی کرد بێ عەلی بووە". جابریش دەفەرموێ "ڕۆژی دووشەممە پێغەمبەر بووە پێغەمبەر، عەلی رۆژی سێشەممە نوێژی کرد".[2]

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لەسەر بێژنگ پێشنیار دەکرێ بۆ مناڵ

بانگدان بەگوێی مناڵدا سوننەتە هەر لەو دەمەی لە داوێنی دایکی دەکەوێتە خوار، لە دەقە پیرۆزەکانی بانگیشدا ئەم رستە شیرینە دەدرێت بە گوێی مناڵی ساواو پاك و بێگەرداو بە دەنگی بەرز پێی دەوترێت **"حي علي الصلاة"** واتە: رابە بۆ نوێژکردن. **"حي علي الفلاح"** واتە: رابە بۆ رزگار بوون، "کە نوێژە".

لە کاتی لە دایك بوونو سەر بێژنگ و لە حەوتەم رۆژی تەمەنی مناڵدا هیچ کام لە ئەرکە شەرعیەکان و پایە کرداریەکانی دین بە گوێی مناڵدا نادرێ نە رۆژوو، نە زەکات، نە حەج و نە جیهادو نە هیچ فەرمانێکی تری شەرع و نەداواشی لێ دەکرێ لە

[1] صلاح الأمة ج٧، ص٥٥.

[2] صلاح الأمة ج٧، ص٥٥.

هیچ خراپەیەك دووركەوێتەوە، بێجگە لە بێباوەڕی كە لە بانگەكەدا پێی دەوترێ (لا اله الا الله) هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە بێجگە لە (الله).

بۆ وەكو داوای نوێژكردنی لێ دەكرێ، لە هەمان كاتیشدا داوای دوركەوتنەوەی لێ ناكرێ لە تاوان و گوناهو خراپە، چونكە نوێژ سەری هەموو چاكەیەكەو رێ لە هەموو خراپەیەكیش دەگرێت **"إن الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر"**. واتە: بەڕاستیی نوێژ قەدەغەی هەموو داوێن پیسی و خراپەیەك دەكات. كەوابوو نوێژی راستەقینە خاوەنەكەی هەموو چاكەیەك ئەنجام ئەداتو لە هەموو خراپەك بە دوورە.

نوێژێكیش ئەگەر خاوەنەكەی لە خراپە نەگێرێتەوەو پەیڕەوی هەموو چاكەیەكی نەكات پێی ناوترێ نوێژ، بەڵكو خاوەنەكەی لەسەری گوناهبار دەبێت، وەكو لە قورئاندا باس كراوە **"فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ"**. (الماعون: ٤ ـ ٥). واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژخوێنانەی لە ناوەڕۆكی نوێژەكانیان بێئاگان.

## نوێژ یەكەم پایەی ئیسلامە واتاو كاكڵەی هەموو پایەو پەرستنەكان بگرێتە خۆی

بۆیە نوێژ ئەوەندە گرنگی پێ دراوە، بەڵكو دوای بڕوابوون بە خوا لە هەموو پەرستن و پایەو بناغەكانی ئیسلام زیاتر گرنگی پێدراوە، كام پایەی ئیسلام رۆژی پێنج جار فەرزەو پێنج جاریش فەرزە جاری بۆ بدرێ، كام پایەی ئیسلام ئەوەندە كۆشك و تەلاری پاشایانەی بۆ دروست كراوە، زۆر تایبەتمەندیی تریش. نوێژ یەكتاپەرستیە، یەك خواناسییە. نوێژ بڕواهێنان و شایەتمانە و نوێژ بەبێ شایەتمان نابێت و دروست نیە.

نوێژ، رۆژووە: چونكە نوێژ وەكو رۆژوو بە خواردن و خواردنەوە بەتاڵ دەبێتەوە، نوێژ بە جووت بوون بەڵكو بە رای هەندێ لە زانایان بە بەركەوتنی پێستی نێرو مێی نامەحرەم بەتاڵ دەبێتەوە.

نوێژ، زەكاتە: چونكە نوێژ بە گرتنی كات و ماندووبوون نەبێت جێبەجێ ناكرێت، زەكاتیش بەبێ كات و سەرقاڵی و ماندووبوون و رەنجدان ئەنجام نادرێت، چونكە كەسانێك زەكات ئەدەن كە رەنج و كۆششێكی زۆریان دابیت هەتا دەبنە خاوەن ماڵ و زەكاتی شەرعی.

نوێژ، حەجە: چونکە حەج لە روگە نەبێت ناکرێت، نوێژیش بەبێ رووکردنە روگە دروست نیە. حەج کردن کات و وەختێکی دەوێت هەتا ئەنجام بدرێت هەرچۆن نوێژ بۆ ئەنجامدانی پێویستی بە کات هەیە. حەج ماندوبوونی دەوێت، نوێژیش بەبێ ماندوبون ناکرێت. هەر لەم روانگەوەیە پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **(الطواف بالبيت صلاة).**[1] واتە: هەڵسووران بە دەوری کەعبەدا وەك نوێژە. خوا دەفەرموێت: **"فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ.."**. واتە: نە جوتبوونو نە قسەی نابەجێ دەربارەی ئافرەتانو نە دەرچوون لە سنووری خوداو نە شەڕە قسە لە حەجدا نییە". لە نوێژیشدا بە هەمان شێوە ئەم شتانە حەرامن، بەڵکو زیاتریش، تەنانەت لە نوێژدا قسەی چاکیش حەرامە مەگەر ئەوەی خوا مۆڵەتی داوە. هەر بۆیەش رێگە دراوە کەسێك بەپێوە بۆی نەکرا با بە دانیشتنەوە نوێژەکەی بکات، ئەگەر بە دانیشتنەوە بۆی نەکرا بە راکشانەوە.

نوێژ، **"جیهادە"**: نوێژیش وەکو جیهاد ماندووبوون و هەوڵ و تێکۆشانی دەوێت نوێژ دژایەتی شەیتانە.

نوێژ، **"ذکر"** یادی خودایە: خوا دەفەرموێت بە موسا **(وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي).** واتە: بۆ ئەوەی منت لەیادبێ نوێژ بکە.

تەواوی نوێژ بریتییە لە یادی خودا. نوێژ دوعاو نزاو پاڕانەوەیە، هەروەکو وشەی **(الصلاة)** واتە: **"الدعاء"** لەناو نوێژیشیدا نزاو پاڕانەوەی زۆر هەیە وەکو دەڵێ: **"اهدِنَـــــ ا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ * صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ"**. **(الفاتحة: ٦ ـ ٧)**. خودایە بەردەوامان کە لەسەر رێگەی راست.

نوێژ، سەلام و ئاشتییە: هەروەکو چەندەها جار وشەی سەلامی تیادا دووبارەو سێبارە دەبێتەوەو نوێژ رێ لە ستەم و دەستدرێژی دەگرێ، خوا دەفەرموێت: **"ان الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر"**. واتە: بەڕاستیی نوێژ رێ دەگرێ لە داوێن پیسی و خراپەکاری.

کڕنوش و سوژدە کە رەمزو مەشخەڵی خواپەرستین لە نوێژدا پایەی سەرەکی و بنەڕەتین.

---

[1] صحيح/ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٣٩٥٤.

نوێژ پاك و خاوێنی و خۆرازاندنەوەو وەرزش و مەشقی لاشەو گیانە و بە هەردوو جەمسەری لاشەو گیان خاوەنی پەیوەستی خودای خۆی دەکات و رۆژی چەند جار دەست و روخسارو قاچی پێ دەشوات.

نوێژ ئەدەب و گوێڕایەڵییە بۆ خواو پێغەمبەر، چونکە نوێژخوێن دەبێ ئەوپەڕی ئەدەب و ڕێز پەیڕەو بکات لە ئاوڕنەدانەوە، قسەنەکردن، جموجوڵ نەکردن و زۆر شتی تریش.

نوێژخوێن دەبێ ئەدەبی لەگەڵ پێشنوێژدا لەبەرچاو بگرێ و نابی پێش بکەوێ نابی زۆر لێی دواکەوێت و بەڵکو دەبێ لە هەموو هەڵسوکەوت و جموجوڵێکدا پابەندی پێشنوێژەکەی بێت.

نوێژ خاوەنەکەی دەپارێزێ لە بێئاگایی، خوای بیر دەخاتەوە، مۆڵەتی نادا بێئاگا بێ لە کاتەکان، چونکە کاتی نوێژ دیاریکراوە. نوێژ ئارامی و بێدەنگی و ڕێزو ئەدەبە لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە فەرموویەتی: **"اسكنوا في الصلاة"**.[1] واتە: ئارام و بێ جم وجوڵ بن لە نوێژدا.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە بەندەو خودا تیایدا هاوبەشن

نوێژ جۆرێکی تایبەتە لە پەرستنو پەیوەندیی نێوان بەندەو خودایە و پەیوەندییەکی گیانیو دەروونییە، بۆیە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە هەر خەمو پەژارەو نارەحەتییەکدا کە رووی تێ کردبێ پەنای وەبەر نوێژ بردووەو بە بیلالیشی فەرمووە "ئەی بیلال ئاسوودەمان بکە بە نوێژ (بانگ بفەموو)".

**قال تعالى في الحديث القدسي: "قسمت الصلاة بيني وبين عبدي نصفين، ولعبدي ما سأل، فإذا قال العبد: الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، قال الله تعالى: حمدني عبدي، فإذا قال: الرَّحْم ـ نِ الرَّحِيمِ. قال الله: أثني على عبدي، فإذا قال: مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ، قال: مجدني عبدي، فإذا قال: إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ، قال: هذا بيني وبين عبدي، ولعبدي ما سأل، فإذا قال: اهدنَ ـ ـ ـ ـ ا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ، قال: هذا لعبدي، ولعبدي ما**

[1] صحيح/ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٦٦٥.

**سأل". صحيح عن أبي هريره.**[1] واته: خوای باڵادەست لە فەرمودەی قودسیدا فەرموویەتی نوێژم دابەشکردووە لە نێوان خۆمو بەندەکەمدا بە دوو بەش، بۆ بەندەکەشم هەیە هەرچی داوا بکات، ئەگەر دەڵێ: **"الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ"**. خوا دەفەرموێت: سوپاسی کردم بەندەکەم، ئەگەر دەڵێ: **"الرَّحْمَ ـ نِ الرَّحِيمِ"** خوا دەفەرموێت: بەندەکەم ستایشی کردم، ئەگەر وتی: **"مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ". (الفاتحة: ٤)** دەفەرموێت: بەندەکەم بە شکومەندو گەورەی دانام. ئەگەر وتی: **"إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ". (الفاتحة: ٥)**. خوا دەفەرموێت: ئەمە لە نێوان منو بەندەکەمدایەو هەرچی بوێ ئەیدەمێ، ئەگەر وتی: **"اهدِنَ ـ ـ ـ ـ ا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ * صِرَاطَ الَّذِينَ أنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ". (الفاتحة: ٦ ـ ٧)**. دەفەرموێت: ئەو داواکارییە بۆ بەندەکەم و هەچی بەندەکەم بیەوێت بۆی ئەکەم.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە پێغەمبەر پێی ئاسوودە بوویێت

هەرکات پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بێ کەیف بوویێتو خەمی پەژارەیەکی هەبوویێت فەرمویەتی: **"يا بلال اقم الصلاة ارحنا بها"**.[2] واتە: ئەی بیلال خەڵکی هەستێنە بۆ نوێژو ئاسوودەمان بکە پێی.

نوێژ دەروونی ئادەمیزاد ئاسوودە و ئارام دەکاتو دەیپارێزێ لە هەموو دڵەڕاوکێو ڕاڕاییو لەرزۆکییەك. نوێژخوێنی ڕاستەقینە دامەزراوو ڕاوەستاوەو دوورە لە هەموو شپرزەییو بێ وورەییەك، لە خۆشییشدا سوپاسی خوا دەکاتو لە ناخۆشییدا خۆڕاگرە. وەکو خوا دەفەرموێت: **"إِنَّ الإنسان خُلِقَ هَلُوعاً * إذا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً * وَإذا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً * إِلَّا الْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ". (المعارج: ١٩ ـ ٢٣)**. واتە: بێگومان مرۆڤ کە دروستکراوە شپرزەو بێوەفا دیارە، کە تووشی ناخۆشی دەبێ شپرزەو بێزارە، کە تووشی خێرو خۆشیش دەبێ قەدەغەی خەڵکی لێدەکاتو لە خۆی بایی دەبێت، تەنها نوێژخوێنان نەبن، ئەوانەی بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان.

---

[1] أخرجه مسلم ٣٩٥، وأبوداود ٨٢١ والترمذي ٢٩٥٣ والنسائي ٩٨١ وإبن ماجة ٨٣٨ وصحيح فقه السنة ج١، ص٥٤٢، وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٤٣٢٦.

[2] صحيح / أبوداود ٤٩٨٥، وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٧٨٩٣.

بە نوێژکردن خەمو پەژارە دەڕەوێتەوەو کەسی موسڵمان نائومێد نابێ لە کاتی تەنگپێهەڵچنینی خەمو خەفەتدا، لە کاتی لافاوو شاڵاوی غەمو پەژارەدا، بەڵکو پەنا بۆ پەروەردگاری گەورەو دەسەڵاتداری هەرەگەورەی خۆی دەبا.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج جار جاڕی بۆ بدرێ بە ئاشکرا

هیچ پایەیەکی ئیسلام و هیچ دینێکی ئاسمانی ڕۆژی پێنج جار بانگی بۆ نادرێتو بانگەوازی بۆ ناکرێ و جاڕی بۆ نادرێ بێجگە لە نوێژ.

کام پایەو کۆڵەکەی دین، حەج، ڕۆژوو، زەکات، ڕۆژی پێنج جار بە ڕاسپاردەی خواو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کەسێکی ئەمینو دەنگ خۆشو دەنگ زوڵاڵو دادپەروەرو بڕوادار خەڵکی بۆ بانگهێشت دەکات، کام ئەرکی شەرعی خەباتو جیهاد، یادی خواو قورئان خوێندن جێبەجێکردنی هەقی زیندوو و مردوو، هەقی دراوسێو خزمان، هەقی دایكو باوك و ژنو مێردو مامۆستاو قوتابیو میوانو باوكو فەرزەندو.. ڕۆژی پێنج جار بانگەشەی بۆ دەکرێ.

تەنها نوێژە ئەوەندە گرنگەو ئەوەندەشی گرنگی پێدراوە کە بەردی بناغەی دینەو ئەخیر گرێیە لە گرێیەکانی دینی ئیسلام هەڵبوەشێنرێو خاو بکرێتەوە.

بانگدان ڕۆژی پێنج جار فەرزی کیفایەیە و بە ئەنجامدانی لە لایەن چەند کەسێکەوە تاوان لەسەر هەمووان لادەچێت.[1] **"وفرض في السنة الثانية من الهجرة"**.[2] واتە: بانگ لە ساڵی دووی کۆچی فەرز کراوە.

زاناکان فەرموویانە پلەوپایەی بانگبێژ بەرزترە لە پێشنوێژ.[3]هەندێ لە زانایان بە فەرزو هەندێکیان بە سوننەتیان زانیوە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) هەتا ئێستا ڕۆژانە لەناو بڕواداراندا پێنج جار بانگدراوەو

---

1 مغني المحتاج، ج١، ص١٨٦. "فصل، في الآذان والإقامة، وصحيح فقه السنة ج١، ص٢٧٢و ٢٧٣.

2 شرح رياض الصالحين/ للعثيمين ج٣، ص٢٢٤. (باب الأذان).

3 شرح رياض الصالحين ج٣، ص٢٢٥. "باب الأذان".

پەیڕەوی لەو ئەرکە شەرعییە کراوەو بەردەوامیش بڕیاری لەسەر دراوە هەتا موسڵمان لەسەر زەویدا هەبن دەبێ ڕۆژانە پێنج جار ئەنجامی بدەن.

## یەکەم پایەی ئیسلامە لە هەموو شەوورۆژێکدا پێنج جار فەرزبێت کردنی

نوێژی فەرز لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژەو خواو پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) بڕیاریان لەسەر داوە، هەموو ئوممەتی ئیسلامو سەرجەم زانایانی ئیسلام لە هەموو چاخو سەردەمێکی مێژووی ئیسلامدا لەسەری یەکدەنگ بوون.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قال رسول الله ﷺ "إن الله افترض على العباد خمس صلوات في كل يوم وليلة".**[1] واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: خوا لەسەر بەندەکانی پێنج نوێژی فەرز کردووە لە هەموو شەوو ڕۆژێکدا.

**وعن عوف بن مالك (رضي الله عنه)، قال قال رسول الله ﷺ "الا تبايعوني على أن تعبدوالله ولا تشركوا به شيئا، وان تقيموا الصلوات وتؤتوا الزكاة، وتسمعوا وتطيعوا، ولا تسألوا الناس شيئا".**[2] واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەرێ بەیعەتم نادەنێ لەسەر پەرستنی خواو هاوەڵ دانەنان بۆی وە کردنی پێنج فەرزەی نوێژ، بەزەکاتدانو گوێگرتنو بە گوێکردن، داوانەکردنی هیچ شتێك لە خەڵکی.

**قال سعيد بن المسيب: "من حافظ على الصلوات الخمس في جماعة فقد ملأ البر والبحر عبادة".**[3] واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەرکەس پارێزگاری لە پێنج فەرزەی نوێژ بکات بێگومان بەڕو بەحری پڕ کردووە لە خواپەرستی.

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٧٢٢.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٦٤٦.

[3] صلاح الأمة ج٢، ص٣٧٥.

**عن عبادة بن الصامت (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "خمس صلوات كتبهن الله على العباد، فمن جاء بهن ولم يضيع منهن شيئا استخفافا بحقهن كان له عند الله عهد أن يدخله الجنة، ومن لم يات بهن فليس له عند الله عهد أن شاء عذبه وان شاء أدخله الجنة".** [1]

واته: له عوبادەی کوڕی سامیتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی گوێم له پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو پێنج نوێژ خوا فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی هەرکەس بیانکاتو زایەیان نەکات حەقیان بەکەم نەزانێ له لای خوا پەیمانی هەیە، کە بیخاتە بەهەشت، هەرکەسیش نەیانکات له لای خوا بەڵێنی نییە، ئەگەر ویستی هەبێ سزای ئەدا، ئەگەر ویستیشی هەبێت دەیخاتە بەهەشت. [2]

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە سونەتەکانی ژمارەی دیاریکراویان نیە

بەندەکان بە ئەنجامدانی فەرزەکان لە خوا نزیك دەبنەوە، پاشانیش بە هۆی سوننەتەکانەوە لە خوا نزیکتر دەبنەوە، ژمارەی فەرزەکان رکاتەکانی دیاریکراون، بەلاّم ژمارەی سوننەتەکان دیاریکراو نییە و ئەو سەریان نییە بۆ ئەوەی بەندەکان زۆر نوێژی سوننەت بکەن و هەتا زیاتر لە خوا نزیك بنەوە، بێگومان هەرچەندە بەندەکان لە خوا نزیك بنەوە هەر کەمە.

توانای بەندەکانیش چوونیەك نییە، بۆیە دەبینی کەسانێك پێنج فەرزەش زایە دەکەن و بەبێ هودە سەیریان دەکەن، کەسانێکیش لەوانەیە لە پێنج فەرزە زیاتر تاقە سوننەتێکیش نەکەن، کەسانی واش هەبوەو دەبێت کە دەیان و سەدان رکات سوننەتیان ئەنجام داوە لە شەوو رۆژێکدا..

سوننەتی پاش و پێشی فەرزەکان، سوننەتی چێشتەنگاوو شەونوێژو وەترو تەوبەو تەراویح و ئیستیخارە (راپرسی)و رۆژگیران و مانگ گیران و نوێژەبارانەو نوێژی جەژن و سوننەتی چوونە سەفەرو گەڕانەوە لە سەفەرو نوێژی تەسبیح و سەلامی مزگەوت (**تحية المسجد**)و نوێژی ترس و دەستەویەخە بوون و سوننەتی رەهاو بێ ژمارە و بێ

[1] موسوعة الأخلاق الإسلامية ج٣، ص١٩٧.

[2] أخرجه البخاري ٣٤٩ ومسلم ١٦٢. صحيح فقه السنة ج١ ص٢٣٦.

سنوورو حیساب. که بڕوادار دەتوانێ بەردەوام نوێژی سوننەت بکات تەنها خۆی بپارێزێ لە کاتە قەدەغەکراوەکان. بۆ نموونە شەونوێژ ژمارەی دیاریکراوی نیە. پێشەوا زەهەبی و پێشەوا یافعی (رەحمەتی خوایان لێ بێت) دەربارەی پێشەوا نەفەعی دەفەرمون: (گێڕدراوەتەوە کە لە شەوو رۆژێکدا حەوسەد رکات نوێژی کردووە).[1]

پێشەوا ئەوزاعی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی عەبدوڕڕەحمان کوڕی یەزیدی کوڕی موعاویە دەفەرموێت: "هەموو شەوو رۆژێك هەزار رکات نوێژی دەکرد".[2]

عەمری کوڕی عوتبە (رەحمەتی خوای لێ بێ) کە دەچوە جیهاد پاسەوانییان نەدەگرت لەبەر زۆر نوێژکردنی ئەو[3] لەم بارەوە سەدان نمونەی گرنگ و گەورە هەیە لە مێژوی ئیسلامدا.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە پێغەمبەر بە بڕبڕەی پشتی ئیسلامی دانابێت

نوێژ بڕبڕەی پشتی دینەو هەر کات کەسێك رایگەیاند دینی هەیەو نوێژی نەدەکرد ئەوە دینەکەی لاشەی پەککەوتوو شەلەل لێ دراوەو هیچ سوودی نیە، وەکو چۆن کەسێك عەمودی فەقەراتی پشتی شکابێت کە تەخت و داماوە.

**قال رسول الله ﷺ: "رأس الامر الاسلام، وعموده الصلاة، وذروة سنامه الجهاد في سبيل الله".**[4] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: سەری هەموو فەرمانێك ئیسلامە، عەمودو بڕبڕاگەکەشی نوێژە، سەری لوتکەکەشی خەبات کردنە لە پێناوی خوادا.

عەمودیش بەو تیرەو دیرەگەیە دەوترێ کە لە هەموو شتێکدا راگرەو موراغەو بڕبڕەی پشتە، لەهەر شتێکدا ئەو زەرەری هێنا ئەو شتە بێ تین و بێ هێزو زەبون دەبێت. چۆن ئادەمیزاد گەر موراغەی پشتی "عمود الفقري" زیانی هێناو نوشستی رووی تێکرد هەموو لاشەی بێ سوودو بێ تواناو پەککەوتە دەبێت و پاکژی خۆشی پێ

---

[1] صلاح الأمة ج ٢ص٣٨٦

[2] صلاح الأمة ج٢ ص٣٩٢.

[3] صلاح الأمة ج٥ ص٥٥٨.

[4] إسناده صحيح أخرجه الترمذي ٢٦٢٢ وتعظيم قدرالصلاة ٩٤٨ وصحيح فقه السنة ج١ ص٢٢٠.

راناگیرێ و کە تەخت و زەبون دەبێت و دەبێتە بار بە سەر دەوروبەرو کەسوکاریەوە، دینیش بەبێ نوێژ لاشەیەکی شەلەل لێدراوو کەتەخت و پەککەوتەیە و سوود بە خاوەنەکەشی و دەروبەریشی ناگەیەنێت مەگەر بە ئەندازەی سوودی کابرای شەلەل لێدراو ئەویش ئەگەر بەدەم شتێکی پێ بکرێ یان نا.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە پێغەمبەر بە بیلبیلەی چاوی دانابێت

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال النبي ﷺ: "حبب الي من الدنيا النساء والطيب وجعل قرة عيني في الصلاة".**[1] واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: لە دونیادا ئافرەت و بۆنی خۆشم لاخۆشەویستە، فێنکی و بیلبیلەی چاوم نوێژە.

لە فەرمودەیەکی تردا هەر لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"جعلت قرة عيني في الصلاة"**[2] واتە: نوێژ کراوەتە گلێنە و بیلبیلەی چاوم.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە کە چاوەڕوانی کردنی تاوان دەسڕێتەوە

هەموو ئامادەباشییەك بۆ نوێژ ئەندازەیەك تاوان دەسڕێتەوە، دەستنوێژ، لە خەوهەستان، رۆیشتن بۆ مزگەوتو بە شوێنی نوێژ چاوەڕوانی نوێژو بە جێنەهێشتنی بەرماڵو بەردەنوێژ..

**عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال: ألا أدلكم على مايمحوا الله به الخطايا، ويرفع به الدرجات؟ قالوا: بلى يارسول الله، قال: إسباغ الوضوء على المكاره، وكثرة الخطا الى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط فذلكم الرباط".**[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەلامی

---

[1] نضرة النعيم ج٦ ص٢٥٥٥. وصحيح الجامع الصغير وذيادته ٣١٢٤

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٣٠٩٨

[3] رواه مسلم، ٢٥١. ورياض الصالحين ١٠٣٠.

خوای لەسەربێت) فەرمووی: "ئەرێ پێتان بڵێم ئەوەی گوناهو تاوان دەسڕێتەوەو پلەی پێ بەرز دەبێتەوە چییە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەستنوێژگرتن بە چاکی لە کاتی ناڕەحەتیدا، زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت، چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ ئەوە خەباتە، ئەوە خەباتە. یان ئەوەیە سەنگەرگرتن لە پێناوی خوادا.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە دەبێتە قەڵغان و مرۆڤ لە شپرزەیی بپارێزێ

لەم نووسراوەداو لە بابەتێکی تردا باسمان لەوە کردووە کە پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەربێت) لە کاتی دڵتەنگیو خەمو پەژارەو ناڕەحەتیو گرفتدا پەنای وەبەر نوێژکردن دەبرد، چونکە نوێژ بڕوادار پەیوەست دەکات بە خواوەو دەیپارێزێ لە شپرزەییو دڵەڕاوکەو خەموپەژارەشی لە دڵ دەردەوێنێ.

خودا دەفەرموێت: "إِنَّ الإنسان خُلِقَ هَلُوعاً * إذا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً * وَإذا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً * إِلَّا الْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ". (المعارج: ١٩ ـ ٢٣). واتە: بێگومان مرۆڤ کە دروستکراوە شپرزەییو بێوەفا دیارە، کە تووشی ناخۆشی دەبێ شپرزەو بێزارە، کە تووشی خێرو خۆشیش دەبێ قەدەغەی خەڵکی لێدەکاتو لە خۆی بایی دەبێت، تەنها نوێژخوێنان نەبن، ئەوانەی بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیانو نایەڵن نوێژەکانیان بچێت.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە دەبێتە هۆی گوشاد بوونی سینەو دەروون

هەرکات پێغەمبەری خودا دڵی تەنگ و دەروونی گوشرابێت، غەمبارو خەفەتبار بووبێت بە هۆی هەڵوێستی نامەردانەو قسەی نابەجێو کردارو رەفتارو گوفتاری نابەجێو ناشایستەی بێباوەڕو هاوبەشدانەرەکانەوە خودا فەرمانی پێ کردووە و هانی داوە بۆ خواپەرستی، لەسەروی هەمووشیانەوە نوێژو سوژدە بردن، خودا دەفەرموێت: "وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ * فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ * وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ". (الحجر: ٩٧ ـ ٩٩). واتە: "بێ گومان ئێمە ئاگادارین کە تۆ لە گفتی ئەمانە دڵتەنگ دەبی، دەی بە سوپاسگوزاریت بێگەردی پەروەردگارت دەربڕەو لە سوژدەبەران (نوێژخوێنان) بەو سوژدەبەرە بۆ پەروەردگارتو پەروەردگاری خۆت بپەرستە هەتا مردنت کە بێ گومانە".

هەروەها پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەربێت) بە بیلالی دەفەرموو: **"یابلال اقم الصلاة وأرحنا بها"**.[1] واتە: ئەی بیلال قامەت بکە بۆ نوێژو ئاسوودەمان بکە. واتە بانگ بفەرموو با نوێژ بکەینو ئاسوودە بین.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە پێغەمبەر بە دڵیدا هات ماڵەکان بسوتێنی بەسەر ئەوانەدا کە کەمتەرخەمییان لێ کردووە

خودای گەورە ئازادی بەهەموو ئادەمییەکان داوەوە هەرکەس بە ویستی خۆیەتی موسڵمان دەبێ یان کافر دەبێ **(فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ) (الكهف)**. واتە: هەرکەس دەیەوێت بێبڕوا بێنێو هەرکەسیش دەیەوێت با بێبڕوا بێت.

بەڵام نابێ کەسێك بڵێ من بڕوادارو موسڵمانم، لە هەمان کاتدا نوێژ نەکاتو ڕەوشتو ئاکاری موسڵمانانە نەبێت. کەسی بێبڕوا، گاور، جولەکە، مانگاپەرست، بتپەرست، لەسەر نوێژ لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێت. بەڵام کەسێك ناوی خۆی بنێ موسڵمانو خۆی لە ریزی موسڵمانان لە قەڵەم بدات لێی قبوڵ ناکرێت نوێژ نەکات، سزای دونیایی و دوارۆژی بۆ دانراوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: والذي نفسي بيده لقد هممت أن آمر بحطب فيحتطب، ثم آمر بالصلاة فيؤذن لها، ثم آمر رجلا فيؤم الناس، ثم أخالف الى رجال فاحرق عليهم بيوتهم،...**[2]

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ "أثقل الصلاة على المنافقين صلاة العشاء، وصلاة الفجر، ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبوا، ولقد هممت أن آمر بالصلاة فتقام، ثم آمر رجلا فيصلي بالناس، ثم انطلق معي برجال معهم حزم من حطب، الى قوم لايشهدون الصلاة فاحرق عليهم بيوتهم بالنار.**[3]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەلاتو

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٧٨٩٢.

[2] متفق عليه البخاري ١٠٨. ومسلم ٦٥١.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٣٣.

سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: گرانترین نوێژ لەسەر دووڕووەکان نوێژی خەوتنانو نوێژی بەیانیانە، ئەگەر بیانزانییایە خێریان چەندە بە گاگۆلکەش بوایە بۆیان دەهاتن. نیازم بوو کە فەرمان بکەم قامەت بکرێو ئینجا فەرمان بکەم بە پیاوێك پێشنوێژی بۆ خەلکی بکات ئینجا خۆشم لەگەڵ کۆمەڵێ پیاوی باوەش داربەدەستەوە بڕۆم، بۆ کەسانێك کە ئامادەی نوێژ نابن ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنم.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە دوعای وەسیلەدا باسکراوە کە بەهەشتو شەفاعەت مسۆگەر دەکات

لە دەقی ئەم نزا پیرۆزەدا نوێژ لە بەرامبەر هەموو دینەوە باسکراوە و ستایشی خوا کراوە لەم دوعایەدا بەوەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازەو ئەو نوێژە ئەنجام دراوەیە.

**عن جابر (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: من قال حين يسمع النداء اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة، آت محمدا الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاما محمودا الذي وعدته، حلت له شفاعتي يوم القيامة.**[1] واتە: لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: هەرکەس گوێی لە بانگ بوو بڵێ: ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوەو ئەم نوێژ پیادە کراوە، بە موحەممەد ببەخشە وەسیلەو فەزیلەو بیگەیەنەرە ئەو پلە بەرزو ستایش کراوە کە بەڵێنت پێداوە. ئەو کەسە تکای منی بۆ مسۆگەر دەبێت لە ڕۆژی دواییدا.

**عن عبدالله بن عمرو أنه سمع النبي ﷺ يقول: إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثم صلوا علي، فانه من صلى علي صلاة، صلى الله بها عشرا، ثم سلوا لي الوسيلة فانها منزلة في الجنة لاتنبغي الا لعبد من عباد الله، فأرجو أن أكون أنا هو، فمن سأل لي الوسيلة حلت عليه الشفاعة.**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوێی لە پێغەمبەر بووە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)

---

[1] رواه البخاري ٧٨ ورياض الصالحين ١٠٣٩ وصحيح الجامع الصغير وزيادته ج١ ص٢٨٧.

[2] أخرجه البخاري ٣٨٤، وأبوداود ٥٢٣. والترمذي ٣٦٩٤. والنسائي ٢/٢٥. صحيح الفقه السنه ج١ ص٢٨٧.

دەیفەرموو: ئەگەر گوێتان لە بانگبێژ بوو چی دەڵێ وەکو ئەو بیڵێنەوە، ئینجا سەڵاوات لەسەرم بدەن، بەڕاستیی هەرکەس سەڵاواتێکم لەسەر بدات، خوا دە سەڵاواتی لەسەر دەدات، پاشان داوای وەسیلەم بۆ بکەن کە شوێنێکە لە بەهەشتدا بەیەك کەس نەبێ بە کەسی تر نادرێ لە خواپەرستان، ئومێدم وایە ئەو کەسەش من بم هەرکەس داوای وەسیلەم بۆ بکات تکای منی بۆ مسۆگەر دەبێت.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە کاتی خۆشیو سەفادا ئەنجام بدرێت

لە جەژنداو لە کاتی خۆشیو کەیفو سەفادا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)و هاوڕێیانی یەکەم شت ئەنجامیان داوە بە ناوی جەژنەوە دوو رکات نوێژ بووە ئەویش لە دوای خۆشتنو خوارازاندنەوەو پۆشینی جوانترین و تازەترین جلو بەرگ.

**عن نافع أن إبن عمر "كان يغتسل يوم الفطر قبل ان يغدوا الى المصلى".**[1] **أسناده صحيح.** واتە: لە نافیعەوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رۆژی جەژنی رەمەزان خۆی دەشۆرد، پێش ئەوەی بچێتە نوێژی جەژن.

**عن إبن عمر قال: "أخذ عمر جبة من استبرق تباع في السوق، فأخذها، فأتى رسول الله ﷺ فقال يارسول الله ابتع هذه، تجمل بها للعيد والوفود..".**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە فەرمووی: عومەر جبەیەکی ئاوریشمی هەڵگرت لە بازاردا دەیانفرۆشت هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەر و فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بکڕە، خۆتی پێ برازێنەرەوە بۆ رۆژی جەژنو پێشوازی وەفدەکان.

**عن إبن عباس (رضي الله عنهما)، أن النبي ﷺ صلى يوم الفطر ركعتين، لم يصل قبلها ولا بعدها".**[3] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە پێغەمبەر (سەڵاتو

---

[1] أخرجه مالك ٤٢٦ وعنه الشافعي ٧٣ وعبدالرزاق ٥٧٥٤، صحيح فقه السنة ج١ ص٦٠٢.

[2] أخرجه مالك ٤٢٦. وعنه الشافعي ٧٣. وعبدالرزاق ٥٧٥٤. صحيح فقه السنة ج١، ص٦٠٢.

[3] أخرجه البخاري ٩٢١، والترمذي ٥٣٧ والنسائي ٤٩٢ وإبن ماجة ١٢٩١. وصحيح فقه السنة ج١، ص٦٠٥.

سەلامی خوای لەسەر بێت) نوێژی جەژنی رەمەزانی کرد دوو رکات، ئیتر نە لە پێشییەوە و نە لە دواییەوە نوێژی نەکرد.

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) قال: شهدت العيد مع رسول الله ﷺ وابي بكر وعمر وعثمان (رضي الله عنهم) فكلهم كانوا يصلون قبل الخطبة".**[١] واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێت) و لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان (رەزای خوایان لێ بێ) هەموویان نوێژی جەژنیان لە پێش وتارەکەدا دەکرد.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە کاتی روودانی دیاردە سروشتییەکاندا ئەنجام بدرێت

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمانمان پێ دەکات کە لە کاتی روودانی هەر دیاردەیەکی سروشتیدا نوێژ بکەین ئەگەر دیاردەکە چاك بوو لە بەرژەوەندیمان بوو نوێژ دەکەین وەکو سوپاسگوزاریی، ئەگەریش ترسناك و مەترسیدار بوو نوێژ دەکەین وەکو نزاو پاڕانەوەو داواکردن لە خوا بۆ چارەسەرکردنی و لابردنی و دوورخستنەوەی زیانی لە موسڵمانانو باقی خەڵکی.

جابر (رەزای خوای لێ بێ) لە فەرمودەیەکدا گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"... إنهم كانوا يقولون: إن الشمس والقمر لاينكسفان الا لموت عظيم، وإنهما آيتان من آيات الله، يريكموها فإذا انكسفا فصلو حتى تنجلي".**[٢]

واتە: لە فەرمودەکەدا هاتووە: ".. ئەوان دەیانوت: بەڕاستیی خۆرو مانگ بۆ مردنی کەسێکی گەورە نەبێت ناگیرێن، ئەوان دوو ئایەتو بەڵگەی خودان نیشانتان دەدرێن ئەگەر گیران نوێژ بکەن هەتا بەڵگەو نیشانەکە لا دەچێت".

---

[1] أخرجه البخاري ٩٦٢ ومسلم ٨٨٤ وصحيح فقه السنة ج١، ص٦٠٨.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٣٩٨.

**عن المغيرة أن النبي ﷺ قال: "إن الشمس والقمر آيتان من آيات الله لاينكسفان لموت احد ولا لحياته، فإذا رأيتموهما فادعوا الله، وصلوا حتى ينجلي.."**.[1] واته: له موغیرەوه (رەزای خوای لیّ بیّ) پیّغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بیّت) فەرموویەتی: بیّ گومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن له نیشانەکانی خوا، بۆ مردنو ژیانی کەس ناگیریّن ئەگەر بینیتان گیرابوون بپاڕیّنەوه له خواو نویّژ بکەن هەتا بەرەلاّ دەبیّت.

**عن عائشة (رضي الله عنها) أن النبي ﷺ قال: ".. فإنا رأيتم ذلك فادعوا الله وكبروا وصلوا وتصدقوا.."**.[2] واته: له عائیشەوه (رەزای خوای لیّ بیّ) پیّغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی ئەگەر بینیتان شتیّکی وا بپاڕیّنەوه (الله اکبر) بکەنو نویّژ بکەنو خیّر بکەن.

**عن عبادة بن تميم عن عمه قال: "خرج النبي ﷺ الى المصلي يستسقى واستقبل القبلة فصلى ركعتين وقلب رداءه جعل اليمين على الشمال"**.[3] واته: له عوبادەی کوڕی تەمیمەوه له مامیەوه فەرمووی پیّغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بیّت) هاته دەر بۆ شویّنی نویّژ، پاڕایەوەو داوای باران بارینی کردو دوو رکات نویّژی کردو جلەکەی هەڵگیّڕایەوه، لای راستی کرده لای چەپی.

**عن عبدالله بن زيد قال: خرج رسول الله ﷺ الى المصلى فاستسقى وحول رداءه حين استقبل القبلة وبدأ بالصلاة قبل الخطبة ثم استقبل القبلة ودعا"**.[4] واته له عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوه فەرموویەتی پیّغەمبەر چووه دەرەوه بۆ شویّنی نویّژو داوای باران بارینی له خوا کردو جلەکانی سەرەوەی هەڵاّواژوو کرد لەو کاتەدا رووی کرده رووگه و دەستی کرد به نویّژکردن، له پیّش وتاردا، ئینجا رووی له رووگه کردو پاڕایەوه.

---

[1] أخرجه البخاري ١٠٦٠ ومسلم ٩٠٤.

[2] أخرجه البخاري ١٠٤٤ ومسلم ٩٠١. صحيح فقه السنه ج١، ص٤٣٤.

[3] أخرجه البخاري ١٠٢٧ ومسلم ٨٩٤، واللفظ للبخاري. وصحيح فقه السنة ج١، ص٤٤٠.

[4] إسناده صحيح أخرجه البخاري ١٠٢٧ و أحمد ١٦٤٨٢، وصحيح فقه السنة ج١، ص٤٤٠.

**وعن عبدالله بن زيد قال: خرج النبي ﷺ يستسقى فتوجه الى القبلة يدعوه وحول رداءه، ثم صلى ركعتين جهر فيهما بالقراءة".**[1] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە فەرمووی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) چووە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، رووی لە رووگە کردو ئەپاڕایەوە کراسەکەی واژوانە کرد، ئینجا دوو رکات نوێژی کرد، بە دەنگی بەرز قورئانی تیادا خوێند.

**عن أنس رضي الله عنه قال: "كان النبي ﷺ لايرفع يديه في شيء من دعائه الا في الاستسقاء وانه يرفع حتى يرى بياض إبطيه".**[2] واته: له ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە هیچ پاڕانەوەیەکیدا دەستی بەرز نەکردەوە تەنها لە دوعای باران بارینددا نەبێت لە پاڕانەوەی نوێژەبارانەدا دەستی بەرز کردەوە هەتا سپیایی بن هەنگڵی ئەبینرا.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە کاتی رۆیشتنو گەڕانەوە لە سەفەر ئەنجام بدرێت

پێغەمبەری خوا هەر کات چووبێتە سەفەر سەرەتاو دەستپێکی گەشتەکەی دوو رکات نوێژ بووە، لە گەڕانەوەشدا بەهەمان شێوە لە مزگەوت دوو رکات نوێژی کردووە ئەوجا بە خێرو سڵامەت چووەتەماڵەوە.

**عن كعب بن مالك (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ: "كان إذا قدم من سفر بدا بالمسجد فركع فيه ركعتين".**[3] واته: له کەعبی کوڕی مالیکەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) کە لە سەفەر دەگەڕایەوە یەکەم جار دەچووە مزگەوت و دوو رکات نوێژی دەکرد.

**عن أبي ثعلبة الخشنى قال: كان رسول الله ﷺ إذا قدم من غزو او سافر بدا بالمسجد فصلى فيه ركعتين ثم يأتي فاطمة، ثم يأتي أزواجه".**[4] واته: له ئەبی

---

[1] أخرجه البخاري ١٠٢٤. ومسلم ٨٩٤. صحيح فقه السنة، ج١، ص٤٤١.

[2] أخرجه البخاري ١٠٣١ ومسلم ٨٩٥ صحيح فقه السنة، ج١، ص٤٤١.

[٥٧٩] متفق علية البخاري ومسلم ٢٧٦٩ وأخرجه أبوداود ٢٧٨١ ورياض الصالحين ٩٨٨.

[4] الحسن بن علي ص٤٧ للصلابي.

سەعلەبەی خەشنیەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی پیٚغەمبەری خوا (سەلاٚت و سەلامی خوای لیٚ بیٚت) کە لە غەزایەك دەگەڕایەوە یان دەچووە سەفەر لە مزگەوتەوە دەستی پیٚ دەکرد دوو رکاعەت نویٚژی تیادەکرد، ئینجا سەردانی فاتیمەی دەکرد، دواتر دەچوەوە بۆ لای هاوسەرەکانی.

## نویٚژ یەکەم پایەی ئیسلامە کە جموجوڵ و لاکردنەوە دروست نییە لە کاتی ئەنجامدانیدا

جموجوڵ و خۆبزواندن لە نویٚژدا دروست نییەو خوداو پیٚغەمبەر ریٚگەیان پیٚنەداوە مەگەر لە ناچاریدا، هەروەها دروست نییە ئاوڕدانەوە و لاکردنەوە لە نویٚژدا.

**قال الزهري في قوله تعالى: "الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ".**[1] (المؤمنون: ٢). واتە زوهری فەرموویەتی لە راڤەی ئەم ئایەتەدا "ئەوانەی لەناو نویٚژەکانیاندا جموجوڵ ناکەن و نابزویٚن".

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: قال لي رسول الله ﷺ: "إياك والالتفات في الصلاة فإن الالتفات في الصلاة هلكة، فإن كان لابد ففي التطوع لا في الفريضة".**[2] واتە: لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی پیٚغەمبەر (سەلاٚت و سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی: ئاگاداربە لە نویٚژدا لا مەکەرەوە، چونکە لاکردنەوەو ئاوڕدانەوە لە نویٚژدا تیاچوونە، ئەگەر هەر ناچار بوو با لە نویٚژی سوننەتدا بیٚت نەك فەرزەکان.

**عن إبن سيرين قال: كان الناس يرفعون أبصارهم في الصلاة ويلتفتوا يمينا وشمالا حتى نزلت هذه الآية: "قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ". (المؤمنون: ١ ـ ٢). قال فلم يلتفتوا يمينا وشمالا.** واتە: لە ئیبن سیرینەوە فەرموویەتی خەڵکیی چاویان هەڵدەبڕی لە نویٚژداو سەیری لای راست و چەپیان دەکرد هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: بەڕاستیی بڕواداران رزگاریان بووە،

---

[1] تعظيم قدر الصلاة ص١١٠.

[2] إسناده صحيح.

ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا گەردنکەچن. فەرمووی لەوەودوا نە بە لای ڕاست نە بە لای چەپدا نەیاندەڕوانی.

**(الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ) فالدوام هو سكون الاطراف والطمانينة.** واتە: ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا بەردەوامن. فەرمویانە (الدوام) واتە: ئارامیو جموجوڵ نەکردنی ئەندامەکانی لەش.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: سألت رسول الله ﷺ عن الإلتفات في الصلاة فقال: "هو إختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد".**[1] واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) دەربارەی لاکردنەوەو ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا، فەرمووی: ئەو غافڵ گیرکردنە لە لایەن شەیتانەوەو دەست لێوەشاندنە لە نوێژی بەندەی موسڵمان.

ئیبن مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: با کەسێك لە ئێوە بەشی شەیتان لە نوێژەکەیدا دانەنێت وابزانێ هەقی بەسەرییەوەیەتی کە هەر بە لای ڕاستدا بڕوات.[2]

ئیبنو سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: **"كانوا يقولون لايجاوز بصره مصلاه".**[3] واتە: دەیانفەرموو، چاوی لە سوژدەگاکەی تێنەدەپەڕی.

**وقال الحسن (رحمه الله)): "إذا قمت الى الصلاة قانتا، فقم كما أمرك الله، وإياك والسهو والإلتفات، إياك أن ينظر الله اليك وتنظر الى غيره...".**[4] واتە: حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەگەر هەستای بۆ نوێژ بە گەردنکەچی، بەو شێوەیە هەستە خوا فەرمانی پێ کردووی، ئاگاداری هەڵەو لاکردنەوە بە، ئاگادار بە خوا سەیری تۆ دەکات، تۆ سەیری غەیری ئەو نەکەی.

---

1 رواه البخاري ١٩٤/٢. أخرجه أبوداود ٩١٠. والنسائي ٨/٣. رياض الصالحين ١٧٥٥.وصلاح الأمة ج٥، ص٥٩٤.

2 صلاح الأمة في علو الهمة، ج٢، ص٣٤٥، الطبعة الثانية.

3 صلاح الأمة في علو الهمة ج٥، ص٥٩٠.

4 صلاح الأمة في علو الهمة ج٥، ص٥٩٨.

ئیبنو جریج فەرموویەتی: هەژدە ساڵ هاودەمی (عەتاء) بووم، دوای ئەوەی چووە تەمەنەوە و بێ هێز بوو هەڵدەستا بۆ نوێژ، دووسەد ئایەتی دەخوێند لە سورەتی **(البقرة)** هەر بە پێوە بوو هیچی لێ تێکنەدەچوو نەشدەجوڵایەوە.[1]

لە فەرمودەی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: **"...أُسكنوا في الصلاة"**.[2] واتە: "مەجولێن لەناو نوێژدا".

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە کە عیسا ئەنجامی ئەدات لە کاتی هاتنە خوارەوەیدا

هاتنە خوارەوەی عیسا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بە فەرمانی خودا لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی هاوکاتە لەگەڵ ریزبوونو پۆل بەستنی موسڵمانان بۆ نوێژی بەیانی، پێشەواکەیان پێش دەکەوێتو یەکسەر دێتە دواوە داوا لە عیسی پێغەمبەر دەکات (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) کە پێشنوێژییان بۆ بکات، بەڵام عیسا رازی نابێ. بەم شێوە لە فەرمودەکەدا هاتووە:

**"وإمامهم (أي أمام الجيش الإسلامي) رجل صالح، فبينما إمامهم قد تقدم يصلى بهم الصبح، إذ نزل عليهم عيسى بن مريم الصبح، فرجع ذلك الامام ينكص، يمشي القهقهرى ليتقدم، عيسى، فيضع عيسى يده بين كتفيه، ثم يقول: تقدم فصل، فانها لك أقيمت، فيصلي بهم إمامهم"**.[3]واتە: پێشەواکەیان (پێشەوای لەشکری ئیسلامی) پیاوێکی چاکە، پێشەواکەیان دەچێتە پێشەوە پێشنوێژییان بۆ بکات، لەوکاتەدا عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە کە نوێژی بەیانییە، پێشەواکە بە خێرایی پاشەوپاش دێتە دواوە هەتا عیسا پێش بکەوێت، بەڵام عیسا رازی نابێتو دەستدەخاتە نێوان هەردوو شانی پێشەواکەو ئینجا پێی دەفەرموێت پێشکەوە، نوێژ

---

[1] صلاح الأمة في علو الهمة ج٧، ص١٣٧. الطبعة الثانية.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٦٦٥.

[3] اليوم الآخر / القيامة الصغرى، ص٢٦٠. الطبعة الثالثة ١٩٩١. والحديث رواه إبن ماجة ٤٠٧٧ وإبن خزيمة وإسناده صحيح. إبن خزيمة ٤٢١٥.

بکە، ئەوە بۆ تۆیە، ئینجا پێشەواکەیان نوێژەکەیان پێ دەکات". کەواتە عیسا نوێژی بەیانی لە دوای ئەو پێشەوایەوە دەکات.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: فبينما هم يعدون للقتال، يسوون الصفوف، إذ أقيمت الصلاة فنزلت عيسى بن مريم، فأمهم. ولفظه في كتاب الإيمان: "كيف أنتم إذا نزل إبن مريم فيكم وأمكم".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: لەو دەمەی خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەکەنو ریزەکان رێك دەخەن، هاوکات قامەت دەکرێ, عیسا کوڕی مەریەم دێتە خوار دەبێتە پێشەوایان. لە دەقێکی تردا دەفەرموێت: حاڵتان چۆنە کە عیسای کوڕی مەریەم بێتە خوار بۆ ناوتان پێشەواییتان بکات (پێشەوای موسڵمانان نەك پێشەوای نوێژ)، چونکە لە فەرمودەی تریشدا هاتووە کە عیسا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) پێشنوێژییان بۆ ناکات.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ "كيف أنتم إذا نزل إبن مريم فيكم، وإمامكم منكم".**[2] لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئێوە چۆن دەبن کاتێ عیسی کوڕی مەریەم لە ناوتاندا بێت پێشنوێژیش لە خۆتان بێت. لە فەرمودەیەکی تردا پێشەوا موسلیم لە جابرەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر بووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە بەشێکی فەرمودەکەدا دەفەرموێ: عیسا دێتە خوار فەرماندەکەتان دەڵێ وەرە نوێژمان بۆ بکە دەفەرموێت نابێ ئێوە خۆتان هەندێکتان فەرماندەی هەندێکتانن ئەوەش رێزی خوایە بۆ ئەم ئوممەتە.[3]

---

[1] رواه مسلم كتاب الفتن، باب فتح قسطنطينية ٢٨٩٧. ورواه في كتاب الايمان باب نزول عسى بن مريم ١٥٥. والقيامة الصغرى ص٢٦٠ـ ٢٦١.

[2] رواه البخاري ٣٢٦٥ "كتاب أحاديث الانبياء" ومسلم كتاب الايمان ١٥٥.

[3] رواه مسلم "كتاب الإيمان" ١٥٦ والقيامة الصغرى ص٢٦١.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە تەمەڵی کردن لە ئەنجامدانیدا نیشانەی دوڕوویيە

کەسێك بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خوا تەمەڵی بکات، کەسێك لەشی قورسو گران بێت بۆ ئەنجامدانی یەکێك لە گەورەترین پایەکانی ئیسلام کە موسڵمانو کافر و بێ بڕوای پێ جیادەکرێتەوە دروشمێك کە ڕەمزی خواپەرستی فریشتەکانو پێغەمبەرەکانو پیاوچاکان بێت، پایەیەکی دین کە پێغەمبەرەکان لە دوای مردنیشیان ئەنجامیان داوە.

تەمەڵی بکات لە فەرمانی خواو پێیغەمبەرو قورئان. تەمەڵی بکات لە دروشمێك کە پێغەمبەری پێ ئاسوودە بووەو بە بیلبیلەی چاوی داناوە، لە هەموو کەس زیاتر شایستەیە پێی بوترێ دووڕوو و دەغەڵ.

خوا دەربارەی دووڕووەکان دەفەرمویێت: **"... وَلاَ يَأْتُونَ الصَّلاَةَ إِلاَّ وَهُمْ كُسَالَى وَلاَ يُنفِقُونَ إِلاَّ وَهُمْ كَارِهُونَ"**. (التوبة : ٥٤) واتە: نوێژ ناکەن بە تەمەڵی نەبێت، ماڵیش نابەخشن بەنابەدڵیو زۆرەمل نەبێت.

هەروەها دەفەرموێت: **"..إذا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى يُرَآؤُونَ النَّاسَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللّهَ إِلاَّ قَلِيلاً"**. (النساء: ١٤٢). واتە:.. هەرکات دووڕووەکان هەستان بۆ نوێژکردن بە تەمەڵیو دەغەڵی هەڵدەستنو ڕووپامایی خەڵکی دەکەن و یادی خوا ناکەن بەکەمی نەبێ.

## دووڕووەکان زۆر نوێژیان لە شان گران بووە

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ليس صلاة أثقل على المنافقين من صلاة الفجر والعشاء ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبوا". متفق عليه**[1]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: هیچ نوێژێك نییە گرانتر بێت لەسەر دووڕووەکان لە نوێژی بەیانیو خەوتنان، ئەگەر بیانزانیایە چی خێرێکی تیایە بە گاگۆڵکەش بوایە بۆی دەچوون.

[1] البخاري ٦٢٦ ومسلم ٦٥١. رياض الصالحين ١٠٧٣. ونضرة النعيم ج٦، ص٢٥٥٤. رقم ١١.

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) قال: "كنا إذا فقدنا الرجل في الفجر والعشاء أسانا به الظن".**[1] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: "ئێمە ئەگەر کەسێکمان لە نوێژی بەیانیو خەوتنان نەبینیایە گومانی خراپمان پێ دەبرد" (واتە گومانی دوڕوویمان پێ دەبرد).

**وفي رواية عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: "لقد رأيتنا وما يتخلف عن الصلاة الا منافق قد علم نفاقه..".**[2] واتە: لەلایەکی ترەوە گێردراوەتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: بەڕاستیی وامان دەزانی کە لە نوێژ دواناکەوێت مەگەر دووڕوویێك بە ئاشکرا دووڕوو بێت.

**ثابت البناني** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: وامان پێگەیشتووە کە ئیبیلس (نەفرەتی خوای لێ بێت) لە لای یەحیای کوڕی زەکەریا خۆی دەرخست (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بینی لە هەموو شتێکی پێوە هەڵاوەسرابوو، یەحیا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: ئەی ئیبلیس ئەوە ئەو هەموو شتە هەڵواسراوە چییە پێوەتەوە ئەیبینم؟ وتی ئەمە ئەو ئارەزووانەیە کە نەوەی ئادەمی پێ دووچار دەکەم. فەرمووی: هیی منی تیایە؟. وتی: لەوانەیە تێر بخۆیو لەشت قورس بێت بۆ نوێژو یادی خوا. فەرمووی: ئایا بێجگە لەمە؟ وتی: نەء. فەرمووی: دەی واللە هەرگیز سکم پڕ ناکەم لە خواردن. ئیبلیس نەفرینی خوای لێبێت وتی: دە واللە منیش هەرگیز ئامۆژگاری موسڵمان ناکەم.[3]

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە وازلێهێنانی دەبێتە هۆی زاڵ بوونی شەیتان

**عن أبي درداء (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "مامن ثلاثة في قرية ولابدو لاتقام فيهم الصلاة الا قد استحوذ عليهم الشيطان، فعليكم**

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٠٥. رجاله ثقات رواه الطبراني في المعجم الكبير ١٣٠٨٥ وإبن خزيمة في صحيحه، الترغيب ٢٠٨.

[2] رواه مسلم رقم ٦٥٤.

[3] صحيح وصايا الرسول ج٢، ص٢٣٧.

**بالجماعة، فانما يأكل الذئب من الغنم القاصية".** [1]واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەر بوو (سەلامی خوای لەسەربیٚت) دەیفەرموو: هەر گوندو خێمەو چادرنشینێك سیٚ کەسی لیٚ بیٚت نوێژ نەکەن بە کۆمەڵ حەتمەن شەیتان سواری سەریان دەبێتو زاڵ دەبێت بەسەریاندا.

**وعنه (رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: "ما من ثلاثة لايؤذن ولا تقام فيهم الصلاة الا استحوذ عليهم الشيطان".** [2] إسناده لين. واتە: هەر لەوەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەر بوو (سەلامی خوای لەسەربیٚت) دەیفەرموو: هەر سیٚ کەسێك کە بانگیان لەناودا نەدریٚو نوێژیان لەناودا نەکریٚ بە جەماعەت، حەتمەن شەیتان سواری سەریان دەبێت تەنانەت تەمەڵی کردن لە ئەنجامدانی نوێژ یان هەر دەرکەوتنی دیاردەو نیشانەی تەمەڵی دەبێتە هۆی دەستوەشاندنی شەیتان وەکو لەم فەرمودەیەدا دەردەکەویٚت: **"إذا تثاءب أحدكم في الصلاة فليكظم مااستطاع فان الشيطان يدخل".** واتە: ئەگەر یەکێکتان لە نوێژدا باوێشکی دا با دان بە خۆیدا بگریٚ، بە گوێرەی توانا، چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوە.

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە لە پێش هەموو پایەکانی ئیسلام و پەرستنەکاندا داکۆکی لێپرسینەوەی لەسەر بکریٚت

لە ڕۆژی دواییدا ئەو کاتەی هەموو دروستکراوەکان ڕووبەڕووی دادگا دەکرێنەوە، خودا مەحکەمەو دادگاییان دەکات، لە پێش هەموو پەرستنەکاندا نوێژ داکۆکی لەسەر دەکریٚت لێپرسینەوەی لەسەر ئەنجام دەدریٚت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إن أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة من عمله صلاته فان صلحت، فقد أفلح وانجح، وان فسدت فقد خاب وخسر، فان انتقص من فريضته شيئا قال الرب عزوجل: انظروا هل لعبدي من تطوع فيكمل منها ما انتقص من الفريضة؟ ثم يكون سائر أعماله على**

---

[1] رواه أبوداود ٥٤٧. رياض الصالحين ١٠٧٠.

[2] أخرجه أبوداود ٥٤٧ والنسائي ٨٤٧ وأحمد ٢١٧٥٨. صحيح فقه السنة ج١، ص٢٧٣.

**هذا"**.[1] له ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی پێغەمبەر (سەلامی خوا لیّ بێت) فەرمووی: بێگومان یەکەم پەرستش لە کردەوەکانی بەندە لێپرسینەوەو داکۆکی لەسەر بکرێت نوێژە ئەگەر نوێژەکان چاك بوون، دەرچووەو رزگاری بووە، ئەگەر نوێژەکانیش خراپ بوون، ئەوە زیانی کردووەو خەسارەتمەند بووە، خۆ ئەگەر کەم و کوڕی لەفەرزەکانیدا هەبوو، خوا دەفەرمویت: بزانن ئەم بەندەیەم سوونەتی هەن، تا کەم و کوڕی فەرزەکانی بۆ پڕ بکەنەوە پێیان، ئینجا هەموو کردەوەکانی بەم شێوەیە.[2]

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: **"إن أول منسك يومكم هذا الصلاة"**.[3] واتە: بەڕاستیی یەکەم پەرستشی ئێوە لەم ڕۆژەدا ئەم نوێژەیە. واتە: نوێژی جەژن.

هەروەها فەرموودەی ژمارە **(٢٥٧١ صحيح / صحيح الجامع الصغير و صحيح أبي داود ٨١١. وصحيح الجامع الصغير ٢٥٧٣ ـ ٢٥٧٤)**.

لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە کە فەرموویەتی: **"نحن آخر الامم، وأول من يحاسب يقال: أين الامة الامية نبيها فنحن الآخرون الأولون"**.[4] واتە: ئێمە کۆتا ئوممەتین و یەکەم جاریش لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێ، دەوترێ کوا ئوممەتی پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکە، ئێمە کۆتاییینو یەکەمیشین.

لە پێش هەموو ئومەتو گەلو هۆزەکاندا لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێ، یەکەم شتیش لەم ئوممەتەدا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ، نوێژە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و پلەو پایەی نوێژ لە ئیسلامدا.

---

[1] الترمذي ٤١٣ وأبوداود ٨٦٤ وان ماجة ١٤٢٥ حديث صحيح. وقال الترمذي حسن. وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٠٢٠. و رياض الصالحين ١٠٨١

[2] واتە: ئەگەر فەرزەکانو ئەرکەکانی کردبێت و کەموکورییان تیادا بێت بە سوننەتەکان بۆی پڕ دەکرێتەوە.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٠٢٣.

[4] صحيح الجامع الصضغير وزيادته. ٦٧٤٩.

## چاوەڕوانی نوێژ، نزای فریشتەکان مسۆگەر دەکات

خۆئامادەکردن و چاوەڕوانی و ئامادەباشی بە نیازێکی پاكو بێگەرد بۆ کردنی هەر چاکەیەك یان هەر خواپەرستییەك بە خێرو چاکەو پەرستن دادەنرێت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: الملائكة تصلي على أحدكم مادام في مصلاه الذي صلى فيه ما لم يحدث تقول: اللهم اغفر له، اللهم ارحمه".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: فریشتەکان نزاو داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ هەر یەکێکتان هەتا لە سوژدەگاکەیدا بێت، کە نوێژی تیادا کردووە، هەتا دەستنوێژی نەشکێ. دەڵێن: خودایە لێی خۆشبە، خودایە بەزەییت بێتەوە پێیدا.

## نوێژ ڕەمزو نیشانەی بەندە ڕاستەکانە

بەندایەتی کردن بۆ خوا بەبێ نوێژ ناوی بێ ناوەڕۆکەو توێکڵی بێ کاکڵە. نوێژ پێشەنگو سەرمەشقو سەرقافڵەی هەموو جۆرەکانی پەرستنو گوێڕایەڵی خوایە. بانگەوازی بەندایەتی خوا بەبێ نوێژ پروپاگەندەیەو خوا شتی وای ناوێ، خوا دەفەرموێت: **"وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاء الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ". (الأنبياء: ٧٣).** واتە: نیگامان بۆ کردن کە کردەوە چاکەکان بکەنو بە چاکی نوێژەکان بکەنو زەکات بدەن، ئەوان بۆ ئێمە بەندەی ڕاستەقینە بوون.

## خوا شانازی دەکات بەوانەی لە نوێژێکەوە چاوەڕوانی نوێژێکی تر دەکەن

**عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) قال صلينا مع رسول الله ﷺ المغرب فرجع من رجع، وعقب من عقب، فجاء رسول الله ﷺ مسرعا قد حضره النفس قد حسر عن ركبته، قال "أبشروا، هذا ربكم قد فتح بابا من أبواب السماء يباهى بكم**

---

[1] رواه البخاري ٤٣٤، ورياض الصالحين رقم ١٠٦٢.

**الملائكة يقول: انظروا إلى عبادي قد قضوا فريضة وهم ينتظرون أخرى". صحيح**[1] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویەتی لەگەڵ پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نوێژی ئێوارەمان کرد، ئیتر ئەوەی گەڕایەوە گەڕایەوە، ئەوەش مایەوە مایەوە، لەناکاو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بە هەڵەداوان هات هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو ئەژنۆی ڕوت کردبوو "واتە جلەکەی هەڵکردبوو لە پەلە پەلیدا" فەرمووی: مژدەبێ، بەڕاستیی ئەوە پەروەردگارتانە دەرگایەکی لە دەرگاکانی ئاسمان کردۆتەوە شانازیتان پێوە دەکات لە لای فریشتەکانو دەفەرموێت: "سەیری بەندەکانم بکەن فەرزێکیان تەواو کردووە چاوەڕێی یەکێکی تر دەکەن".

## چاوەڕوانی کردنی نوێژ نوێژکردنە

چاوەڕوانی هەر کارێکی خێرو چاك پاداشتی دونیاو دوارۆژی لەدوایە، چاوەڕوانی نوێژیش کە چاکترین کردار و خواپەرستیە لە هەموویان زیاتر.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "لايزال أحدكم في صلاة مادامت الصلاة تحبسه، لايمنعه أن ينقلب الى أهله الا الصلاة"**[2]. واتە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: بەردەوام هەر یەکێکتان لە نوێژدایە هەتا نوێژ گیری دابێ، ئەوەی نەهێڵێ بچێتەوەماڵەوە، نوێژ بێ.

**عن أنس (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ أخر ليلة صلاة العشاء الى شطر الليل ثم أقبل علينا بوجهه بعدما صلى فقال: صلى الناس ورقدوا ولم تزالوا في الصلاة منذ أنتظرتموها"**.[3] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) نوێژی خەوتنانی دواخست بۆ نیوەی شەو ئینجا

---

[1] رواه إبن ماجة ٨٠١. والترغيب والترهيب ٦٢٩.

[2] ـ متفق عليه، البخاري ١٧٦، بلفظ. مسلم ٦٤٩، ورياض الصالحين ١٠٦١، وصحيح الترغيب والترهيب ٦٢٦، وصحيح الجامع ٧٦٨٨.

[3] ـ رواه البخاري واللفظ له رقم ٦٣٠ ورياض الصالحين ١٠٦٣ والترغيب والترهيب ٦٢٧.

رووی تێکردین دوای ئەوەی نوێژی کرد فەرمووی: خەڵکیی نوێژیان کردو خەوتن ئێوە بەردەوام لە نوێژدان لەو کاتەوەی چاوەڕوانیتان کردووە.

**قال النبي ﷺ: "أنكم لن تزالوا في الصلاة ما انتظرتم الصلاة"**[١]. واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "بەردەوام ئێوە لە نوێژدان ئەوەندەی چاوەڕوانی نوێژتان کردووە". **وللبخاري: "أن أحدكم في الصلاة ما دامت الصلاة تحبسه والملائكة تقول اللهم أغفر له، اللهم أرحمه، ما لم يقم من مصلاه أو يحدث"**[٢]. واتە: لە بوخاریدا هاتووە: "هەریەکێ لە ئێوە لە نوێژدایە ئەگەر نوێژەکەی گیری دابێو فریشتەش دەڵێن خوایە لێی خۆش بە، خوایە بەزەییت پێیدا بێتەوە هەتا لە شوێنی نوێژکردنەکەی هەڵنەستابێو بێ دەستنوێژیش نەبووبێ".

## نوێژ تاوان دەسڕێتەوە

هەموو خواپەرستییەكو هەموو کردارو گوفتارێکی پەسەندو چاك گوناهو تاوان دەسڕێتەوە، نوێژ لە روانگەی چەندەها فەرمودەی راستو صەحیحی پێغەمبەرەوە چاکترو باشترین کردارو خواپەرستییە، خوا دەفەرموێت: **"إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَات"**. واتە: بێگومان چاکەکان خراپەکان رادەماڵن.

## نوێژ گەورەترینی چاکەکانە

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: سألت رسول الله ﷺ: أي الأعمال أفضل؟ قال: الصلاة على وقتها، قلت ثم أي؟ قال: بر الوالدين. قلت: ثم أي؟ قال: الجهاد في سبيل الله"**[٣]. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم لە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کرد کام کردەوە

---

[1] ـ متفق عليه، البخاري ٥٧٥ ومسلم ٦٤٠ وصحيح وصايا الرسول ج٢ ص٥٣٨.

[2] ـ البخاري ٣٠٥٧، ومسلم ٦٤٩ بلفظ آخر، والترغيب والترهيب باب الترغيب في أنتظار الصلاة بعد العصر.

[3] ـ متفق عليه البخاري ٥٠٤ ومسلم ٨٥ رياض الصالحين ١٠٧٤. صحيح / صحيح الترغيب والترهيب ٥١٤.

له هه‌مووان باشتره‌؟ فه‌رمووی: نوێژ له‌ کاتی خۆیدا. وتم: پاشان چی تر؟ فه‌رمووی: چاکه‌کردن له‌گه‌ڵ دایكو باوكدا. وتم: پاشان چی تر؟ فه‌رمووی: خه‌بات له‌ پێناوی خوادا.

ئه‌م فه‌رموده‌ پیرۆزه‌ش به‌ڵگه‌یه‌كه‌ نوێژ له‌ هه‌موو كرده‌وه‌و چاكه‌كان گه‌وره‌تره‌و له‌ هه‌مووشیان زیاتر گوناه و تاوان ده‌سڕێته‌وه‌.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: أرأيتم لو أن نهرا بباب أحدكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات، هل يبقى من درنه شيء؟ قالوا: لا يبقى من درنه شيء. قال: فذلك مثل الصلوات الخمس، يمحوا الله بهن الخطايا"**[1]. واته‌: له‌ ئه‌بی هوره‌یره‌وه‌ (ره‌زای خوای لێ بێ) فه‌رمووی: گوێم له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (سه‌ڵاتو سه‌لامی خوای لێ بێ) بووه‌ ده‌یفه‌رموو: "ئه‌گه‌ر روبارێك له‌ به‌ر ده‌رگای یه‌كێكتاندا بێتو رۆژی پێنج جار خۆی لێبشوات، ئایا چڵكی پێوه‌ ده‌مێنێ؟ وتیان: نه‌خێر چڵكی پێوه‌ نامێنێ. فه‌رمووی: ئه‌وه‌ نمونه‌ی پێنج فه‌رزه‌ی نوێژه‌، گوناهه‌كانتان لێ ده‌سڕێته‌وه‌".

**وعن جابر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "مثل الصلوات الخمس كمثل نهر جار غمر على باب أحدكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات"**.[2]واته‌: له‌ جابره‌وه‌ (ره‌زای خوای لێ بێ) فه‌رموویه‌تی: پێغه‌مبه‌ر (سه‌ڵاتو سه‌لامی خوای لێ بێت) فه‌رمووی: نمونه‌ی پێنج نوێژه‌كه‌ وه‌كو نموونه‌ی روبارێكی زۆری خوڕه‌ به‌بن ده‌رگای یه‌كێكتاندا بڕوات، رۆژی پێنج جار خۆی لێ بشوات.

**وعن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "ومامن أمرىء مسلم تحضره الصلاة المكتوبة فيحسن وضوءها وخشوعها وركوعها إلا كانت كفارة لما قبلها من الذنوب مالم تؤت الكبائر، وذلك الدهر كله"**.[3]واته‌: له‌ عوسمانی كوڕی عه‌ففانه‌وه‌ (ره‌زای خوای لێ بێت) فه‌رمووی گوێم له‌

---

[1] ـ متفق عليه، البخاري ٥٠٥ ومسلم ٦٦٧، رياض الصالحين ١٠٤٢.

[2] ـ رواه مسلم ٦٦٨ ورياض الصالحين ١٠٤٣ صحيح/ صحيح الترغيب والترهيب ٥١٧.

[3] رواه مسلم ٢٢٨ ورياض الصالحين ١٠٤٦، وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٦٨٦ والمشكاة ٢٨٦ وصحيح الترغيب والترهيب رقم ٥٢٧/٠٢

پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: "هەر کەسێکی موسڵمان کە کاتی نوێژێکی فەرز هات دەستنوێژێکی باش بگرێو بە باشی گەردنکەچو کڕنوشبەرێت حەتمەن دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەموو گوناهەکانی لەوەوپێشی، گەر خۆی لە تاوانی گەورە پاراستبێ، ئەمەش بە درێژایی رۆژگار".

**قال ﷺ: "ان العبد إذا قام يصلي أتي بذنوبه كلها فوضعت على رأسه وعاتقيه فكلما ركع أو سجد تساقطن عنه".**[١] واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەر بەندەیەکی خوا کە هەستا بۆ نوێژ هەموو گوناهەکانی دەهێنرێتو لەسەر سەرو گەردنی دادەنرێت هەرکە کڕنوشی برد یان سوژدەی برد لێی هەڵدەوەرن.

**وقال رسول الله ﷺ: "مامن امريء يتوضأ فيحسن وضوءه، ثم يصلى الصلاة الا غفر له ما بينه وبين الصلاة الآخرى، حتى يصليها". صحيح**[٢]واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەر کەسێك کە دەستنوێژ بە چاکی بگرێ، ئینجا نوێژ بکات، حەتمەن خوا لە گوناهی نێوان ئەم نوێژەو نوێژێکی تری خۆش ئەبێت هەتا نوێژ بکات".

**عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ، قال: "ما من مسلم يتوضأ فيسبغ الوضوء، ثم يقوم في صلاته فيعلم ما يقول الا انفتل وهو كيوم ولدته أمه".** صحيح[٣] واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "هەر مسوڵمانێك دەستنوێژێکی چاك بگرێ ئینجا نوێژەکەی بکاتو بزانێ چی دەڵێ حەتمەن دەچێتەوە دۆخی رۆژی لە دایکبوونی".

---

[1] ـ صحيح وصايا الرسول ج١ ص٦٢٥، صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٦٧١.

[2] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٦٨٩ وصحيح الترغيب ١٧٧ وصحيح الترغيب والترهيب ٢٩٢ وإسناده على شرط شيخين.

[3] مسلم و الترغيب والترهيب ٧٦٦

## نوێژ یەکەم پایەی ئیسلامە چاوەڕوانی کردنی تاوان دەسڕێتەوە

هەموو کردەوەیەکی چاك ئەندازەیەك گوناهو تاوان دەسڕێتەوە، نوێژیش کە چاکترین و گەورەترین کردەوەی چاکە ئەندازەیەکی زۆر گوناه و تاوان رادەماڵێ‌و خاوەنەکەی پاك دەکاتەوە، خوا دەفەرموێت: **"إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّـ ـيِّئَات"**. واتە بەڕاستیی چاکەکان خراپەکان رادەماڵن.

چاوەڕوانی کردنی، کردەوەی چاك خێرو چاکەیە گوناه و تاوان دەسڕێتەوەو رادەماڵن. **عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "ألا أدلكم على مايمحوا الله به الخطايا، ويرفع به الدرجات؟ قال: بلى يارسول الله، قال: أسباغ الوضوء على المكاره، وكثرة الخطا الى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط، فذلكم الرباط"**[1]. واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێت)، فەرمووی: ئەرێ پێتان بڵێم ئەوەی خوا گوناهەکانی پێدەسڕێتەوەو پلەکانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەستنوێژگرتن بە چاکی لە کاتی ناڕەحەتیداو زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوتو چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ ئەوە جیهادە، ئەوە جیهادە. یان ئەوە چوونە سەنگەرە لە پێناوی خوادا.

لە فەرمودەیەکی راستدا هاتووە ئەمە بەشێکی فەرمودەکەیە خوا بە پێغەمبەری فەرمووە: "**.. یامحمد! هل تدري فيم يختصم الملأ الأعلى؟ قلت نعم، في الكفارات والدرجات، والكفارات: المكث في المساجد بعد الصلوات، والمشي على الأقدام الى الجماعات، واسباغ الوضوء في الكفارات...**".[2] واتە: "ئەی موحەممەد ئایا دەزانی ئاسمانییەکان لەسەر چی مشتو مڕیانە؟ وتم: بەڵێ، لەسەر کەفاراتو پلەکان. کەففاراتو سڕینەوەی گوناهەکان. مانەوە لە مزگەوتا لە دوای نوێژەکانو بەپێ رۆیشتن بۆ جەماعەتو دەستنوێژگرتن بە چاکی لە ناڕەحەتیدا".

---

[1] ـ رواه مسلم ٢٥١، رياض الصالحين رقم ١٠٥٩.

[2] ـ متفق عليه البخاري ومسلم ورياض الصالحين رقم ١٠٥٧.

**قال النبي ﷺ: "أنكم لن تزالوا في الصلاة ماانتظرتم الصلاة"**[1]. واته: پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی: بێگومان ئێوه بەردەوام له نوێژدان هەتا چاوەروانی نوێژ بکەن.

## نوێژ تاوانو خراپەو داوێنپیسی ریشەکێش دەکات

خوا دەفەرموێت: **"إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ"**[2]، واته: بەڕاستیی نوێژ رێ له خراپەو تاوان دەگرێ.

هەر نوێژێك خاوەنەکەی نەگێڕێتەوه له خراپەو بەدڕەفتاریو بەدکرداری پێی ناوترێ نوێژو سوودێك به خاوەنەکەی ناگەیەنێت، بەڵکو سوکایەتی به نوێژ کردووەو دووچاری سزای خواش دەبێت.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قيل للنبي ﷺ، يارسول الله ان فلانة تقوم الليل وتصوم النهار وتفعل وتصدق وتؤذي جيرانها، فقال رسول الله ﷺ: لاخير فيها، هي من أهل النار". قال: وفلانة تصلى المكتوبة وتصدق بأثوار من الاقط، ولا تؤذي أحدا، فقال رسول الله ﷺ: هي من أهل الجنة"**.[3] واته: له ئەبی هورەیرەوه (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: به پێغەمبەر وترا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) ئەی پێغەمبەری خوا فلاّن ئافرەت شەونوێژ دەکاتو به رۆژیش بەڕۆژووه خێر دەکاتو ماڵ دەبەخشیّو دراوسێکانیشی ئازار ئەدات، پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی: خێری پێوه نییه، له ئاگری دۆزەخدایه. وتی: دەفلاّن هەر نوێژه فەرزەکان دەکات و چەند قاپێك کەشکێکیش دەکاته خێر و ئازاری کەسیش نادات، پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی: ئەوه له بەهەشتییانه".

---

1 ـ متفق عليه البخاري ومسلم وصحيح وصايا الرسول ج٢ ص٥٣٨.

2 ـ العنكبوت (٤٥).

3 ـ قال الألباني إسناده صحيح، سلسلة الصحيحة ١٩٠. وصحيح أدب المفرد ٨٨. الجامع الصحيح من احاديث النساء ص٤٤٥.

خوای باڵادەست دەربارەی شوعەیب دەفەرموێت: **"يَا شُعَيْبُ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا" (هود: ٨٧)**. واتە: کافرگەلی مەدیەن بە شوعەیبیان وت ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێدەکات بە ئێمە رابگەیەنیت واز لەو بتانە بێنین کە باب‌و باپیرانمان پەرستوویانن.

گەلی کافران زانیویانە کە نوێژ لە هەموو پەرستنەکان زیاتر خراپە رادەماڵێ و بنبڕی دەکات، بۆیە لە هەموو پەرستنەکانی شوعەیب (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) باسی نوێژیان کرد، ئەو فەرموویەتی پێیان بت مەپەرستن ئەوانیش وتویانە ئەوە نوێژەکەت ئەم شتانەت فێر دەکات.

## ڕۆیشتن بۆ ئەنجامدانی نوێژ گوناه و تاوان دەسڕێتەوە

ڕۆیشتن بۆ هەر کارێکی خێرو خۆماندووکردن لە ڕێگەی چاکەکاریدا دەبێتە خێرو چاکەو کەسی بڕوادار لە لای پەروەردگاری پاداشتی لەسەر وەردەگرێ، بەشێکیش لەو پاداشتە سڕینەوەی تاوانەکانیەتی.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "من تطهر في بيته، ثم مضى الى بيت من بيوت الله، ليقضي فريضة من فرائض الله، كانت خطواته، احداها تحط خطيئة والآخرى ترفع درجة"**.[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر کەس لە ماڵەوە دەستنوێژ بگرێت‌و ئینجا بڕوات بۆ ماڵێك لە ماڵەکانی خوا بۆ ئەنجامدانی فەرزێك لە فەرزەکانی خوا، هەنگاوەکانی یەکێکیان گوناهێك دەسڕێتەوەو ئەویتریان پلەیەك بەرزی دەکاتەوە.

**عن عثمان (رضي الله عنه) انه قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: من توضأ فأسبغ الوضوء، ثم مشى الى صلاة مكتوبة فصلاها مع الأمام غفر له ذنبه"**.[2] واتەی: لە عوسمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا

---

[1] ـ رواه مسلم ٦٦٦ ورياض الصالحين ١٠٥٤.

[2] ـ صحيح رواه إبن خزيمة صحيح الترغيب ٢٩٩. وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٣٦٩.

بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) دەیفەرموو: هەرکەس دەستنویٚژیٚکی باش بگریٚت، ئینجا بڕوات بۆ ئەنجامدانی نویٚژیٚکی فەرزو لەگەڵ پیٚشنویٚژ نویٚژەکەی کرد، چاوپۆشی لە گوناهەکانی دەکریٚت.

پیٚشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) لە باسی ڕۆژوو (كتاب الصوم)دا ئەم فەرمودەیە دەگیٚڕیٚتەوە: **قال رسول الله ﷺ: فتنة الرجل في أهله وماله وجاره تكفرها الصلاة والصيام والصدقة.."**.[1]واتە: پیٚغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەربیٚ) فەرموویەتی: گرفتاریی هەرکەسیٚك لە خیٚزانو ماڵو دراوسیٚکانیدا نویٚژو ڕۆژوو و خیٚرکردن دەیسڕیٚتەوە.

**وعن عثمان (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ من توضا هكذا، ثم خرج الى المسجد لا ينهزه الا الصلاة غفر ما خلا من ذنبه" صحيح.**[2]واتە: لە عوسمانەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) پیٚغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرمووی: هەرکەس دەستنویٚژیٚکی ئاوا بگریٚ، (وەکو بۆی باسکردوون) ئینجا بڕوا بۆ مزگەوت تەنها نویٚژ ڕاییەڕاندبیٚ چاوپۆشی دەکریٚ لە گوناهەکانی ڕابردووی.

**وقال ﷺ: "من توضأ للصلاة، فأسبغ الوضوء، ثم مشى الى الصلاة المكتوبة، فصلاها مع الناس، غفر الله له ذنوبه".**[3]واتە: پیٚغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: هەرکەس دەستنویٚژ بۆ نویٚژ بگریٚ، بە چاکی دەستنویٚژەکەشی بگریٚ، ئینجا بڕوا بۆ نویٚژی فەرز لەگەڵ خەڵکیی نویٚژەکەی بکات، خوا لە گوناهەکانی خۆش دەبیٚ.

## دەستنویٚژگرتنو خۆئامادەکردن بۆ نویٚژ گوناه و تاوان دەسڕیٚتەوە

نویٚژ ئەرکیٚکی شەرعییەو بە نەکردنی ئادەمیزاد دووچاری سزاو هەڕەشەی خوا دەبیٚت، نویٚژ بەبیٚ دەستنویٚژ دروست نییە، کەواتە دەستنویٚژ وەکو نویٚژ فەرزەو بە ئەنجامنەدانی ئادەمیزاد گیرۆدەو دووچاری سزای خوا دەبیٚت، بە کردنیشی شایستەی

---

[1] ـ رواه البخاري ١٧٩٦ في كتاب الصوم. والجامع الصحيح من أحاديث النساء ص٤٣٥.

[2] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦١٧٧.

[3] ـ نفس المصدر ٦١٧٣. ونفس المصدر بلفظ آخر ٦١٧٤.

پاداشتو ڕەزامەندیی دەبێت. لێرەوە بە روونی دەردەکەوێت کە هەر سزاو ئەشکەنجەیەك بۆ نوێژنەکەر هەیە بۆ ئەو کەسانەش هەیە کە هەرگیز دەستنوێژ ناگرن، بە پێچەوانەشەوە هەر پاداشتو بەخششو خۆشبەختییەك لە دونیاو دوارۆژ بۆ نوێژخوێنان هەیە بۆ ئەو کەسانەش هەمان پاداشت هەیە کە دەستنوێژ وەکو خواپەرستییەکی پاكو بێگەرد ئەنجام ئەدەن، هەر بەو پاكو خاوێنیو دوور لە چڵكو چەپەڵیەوە روو دەکەنە خواو نوێژەکانیان ئەکەن.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "ألا أدلكم على ما يمحوا الله به الخطايا ويرفع يه الدرجات؟ قالوا بلى. قال: أسباغ الوضوء على المكاره وكثرة الخطا الى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط، فذلكم الرباط".**[1]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەرێ شتێکتان پێ بڵێم کە تاوانەکانتانی پێبسڕێتەوەو پلەتانی پێبەرز بێتەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: چاك دەستنوێژگرتن لە کاتی نارەحەتیدا، زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوتو چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئەوەیە خۆسازدان بۆ خەبات، ئەوە چوونە سەنگەرە لە پێناوی خوادا.

**عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: "ما من مسلم يتوضأ، ثم يقوم في صلاة فيعلم مايقول الا انفتل وهو كيوم ولدته أمه".**[2]واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەر موسڵمانێك کە دەستنوێژ بگرێت، ئینجا هەستێ بۆ نوێژو لەناو نوێژەکەیدا بزانێ ئەڵێ چی، حەتمەن گوناهەکانی لێ دادەماڵرێ وەکو ئەو رۆژەی لە دایکبووە.

---

[1] ـ رواه مسلم ٢٥١، رياض الصالحين ١٠٥٩, ومالك والترغيب ٣٠٧، وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٣٦٢.

[2] ـ رواه مسلم ٢٣٤ وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٣٦٣.

**عن عمر (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من توضأ فأحسن الوضوء، ثم صلى ركعتين، لايسهو فيهما، غفر الله له ماتقدم من ذنبه".** حسن[1] واته: له عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێ)، فەرموویەتی: "هەرکەس دەستنوێژ بە چاکی بگرێ، ئینجا دوو ركات نوێژ بکات، هەڵەو ئیشتیبایان تیادا نەکات، خوا لە هەموو گوناهی رابردووی خۆش دەبێت".

**وعن عثمان (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من توضأ، فأحسن الوضوء خرجت خطاياه من جسده، حتى تخرج من تحت أظفره".**[2] **وعن عثمان (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من توضأ هكذا، ثم خرج الى المسجد، لاينهزه الا الصلاة، غفر له ما خلا من ذنبه".** صحيح[3] واته: لە عوسمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەرکەس ئاوا دەستنوێژ بگرێ ئینجا بڕوا بۆ مزگەوت هیچ شتێك رای نەپەڕێنێ نوێژ نەبێ، لێخۆشبوونو چاوپۆشی لە هەموو گوناهەکانی رابردووی دەکرێ".

**وقال رسول الله ﷺ: "من توضأ كما أمر، وصلى كما أمر، غفر له ما تقدم من عمل".** حسن[4] واته: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەرکەس ئاوا دەستنوێژ بگرێ وەکو ئەوەی فەرمانی پێکراوە، نوێژ بکات وەکو ئەوەی فەرمانی پێکراوە، چاوپۆشی دەکرێ لە هەموو کردەوەکانی پێشووی".

**وقال ﷺ: "من توضآ للصلاة، فأسيغ الوضوء، ثم مشي الى الصلاة المكتوبة، فصلاها مع الناس، غفر الله له ذنوبه".** صحيح[5] واته: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس دەستنوێژ بگرێ بۆ نوێژ، چاك دەستنوێژ بگرێ،

[1] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦١٦٥. وصحيح أبي داوود ٨٤٠ وبلفظ آخر ٦١٧٥، صحيح الجامع الصغير وزيادته، وجاء بلفظ آخر ٦١٦٧.

[2] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦١٦٩. وصحيح الترغيب ١٧٧.

[3] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦١٧٧.

[4] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦١٧٢.

[5] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦١٧٣. ومختصر صحيح مسلم ١٣٢.

ئینجا بڕوا بۆ کردنی نوێژی فەرز، لەگەڵ خەڵکیی نوێژەکەی بکات، خوا لە گوناهەکانی رابردووی خۆش دەبێت".

## نوێژ بەردی بناغەی ئیسلامە

تەواوی ئەم بابەتەی لەبەردەستی جەنابتانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژ بەردی بناغەی دینەو دینی ئیسلام بەبێ نوێژ لەکەس وەرناگیرێ، بەڵکو لاشەیەکی بێ گیانە و سوودی بۆ دونیاو دوارۆژی خاوەنەکەی نییە.

**عن أبي أمامة (رضي الله عنه)، قال رسول الله ﷺ: "لتنقضن عرى الاسلام عروة عروة فكلما انتقضت عروة، تشبث الناس بالتي تليها، فاولهن نقضا الحكم وآخروهن الصلاة".**[1]واتە: لە ئەبی ئومامەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "بێگومان گرێکانی ئیسلام گرێ گرێ دەکرێنەوە هەرکات گرێیەك کرایەوە، خەڵکیی شالاو بۆ گرێکەی دوای ئەو دەبەن، یەکەم گرێ کە دەکرێتەوە حوکمە، کۆتا گرێشیان نوێژە".

هەرکەس نوێژی نەکرد بەردی بناغەی ئیسلامی لە ریشە دەرهێناوە، هەر کات قسە هاتە سەر نوێژو رێگرتن لە نوێژو تەنگ هەڵچنین بە نوێژخوێنانو تانەو تەشەر لێدانیانو گاڵتە کردن بە نوێژ دووبارەکردنەوەی ئەم رستە پوچەڵو بێبڕشتە "بە نوێژ نییە بە دڵە"، کە لە دەیان ئایەتو سەدان فەرموودەدا خواو پێغەمبەر دەفەرموون بە نوێژە، بەڵام کەسانێك بەو رستە بێ ناوەڕۆکە خۆیانو کەسانی وەکو خۆیان گەلۆرو دەغەڵ لە خشتە دەبەن، کە کار گەیشتە ئەو ئەندازەیە ئەوە هەموو دینیان وەلا ناوە، تەنها نوێژ ماوە، ئەگەر ئەویشیان واز لێهێنا، یان دژایەتیان کرد ئەوە تەنها دژایەتی ئیسلامەو رازی نەبوونە، نەك تەنها بەیەك پایەو یەك روکنی ئیسلام بەڵکو رازی نەبوونە تەنانەت بە ناوی ئیسلامیش.

**عن أبي المليح قال: سمعت عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) يقول على المنبر: "لا اسلام لم يصل".** [2] واتە: ئەبی مەلیح فەرموویەتی گوێم لە عومەری خەتتاب بوو

---

[1] ـ صحيح، سلسلة الأحاديث الصحيحة ٥٠٥٧ وصلاح الأمة ج٥، ص٧٧٥.

[2] ـ حياة الصحابة ج٣، ص٨٥.

(ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر مینبەر دەیفەرموو: "بەشی بە ئیسلامەوە نییە ئەوەی نوێژ نەکات".

**وعن أنس مرفوعا قال: "أول ماتفقدون من دينكم الأمانة، وآخره الصلاة".**[1] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی لە پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێ): "یەکەم شت لە دینی ئێوەدا تیادەچێو لە دەستی ئەدەن، ئەمانەتە. کۆتاشیان نوێژە.

**قال حذيفة (رضي الله عنه): "أول ماتفقدون من دينكم: الخشوع، وآخر ماتفقدون من دينكم: الصلاة".**[2] واتە: حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یەکەم شتێك لە دینەکەتاندا لە دەستی ئەدەن گەردنکەچییە، کۆتا شتیش کە لە دینەکەتاندا لە دەستی ئەدەن نوێژە.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس نوێژ نەکات، دینی نییە".[3]

## نوێژ سێیەکی ئیسلامە

**عن عائشة (رضي الله عنها) قال رسول الله ﷺ: "ثلاث أحلف عليهن: لايجعل الله تعالى من له سهم في الاسلام كمن لا سهم له، وأسهم الاسلام ثلاثة: الصلاة، والصوم، والزكاة، ولايتولى الله عبدا في الدنيا فيوليه غيره يوم القيامة ولايحب رجل قوما الا جعله الله معهم، والرابعة لو حلفت عليها رجوت ان لا آثم، لا يستر الله عبدا في الدنيا الا ستره يوم القيامة".**[4]

واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێت)، فەرموویەتی: "سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم: خودا کەسانێك کە پشکیان هەیە لە ئیسلامدا چوونیەك ناکات، لەگەڵ کەسانێك کە بەشیان نییە لە ئیسلامدا،

---

[1] ـ سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٧٣٩. قال الألباني: صحيح بشواهده.

[2] ـ صلاح الأمة، ج٥، ص٥٨٢.

[3] ـ فتاوى معاصرة ص٢٠٩.

[4] ـ صحيح : سلسلة أحاديث الصحيحة ٣٠٢١. وراوه احمد بأسناد جيد.

بەشەکانی ئیسلامیش سیانن: نوێژ، ڕۆژوو، زەکات. کەسێك خوا خۆی سەرپەرشتی بکات لە دونیادا، نایداتە دەست یەکێکی تر لە دوارۆژدا، کەسێك کۆمەڵێکی خۆش بوێ حەتمەن خوا لەگەڵ ئەوانی دادەنێ، چوارەمیش ئەگەر سوێندم لەسەر خوارد ئومێدم وایە گوناهبار نەبم: کەسێ نییە خوا عەیبو عاری داپۆشێ لە دونیادا، کە خوا عەیبی نەپۆشێ لە دوارۆژدا"، پێغەمبەری ئیسلام (سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر شتی زۆر گرنگ نەبێ سوێندی نەخواردووە، کەواتە نوێژی زۆر بەگرنگ زانیوە، بۆیە سوێندی لەسەر خواردووە.

## خوا نوێژی خۆش دەوێ

نوێژی وەتر یەکێکە لە سوننەتە گەورەو بەردەوامەکانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) کە لە ماوەی تەمەنی پیرۆزیدا بۆ جارێکیش وازی لێ نەهێناوەو ئامۆژگاری هاوڕێکانی کردووە بەردەوام ئەنجامی بدەن.

**قال رسول الله ﷺ: "إن الله تعالى وتر يحب الوتر".**[1] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "بەڕاستیی خوای باڵا دەست، تاکەو نوێژی تاك (وتر)ی خۆش دەوێت".

**قال رسول الله ﷺ: "يا أهل القرآن أوتروا فان الله عزوجل وتر يحب الوتر".**[2]واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەی قورئاندۆستان نوێژی وەتر بکەن، بەڕاستیی خوای شکۆمەندو دەسەڵاتدار نوێژی وەتری پێخۆشە".

**عن علي (رضي الله عنه) قال: الوتر ليس بحتم كالصلاة المكتوبة، ولكن سن رسول الله ﷺ: "ان الله وتر يحب الوتر فأوتروا يا أهل القرآن".**[3]واتە: لە عەلییەوە

---

[1] متفق عليه، البخاري ٦٠٤٧ ومسلم ٢٦٧٧ واللفظ له، الترغيب والترهيب باب الترغيب في الصلاة الوتر.

[2] صحيح جامع ٧٨٦٠، حسن رواه أبوداود ١٢٧٤. واحمد وقال الشيخ أحمد شاكر إسناده صحيح. حديث رقم ٨٧٧. وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٥٥. والترغيب والترهيب ٨٦١. وصحيح الجاه.

[3] صحيح رواه أبوداود وأحمد١٢١٣ وقال أحمد شاكر: صحيح، وصحيح وصايا الرسول، ج١، ص٤٥٥.

(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نوێژی تاك (الوتر) ناچاری نییە، وەكو نوێژە فەرزەكان، بەڵكو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) كردویەتیە سوننەت، خوا تاكەو تاكی پێ خۆشە، نوێژی وەستی بكەن دۆستانی قورئان.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: "قال رسول الله ﷺ أحب الأعمال الى الله الصلاة على وقتها ثم بر الوالدين ثم الجهاد في سبيل الله".**[1]واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: خۆشەویستترین كردەوە بە لای خواوە نوێژكردنە لە كاتی خۆیدا، ئینجا چاكە كردنە لەگەڵ دایكو باوك، ئینجا جیهادو خەبات لە پێناوی خوادا. خۆشەویستترین كردەوە بە لای خواوە ئەم سێ كردەوەیەیە، لەم سیانەشدا یەكەم نوێژە.

**عن عبدالله بن عمر بن الخطاب (رضي الله عنهما) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "إن الله تبارك وتعالى ليعجب من الصلاة في الجمع".**[2]**حسن"** واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەری كوڕی خەتتابەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: بەڕاستیی خوای بڵند و بێگەرد نوێژی بە كۆمەڵی پێخۆشە.

## نوێژخوێن خۆشەویستی خوایە

گەورەترین پاداشت بۆ نوێژخوێنانە ئەوەش لە چەندەها ئایەتو فەرمودەدا هاتووە.

**عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: ثلاثة يحبهم الله، ويضحك اليهم، ويستبشر بهم. الذى إذا انكشفت فئة قاتل وراءها بنفسه لله عزوجل، فاما أن يقتل، واما أن ينصره الله عزوجل ويكفيه فيقول: انظروا الى عبدي هذا كيف صبر لي بنفسه ؟ والذي له امراة حسنة، وفراش لين حسن، فيقوم من الليل فيقول: يذر شهوته ويذكرني ولو شاء رقد. والذي إذا كان في سفر، وكان معه ركب**

---

[1] رواه البخاري ٧٠٩٦، ومسلم ٨٥، وأبوداود واحمد ٤١٨٦ والنسائي وصحيح الجامع ١٦٤.

[2] الترغيب والترهيب، ٥٧٧.

**فسهروا ثم هجعوا فقام من السحر في ضراء وسراء"**.[1] واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: سێ کەس خوا خۆشی دەوێنو بۆیان پێدەکەنێو مژدەیان پێ ئەدا: ئەو کەسەی کە دەستەیەکی لێ پەیدا بووە بە گژیاندا دەچێ، بە گیانو ڕۆحی خۆی لەبەر خوا، جا یان دەکوژرێ یان خوا سەری دەخات ئەویشی بەسەو دەفەرموێ: وردبنەوە لەو بەندەیەی من چەند خۆڕاگر بوو؟. ئەو کەسەیش هاوسەرێکی جوانو جێگەیەکی گەرمو نەرمی هەبێت هەڵدەستێ بە شەو دەفەرموێ: وازی لە ئارەزووەکانی هێناوەو یادی من دەکات دەشتوانێ ئەگەر بیەوێ بخەوێ. ئەوەش لە سەفەردایە، کاروانێکی لەگەڵەو شەونخونی دەکێشن، دەخەونو لە بەرەبەیاندا لە کاتی جەنگو لە کاتی خۆشیدا هەڵدەستێ شەونوێژ دەکات.

## نوێژ بەڵێنو پەیمانە لەگەڵ خوادا

نوێژ سەرتاپای بەڵێنو ستایشو پاڕانەوەو یادی خوایە، **عن عبادة بن الصامت (رضي الله عنه)، قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "خمس صلوات كتبهن الله على العباد، فمن جاء بهن ولم يضيع منهن شيئا استخفافا بحقهن كان له عهد عندالله أن يدخله الجنة، ومن لم يات بهن فليس له عندالله عهد إن شاء عذبه وان شاء أدخله الجنة"**.[2]

واتە: لە عوبادەی کوڕی سامتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: پێنج فەرزەی نوێژ خوا فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، هەرکەس ئەنجامیان بدات و هیچیان زایە نەکات بە سوکایەتی پێکردنیان، ئەوە پەیمانی لای خوا پیدەدرێ کە بیخاتە بەهەشت، هەرکەسیش نەیانکات ئەوە لە لای خوا پەیمانی نییە گەر بیەوێ سزای ئەدات، یان بیەوێ دەیخاتە بەهەشت.

---

[1] حسن، رواه الطبراني في الكبير، وصحيح الترغيب ٦٢٥. وصحيح قصص الرسول ج٣، ص٢٠٥.

[2] صحيح رواه مالك وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٣٢٤٣. وأيضا بلفظ آخر ٣٢٤٢. نفس المصدر. وصحيح الوصايا لرسول ص٤١٢.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: ما خطبنا رسول الله ﷺ الا قال: لا إيمان لمن لا أمانة له، ولا دين لمن لا عهد له.**[1]واته: له ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەرگیز پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) وتاری بۆ نەداوین کە نەیفەرمووبێ: ئیمان و بڕوای نییە هەرکەس ئەمانەتی نەبێ (واتە ئەمین نەبێ). دینی نییە ئەوەی پەیمانی نەبێ. نوێژیش پەیمانە وەکو لە زۆر فەرمودەدا هاتووە کەواتە" **العهد الذى بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر**". واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندایە نوێژە، هەرکەس وازی لێبێنێ بەڕاستیی بێبڕوا بووە.

## نوێژ را پرسییە بە خوا

پێغەمبەری مامۆستاو رابەرو پێشەوا، هاوەڵە بەڕێزەکانی و سەرجەم موسڵمانانی فێری راپرسی کردووە بە خودای گەورە لە هەر کارو پیشەیەکدا دوودڵیو راڕایی دروست بوو ئەو راپرسیەش بە دوو رکات نوێژ دەکرێ.

**عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) قال: كان رسول الله ﷺ يُعلّمنا الاستخارة في الأمور كلها كما يعلمنا السورة من القرآن يقول: إذا هم أحدكم بالامر فيركع ركعتين من غير الفريضة ثم ليقل: اللهم اني استخيرك بعلمك، واستقدرك بقدرتك، واسألك من فضلك العظيم، فانك تقدر ولا أقدر، وتعلم ولا أعلم، وأنت علاّم الغيوب. اللهم ان كنت تعلم إن هذا الامر خير لي في ديني ومعيشتي وعاقبة امري (او قال في عاجل امري وآجله) فيسره لي، ثم بارك لي فيه. وإن كنت تعلم إن هذا الامر شر لي في ديني ومعيشتي وعاقبة امري (أو قال في عاجل أمرى وآجله)، فاصرفه عني واصرفني عنه، واقدر لي الخير حيث كان، ثم ارضني به. قال: ويسمي حاجته".**[2]واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فێری نوێژی راپرسی بە خوا

---

[1] حسن، رواه احمد ١٢٥٨٩ والبزار وغيرهما. صحيح الجامع ٧١٧٥. وصحيح الوصايا الرسول، ج١، ص٣١٦.

[2] صحيح: رواه البخاري ١١٠٩ صحيح سنن الترمذي، ٣٩٧. وصحيح سنن إبن ماجة ١١٤٤. وصحيح سنن أبي داود ١٣٦١. وصحيح وصايا اللرسول ح١، ص٤٦٠.

(الاستخاره)ی دەکردین لە هەموو کارو پیشەیەکدا هەر چۆن سورەتێکی قورئانی فێردەکردینو دەیفەرموو: ئەگەر یەکێکتان خەیاڵی کارێکی کرد، با دوو رکات نوێژ بکات بێجگە لە فەرزەکان و ئینجا بڵێ: خودایە راپرسی بە زانینی تۆ دەکەم، داوا لە دەسەڵاتی تۆ دەکەم، داوا لە گەورەیی تۆ دەکەم، بەڕاستیی تۆ دەتوانی و من ناتوانم، تۆ دەزانیو من نازانم، هەر تۆ پەنهانو نادیار و چاك ئاگاداری، خودایە ئەگەر تۆ دەزانی ئەم کارە (ناوی ئیشەکە دەبەیت) خێری دینو ژینو سەرئەنجامی کارەکانمی تیایە (یان دەڵێی کارەکانی دونیاو دوارۆژی منی تیایە) بۆم بڕیار بدەو بۆم ئاسانو پیرۆز بکە. ئەگەر دەشزانی ئەم کارە شەڕو زیانی دینو ژینو سەرئەنجامی کارەکانمی تیایە یان دەڵێی "دونیاو دوارۆژمی تیایە" لێم لادەو منیش لەو لادە و خێر لە کوێیە بۆم بڕیار بدەو رازیم بکە پێی.

## نوێژکردن لەدەرگادانی خودایە

نوێژکردن رووکردنە خواو پاڕانەوەو لاڵانەوەو پەنابردنە بۆ خوا، نوێژخوێن هەروەکو تاوانبارو خەتاکارێك روو لە پاشای پاشایانو کاربەدەستی هەرە گەورە دەکاتو نزاو پاڕانەوەو یادی خواو دەربڕینی بێگەردی شکۆداریو پەسەندی بەدڵو بە زمانو رۆحو گیانو لاشەی دەردەبڕێت، ئاگری دەروونی بە فرمێسکی چاوەکانی جۆش ئەدات، دەرگای تەوبەش لەسەر پشتە، دەرگای بەزەییو بەخشندەییو لێبوردەیی خوا بە کلیلو پوازی ئاسنین ناکرێتەوە بەڵکو بە فرمێسك و ئەشکی چاوان.

**قال إبن مسعود (رضي الله عنه): "من كان في الصلاة فهو يقرع باب الملك، ومن يقرع باب الملك يوشك أن يفتح له".**[1] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی "هەرکەس لەناو نوێژدا بێت لە دەرگای پاشای داوە، هەر کەسیش لە دەرگای پاشا بدات، نزیکە لێی بکرێتەوە، نوێژ رووکردنە خوایە، پاڕانەوەو نزایە، سەرمایەی ژیانی دونیایە، مامەڵەیە، سەودایە، نزیك بونەوە لە خوایە، نوێژ رەوشتی جوانە، ئایەتی قورئانە، تەوژمو هێزو تینی لاشەو گیانە، سوننەتی پێغەمبەرانە، بەڵێنو پەیمانە، خواپەرستیە، ئیمانە، لە خوا نزیکبوونەوەی ئینسانە.

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٦٢٥. والصلاة لماذا ص٣٠. وموسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢، ص٣٥.

چوونە مزگەوت بە دەعوەتو بانگکردن نەك ڕێکەوت، بە نوێژکردن، بە پاڕانەوە، تەوبەکردنو لاڵانەوە، خوا میوانی تۆم، داوەتی تۆم، لە ماڵی تۆم، گەر دەرم کەی، بۆ کوێ بڕۆم؟ کەسم نییە، بە تەمای تۆم.

خوایە میوانداریت کردین لە ماڵی خۆت، لەسەر دەستی پێغەمبەری نازداری خۆت، وەڵاممان بڕواکردن، گوێگرتن، بە گوێکردن، ڕوو لە میحراب کردن، نوێژکردن، چاکە کردن، بە موسڵمانی ژیانو بە موسڵمانی مردن، بە پەیڕەوی تۆ کارکردنو خەوتن، شاییو شینکردن، ئەمەیە بەرنامەی دونیای پڕ ئازارم، وەڵامی گۆڕی تەنگو تارم، دەستمایەی بەر مەحکەمەی پەروەردگارم.

خودایە لە مزگەوتەکانەوە، لە ماڵەکانەوە، لەسەر بەرماڵو دەلاقەی میحرابەکانەوە، داوا دەکەین، دەرگای بەزەییو لێخۆشبوونی خۆتمان لێبکەرەوە، نوێژەکانمان بۆ بکەرە کلیلی بەهەشتو بە هۆیانەوە دەرگای بەهەشتمان بۆ بخەرە سەرپشت، وەکو دەرگای مزگەوتەکانت بۆ خستینە سەرپشت.

## نوێژ کرۆكو کاکڵەی هەموو کردەوە چاکەکانە

لە چەند دیمەنێکی تری ئەم نوسراوەدا ئەم بابەتەم بە بەڵگەوە باسکردووە، لە مەیدانی خوێندنەوەدا چاوەکانت پێی فێنك دەبێتەوە و فرمێسکی خۆشی دەبارێنن. پێغەمبەری سەروەرمان نوێژ وەکو هەوێنی هەموو کردەوە چاکەکان باس دەکات، با بزانین چۆن بۆ ئوممەتەکەی دەدوێ:

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "على كل ميسم من الإنسان صلاة كل يوم. فقال رجل من القوم: هذا من أشد ما اوتيتنا به. قال: أمرك بالمعروف ونهيك عن المنكر صلاة، وحملك عن الضعيف صلاة، وانحاؤك القذر عن الطريق صلاة وكل خطوة تخطوها الى الصلاة صلاة".** [1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەسەر هەموو جومگەیەکی مرۆڤ ڕۆژانە نوێژێك پێویستە. پیاوێك لەو خەڵکە وتی: ئەمە گرانترین شتە بۆمان هاتبێت. پێغەمبەر فەرمووی:

[1] رواه إبن خزيمة، ١٤١٧. وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٠٧.

فەرمانکردنت بە چاکەو ڕێگرتنت لە خراپە نوێژە، شت هەڵگرتنت بۆ لاوازێك نوێژە، هەموو هەنگاوێك و قەدەم لێدانێکت بۆ نوێژ نوێژە".

نوێژ هەوێنی کردەوە چاکەکانە، کردارو گوفتاری چاك بەبێ نوێژ ماستی بێ هەوێنن‌و میوەی نەگەیوو بزرکاو دەدرەچن، یەکەم خواپەرستییە فەرمان بە کردنی کراوەو هەموو خراپەکان بنبڕ دەکات، هەموو پێغەمبەرەکان کردوویانە، هەموو بوونەوەر بە گیاندارو بێ گیانەوە بە تەڕو وشکەوە، نوێژ پەیڕەوو بەرنامەی ژیانی بەرەو خوا چونیانە، پەیوەندیی بەندەی خواپەرست بە خواوە لە نوێژدا گەورەترو کاریگەرترە لە پەیوەندیی ئەندازیار بە کۆشکی نەخشەکێشراوی خۆیەوە، لە پەیوەندیی پزیشك بە نەخۆش‌و وەستا بە کرێکارو منداڵ بە دایك‌و پەروانە بە شەم‌و ماسی بە ئاوو ئادەمی بە هەواو قوتابی بە مامۆستاو ئاگرپەرست بە ئاویستاوە. نوێژ پشتت پێدەکاتە خراپەو ناپاکی‌و خۆپەرستی‌و لە خۆبایی بوون‌و خۆ بە گەورە زانین، دەتکاتە دوژمنی دڵ پیس‌و داوێن پیس‌و دەست پیس‌و نەبیستن‌و نەبینین‌و نەزانین، نابیە بەندەی بتی بەدفەڕ، بێ هەست بێ عەقڵ بێ فەڕ، بێ گیان‌و بێ کیان‌و کوێرو کەڕ.

نوێژ دەتکاتە، بەندەی خوا، دۆستی خوا، خۆشەویستی خوا، نوێژ دەتکاتە پیاوی مزگەوت، دەرت دێنێ لە گۆشەگیری لە ئەشکەوت، کە نوێژت کرد دەبێ هەموو چاکەیەك بکەی‌و خۆت لە هەموو خراپەیەك بپارێزی دەنا لەهەردوولا دەبیت‌و "مفلیس"یش دەبێتە نازناوت (**عاملة ناصبة**)ش دەبێتە پێناسی ڕۆژی دواییت.

## نوێژ شوکرانە بژێرییە

شوکرانەبژێری‌و بە ئەمەکی و سوپاسگوزاری کە بە کردەوەو لە مەیدانی کردەی ڕاستەقینەدا نەبێت، داری بێبەرە، بەڵکو وتەی بێ ناوەڕۆك و میوەی پوچەڵ نە برین سارێژ دەکات‌و نە برسیەتی و تینوێتی لادەبا، بەڵکو نائومێدی و ڕەشبینی دروست دەکات.

بۆیە نوێژ کە گەورەترین کردارو خواپەرستیە کراوەتە ڕەمزی شوکرانەبژێری‌و سوپاسگوزاری نەك کردەوەیەکی بچوك یان قسەی سەر سفرەو خوان‌و بەرتیلی زمان، کە لە کەسانی نمەك کوێرو سپڵەی بێ ویژدانەوەیە. خوا دەفەرموێت: **"اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ**

**شُكْراً"**. واتە: ئەی هۆزو خانەوادەی داود شوكرانەبژێریی بكەن. وردبەرەوە وەك كەسێكی هەستیارو بەهۆش بزانە شوكرانەبژێریی خانەوادەی داود چۆن بووە.

**قال إبن أبي الدنيا: حدثنا على بن جعد أخبرني مزاحم بن زفر عن مسعر قال: لما قيل لهم: "اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْراً" قال: لم تأت على القوم ساعة الا ومنهم مصل".**[1] واتە: ئیبن ئەبی دونیا فەرموویەتی عەلی كوڕی جەعد بۆی باس كردم كە موزاحیم كوڕی زوفەر هەواڵی داوەتێ لە موسەعیرەوە فەرموویەتی: "كاتێ بە خانەوادەی داود وترا: خانەوادەی داود سوپاسگوزارو شوكرانەبژێرن، یەك كات نەبوو بچی بۆ لایانو چەند كەسێكیان لە نوێژدا نەبن".

بە نوێژ كە چاكترین كردەوەیە سوپاسگوزاری خوایان دەكرد، بۆیە سوفیانی كوڕی سەعید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) باسی داود پێغەمبەری كرد (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: **"الحمدلله حمدا كما ينبغي لكرم وجه ربي عز جلاله فأوحى الله إليه يا داود أتعبت الملائكة"**. واتە: هەرچی سوپاسو ستایش هەیە شایستەی خوایە هەروەكو شایستەو ڕەواو پێویستە بۆ پەروەردگاری شكۆدارو دەسەڵاتدارم، خوا فەرمووی: ئەی داود بەراستیی فریشتەكانت ماندوو كرد. واتە بە نوسینی پاداشتی زۆر.[2]

**عن المغيرة بن شعبة (رضي الله عنه) قال: "إذا كان النبي ﷺ، ليقوم او ليصلي حتى ترم قدماه او ساقاه، فيقال له، فيقول: "أفلا أكون عبدا شكورا".**[3] واتە لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: "كە پێغەمبەر هەڵدەستا بۆ شەونوێژ، هەر نوێژی دەكرد هەتا بەری پێكانی ئاوسا بوون، یان بەرئەژنۆكانی ماسی بوون پێیی وترا، فەرمووی: ئەی نابێ بەندەیەكی سوپاسگوزاربم".

سوپاسی خوای كردووە بە نوێژ كە سەنگینترینو گەورەترین كردارە، موساش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بەم شێوەیە سوپاسی خوای كردووە.

---

[1] إسناده صحيح أخرجه البيهقي في الشعب، ٤٢٠٦. وغيره وموسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢ ص٤٩٢.

[2] موسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢، ص٤٩٢.

[3] رواه البخاري ١١٣٠ ومسلم ٢٨١٩ وموسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢، ص٤٩٠.

عن عبدالله بن سلام (رضي الله عنه): أن موسى (عليه السلام) قال: "يارب: ما الشكر الذي ينبغي لك؟ قال: ياموسى لايزال لسانك رطب من ذكرى".[1] واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: موسا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پەروەردگارا کام سوپاسگوزاری شایستەی تۆیە؟ فەرمووی: ئەی موسا بەردەوام زمانت بە یادی من پاراو بێت. بۆ چۆنیەتی یادکردنەکەش پێی فەرمووە، بەم شێوەیە "إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي". (طه: ١٤). واتە: بێگومان و بەڵگەنەویستە کە من خۆم خودام و هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نییە بێجگە لە من دەهەر من بپەرستەو بۆ یادکردنەوەی منیش نوێژ بکە. موسا فەرمووی: کام سوپاسگوزاریی شایستەی تۆیە خودایە، ئەویش فەمووی: یادی من کە بە نوێژ ئەنجام دەدرێ خوا لە قورئانی پیرۆزدا داوا لە پێغەمبەر دەکات بە نوێژ سوپاسگوزاری خوا بکات لەسەر ئەو هەموو بەخششەی پێی بەخشیوە وەکو دەفەرموێت: "إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ. فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ". واتە: ئێمە ئەی موحەممەد شتی زۆرمان بە تۆ بەخشیوە "یان حەوزی کەوسەرمان" بە تۆ بەخشیوە دەی تۆش نوێژ بۆ پەروەردگارت بکە.[2]

## نوێژ شەرەفمەندیو شکۆدارییە

نوێژ چۆن شەرەفمەندیی نییە کە رێ لە هەموو خراپەو بەدڕەفتارییەك بگرێو هۆی خاوێنی لاشەو دەروونو گیانیو تاكو کۆمەڵ بێت؟ چۆن شەرفمەندیو شکۆداری نییە کە ئەنجامدانی فەرمانی خواو پێغەمبەرو رەفتاری سەدوبیستو چوار هەزار پێغەمبەرو سەرجەم پیاوچاکان و خوادۆستانە.

قال رسول الله ﷺ: "شرف المؤمن صلاته بالليل، وعزه استغناؤه عما في أيدي الناس".[3] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ)

---

[1] موسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢، ص٤٩٢.

[2] فضل الصلاة وحكم تاركها في الكتاب والسنة ص٢٨.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٣٧١٠ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ١٩٠٣.

فەرموویەتی: شەرەفمەندیی بڕوادار شەونوێژەو شکۆدارێتی و بێنیازبوونیەتی لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە.

**عن سهل بن سعد (رضي الله عنه) قال: جاء جبريل الى النبي ﷺ، فقال: "يا محمد عش ما شئت فانك ميت، واعمل ماشئت فانك مجزى به، واحبب من شئت فانك مفارقه واعلم أن شرف المؤمن قيام الليل، وعزه استغناؤه عن الناس".** [1] واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: جبریل هاتە لای پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێ)، فەرمووی: ئەی موحەممەد چۆن دەژی بژی هەر دەمری، چیت دەوێ بیکە پاداشت دەدرێیتەوە، کێت خۆش دەوێ با خۆشت بوێ هەر لێی جیا دەبیتەوە، بزانە شەرەفو پلەو پایەی بڕوادار شەونوێژەو شکۆداریشی بێنیازبوونیەتی لە خەڵکی.

نوێژ ئەوپەڕی شەرەفمەندی و شکۆدارییە بۆ موسڵمانو مایەی سەربەرزییو پایەدارییە لە دونیاو دواڕۆژ، چونکە نوێژی ڕاستەقینە خاوەنەکەی دەپارێزێ لە داوێن پیسیو دەست پیسیو دڵ پیسیو دەم پیسیو خراپەکارییو لە کردارو گوفتار لە لادێو شار بە ئاشکراو بە نادیار.

نوێژی ڕاستەقینە خاوەنەکەی لە هەموو غەدرو خیانەتو جاسوسیو دووڕوییو دەغەڵییەك دەپارێزێو خاوەنەکەی ڕزگار دەکات لە کۆتی خۆپەرستیو خەڵکپەرستیو دونیاپەرستی، نوێژخوێنی ڕاستەقینە دوورە لە منەتکردنو خۆبەگەورەزانین، چونکە نوێژەکەی فێری خۆ بەکەمزانینی دەکات. لە بەرامبەریشدا دەروون بەرزو چیا ئاسا لە خوا کەمتر بەخوا نازانێ، نوێژخوێن تەنها لە خوا دەترسێو لە غەیری خوا ناترسێ.

## نوێژخوێن وەفدی خوایە

لەسەرەتاو دەستپێکی نوێژدا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) ئەم چەند وشە پرشنگدارو بەپێزەی خوێندووەو کردوویەتی سوننەت بۆ ئوممەتەکەی:

**"إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأرض.."**. واتە: ڕووی ڕوخساری خۆم کردە ئەو خوایەی ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووە لە نەبوو.

---

[1] رواه الطبراني في الأوسط وإسناده حسن، الترغيب، وصحيح وصايا الرسول، ج١، ص٤٣٨و٤٣٩.

لەسەرەتای هەموو نوێژێکدا ئەم چەند وشە شیرینە هەتا کۆتایی سوونەتە بخوێنرێ و هاوکات لەگەڵ دەربرینی ئەم وشانە نوێژخوێن رووی روخساری لە روگە و رووی دڵیشی لە خودایە، بۆیە پێغەمبەریش بە وەفدی خودا ناوی بردوە.

**عن أبي امامة (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: من توضأ ثم أتى المسجد فصلي ركعتين قبل الفجر، ثم يجلس حتى يصلي الفجر كتبت صلاته يومئذ في صلاة الابرار وكتب في وفد الرحمن".** [1] واتە: لە ئەبی ئومامەوە (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەرکەس دەستنوێژ بگرێ، ئینجا بێتە مزگەوت و دوو رکات نوێژ بکات پێش هەڵهاتنی سپێدەی بەیانی (الفجر) پاشان دانیشێ هەتا نوێژی بەیانی دەکات ئەو رۆژە نوێژەکەی لەگەڵ نوێژی پیاوچاکان دەنوسرێو لە وەفدی خواش ناوی تۆمار دەکرێ.

## نوێژ رەمزی وەڵامدانەوە و گوێڕایەڵی پەروەردگارە

لە چەندەها ئایەتدا فەرمان کراوە بە نوێژ بە جۆرەها شێوازی جیاواز. هەروەها لە دەیان فەرموودەی بەهێزدا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمانی کردووە بە نوێژکردن، بە گوێکردنی پێغەمبەریش وەڵامدانەوەی و گوێڕایەڵی خوایە.

خوا دەفەرموێت: **"وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ.."**. **(الشورى: ٣٨)**.

واتە: ئەوانەی وەڵامی پەروەردگاری خۆیان دایەوەو نوێژەکانیان بە چاکیی کرد.

بە روونو ئاشکرا لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێت کە نوێژکردن وەڵامدانەوەی خوایە. هەروەکو لە فەرمودەکانیشدا دەردەکەوێت کە نوێژ وەڵام دانەوەو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوایە. هەموو گوێڕایەڵیو وەڵامدانەوەیەکی پێغەمبەریش بەدەنگەوە چوونو فەرمانبەرداری خوایە.

لە بەرامبەریشدا لە چەندەها ئایەتی قورئاندا هەڕەشە لە نوێژنەکەر کراوە، چونکە نوێژنەکردن و کەمتەرخەمی کردن جێبەجێ نەکردنی فەرمانی خوایە، بۆ نموونە هاوبەشدانەرو بتپەرستەکان لە قورئاندا بە پیسترین دروستکراوی خوا ناوبراون، خواش

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٠٨. رواه الطبراني في المعجم الكبير ٧٧٦٦ عن القاسم أبي عبدالرحمن عن ابي أمامة.

دەفەرموێ: **"إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ"**. واتە: هاوبەشدانەرەکان پیسن. دواتریش دەفەرموێ: **"وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ"** (الروم: ٣١). واتە: نوێژەکان بە چاکی بکەنو مەبنە بتپەرستو هاوبەشدانەر. پێغەمبەریش دەفەرموێت: **"بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة"**. واتە: لە نێوان پیاوی بێباوەڕو پیاوی باوەڕدار نوێژ هەیە. واتە: نوێژ بکەنو مەبنە بێباوەڕو با سیفەتی بێباوەڕتان تێدا نەبێت. لە بەرامبەریشدا نوێژنەکردن یاخیبوونو بێگوێیکردنی خواو پێغەمبەرو جێبەجێ نەکردنی ئایەتی قورئانە.

## نوێژ یەکەم مەرجی دۆستایەتی مسوڵمانانە

دۆستی بواداران و سەرپەرشتیارو کاربەدەستو فەرمانڕەوای موسڵمانان خوداو پێغەمبەرو بڕوادارانێکن کە لە خۆیانو نوێژ دەکەنو زەکات ئەدەنو فەرمانبەرداری خودان.

خوا دەفەرموێت: **"إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ"**. (المائدة: ٥٥). واتە: تەنها دۆستو پشتیوانی ئێوە خوداو پێغەمبەرەکەیو ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە ئەوانەی کە بە چاکی نوێژەکانیان دەکەنو زەکات ئەدەنو ئەوانەی لە کڕنوشدان.

کڕنوشیش کە رەمزی گوێڕایەڵیو کار ئەنجامدانە هەرچۆن لە شوێنی خۆیدا باسمان کردووە.

لە ئایەتێکدا دووجار باسی نوێژی کردووە: **"يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ"** ئەوانەی بە چاکی نوێژەکانیان دەکەن. دووبارە دەفەرموێت **"وَهُمْ رَاكِعُونَ"** ئەوانەی نوێژی سوننەت دەکەن بە رۆژو بە شەو، بەڵام لەبەر گەورەیی پلەو پایەی کڕنوش نوێژی بە کڕنوش ناوبردوە.[1]

---

[1] زاد المسير، إبن الجوزى، ج٢، ص٢٢٧. الطبعة الأولى.

## نوێژکردن نیشانەی کامڵبوونی ژیرییە

ئەم بابەتەش بە روونو ئاشکرا و بێ پەردە لە دەقی ئایەتو فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە.

قال تعالى: **"وَإِذا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ اتَّخَذُوهَا هُزُواً وَلَعِباً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْقِلُونَ"**. (المائدة: ٥٨). واتە: هەرکات بانگیان کەن بۆ نوێژکردن، یاریو گاڵتە بە نوێژ دەکەن، ئەوەش بێگومان لەبەر بێ عەقڵیو نەفامی ئەو گەلەیە، کە ژیر نابنو نافامن.

لەم روانگەشەوە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **"أنهى عن كل مسكر أسكر عن الصلاة"**[١]. واتە: رێدەگرمو قەدەغە دەکەم لە هەموو سەرخۆشکەرێك کە مەستکەرو سەرخۆشکەر بێت.

قال تعالى: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ. إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ"**. (المائدة: ٩٠ ـ ٩١). واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان عارەق (مەی)و قومارکردنو بتپەرستی و راپرسی بە بتەکان کارێکی پیسو قیزەونەو لە کردەوەکانی شەیتانە، دە خۆتانی لێ بپارێزن، بەڵکو رزگارتان ببێت. بەڕاستیی شەیتان بەس دەیەوێت دوژمنایەتی و رقەبەرایەتی بخاتە نێوانتانەوەو بە هۆی مەیو قومارەوەو لە یادی خوا و نوێژ وێڵو بێئاگاتان بکاتو رێگریتان بکات ئەرێ هەر وازناهێنن؟

هەروەها دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ.."**. (النساء: ٤٣). واتە: نزیکی نوێژ مەکەون "نوێژ مەکەن" لە کاتێکا کە ئێوە سەرخۆشن، هەتا بزانن چی دەڵێن.

هەر بۆیەش نوێژ لەسەر منداڵ فەرز نییەو شێتیش نوێژی لەسەر نییەو باقی گیاندارانو گیانلەبەران نوێژیان لەسەر فەرز نییە، چونکە ژیر نینو خاوەنی ژیریی نین. مەگەر جۆرێك لە پابەندبوون بە یاسای خوایی لە بوونەوەردا بۆ ئەوان پێی بوترێ نوێژ، بەڵام ئەو نوێژە نییە کە لەسەر خاوەن ژیرییەکان فەرزە.

---

[1] رواه مسلم ١٧٣٣. صحيح وصايا الرسول ج٣، ص٨٩.

**قال رسول الله ﷺ: "رفع القلم عن ثلاث: عن النائم حتى يستيقظ، وعن الصبي حتى يكبر، وعن المجنون حتى يعقل"**[1]. واته: پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرموویەتی: "پێنووسی تاواننوسین هەڵگیراوە لەسەر سیّ کەس: لەسەر خەوتوو هەتا بەخەبەر دیّت، لەسەر منداڵ هەتا گەورە دەبیّتو لەسەر شیّت هەتا چاك دەبیّتەوە".

## نوێژ پاكو خاوێنییە

کام دینو بەرنامەی سەر رووی زەوی بەرنامەرێژەکەی مرۆڤ بیّت یان بەرنامەی ئاسمانی بیّت دەستکاری و گۆڕانکاری تیادا کرابیّ وەکو دینی پیرۆزی ئیسلام دەتوانیّ شوێنکەوتوانی خۆی لە هەموو کونو قوژبنی دونیادا رابهێنیّو پەروەردەیان بکاتو فەرزو پێویستی بکات لەسەریان شەوو رۆژی پێنج جار بە لایەنی کەمەوە رووخسارو دەستو دەمو چاوو قاچەکانیان بشۆرن، بە چاکیو تەنها بنی موێکیش، بە وشکیو نەشۆراوی بەجیّ نەهێڵنو پێیان بفەرمووی: "**ویل للأعقاب من النار**". واتە: سزای سەخت لە دۆزەخدا بۆ ئەو کەسەی پاژنەی پێی باش ناشۆری، لە کاتی دەستنوێژ شۆریندا.

خوا دەفەرموێت: "**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ..**". (المائدة: ٦).
واتە: ئەی بڕوادارینە کە هەستان بۆ نوێژ روخسارو دەستەکانتان لەگەڵ ئانیشکەکان بشۆرنو دەستی تەڕ بەسەرتاندا بێننو قاچەکانتان لەگەڵ قولە پێکانتان بشۆرن.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "لا يقبل الله صلاة أحدكم إذا أحدث حتى يتوضأ"**[2]واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیّ بیّ) پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بیّت) فەرمووی: "خوا نوێژی کەستان وەرناگریّ کە بیّ دەستنوێژ بیّت، هەتا دەستنوێژ نەگریّ".

---

[1] أخرجه أبوداود ٤٣٩٨، والنسائي وإبن ماجة ٢٠٤١و غيرهم. وصحيح فقه السنة ج١ ص٢٣٤.

[2] صحيح أخرجه البخاري، ١٣٥. ومسلم ٢٢٥, وصحيح فقه السنه ج١، ص٢٩٢. وصحيح الجامع الصغير وزيادته ٧٣٨٢.

له مەرجە سەرەكییەكانی نوێژ پێش نوێژدابەستن كە نوێژ بە بێ ئەو مەرجانە وەرناگیرێ، دەستنوێژە كە شۆردنی روخسارو دەستو قاچە، هەروەها پاكژی پۆشاكو جلو بەرگو شوێنی نوێژە.

پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **"لاتقبل الله صلاة بغير طهور ولا صدقة من غلول"**. صحيح[1] واتە: نوێژ بەبێ پاكژی "دەستنوێژ" وەرناگیرێو خێریش لە دزییەك لە دەستكەوتی موسڵمانان بكرێ.

كەسێك تارەت باش نەگرێ و لە كاتی دەست بە ئاوگەیاندندا جوان خۆی پاك نەكاتەوە شایستەی سزای خوایە پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: دەربارەی دوو گۆڕەكە بە لایاندا تێپەڕیوە **"أنهما يعذبان، وما يعذبان في كبير، أما أحدهما فكان لايستتر من البول وأما الآخر فيمشى بالنميمة"**. صحيح[2]

واتە: ئەم دووانە لە ئەشكەنجەدان، لەسەر گوناهی گەورەش سزا نادرێن، یەكێكیان خۆی لە میز پاكنەكردۆتەوە، ئەویتریشیان قسەی هێناوەو بردووە.

كەسێك جلەكانیو شوێنی نوێژەكەیو لەشو تەواوی جەستەی پاك نەبێتو دەستنوێژی نەگرتبێ كە شۆردنی روخسارو دەستەكانو قاچەكانە نوێژی لێوەرناگیرێ.

ئافرەت بێنوێژ دەبێو دەورەی مانگانە پەیڕەو دەكات، چونكە خوێنێكی دەبێ بەو خوێنەشەوە خوا مۆڵەتی دەدات نوێژ نەكات دواتریش نەیگێڕێتەوە، یەكەمجار نوێژ ناكات لە كاتی بوونی خوێنەكەدا، چونكە خوێنەكە پیسە، دواتریش نوێژەكان ناگێڕێتەوە هەتا نەبێتە ئەركێكی گران.

ئافرەت بەو خوێنە پیس نابێت، چونكە پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) لەو حاڵەتانەدا تێكەڵی هاوسەرەكانی كردووەو هەڵسوكەوتی لەگەڵیان كردووە، لەگەڵیان ماوەتەوەو لەگەڵیان خەوتووەو شتی دەستی خواردوونو بەڵكو لە پەرداخی ئەواندا لە شوێنی دەمی ئەوان لەو حاڵەتەدا ئاوی خواردۆتەوەو نانی لەگەڵ خواردون. هەروەها نوێژ دڵو دەروونو تەواوی ئەندامەكانی لاشە پاك دەكاتەوە لە تاوانی دەروونیو دەرەكی.

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٧٣٨٤.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٤٤٠. وصحيح أبي داود ١٥ وصحيح الترغيب والترهيب ١٥٤ و٢٤٤١ صحيح الجامع الصغير بلفظ آخر.

## نوێژ وەرزشی جەستەیە

هەموو پایە کردارییەکانی نوێژ مەشقو جوڵاندنو وەرزشی لاشەیەو سەرجەم راوەستانو کڕنوشو سوژدەو راستبوونەوە، تەنانەت جۆری دانیشتنەکانیش لەناو نوێژدا چوستو چالاکی بە لاشەی نوێژخوێن و تەوژم بە خوێنی ئەدات و جومگەو ئێسکی نوێژخوێن دەجوڵێنیو بەهێزی دەکات، کام بەرنامەو کام ئیمپراتۆرو کام دەوڵەتو حیزب بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی توانیویەتی رۆژی پێنج جار وەرزشو مەشقی لاشە بە ئەندامەکانی بکات بێجگە لە بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام، کە هەموو رۆژێ بە درێژایی مانگو ساڵو زەمانەو رۆژگار، بە گەرماو سەرما رۆژی پێنج جار ئەندامەکانی نوێژ دەکەن کە یەکێك لە گەوهەری بێژمارەی نوێژ ئەو وەرزشەیە کە خوێندەوارو نەخوێندەوار، ئازادو بەندەو پاشاو گەدا، بە سەرماو گەرما، شاریو گوندنشین، بە زستانو هاوین، گەنجو پیر، بەندو یەخسیر زاناو نەزان، بەهۆشو بیر، شوانو گاوان، خاوەن ماڵو سەپان، هەژارو نەدار، دەسەڵاتدارو بێدەسەڵاتو نەخۆشو دەردەدار، ئافرەتو نێر، چاوساغو کوێر، لە ماڵەوەو لەسەر بێر، لە جەنگ بێ یان لە سەفەری خێر، برسی بێ یان تێر، لە کوێستان یان لە گەرمەسێر، زیرەك بێ یان زەین کوێر، ترسنۆك بێ یا وەکو شێر، سوودمەند بێ یا بێ خێر، تەمەڵ یان چاپوكو دلێر، رۆژێ هەزاران ملیۆن دینار بکاتە خێر، نابێ نوێژ دوابخات، وەکو دووڕوو و دەغەڵو بێ خێر. دەبێ نوێژ هەر بکرێ گەر بەندەی خوایە، گەرنا بێ سوود و پاداشت دەبێ لەو دونیایە.

بەڵێ نوێژ چوستو چالاکیو گڕو تینە، بۆیە لە تەواوی ئایەتەکانی قورئاندا خوا دەربارەی نوێژ وشەی (**أقیموا الصلاة**) یان (**أقم الصلاة**) یان هەمان وشە بە شێوازی تر بەکاردێنێ، هەرگیز نەیفەرمووە (**أدوا الصلاة**) هەروەها دەفەرموێت: **"فاسعوا الی ذکر الله"**. بە چوستو چالاکی بچنە نوێژی هەینی.

لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا بەهەمان شێوە هەر ئەو وشەیە بەکار هاتووە، هەروەها پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: کەسێك خەواڵوو بوو با نوێژ نەکات، تا خەوەکەی بەسەردەچێت، وەکو دەفەرموێت: **"إذا نعس**

**أحدكم وهو يصلي فلينصرف فلينم، حتى تعلم مايقول"**. صحيح[1] واته: ئەگەر یەکێکتان لە کاتی نوێژدا وەنۆزی داو خەوی هات، بێبڕوات بخەوێ، "دواتر نوێژەکەی بکات" هەتا بزانێ چی دەڵێ.

هەروەها دەفەرموێت: **"لاتجزیء صلاة الرجل، حتى يقيم ظهره في الركوع والسجود"**. صحيح[2] واتە: نوێژی کەس بری ناکەوێ هەتا بە باشی پشتی راستو رێك نەکاتەوەو لە کڕنوشو سوژدەدا. ئەم مەشقو وەرزشو جموجوڵەش لە زۆر ئازارو نەخۆشی دەیپارێزێ وەکو دواتر باسی دەکەم.

## نوێژ خۆڕازاندنەوەیە

خۆڕازاندنەوە بۆ مزگەوتو بە تایبەتی لە کاتی نوێژدا سوونەتەو دەبێ نوێژخوێن جوانترینو رازاوەترین پۆشاك بپۆشێ. خوا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: **"..خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ.."** واتە: لەگەڵ چوونە هەر مزگەوتێك خۆبڕازێننەوە، هەروەها خوا دەفەرموێت بە پێغەمبەر: **(وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ)** (المدّثر: ٤) واتە: پۆشاکت پاکژ راگرە، هەروەها لە فەرمودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە دەفەرموێت: **"أن الله جميل يحب الجمال"**. صحيح[3] واتە: بێگومان خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێ.

پێشینی ئەم ئوومەتی ئیسلامە، کە لە هەموو کەس باشتر لە دینی ئیسلام تێگەیشتوون هەندێکیان جوانترینو بەنرخترین پۆشاکی هەبووەو بە نرخێکی زۆر گران کڕیبووی لە کاتی نوێژدا لەبەری دەکردو دەیفەرموو: پەروەردگارم لە هەموو کەس شایستەترە خۆمی بۆ بڕازێنمەوە لە نوێژەکەمدا.[4]

---

1 صحيح الجامع الصغير وزيادته ٨١١، ولفظ آخر رقم ٨١٢، ٨١٣.

2 صحيح الجامع الصغير وزيادته ٧٢٢٤ صحيح أبي داود ٨٠٦ المشكاة ٨٧٨ وبلفظ آخر نفس المصدر ٧٢٢٥.

3 صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٧٤١. وبلفظ آخر ١٧٤٣.

4 صلاح الأمة، ج٥، ص٦٣٤.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: وەکو ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە: **"إذا صلى أحدكم فليلبس ثوبيه، فان الله تعالى أحق من تزين له"**.[1] واتە: ئەگەر یەکێتان نوێژی کرد با هەردوو جلەکەی لەبەر بکات، بەڕاستیی خوا شایستەترە کەسێك خۆی بۆ بڕازێنێتەوە.

**وعن إبن عمر (رضي الله عنهما)، قال رسول الله ﷺ: "إذا صلى أحدكم فليأتزر، وليرتد". صحيح**[2] واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد با "شروال و مراخانی" جلی سەرو خوار لەبەر بکات.

**كان إبن مسعود (رضي الله عنه) يعجبه الثياب الحسنة النظيفة والريح الطيبة إذا قام الى الصلاة"**.[3] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) حەزی لە جلو بەرگی جوانو پاکوخاوێن و بۆنی خۆش بوو کاتێ هەڵدەستا بۆ نوێژ.

**كان عبدالله بن زكريا وأصحابه يغتسلون كل ليلة بعد العشاء للعبادة.**[4] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەکەریاو هاوڕێکانی هەموو شەوێ دوای نوێژی خەوتنان (عیشا) خۆیان دەشت بۆ خواپەرستی.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) خۆی بۆنخۆش دەکرد بە میسكو عەنبەر.[5]

بە دڵسۆزییو یەکلابوونەوە ناخو دەروونی خۆیان رازاندۆتەوەو بە بۆنی خۆشو پۆشاکی جوانیش رواڵەتی خۆیان رازاندۆتەوە، چونکە ئیسلام گرنگی بە توێکڵ و کاکڵ ئەدات.[6]

---

1 صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦٥٢.

2 صحيح الجامع ٦٤٧.

3 رهبان الليل ج٢، ص٢٥٦.

4 رهبان الليل ج٢، ص٢٥٦.

5 رهبان الليل ج٢، ص٢٥٧ .

6 رهبان الليل ج٢، ص٢٥٧ .

**كان أبوحنيفة (رحمه الله) إذا أراد أن يصلي من الليل تزين حتى يسرح لحيته".** [1] واتە: ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) ئەگەر بیویستایە شەونویٚژ بکات خۆی دەڕازاندەوە، تەنانەت ریشیشی دادەهیٚناو شانەی دەکرد.

## نویٚژ پاریٚزەری گیان "ڕۆح"ی ئادەمیزادە

هەرکەس جاڕی موسڵمانەتی و نویٚژ بکات، نویٚژەکەی دەبیٚتە قەڵغان بۆیو دەبیٚتە ئەندامیٚکی کۆمەڵگەی موسڵمانانو خویٚنو گیانی بەرِیٚزو حەرام دەبیٚت، کەس بۆی نییە دەست بەریٚتە خویٚنی. بەڵام ئەگەر خۆی بە موسڵمان بناسیٚنیٚ، نویٚژ نەکات، دووچاری سزای شەرعیی دەبیٚت لە دونیادا لە لای دەسەڵاتدرانی موسڵمانان و لە دوارِۆژیشدا لە لای خوای گەورە، ئەگونجیٚ خوا بیبەخشیٚ یان سزای بدات.

لە حوکمو شەرعی دادپەروەری خوادا کەسیٚك دووڕوو و دەغەڵ بیٚو خۆی بە موسڵمان بنویٚنیٚ و نویٚژ بکات دووچاری سزادان نابیٚ مەگەر تاوانیٚك بکات، بەڵام کەسیٚك بە دڵ موسڵمان بیٚتو بەڕاستیی بڕوای هیٚنابی، بەڵام نویٚژ نەکات دووچاری دوو جۆر سزا، دەبیٚت سزای دونیاو سزای دوارِۆژ.

**قال رسول الله ﷺ: "نهيت عن قتل المصلين".** واتە: پیٚغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی: لیٚم قەدەغەکراوە نویٚژخویٚنان بکوژم.

**وعن أم سلمة (رضي الله عنها) أن النبي ﷺ قال: ستكون أمراء فتعرفون فمن عرف بريء، ومن أنكر سلم، ولكن من رضي وتابع قالوا: أفلا تقاتلهم؟ قال: لا، ماصلوا".** [2]واتە: لە ئوم سەلەمەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) پیٚغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی: لەمەودوا کاربەدەستانیٚ دیٚن، کاری چاکیش دەکەنو کاری خراپیش دەکەن، هەرکەس زانیی خراپە دەکەن خۆی بیٚبەری بکات لیٚیان، هەرکەسیش ئینکاری کردو خۆی دوورەپەریٚز گرت، سەلامەت دەبیٚ، بەڵام هەرکەس رازیی بوو شویٚنیان کەوت، فەرمویان ئەریٚ بە گژیاندا نەچین؟ فەرمووی: نەء، هەتا نویٚژ بکەن. بەگژیاندا مەچن.

---

[1] رهبان الليل ج١، ص٥٠١.

[2] رواه مسلم ١٨٥٤، وصحيح وصايا الرسول ج٣، ص٣٧.

هەروەها پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **"أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله، ويقيموا الصلاة، ويؤتوا الزكاة، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم واموالهم الا بحقها، وحسابهم على الله.."**. (صحيح)[1] واتە: فەرمانم پێکراوە، کە بجەنگم لەگەڵ نەیاران هەتا بڕوادێنن کە هیچ خوایەك بە حەق نییە بێجگە لە (الله) و منیش پێغەمبەری خوامو بە چاکی نوێژ بکەنو زەکات بدەن، ئەگەر ئەوەیان کرد خوێنیان لە من حەرامو قەدەغەیە مەگەر بە هەقی ئیسلام، حیسابیشیان لە لای خوایە.

پیاوچاکانو خواناسان، دڵو گیانیان، ئاسمانەکانو بوونەوەرو هەزاران کەشکەشان دەبڕێتو لە ژێر سایەی عەرشدا سوژدە دەباتو لاشەو جەستەشیان هەر لەناو پێخەفەکاندایە، هەروەکو (**أبودرداء**) دەیفەرموو: هەرکات بەندەی بڕوادار خەوت گیانی (روح)ی بەرز دەکرێتەوە هەتا لە ژێر عەرشدا سوژدە دەبات، جا ئەگەر پاك بێت مۆڵەتی ئەدرێ سوژدە بەرێ، ئەگەر لەشگرانیش بێت رێگەی پێنادرێ سوژدە بەرێ ـ والله أعلم ـ . ئەمەش نهێنیی ئەو فەرمانەی پێغەمبەرە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) کە دەفەرموێت هەرکەس لەشگران بوو واتە خۆشتنی لەسەر بوو دەیویست بخەوێ با دەستنوێژ بگرێ.[2]

## نوێژکردن پاراستنی زمانە

یەکێك لەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە قسەکردنە، حەڵاڵو رێگە پێدراوبێ یان حەرام و قەدەغەکراوبێ. لە نوێژدا بێجگە لە یادی خوا و قورئانخوێندنو تەسبیحات، هیچ قسەیەك دروست نییە، جوان بێ یان ناشیرین، بابەتی گریان یان پێکەنین، تەنانەت ئامۆژگاریی، مەگەر لە غەفڵەتو بێئاگاییدا..

---

[1] صحيح الجامع ١٣٧١، وسلسلة الصحيحة ٤٠٨.

[2] رهبان الليل، ج٢، ص٩١ـ ٩٢.

خواپەرستییەك بەو جۆرە شوێنكەوتوانو هەوادارانی خۆی پەروەردە بكات نەك حەرام دەبێ خۆ لە وشەی حەلاڵیش بپارێزین مەگەر ئەو رستەو وشانەی بۆیان دیاریكراون، دەبێ بزانن چی دەڵێن و ئاگاداری وردو درشتی قسەكانیان بن.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) ان رسول الله ﷺ قال: "نهينا عن الكلام في الصلاة، الا بالقرآن والذكر".**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودەوە (رەزای خوا لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "لێمان قەدەغەكراوە قسەكردن لە نوێژدا، مەگەر قورئان یان یادی خوا".

تەنانەت لە كاتی وتاردانی رۆژی هەینیش قسەكردن نییەو پێچەوانەی سوننەتەو زۆربەی زاناكان لەو كاتەدا قسەكردن بە حەرامو نادروست دەزانن، ئەگەر قسەی باشو ئامۆژگاریش بێت.

**قال رسول الله ﷺ: "من تكلم يوم الجمعة والإمام يخطب فهو كالحمار يحمل اسفارا، والذي يقول له انصت لا جمعة له".**[2]پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەركەس رۆژی هەینی لە كاتی وتاردانی پێشەوای وتارخوێندا قسە بكات ئەوە وەكو گوێدرێژێك وایە بارە كتێبی لێنرابێ، ئەوەش پێی دەڵێ بێدەنگ بە خێری جومعەی بۆ نانوسرێ.

**عن معاوية بن الحكم (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إن هذه الصلاة، لا يصلح فيها شيء من كلام الناس، إنما هو التسبيح والتكبير وقراءة القرآن".**[3]واتە: لە موعاوییەی كوڕی حەكەمەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئا ئەم نوێژە دروست نییە هیچ قسەیەكی خەڵكی تێدا بێت، بەڵكو ئەوە باسی بێگەردی (تەسبیحات)و گەورەیی خواو قورئان خوێندنە.

---

[1] صحيح ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦٧٩١.

[2] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٣٩٩.

[3] رواه أبوداوود ٩٣٠. صحيح الجامع ٢٢٦٥.

## نوێژ فریادڕەسە لە کاتی تەنگانەدا

نوێژ کە لە زاراوەی زمانی عەرەبیدا بە دوعاو نزا لێکدراوەتەوە پتەوترین پەرستشێکە کە بڕوادار لە تەنگانەو بێدەرەتانیدا پەنای بۆ بەرێت.

پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتە **"فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُسَبِّحِينَ"**. **(أي من المصلين)**. دەفەرموێت: ئەگەر یونس (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە نوێژخوێنان نەبوایە لە سکی نەهەنگەکەدا ڕزگاری نەدەبوو **"لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ"** واتە لە سکی نەهەنگەکەدا دەمایەوە هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە.[1]

خوا دەفەرموێت: **"وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ.."**. واتە: پشت بە خۆڕاگریو نوێژ ببەستن.

**وعن حذيفة (رضي الله عنه) قال: "كان رسول الله ﷺ إذا حزنه أمر فزع الى الصلاة".**[2] واتە: لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێ) کاتێك شتێك تەنگی پێهەڵدەچنی پەنای بە نوێژکردن دەبرد.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویەتی: **"كل تسبيح في القرآن هو الصلاة".**[3] واتە: هەموو وشەی تەسبیحاتێك لە قورئاندا مەبەست پێی نوێژە. کە دەفەرموێت تەسبیحات بکە واتە: نوێژ بکە.

**"ابن العربي"** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: جیاوازیی لە نێو زانایاندا نییە کە مەبەست بە (سبح) لە ئایەتی (١٣٠) سوڕەتی (**طه**)و ئایەتی (**٣٩**)ی سوڕەتی قافدا، واتە: نوێژ بکە. لە سوڕەتی قافدا دەفەرموێت: **"وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ"**. (ق : ٣٩). مەبەست پێی نوێژی بەیانیو عەسرە، چونکە

---

[1] موسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢، ص٣٦. والتفسير القورطبي ١١١/١٥.

[2] الصبر في القرآن والسنة ص٩٠، وصحيح الجامع ٤٧٠٢، وحسنه الألباني في المشكاة ١٣٢٥.

[3] التسبيح في الكتاب والسنة ص٨٦.

نوێژ ئەوپەڕی تەسبیحاتە. واتە: نوێژی بەیانی بکە پێش خۆرهەڵاتن‌و نوێژی عەسریش بکە پێش خۆرئاوا بوون.[١]

## هەموو ئەندامانی لاشە نوێژیان لەسەر فەرزە

نوێژ پەرستنێکی تایبەتی‌و گشتگیرە نەوەکو زەکات تەنها ماڵ تیایدا بەشدارە، نەوەکو رۆژوو تەنها گەدەو هەندێ لە ئەندامانی لاشە تیایدا بەشدارن، نەوەکو حەج تەنها دەوڵەمەند تیایدا بەشدارە، بەڵکو بە دڵ‌و بە گیان و تەواوی ئەندامانی لاشە ئەنجام دەدرێت و فەرزە لەسەر هەژارو دەوڵەمەندو ساخ‌و نەخۆش‌و نابێ لاشەیەکی بێ گیان بێ، هەروەکو نابێ گیانێکی بێ لاشە بێ، هەروەها **"لیست عاجلة ولا آجلة"** واتە نابێ پەرستنێکی دونیایی رووت بێ یان قیامەتی رووت بێ. بەڵکو نوێژ پەرستنێکە بۆ دونیاو دوارۆژ ـ لە دونیادا پاکو خاوێنییە ـ وەرزشی لاشەو گیانە ـ رێگرو لەمپەرە لە بەردەم هەموو خراپەیەکداو هەموو خراپەیەك بنبڕو ریشەکێش دەکات ـ دەبێ دەستپاکو داوێن پاك بێت.

نوێژ خاوەنەکەی فێری ئەدەب‌و رێزو خۆبەکەمزانین دەکات، لە هەمان کاتدا بەشی رۆح‌و گیانیشی تیایە، چونکە پەرستنێکە خوا فەرمانی پێکردووەو پاداشتەکەی لە دوارۆژدایە، کۆمەڵێ نهێنی‌و پەنهانکاری تیایە، کە تەنها خودا لێی ئاگادارە، کێ دەزانێ فلان کەس دەستنوێژی هەیە یان نا؟ یان دەستنوێژی لەبەر خوا گرتووە یان بە دووڕوویی و زۆر شتی تر؟

نوێژخوێن دەبێ بە هەموو لاشەی هەستی‌و دانیشی‌و کرنۆش‌و سوژدە بەری‌و نابێ قسە بکات و جموجۆڵ بکات‌و چاو بەرز بکاتەوەو شت بخوات، هاوکات دەبێ وریاو هەستیار بێت‌و ئاگاداری نوێژەکەی بێت، ئەگەر لە نوێژەکەیدا بێئاگا بوو یان لە هۆشی خۆی چوو، بورایەوە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە عەقڵ‌و ژیریی بەشداریی ئەو نوێژەی نەکردووە، ئەگەر شتی خوارد یان قسەی کرد یان جموجوڵی زۆری کرد بە ئەنقەست نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە بە بەشداری نەکردنی هەر ئەندامێك لەوانە

---

[1] التسبیح في الکتاب والسنة ٨٧.

نوێژەکە بەتاڵ دەبێت، هاتنەدەرەوەی شتێك لە پاشو پێش، لاچوونی پۆشاکی بەری نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، پاشگەزبوونەوە لە دین نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

کەواتە نوێژ بە گیانو بە دڵ بە مێشكو عەقڵ بە بیرو هەست، بە قاچو دەست، بە گەدەو زمان، بە خۆداپۆشین، بە پۆشاکی جوان، تەواوی لاشەو چاوو گوێ، مۆخو ئێسقان، بیرو ئەندێشەو هزری ئینسان، لووتو ناوچەوان، ئەژنۆکان، لە نوێژدا دەستو روخسار و قاچ دەشۆرێ، نوێژ چڵكو ژەنگو گوناهباریت لێدەشۆرێتەوە، بە دەستی تەڕ، سەرو گوێچەکەکان پاك دەکەیەوە، لە هەر تەپوتۆزێك، چڵكو ژەنگو ژارێکی دیارو پەنهان، نابێ بیری بڕوا شتێ دەردا، شتێ بخوا.

نوێژ تەواوی لاشەو گیان و هەستو نەست دەگرێتەوە، دووڕووەکان تەنها دڵو گیانیان بەشداریی نوێژی نەدەکرد، هەرچەند لە دوای پێغەمبەریشەوە نوێژیان دەکرد، بەڵام سوودی پێنەگەیاندن، بەڵکو دەبێتە دەعواچی و شکایەتیان لێدەکات.

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) مرفوعا: "أمرت أن أسجد على سبع الجبهة والأنف واليدين والركبيتين والقدمين". وفي رواية "الجبهة واشار بيده على انفه".**[1] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) گێڕاویەتییەوە لە پێغەمبەری خواوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەسەر حەوت ئەندام سوژدە بەرم: ناوچەوانو لووت، هەردوو دەست، هەردوو ئەژنۆ، هەردوو قاچ". لە ریوایەتێکی تردا "لەسەر ناوچەوان، بە دەستیشی هێمای بۆ لووتی کرد".

لە فەرمودەی پێغەمبەردا سەڵاتو سەلامی خوای لێبێ هاتووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"على كل ميسم من الإنسان صلاة كل يوم"**. واتە لەسەر هەموو جومگەیەکی مرۆڤ نوێژ فەرزە، هەموو ڕۆژێ، لەناو خەڵکەکەدا پیاوێك وتی: ئەمە گرانترین شتە بۆمان هاتبێ. پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "فەرمانکردنت بە چاکەو ڕێگەگرتنت لە خراپە نوێژە، دڵنەرمیو نەرمو نیانیت لەگەڵ

---

[1] الحديث في الصحيحين، البخاري ٧٧٩ ومسلم ٤٩٠ وصحيح الجامع ٥٩٧. سلسلة أحاديث الصحيحة ج٤، ص١٩٩

بێدەسەلات نوێژە، داهاتنەوەت بۆ فرێدانی پیسی لەسەر ڕێگا نوێژە، هەموو هەنگاوێك کە هەنگاو دەنێیت بۆ نوێژ، نوێژە".[1]

**قال رسول الله ﷺ: "أمر إبن آدم أن يسجد على سبعة أعظم".**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: "ئەوەی ئادەم فەرمانی پێکراوە کە سوژدە لەسەر حەوت ئێسقان بەرێت".

## نوێژ دەرکردنی شەیتانە

نوێژ جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە، هەرکەس سەرگەرمی بەڕێوەبردنی فەرمانی خوا بێ، دڵو رۆحو گیانو لاشەی پەیوەستی خودا بێ، سەرقاڵی کارێکی شەریکی بێ، لەگەڵ شەریكو هاوبەشەکەیدا کە خودایە شەیتان ناوێرێ خۆی لە قەرە بداتو بۆی لە خشتە نابرێ، نوێژ کە خاوەنی راستەقینەی خۆی هان بدات بۆ جێبەجێکردنی تەواوی فەرمانەکانی خواو دوور کەوتنەوە لە تەواوی قەدەغەکراوەکانی خوا، نوێژ کە شتی حەلاڵو زولاڵیش لە خاوەنەکەی قەدەغەو حەرام دەکات وەکو خواردن و خواردنەوەی رەنجی شانی خۆیو قسەکردنێك کە پێش نوێژەکە لێی حەلاڵ بوو و دوای نوێژەکەش لێی حەلاڵە، بەلام لە کاتی نوێژدا لێی حەرام دەبێ، کەسێك شتی حەلاڵیش نەکات نەك حەرام، قەرەی شتی دروستیش نەکەوێ نەك نادروست دەبێ شەیتان لە خشتەی بەرێو دووچاری داوی زەبوونی شەیتان بێت، نا بەڵکو شەیتان لێی نائومێد دەبێت.

**قال رسول الله ﷺ: "أن الشيطان قد أيس أن يعبده المصلون ولكن في التحريش بينهم" حسن.**[3] واتە: پێغەمبەری خوا (سەلامی خوا لێ بێ) فەرموویەتی: بەڕاستیی شەیتان نائومێد بووە کە نوێژخوێنان بیپەرستن، بەلام هەوڵی تێکدانی نێوانیان دەدات.

نوێژ فەرمان دەکات بە پەیوەست بوون بە خواوە، بەجێبەجێکردنی فەرمانی خوا بە داواکردنی **(الصراط المستقيم)** ڕێگە راستەکەی خوا، ڕێگەی پێغەمبەرانو پیاوچاکانو راستگۆیان، لە بەرامبەریشدا هاوکات داوا دەکات نەیخاتە سەر بەرنامەی

---

[1] رواه إبن خزيمة في صحيحه وصحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٠٧.

[2] صحيح الجامع ١٣٦٦.

[3] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٦٥١ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ١٦٠٨

گاورو جولەکەو دیانەکانو ڕێگەی هەموو خراپەیەکی لێدەگرێ، **"إن الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر"**. واتە: بەڕاستیی نوێژ ڕێدەگرێ و یاساغ دەکات هەموو خراپەو خراپەکارییەك.

جا کەسێك ئاوەها نوێژێك بکات شەیتان چۆن ئومێدی پێیدەمێنێ و دەستی لێناشوات، بەڵکو بە بانگەوازکردن بۆ نوێژو بانگکردنی خەڵکیی و ئاگادارکردنەوەیان لە کاتی نوێژ لە لایەن بانگبێژەوە شەیتان ڕا دەکات زۆر بە بێ ئەدەبی و سەرشۆڕییەوە هەتا بانگبێژ لە بانگەکەی دەبێتەوە نزیك نابێتەوە.

## نوێژخوێن لە چاکەخوازانە ( مُحْسنِينَ )

چاکەکار بە کەسێك دەوترێ چاکە بکات، سەرداری هەموو چاکەکانیش نوێژە، ئەگەر کەسێك بە کردنی کردەوە چاکەکان ببێتە پیاوچاك، دیارە بە کردنی چاکترینی کردەوەکان دەبێتە پێشەنگی چاکان.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **"أفضل الأعمال الصلاة لوقتها، وبر الوالدين"**. صحيح[1] واتە: **"**چاکترینی کردەوەکان نوێژە لە کاتی خۆیدا، چاکەکردنە لەگەڵ دایكو باوکدا**"**.

هەروەها فەرموویەتی: **"أفضل الأعمال الصلاة في أول وقتها". صحيح.**[2] واتە: چاکترین کردەوە نوێژکردنە لەسەرەتای کاتیدا، خوای گەورە نوێژخوێنانی بە **"مُحْسنِينَ"** چاکەخوازان ناو بردووە، وەکو دەفەرموێت : **"هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ * الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالآخرةِ هُمْ يُوقِنُونَ"**. (لقمان: ٣ ـ ٤).
واتە: ئەم قورئانە ڕێنمونی بەخشو میهرەبانییە بۆ چاکەخوازان، ئەوانەی بە چاکی نوێژەکانیان دەکەن، زەکات ئەدەنو بێگومانن لە دواڕۆژ.

کەسێك نوێژ فێری هەموو چاکەیەکی بکاتو هانی بدات بۆ کردنی هەموو کارو کردارو ڕەفتارێکی خێرو ڕێگری و قەدەغەی هەموو هەڵسوکەوتو ڕەفتارو گوفتارێکی خراپی لێبکات چۆن ناچێتە ڕیزی پیاوچاکان و چاکەخوازان.

---

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٠٩٣.

[2] صحيح الجامع الصغير وزيادته ١٠٩٣، وبلفظ آخر ١٠٩٥.

## نوێژخوێن بەندەی ڕاستەقینەی خوایە

خوای پاكو بێگەرد و باڵا دەست دەفەرموێت: **"وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ"**. (البينة: ٥). واتە: فەرمانیان پێنەکراوە مەگەر تەنها بە پەرستن و دڵسۆزی ڕاستەقینەو دینداری بێخەوشو یەکلابوونەوە بۆ خواو بە چاکی نوێژکردن و زەکاتدان نەبێت، ئا ئەوە دینی بێخەوشو پۆڵاینە". لێرەدا باسی نوێژخوێن کراوە بەوەی کە بەندەی دڵسۆزو ڕاستەقینەو یەکلا بووەی خوایە.

لە نوێژەکەیدا دەڵێ: **"إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ"**. واتە: تەنها هەر تۆ دەپەرستینو هەر لە تۆ داوای کۆمەکی و پشتبەستن دەکەین.

دواتریش دەڵێ: **"اهدِنَ ـ ـ ـ ـ ا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ"** واتە: ڕێنوینی ڕێگەی ڕاستو ڕەوانەکەمان بکە بە دوای ئەوەشدا دەڵێ: **"غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ"**. واتە: خودایە نەمخەیتە سەر ڕێگەی ئەوانەی ڕقو خەشمو قینت لێگرتون کە "جولەکەکانن" و نەشم خەیتە سەر ڕێگەی ئەوانەی گومڕاو سەرکوێرو سەر لێشێواون کە گاورەکانن.

کەسێك نوێژەکەی فێری ئەم پەیامە بێگەردەی بکاتو لە نوێژەکانیدا بە فەرزو سوننەتەوە تەنانەت لە نوێژی مردوویشدا دەبێ ئەو بەندە سەرەکیانەی بیروباوەڕەکەی دووبارە بکاتەوەو بە دەمو بە دڵ وەریان بگرێو بڕیاریان لەسەر بداتو بە کردەوەش ئەنجامیان بدات، چۆن نابێتە بەندەی ڕاسیتەقینەی خوا؟

## نوێژ دروشمی یەکتا پەرستیی ئیبراهیم بووە

پێغەمبەرەکان بۆ هەموو چاکەیەك سەرمەشقو پێشەوای بەرەی مرۆڤایەتی بوون، نوێژیش کە لەسەرجەم چاکەکان گەورەترە پاداشتی زیاترە، بۆیە پێغەمبەرەکان نوێژیان بە تاجی سەریان زانیوە و بە پتەوترین پەیوەندیی نێوان خۆیانو پەروەردگاریان زانیوە، پەیڕەویان لێکردووەو لە تەواوی ژیانی خۆیانو خێزانو ژنو منداڵیاندا جێبەجێیان کردووەو خەڵکیان بۆ بانگ کردووەو داوایان لە خوا کردووە نەوەکانیان نوێژخوێن بن.

قال الله تعالى: **"قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِيناً قِيَماً مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ * قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ"**. (الأنعام : ١٦٢). واتە: ئەی موحەممەد پێیان بڵێ بەڕاستیی من

پەروەردگارم ڕێنوێنی کردووم بۆ ڕێگەی ڕاستو دروست، دینێك کە ڕاگری ژیانەو ڕێكو ڕەوانەو ئەویش دینی بێگەردی ئیبراهیمە کە ئەو لە هاوەڵ دانەران نەبووە، بڵێ نوێژەکانم و قوربانیەکانم و ژیانو مردنم بۆ پەروەردگاری جیهانیانە".

## خوا خۆشنوود دەبێ بە نوێژی بەندەکانی

خوای پەروەردگار خۆشیی دێ کە بەندەکانی لە چاکەکردنو چاکەکارییدا ببینێ، هەروەکو یەکێك پێیخۆشە کەسێکی خۆشەویستی دورەوڵاتی بێتەوەو پێی شاد بێتەوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ماتوطن رجل مسلم المساجد للصلاة والذكر الا تبشبش الله له كما تبشبش اهل الغائب بغائبهم إذا قدم عليهم".**[1] واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەر پیاوێکی موسڵمان کە لە مزگەوت بمێنێتەوە بۆ نوێژو یادی خوا، حەتمەن خوا خۆشنوود ئەبێتو پێی خۆش ئەبێت، هەر چۆن کەسوکاری کەسێکی نادیار خۆشحاڵ دەبن بە هاتنەوەی نادیارو ونبووەکەیان".

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "ماتوطن رجل مسلم المساجد للصلاة والذكر، الا تبشبش الله له من حين يخرج من بيته، كما تبشبش اهل الغائب بغائبهم، إذا قدم عليهم".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەر پیاوێکی موسڵمان نیشتەجێی مزگەوت بێت، بۆ نوێژو یادی خوا، لەو کاتەوەی لە ماڵ دەردەچێ خودا خۆشنود دەبێت پێی هەرچۆن کەسوکاری غەریبو نادیار دڵخۆشو ڕووگەشو مژدەئامێز دەبێت بە هاتنەوەی خۆشەویستە ونبووەکەیان.

---

[1] إبن ماجة ٨٠٠، واحمد ٨٠٥١. وقال في الزوائد "أسنادة صحيح. ورجاله ثقات. نضرة النعيم ج٣، ص٨١٤.

[2] حسن، سلسلة الأحاديث الصحيحة ٥٦٠٤ وصحيح الترغيب ٣٠١و ٣٢٥.

## نوێژو گرنگیدان به كات

نوێژ كاتی بۆ دیاریی كراوه له لایەن خواوه له ڕێگەی جیبریلەوه پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بێت) فێر كراوه و پێی وتراوه ئەمە سەرەتای كاتی هەر نوێژێكه و ئەمەش كاتی كۆتایی هەر نوێژێكه، هەتا بڕواداران به بیٚ سەروبەرەو به پەرتو بڵاوی و شپرزەیی نوێژ نەكەن، بەڵكو له كاتی دیاریكراودا دەبیٚ بانگ بوتریٚو بڕواداران ئاگادار بكرێنەوه و یادیان بخرێتەوه كه كاتی نوێژەو ئاگاداربن، لەناو شارن، لەسەر كارن، له ماڵن یا له سەفەرن، خەوتوون یا خەبەرن، رابن.

**قال تعالى: "فَإِنا قَضَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَاذْكُرُواْ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِكُمْ فإذا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَّوْقُوتاً". (النساء: ١٠٣).** واتە: ئەگەر له نوێژ بوونەوه یادی خودا بكەن به پێوەو به دانیشتنەوه لەسەر تەنیشتو كاتێكیش ئارام بوون نوێژەكانتان بكەن، بەڕاستیی نوێژكردن لەسەر بڕواداران فەرزه له كاتی دیاریكراودا.

كاتی دیاریكراوی نوێژەكان بڕوادار فێر دەكات دەبیٚ وادەو بەڵێنو كاتی دیاریكراوی وادەو بەڵێنەكان رەچاو بكاتو نابیٚ له ئاستیاندا كەمتەرخەم بێت، بەڵكو گوێپێنەدانو كەمتەرخەمی كردن له ئاست جێبەجێكردنی بەڵێن نیشانەی دووڕوویی دەنوێنیٚو له بەرامبەردا كەسی بەڵێنشكێن شایستەی سزای خوای پەروەردگارەو نەفرینی خواو فریشته و ئادەمیزادەكانه.

## خودا له شوانێك خۆش دەبێتو دەیخاته بەهەشت به هۆی نوێژەكەیەوه

چونكه بەهەشتو رەزامەندیی خودا به بڕوابوونو كردەوەی چاكه، بڕواداریش رەوشت جوان و به كەڵك نەبیٚ بۆ مرۆڤەكان دەبیٚ چاوەڕوانی رەزامەندیی خوا نەبیٚ، دین بۆ هەمووانه، بڕبڕەی پشتی ئیسلامیش نوێژه و رەوشتی جوانه، بۆ هەموو چینو توێژی گەلانه، به پیاوو ژنو پیرو گەنجو جوانەوه، كەس بەبیٚ دین رەزامەندیی به دەست ناهێنیٚ، دینیش به بیٚ نوێژ هیچیٚ ناهێنیٚ.

**عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "يعجب ربك من راعي غنم في رأس شظية بجبل، يؤذن لصلاة ويصلي، فيقول الله عز وجل:**

**انظروا الى عبدي هذا يؤذن ويقيم الصلاة يخاف مني، قد غفرت لعبدي وادخلته الجنة". صحيح**[1] واتە: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) دەیفەرموو: پەروەردگاری تۆ خۆشییدا لە شوانێك بەسەر لوتکەی کەژێکەوە، بانگ دەفەرموێتو نوێژ دەکات، خوای شکۆمەند و بە دەسەڵات بە فریشتەکان دەفەرموێت سەیری ئەو بەندەیەم بکەن بانگ دەفەرموێتو نوێژەکەی دەکات، لە من دەترسێت، بەڕاستیی لە بەندەکەم خۆش بووم و دەیخەمە بەهەشت.

## نوێژ لە ئاستی پەرستنەکانو ژیانو مردندا

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا نوێژو قوربانیو خوێنبەخشینو ژیانو مردنی پێکەوە باس کردوون، یەك لە داوای یەك، بەڵام لە پێشدا نوێژ پاشان قوربانیی، دواتر ژیان، لە کۆتاییشدا مردن، چونکە نوێژ هەوێنی ژیانی بەرەی ئادەمیزادەو نوێژ کە پەیوەست بوونی لاشەو دڵو گیانە بە خواوە، خاوەنەکەی دەخاتە ژێر چاودێرییەوەو ئاگاداری وردو درشتی بێوێنەی پەروەردگارەوە و هەتا نوێژخوێن بۆ خۆپاراستن لە هەموو تاوان و خراپەیەکی وردو درشت چۆڵی و ئاوەدانی بۆ نەبیٚ، چونکە دەزانیٚ لە هەموو کاتو شوێنێکدا خوا دەیبینیٚو ئاگاداریەتی و لە هەموو کاتو شوێنێکدا دەبیٚ چاکە تۆمار بکات، بە هەر شێوەیەك بۆی بڕەخسیٚ، چونکە بۆ چرکەیەکیش خوا لێی غافڵ نییەو ئاگاداری ئاشکراو پەنهانیەتی لە خەیاڵو خەتەرەی شاراوەی ناو دڵو دەروونی، لە گوێڕایەڵیو لە فەرمان دەرچوونی، بەڵکو خاوەنی نوێژی راستەقینە ئاشکراو پەنهانیو نهێنی نییە، بڕوای وایە ئاشکراو نهێنی بۆ خودا، یەکسانە جا لە بنی زەویدا یا لە کەشکەشانی ئاسمانە، لە لادیٚو شار یا لە بیابانە، لە ئەشکەوتی تار یا لەسەربانە، لە کۆڕی زیندوانە یا لە گۆڕی مردووانە، لە چەقی بازاڕ یا لە ماڵی عەزیزی میسرە یا لە زیندانە.

دواتر بڕوادار قوربانی و ژیان و مردنی لەسەر ئەو بڕوایە دەرازێنێتەوەو کۆشکی ژیانی لەسەر هەڵدەچنیٚ، لە رێگەی نوێژەکەیەوە خوا بە چاودێرو ئاگای تەواوی وردو

[1] صحيح الجامع الصغير وزيادته ٨١٠٢، وصحيح أبي داود ١٠٨٦، وفضل الصلاة ص٥٦.

درشتی ژیانی دادەنێ، لە هەموو شوێنو زەمانێکدا هەوڵی چاکە ئەداتو خۆ لە خراپە دەپارێزێ، چونکە نیگابانی راستەقینەو چاودێری بە ئاگایی ئەو ناخەوێ، بێ ئاگا نابێ، پیر نابێ، چاوکزو لاواز نابێ، دوور و نزیك کاری تێناکات، پەردە بینینی تەڵخ و ئاڵۆز ناکا، لە تاریکیو رووناکی بێباکە.

کەسێکیش ئاوا خوای خۆی بناسێو لە نوێژی رامێنێ، شەوەکانیشی دەبنە رۆژی روونو دزی و نهێنی نامێنێ، ژیانی دەبێتە شانۆیەکی بێ پەردەو ئاشکراو دەغەڵو دووڕوو نابێ، نە خۆی و نە خەڵکیی ناخەڵەتێنێ.

بۆیە خوا نوێژی لە پێش قوربانیو ژیانو مردندا باس کردووەو وەکو دەفەرموێت: **"قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ"**. (الأنعام: ١٦٢). واتە: بڵێ بەڕاستیی نوێژو قوربانیو ژیانو مردنم بۆ پەروەردگاری جیهانە.

هەر لێرەوە بڕوانە کۆرپەی ساوای سەر بێژنگ لە یەکەم قۆناغی ژیانی دونیاو لەگەڵ هەڵمژینی یەکەم هەناسەیدا دەبێ بانگ بدرێ بە گوێیداو بانگ بکرێ بۆ نوێژ، بۆ ئەوەی پێبگەیەنرێ و تێبگەیەنرێ کە کۆڵەکەی ژیانی داهاتووت نوێژە، لە ئێستاوە ئاگادارت دەکەین لە نوێژ، رۆژانەش پێنج نوێژ دەکەی، کە مردیشی نوێژت لەسەر دەکرێ، کە زیندوویش کرایەوە، یەکەم شت پرسیاری نوێژت لێدەکرێ.

## بەدەستهێنانی مەقامی ( مەحمود ) بە هۆی نوێژەوە

پێغەمبەری خوا (سەلامی خوا لەسەر بێ) وەسیەتی بۆ ئوممەتەکەی کردووە کە لە دوای بانگ نزای تایبەتی بۆ بکەن، هەتا خوا تاقە شوێنی ناوازەی لە بەهەشتدا پێ ببەخشێ، کە تەنها دەدرێتە یەك کەس.

خوا ئەم مژدەیە لەم ئایەتەدا ئەداتە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) : **"عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَاماً مَّحْمُوداً"**. (الإسراء: ٧٩). واتە: هیوا هەیە پەروەردگارت پلەو پایەی بەرزو بەڕێزو ستایشکراوت پێ ببەخشێ. نووسەری کتێبی (رهبان الليل) دەفەرموێت: ئەو خوایەی بەرزت دەکاتەوە بۆ مەقامی مەحمود ئەی (پێغەمبەری گەورەمان) لە دوای مردنی گەورە، هەر ئەو خوایەیە کە لە دوای

خەوتن كە مردنی بچوكە هەڵتدەستێنێ بۆ نوێژو خواپەرستیی كە بەرێزترین پلەیە، ئەمەش هەتا شەونوێژیان بەلاوە ئاسان بێت.[1]

لەو دوعاو پاڕانەوە ناوازەیەشدا لە پایەكانی ئیسلامو لە ئەركە دینییەكان تەنها نوێژ ناوی هاتووە.

پێغەمبەری (خوا سەلامی خوای لێ بێ) خۆی دەقی ئەم نزاو پاڕانەوەیەی داڕشتووەو باسی نوێژی تیادا كردووە، چونكە چاك دەزانێ پلەو پایەی نوێژ چەند گەورەیە لە لای خوا.

بێجگە لەوەش بە گشتیی و بە تایبەتی لەو نزایەدا باسی نوێژ دووبارە بۆتەوەو وەكو لە رەوانبێژیدا پێی دەوترێ (**ذكر الخاص بعد العام**) واتە: باسكردنی تایبەتی دوای باسكردنی بە گشتی.

لە نزاكەدا دەفەرموێت: **"اللهم رب هذه الدعوة التامة"** واتە: ئەی خوایە پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە، نوێژیش بەشێكی گرنگو سەرەكییە لەو بانگەوازە تەواوەداو بەبێ نوێژ بانگەوازەكە تەواو نابێ.

دووبارە بە تایبەتی ناوی دەباتەوە و دەفەرموێت: **"والصلاة القائمة"** و پەروەردگاری ئەو نوێژە، خوا دەفەرموێت: **"أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً * وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَاماً مَّحْمُوداً"**. (الاسراء ٧٨ ـ ٧٩). واتە: نوێژ بكە كاتێك خۆر لە چەقو ناوەڕاستی ئاسماندایە، كە نوێژی نیوەڕۆ و عەسرە، لە تاریكیی شەویشدا كە نوێژی ئێوارەو خەوتنانە، بەیانییش فەرامۆش مەكە، كە قورئانی زۆر تیایدا دەخوێنرێو فریشتەكان ئامادەو گوێبیستی دەبن، بە شەویش شەونوێژ بكە بە زیادەو خۆیەخش بەڵكو پەروەردگارت بتخاتە پایەو مەقامی بەناوبانگو ستایشكراو.

**وفي الأثر المشهور: "كذب من ادعى محبيي، فإذا جنة الليل نام عني أليس كل محب يحب خلوة حبيبه، فها أنا ذا مطلع على احبابى، إذا جنهم الليل جعلت أبصارهم في قلوبهم فخاطبوني على المشاهدة، و كلمونى على حضوري، غدا أقر**

---

[1] رهبان الليل ج١، ص١٣٠.

**أعين احبابي في جناني"**.[1] واتە: درۆ دەكات ئەوەی بانگەشەی خۆشەویستی من دەكات، بەڵام كە شەوی لێهات لێی دەخەوێ، ئەرێ هەموو خۆشەویستێك پێی خۆش نییە بە تەنها دوو بە دوو لەگەڵ خۆشەویستەكەیدا بێت، ها ئەوە من ئاگام لە خۆشەویستەكانمە، كاتێ شەویان لێهات روناكی چاوەكانیان دەخەمە دڵیانەوە، بەرەورووو گفتوگۆم لەگەڵ بكەن، بە ئامادەبوونم قسەم لەگەڵ بكەن، سبەینێ كە قیامەتە چاوی خۆشەویستەكانم گەشو فێنك دەكەمەوە لە بەهەشتەكانمدا.

## نوێژ، خێری حەجو عەمرەی هەیە

نوێژ كە واتای حەجو عەمرە لە خۆی دەگرێ لە زۆر لایەنەوە، چونكە حەجو عەمرەی بڕواداران لە روگە نەبێ ئەنجام نادرێن، نوێژیش روو بە روگە نەبێ دروست نییە، چونكە مەرجی سەرەكیی نوێژە، حەجو عەمرە ماندووبونو لێبڕانی دەوێ، نوێژیش بە هەمان شێوە ماندووبوونو لێبڕانو كاتی دەوێ، لە كاتی ئەنجامدانی حەجو عەمرەدا كۆمەڵێ شت حەرامو یاساغ دەبن، لە نوێژیشدا كۆمەڵێ شتی زۆر زیاتر لەوەی حەجو عەمرە قەدەغەو یاساغ دەبن لە موسڵمان، حەجو عەمرە بە فەرمانی خواو پێغەمبەر پێویست كراون، نوێژیش بە فەرمانی خواو پێغەمبەر پێویست كراوە، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) چۆن خەڵكیی فێری حەجو عەمرە كردووە، بە هەمان شێوەش فێری نوێژی كردوونو وەكو حەجو عەمرە بۆ نوێژیش رێو شوێنی نیشان داونو بەرچاو رۆشنی كردوون. كە حەجو عەمرەی كردووەو ئەوانیش لە دوایەوەو بە شوێنیدا چاویان لێكردووە، بۆ نوێژیش فەرموویەتی: **"صلو ا كما رأيتموني أصلي"**. واتە: چۆن من دەبینن نوێژ دەكەم، ئاوا نوێژ بكەن.

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى الفجر في جماعة، ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ثم صلى ركعتين، كانت له كأجر**

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٤٠.

**حجة وعمرة تامة، تامة تامة". صحيح**[١] واتە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "هەرکەس نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات، پاشان دانیشێ یادی خوا بکات هەتا خۆر هەڵدێ، ئینجا دوو رکات نوێژ بکات ئەوە پاداشتی حەجو عەمرەیەکی تەواو، تەواو، تەواوی هەیە".

هەروەها دەفەرموێت: **"الصلاة في مسجد قباء كعمرة".**[٢] واتە: نوێژ لە مزگەوتی قوبا وەکو عەمرەیە وایە.

**وعن أبي أمامة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من خرج من بيته متطهرا الى صلاة مكتوبة فاجره كأجر الحاج المحرم ومن خرج الى تسبيح الضحى، لاينصبه الا أياه، فأجره كاجر المعتمر، وصلاة على أثر صلاة، لا لغو بينهما كتاب في عليين".** حسن[٣]، واتە: لە ئەبی ئومامەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەرکەس بە دەستنوێژەوە لە ماڵ دەرچێ بۆ کردنی نوێژی فەرز پاداشتەکەی وەکو حاجییەکی ئیحرام بەستووە، هەرکەس دەرچێ بۆ کردنی نوێژی چێشتەنگاو هەر لەبەر ئەو نوێژە راست بووبێتەوە، پاداشتی وەکو عەمرەکار وایە، نوێژیش بە شوێن نوێژدا قسەی پڕوپوچ لە نێوانیاندا نەبێ لە پەڕاوی پایەبەرزاندایە.

**عن أبي أمامة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى صلاة الغداة في جماعة ثم جلس يذكر الله حتى تطلع الشمس، ثم قام فصلى ركعتين انقلب بأجر حجة وعمرة" حسن صحيح.**[٤] **ورواه الطبراني واسناده جيد.** واتە: لە ئەبی ئومامەوە (ڕەزای خوا لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی

---

[1] رواه الترمذي ٥٨٦ وقال حسن غريب. صحيح الجامع الصغير وزيادته ٦٣٤٦، الترغيب والترهيب ٦٥٠ حسن لغيره.

[2] صحيح الجامع ٣٨٧٢.

[3] صحيح الجامع ٦٢٢٨ وصحيح أبي داود ٥٩٧.

[4] الترغيب والترهيب ٦٥٦ و ٦٥٧ عن إبن عمر و٦٥٨ عن عبدالله بن غابر.

خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: "هەرکەس نویٚژی سبەینیٚ (بەیانی) بکات بە کۆمەڵ ئینجا دانیشیٚ یادی خوا بکات هەتا خۆر هەڵدیٚ، ئینجا هەستیٚ دوو رکات نویٚژ بکات، دەگەڕیٚتەوە بە پاداشتی حەجو عەمرەیەکەوە".

## هەرکەس پاریٚزگاریی لە نویٚژ بکات خودا دەیپاریٚزیٚت

پیٚغەمبەری خوا (سەڵاٚتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) ئامۆژگاری عەبدوڵلاٚی کوڕی عەبباسی کرد بە چەند وشەیەکی شیرینو بایەخدارو سەنگین، ئەویش بەوپەڕی گویٚڕایەڵییەوە پەیڕەوی لیٚکردن و کردنیە پیٚشەنگی ژیانی، یەکیٚ لەو رستە گەوهەریانە پیٚی فەرموو: **"أحفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك.."** صحيح[1]، واتە: سنووری دینی خوا بپاریٚزە حەقەکانو فەرمانەکانی ئەنجام بدەو خۆبپاریٚزە لە قەدەغەکراوەکان، خواش دەتپاریٚزیٚ.

خوا لە قورئاندا دەفەرمویٚت: **"هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ"** (ق : ٣٢)". واتە: ئەوە ئەو بەهەشتەیە بڕیار دراوە بۆ هەموو لە خواترسو پاریٚزکاریٚ. وشەی (**حفيظ**)، لیٚرەدا بە پاریٚزەری فەرمانەکانی خواو پاریٚزەری گوناهەکانی خۆی راڤە کراوە، بۆ ئەوەی تەوبەیان لیٚ بکات. کام فەرمانی خوا لە نویٚژ گەورەترە کە پیٚویست بیٚ پاریٚزگاریی لیٚ بکریٚ.

خوا دەفەرمویٚ: **"حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى.." البقرة ٢٣٨**. واتە: پاریٚزگاریی نویٚژەکان بکەنو مەیان فەوتیٚنن، بە تایبەتیش نویٚژی ناوەڕاست.

**عن أم حبيبة (رضي الله عنهما) قالت سمعت رسول الله ﷺ يقول: من يحافظ على أربع ركعات قبل الظهر وأربع بعدها حرمه الله على النار". حسن صحيح**[2] واتە: لە ئوم حەبیبەوە (رەزای خوایان لیٚ بیٚ) فەرمووی گویٚم لە پیٚغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو هەرکەس پاریٚزگاریی لە چوار رکات بکات لە پیٚش نیوەڕۆداو چوار رکات دوای نیوەڕۆ، خوا حەرامو یاساغی دەکات لە ئاگر.

---

[1] أخرجه الترمذي ٢٥١٦ وقال حسن صحيح وأخرجه أحمد ٢٦٦٩ بلفظ له.

[2] الترغيب والترهيب ٣٥.

له فەرمودەیەكی تریشدا هاتووە: **"من حافظ علیها كان له عند الله عهد أن یدخله الجنة". صحیح**[1] واته: هەركەس پارێزگاریی له نوێژ بكات پەیمانی لای خوا هەیە كه بیخاته بەهەشت.

خوا له وەسفو ستایشی موسڵماناندا دەفەرموێت: **"(وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ) (المعارج: ٣٤)"**. واته: ئەوانەی كه پارێزگاریی له نوێژەكانیان دەكەن.

هەروەها پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێ) دەربارەی نوێژ دەفەرمووێ: **"من حافظ علیهن كن له نورا وبرهانا ونجاة یوم القیامة"**.[2] واته: هەركەس پارێزگاریی له نوێژەكان بكات بۆی دەبنه روناكیو بەڵگەو رزگاربوون له رۆژی دواییدا.

عومەری كوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ) له كاتی بریندارکردنەكەیدا و لەسەرەمەرگدا كه فرمێسك له چاوەكانی هەڵدەڕژان دەیفەرموو: **"الله الله في الصلاة، لا حظ في الإسلام لمن ترك الصلاة، من حفظ الصلاة حفظه الله، ومن ضیع الصلاة ضیعه الله"**.[3] واته: الله الله له نوێژ، هەركەس واز له نوێژ بێنێ بێ بەشە له ئیسلام، هەركەسیش نوێژ بپارێزێو نەیفەوتێنێ، خوا دەیپارێزێ، هەركەسیش زایەیان بكات خواش ئەو زایە دەكاتو دەیفەوتێنێ.

**الحافظ إبن رجب** (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پاراستنی بەندە له لایەن خواوە دوو جۆرە:

یەكەمیان: پاراستنی بەرژەوەندیی دونیایەتی له لاشەو منداڵو خێزانو ماڵدا، وەكو خوا دەفەرموێت: **"لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللّهِ". (الرعد: ١١)**. واته: خوا فریشتەگەلێكی هەیە كه بە دوای یەكدا دێن له پێشو پاشو هەموو لایەكەوە ئادەمیزاد دەپارێزن بە فەرمانی خوا. پێشەوا عەلی (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: لەگەڵ هەموو كەسێك دوو فریشتە هەیە دەیپارێزن له هەر بەڵایەك

---

[1] أخرجه أحمد ٢٢٧٤٥.

[2] صحیح أخرجه أحمد وغیره.

[3] صحیح وصایا الرسول ج٢، ص١٧٣ـ ١٧٤.

خوا بڕیاری نەدابێ، بەڵام ئەگەر خوا بڕیاری دابێ ڕێگەی بۆ بەر ئەدەن، چونکە ئەجەل ڕێی لێ ناگیرێ.

موجاهیدیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هیچ کەس نییە کە فریشتەیەك چاودێربی نەکاتو نەیپارێزێ لە خەوتنیو بە ئاگاییدا لە جنۆکەو ئادەمیزادو جانەوەرو مارو مێرو".[1]

یەکێ لە زاناکان، کە دەڵێن: "قازی أبو طیب"ە، لە تەمەنی سەدساڵیدا زیاتر بووە، بازێکی زۆر گەورەی داوە هەتا خەڵکیی گلەییان لێ کردووە وتویانە تووشی نەخۆشییەك دەبی، فەرمووی: لە منداڵییەوە ئەم ئەندامانەمان پاراستووە لە تاوان، خواش لە گەورەییدا بۆمان دەپارێزی". یەکێ لە پێشین پیرێك دەبینێ سواڵ دەکات دەڵێ: "ئەوە هەقی خوای زایە کردووەو جێبەجێی نەکردووە بە منداڵیی، خواش لەسەردەمی پیرییدا زایەی کردووە.

سەعیدی کوڕی موسەیب بە کوڕەکەی فەرموو: "بەڕاستیی من نوێژی زۆر دەکەم لەبەر تۆ، بە ئومێدی ئەوەی خوا بتپارێزێ، بە هۆیانەوە ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: "وكان أبوهما صالحا". واتە: ئەو دوو منداڵە باوکیان پیاوی چاك بووە. باشیی باوکیان بووە بە هۆی پاراستنی خۆیانوماڵو سامانەکەیان، خوا موساو خدری (سەلامی خوایان لێ بێ) بۆ ناردن دیوارەکەیان بۆ هەڵچننەوە.

ابن المنكدر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خوا بە هۆی پیاوی چاکەوە منداڵەکەیو نەوەکانی و خانوبەرەو دەوروپشتیان دەپاریزێ، بەردەوامیش لە پارێزگارییو چاودێریی خوادا دەبن.

دووهەمیان: پاراستنی بەندەیە لە لایەن خواوە لە دینو ئیمانو گومانی گومڕاکەرانو ئارەزووی حەرامو پاراستنی دینی لە دوای مردنی.

پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێ) ئەم نزایەی فێریی عومەری کوڕی خەتتاب کرد، **"اللهم احفظني بالإسلام قائما، واحفظني بالإسلام قاعدا، واحفظني**

[1] صحيح وصايا الرسول ج٢، ص١٧٦، و زاد المسير ج٤، ص٢٣٩.

**بالإسلام راقدا، ولا تطمع في عدوا ولا حاسدا"**.[1]واته: خوایه بە پێوە بە ئیسلام بمپارێزی، بە دانیشتنەوە بە ئیسلام بمپارێزی، بە راکشانەوە بە ئیسلام بمپارێزی، دوژمنو حەسوودبەرم پێ خۆش نەکەی.

## نوێژ گەورەیی خوداو بچوکی بەندە دەردەخات

نوێژ پەرستنو جۆرە پەیوەندییەکە لە نێوان خواو بەندەدا، بەندەی بێدەسەلاتو دروستکراو ئەم پەرستنە ئەنجام ئەدات، بۆ خوای نیگارکێشو بناغەدارێژی بونەوەر، هەر مانای نوێژو چۆنیەتی کردنیو وتەکانو نزاو پاڕانەوەکان و هەڵسوکەوتی ناو نوێژەکە بەندایەتی و بێدەسەلاتی مرۆڤی خواپەرست، لە هەمان کاتدا گەورەیی و کاربەدەستی و شکۆداریی خوا دەگەیەنێت.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: **"من أسبل إزاره في صلاته خيلاء فليس من الله في حل ولا حرام". صحيح**[2]واتە: هەرکەس شەرواڵەکەی لە نوێژدا بەدوای خۆیدا بخشێنێ لەبەر فیزو خۆبەگەورەزانین، لە لایەن خواوە خاوەنی هیچ حەلاڵو حەرامێك نییە.

لە تەواوی فەرزو سوننەتەکانی نوێژدا بێدەسەلاتیو زەبوونیو بێهێزیی مرۆڤ دەردەکەویو رەنگدەداتەوە، بە تایبەتی کاتێك نوێژخوێن پیرۆزترین و شکۆدارترین ئەندامی دەخاتە سەر زەوی، بەڵکو بەرزترین ئەندامی لە خۆڵ وەرئەداتو دەیخاتە سەر خاك بۆ پەروەردگار، لەو کاتەدا کە سەری نەوی کردووەو لە کڕنوش یان لە سوژدەدایە باسی گەورەییو شکۆمەندیی پەروەردگاری دەکاتو دەڵێ **"سبحان ربي العظيم"** واتە: پاكو بیگەردیی بۆ پەروەردگاری هەرە گەورەم، یان لە سوژدەدا دەڵێ: **"سبحان ربي الأعلى"**. واتە: پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم، ئەمەش لە کاتێکدا کە بەرزترین ئەندامی لاشەی کە سەریەتی لە نزمترین حاڵەتیدایە.

نوێژخوێن هەر لە دابەستنی نوێژ، بە (الله أكبر) دەست پێ دەکاتو لەگەڵ هەموو هەستانو کڕنوشو سوژدە و بەرزبوونەوەو راستبوونەوەو نزم بوونەوەیەکدا دەڵێ: **"الله**

---

[1] أخرجه إبن حبان ٩٣٠. وصحيح وصايا الرسول ج٢، ص١٧٩.

[2] أخرجه أبوداود ٦٣٧ وغيره، صحيح وصايا الرسول ج٢، ص٢٠٤.

أكبر"، واتە: خودا لە هەموو گەورەکان گەورەترە، لە هەمان کاتیشدا بچوکیو بێدەسەلاتیو بەندەیی خۆی دەسەلمێنێ.

شێخ حەسەنی بەصری (رەحمەتی خوا لێ بێ) فەرموویەتی: ئەگەر هەستای بۆ نوێژ بە ملکەچیی، بەو شێوەیە هەستە کە خوا فەرمانی پێکردووی، ئاگاداربە لامەکەرەوەو بە هەڵەدا نەچی، ئاگاداربە نەکەی خوا سەیری تۆ بکات، تۆش سەیری غەیری ئەو بکەی، نەکەی داوای بەهەشت لە خوا بکەیو پەنا بە خوا بگری لە دۆزەخو دڵیشت بێئاگابێو نەزانێ زمانت چی دەڵێ".[1]

پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە کڕنوشدا فەرموویەتی: **"خشع لك سمعي وبصري ومخي وعظمي، وما استقلت به قدمي"**.[2] واتە: بیستنمو بینینمو مۆخمو ئێسقانمو هەرچی لاقەکانم هەڵیان گرتووە ملکەچو گەردنکەچن بۆ تۆ. لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: **"من أسبل إزاره خيلاء فليس من الله في حل ولا حرام". صحيح**[3] واتە: هەرکەس شەرواڵەکەی راکێشی لە نوێژەکەیدا بە فیزو کەشخەوە ئەوە لە لای خوا حەڵاڵو حەرامی نییە.

## نوێژ ئاشتیو ئاشتیخوازییە

سەلام ناوی خوایە، لە خواوە دانراوە بۆ ئەوەی هەرکەس سەلامی لە کەسێك یان کەسانێك کرد واتە ئێوە لە لایەن منەوە سەلامەتنو چاوەڕێی هیچ زەرەرو زیانێك مەبن، ئەگەر وا نەبوو ئەوە لە درۆزنانەو لە ریزی خراپەکارانو خیانەتکاراندایە.

موسڵمان سەلامەتە بۆ زیندووەکانو بۆ مردووەکان، بۆ گیاندارو بێ گیان، بۆ دارو درەخت، موسڵمان سەلامەتەو نابی زیانی هەبێ، تەنانەت بۆ رێگەوبانو سەکۆو شوێنی حەوانەوەو پشوودانی خەڵکیش، کەسێك سەلامی کرد ئەوا سوننەتێکی کردووە، دەبێ

---

[1] صلاح الأمة ج٥، ص٥٩٨.

[2] أخرجه مسلم في حديث طويل ٧٧١.

[3] صحيح الجامع ٦٠١٢ عن إبن مسعود.

بەرامبەریش وەڵامی بدەنەوە بەڵێنی سەلامەتی پێبدەن، هەستن بە ئەرکی سەرشانیان کە واجبە.

سەلامی مزگەوت نوێژە، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) هەرکات بچوایە مزگەوت دانەدەنیشت هەتا دوو رکات نوێژی نەکردایە.

**عن أبي قتادة (رضي الله عنه)، قال: قال رسول الله ﷺ: "إذا دخل أحدكم المسجد فلا يجلس حتى يصلي ركعتين". (متفق عليه).** واتە لە ئەبی قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکیتان چووە مزگەوت با دانەنیشێ هەتا دوو رکات نوێژ دەکات".

**وعن جابر (رضي الله عنه) قال أتيت النبي ﷺ وهو في المسجد فقال: "صل ركعتين". متفق عليه.**[1] واتە: لە جابرەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: چوومە خزمەتی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) لە مزگەوت بوو، فەرمووی: "دوو رکات نوێژ بکە".

دوان لە پایەکانی نوێژ سەلامن‌و بەبێ ئەو دوو پایە یان بەبێ یەکێکیان نوێژ بەتاڵە، لە تەحیاتدا دەڵێی: **"السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته"** سەلام لە پێغەمبەر دەکەیت واتە دەستکاری دینی تۆ ناکەم، شتێك ناکەم تۆ پێت ناخۆش بێت، لە هەموو هەڵوێستێکی من سەلامەتی، لە کردارو گوفتار. دواتر دەڵێ: **"السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين"**. واتە: سەلام لە ئێمەو لەسەر بەندە چاکەکانی خوا.
نوێژخوێنان هەموو سەلام لە یەکتر دەکەن، هەر موسڵمانەو ملیۆنەها سەلامی بۆ دەچێ، هەموویان لەدەستو دەمو دڵی یەکتر سەلامەتن کە نوێژەکەی کۆتایی پێهات بە سەلام کۆتایی دێ، بە لای راستو چەپدا کە هەموو موسڵمانانو خەڵکی لای راستو چەپم لەسەرانسەری جیهاندا لە شەڕی من سەلامەتن.

**عن علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) قال: كان النبي ﷺ يصلي قبل العصر أربع ركات، يفصل بينهن، بالتسليم على الملائكة والمقربين ومن تبعهم من**

---

[1] ـ البخاري ٤٣٢ و مسلم ٧١٥ واللفظ للبخاري، ورياض الصالحين ١١٤٥.

**المسلمين والمؤمنين"**. حسن[1] واته: عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خوای لێ رازی بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە پێش عەسردا چوار رکات نوێژی دەکرد بەینی دەخستن بە سەلام کردن لە فریشتە نزیکەکانی خواو شوێنکەوتووەکانیان لە موسڵمانانو بڕواداران.

هەروەها خوا دەفەرموێت: **"وَالَّذِينَ يُمَسَّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ إِنَّا لاَ نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ"**. (الأعراف: ١٧٠). واتە: ئەوانەی پابەندو پەیوەستی قورئانن و نوێژ بە چاکیی دەکەن، بێگومان ئێمە پاداشتی ئاشتیخوازان زایە ناکەین.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا نوێژخوێنی بە ئاشتیخواز داناوە تەنانەت نەیفەرمووە پاداشتی نوێژخوێنان ئەدەمەوە، بەڵکو فەرموویەتی پاداشتی ئاشتیخوازان ئەدەینەوە، چونکە نوێژخوێنو ئاشتیخواز یەك کەسنو یەك شتن.

---

[1] ـ رواه الترمذي ٤٢٩، وقال حديث حسن. ورياض الصالحين ١١١٩.

## نوێژ مەرجو بەندی سەرەکیی بەیعەت بووە

هەرکەس وازی لە بتپەرستی دەهێنا و رووی لە ئیسلام دەکرد، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بەڵێن (بەیعەت)ی لێ وەردەگرت، بەندی سەرەکیش لە دەقی زۆربەی ئەو بەڵێننانەشدا نوێژکردن بووە.

**عن عوف بن مالك (رضي الله عنه) قال كنا عند رسول الله ﷺ سبعة أو ثمانية أو تسعة فقال: ألا تبايعون رسول الله، وكنا حديث عهد ببيعة، قلنا: قد بايعناك. حتى قالها ثلاثا، فبسطنا أيدينا فبايعناه، فقال قائل: يارسول الله انا قد بايعناك فعلام نبايعك؟ قال: أن تعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا، وتصلوا الصلوات الخمس، وتسمعوا وتطيعوا". وأسر كلمة خفية، قال: ولا تسألوا الناس شيئا، قال: فلقد كان اولئك النفر يسقط سوطه، فما يسأل أحدا أن يناوله أياه"**[1]. واتە لە عەوفی کوڕی مالیکەوە (رەزای خوای لێ بێ)، فەرموویەتی: "ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بووین، فەرمووی: ئەوە بۆ بەیعەت نادەن بە پێغەمبەری خوا، ئێمەش تازە پێکەوتبووین لەگەڵ بەیعەت، وتمان بەیعەتمان داوە، سێ جار دووبارەی کردەوە، دەستمان درێژ کردو بەیعەتمان دایە، یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بەیعەتمان پێدابووی، لەسەرچی بەیعەتت پێبدەین؟ فەرمووی: خوا بپەرستنو هاوبەشی بۆ دانەنێن، پێنج فەرزەی نوێژ بکەنو گوێ بگرنو گوێڕایەڵ بن، ئینجا بە هێواشی قسەیەکی کرد فەرمووی: داوای هیچ شتێك لە کەس نەکەن، بەڕاستیی ئەو کۆمەڵە قەمچیەکەیان لێدەکەوتە خوار داوایان لە کەس نەدەکرد بیدەنەوە دەستیان.

ئەبی مالیکی ئەشجەعی لە باوکییەوە گێڕاویەتییەوە (رەزای خوایان لێ بێ) فەرموویەتی: "کاتێك کەسێك موسڵمان دەبوو، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) یەکەم شت فێری دەکرد نوێژ بوو، یان دەیفەرموو فێری نوێژی بکەن".[2]

---

[1] ـ رواه مسلم ١٠٤٣.

[2] ـ حياة الصحابة ج٣ ص١٨٣. (قال الهيثمي رجاله رجال الصحيح ورواه الطبراني في الكبير).

## نوێژ هۆی خۆشەویستیو نزیك بوونەوەیە لە خوا

هەموو چاکەو خواپەرستییەك لە کردارو گوفتارو رەفتارو هەڵسوکەوتو تەنانەت نیازو بەرخوردی دڵو دەروونیش کە لە فەرموودەی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) هاتووە: **"...إذا أراد أن يعمل حسنة فلم يعملها فاكتبوها له حسنة.."**.[1] ئەمە بەشێکی فەرمودەکەیە، واتە: ئەگەر بەندەیەکم ویستی کردنی چاکەیەکی کرد، بەڵام نەیکرد یەك چاکەی بۆ بنووسن.

لێرەدا بە روونیی دەردەکەوێ هەر کات موسڵمانێك بەڕاستیی ویستی نوێژ بکات، بەڵام بۆی نەکرا چاکەی بۆ دەنووسرێ، ئەی ئەگەر نوێژەکەی کرد، دیارە لە یەك بە دەوە هەتا یەك بە حەوت سەد بۆی دەنوسرێ، وەکو لە بەشێکی تری هەمان فەرمودەدا هاتووە بەم شێوەیە: **"فإن عملها فاكتبوها له بعشر أمثالها الى سبعمائة ضعف"**.[2] واتە: ئەگەر ئەو چاکەی کرد کە نیازو ویستی کردنی هەبوو لە یەك بە دە هەتا یەك بە حەوت سەد بۆی بنووسن. خوا دەربارەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرمووێت: **"واسجد واقترب"**. لەسەر یەکێ لە رای توێژەرەوانی قورئانی پیرۆز ئاوا راڤە کراوە: ئەی موحەممەد نوێژ بکەو نزیك بەوە لە پەروەردگارت".[3]

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێت: **"اقرب مايكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء"**.[4] واتە: نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاریەوە لە کاتی سوژدەدایە. کەواتە زۆری تێدا بپاڕێنەوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: يقول الله تبارك وتعالى في الحديث القدسي: "وما تقرب الى عبدي بشيء أحب مما افترضته عليه ولايزال العبد يتقرب إلي بالنوافل.."**.[5] واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: خوای شکۆدارو

---

[1] ـ رواه البخاري ٧٠٦٢ ومسلم ١٢٨ واللفظ للبخاري.

[2] ـ رواه البخاري ٧٠٦٢ ومسلم ١٢٨.

[3] ـ زاد المسير ج٨ ص٢٩٣.

[4] ـ رواه مسلم ٢١٥.

[5] ـ رواه البخاري ٦١٣٧.

باڵادەست لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرمویێت: "بەندە بە هیچ شتێك ئەوەندەی نوێژە فەرزەکان لە لام خۆش نییە کە لێم نزیك دەبێتەوە، بەردەوامیش بەندە بە نوێژە سوننەتەکان لە من نزیك دەبێتەوە".

یەزیدی رەققاشی لەسەرەمەرگیدا گریاو فەرمووی: "ئینجا کێ نوێژت بۆ دەکات لە دوای خۆت ئەی یەزید، کێ رۆژووت بۆ دەگرێ؟ کێ لە خوا نزیکت دەکاتەوە؟ کێ تەوبەت بۆ دەکات لە گوناهەکانی رابردووت"[1].

## نوێژ یەکێکە لەدەرگا خێرەکان

نوێژ دەرگای خێرە کە مرۆڤ فێری هەموو جۆرە چاکەیەك دەکات لەبەر خواو بەبێ منەتو بە رووداو دانەوە، نوێژ دەرگای خێرە کە نوێژخوێنان دەگێرێتەوە لە هەموو خراپەیەك لە کردارو گوفتارو تەنانەت نیازی دڵیش، بەڵکو دەیانپارێزێ لە شتی گوماناوی و دوودڵییش.

**جاء في حديث معاذ بن جبل (رضي الله عنه)، قال: "قلت يارسول الله اخبرني بعمل يدخلني الجنة ويباعدني عن النار؟ قال: لقد سألت عن عظيم وأنه ليسير على من يسره الله تعالى عليه، تعبدالله ولا تشرك به شيئا وتقيم الصلاة وتؤتى الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت" ثم قال له ألا أدلك على أبواب الخير؟ الصوم جنة والصدقة تطفيء الخطيئة كما يطفيء الماء النار، وصلاة الرجل في جوف الليل" ثم تلا: تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ..."[2].**

واتە: موعازی کوڕی جەبەل (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم پێ بفەرموو پێی بچمە بەهەشت، دوورم بخاتەوە لە ئاگر؟ فەرمووی: بەڕاستیی پرسیارت لە کارێکی مەزن کرد، بەڵام ئاسانە بۆ کەسێك خوا بۆی ئاسان بکات، خوا بپەرستەو هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە، نوێژ بە چاکیی بکەو زەکات بدەو رۆژووی رەمەزان بگرە، حەجی ماڵی خوا بکە". ئینجا پێی فەرموو: ئەرێ دەرگای

---

[1] ـ صحيح وصايا الرسول ج٣ ص٣٩٠.

[2] ـ صحيح أخرجه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، سنن الترمذي ٢١١٠ وصحيح وصايا الرسول ج٢ ص٥٣٠.

خێرەکانت پێ بڵێم؟ ڕۆژوو قەڵغانەو خێرکردن گوناهوتاوان دەکوژێنێتەوە هەر چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، شەونوێژیش لە نیوەشەودا، ئینجا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: **"تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ.."** واتە: تەنیشتەکانیان بەرزەو دوورە لە جێگاو پێ خەفیان.

بیلالیش سەربەخۆو بەبێ فەرمانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە بانگی بەیانیدا نەیدەفەرموو: **"الصلاة خير من النوم"** واتە: نوێژ لە خەو باشترە.

## نوێژ لە خەو خێرترە

خەو یەکێکە لە ئایەتەکانو بەڵگەکانی خوای گەورە بۆ خۆشگوزەرانیو ئاسوودەیی ئادەمیزاد دروستی کردووە، بەڵام بەڵگەنەویستە نوێژکردن کە پەیوەندیی گیانو دەروونو لاشەیە بە خواوە، خەوو نوێژ خوا بۆ بەرژەوەندیی دونیاو دوارۆژی مرۆڤی داناون. بێجگە لە ئەندازەی پێویست ئەگەر باسی گەورەیی خەوو نوێژ بکەین نوێژ خێرو پاداشتی زۆرترو گەورەترە لە خەو، تەنانەت دەبێ لە خەو بخەینە سەر نوێژ، بەڵام نابێ نوێژ بفەوتێنرێت بۆ خەو.

ئەگەر بۆ نوێژ خۆی لە خەو کرد ئەوە دەبێتە خاوەنی پاداشتی هەرە گەورە، بەڵام ئەگەر نوێژی فەوتاند بۆ خەوو دەسەڵاتی خۆی تیایدا نەبوو گوناهبار نابێو هەرکات بەخەبەر هات نوێژەکەی دەکات، ئەگەر بە ئەنقەستو گوێ پێنەدان بێت گوناهبار دەبێت.

خوا لە قورئاندا وەسفی ئەو بڕوادارانە دەکات کە شەونوێژ دەکەنو لە خەویان دەخەنە سەر نوێژیانو شەو زیندوو دەکەنەوە بە خواپەرستیو دەفەرموێت: **"كَانُوا قَلِيلاً مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ"** **(الذاريات: ١٧)**. واتە: ئەوان بەشەوا کەم ئەخەوتن.

هەروەها دەفەرموێت: **"تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ..."** **(السجدة: ١٦)** واتە: تەنیشتیان دوورەپەرێزە لە پێخەفەکانیان.

پێغەمبەرەکانیش (سەلامی خوایان لێ بێ) بەشێکی زۆری شەوو خەوی خۆیان کردووە بە ڕۆژی ڕووناك بە خواپەرستیو پەنهانی لەگەڵ پەروەردگاریانو بە تایبەتیش نوێژکردن.

قال ﷺ: **"مامن امرىء يكون له صلاة بالليل فيغلبه عليها النوم الا كتب الله تعالى له أجر صلاته، وكان نومه عليه صدقة"**[1]. واته: هیچ كەسێك نییە شەونوێژی هەبێ‌و خەو زاڵ بێ بەسەریدا ئیللا خێری شەونوێژەكەی بۆ دەنووسرێ‌و خەوەكەشی بە خێر بۆ دەمێنێتەوە، خوا دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەر دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ * قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً * نِصْفَهُ أو انقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً * أو زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقرآن تَرْتِيلاً". (المزمل ١ ـ ٤)**. واتە: ئەی ئەو كەسەی كە پێخەفت بە خۆتا داوە شەو هەستە بۆ شەونوێژ كەمێك نەبێ، نیوەی شەو یان هەندێ كەمی بكەرەوە یان لێی زیاد بكەو قورئانیش بە لەسەرخۆیی‌و رەوانی بخوێنەوە.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال: "من السنة إذا قال المؤذن في اذان الفجر حي على الفلاح قال: الصلاة خير من النوم"**[2]. واتە: لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: لە سوننەتە ئەگەر بانگبێژ فەرمووی لە بانگی بەیانیدا **"حي على الفلاح"** بڵێ: **"الصلاة خير من النوم"**. واتە: نوێژ لە خەو خێرترە.

عومەری كوڕی خەتتاب پێشنوێژیی خەوتنانی بۆ خەڵكی دەكرد، ئینجا دەچووە ماڵەوە بەردەوام نوێژی دەكرد هەتا بەیانی.[3]

هەروەها عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی بە موعاویە كوڕی خودەیج "ئەگەر بە رۆژ تێر بخەوم بەردەستەكانم تیادەچن، ئەگەر بە شەویش تێر بخەوم خۆم تیادەچم، بەم حاڵە خەو چۆن دەكرێ ئەی معاویە"[4].

پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێ) بەری پێی ئاوسابوو ئەوەندەی شەونوێژ كردبوو.[5]

**قال رسول الله ﷺ "إذا بلغت حي على الفلاح فقل الصلاة خير من النوم"**.[6] **(صحيح)** واتە: پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەگەر لە

---

1 ـ صحيح الجامع ٥٦٩١ الترغيب والترهيب ٨٧٠ و ٨٧١ـ ٨٧٢.

2 ـ إبن خزيمة ٢٨٦ وقال محققه : إسناده صحيح ونضرة التقيم ج٦ ص٢٥٨٢ رقم ١.

3 ـ صحيح وصايا الرسول ج٢ ص٥٥٥.

4 ـ هەمان سەرچاوە.

5 ـ رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

6 ـ صحيح الجامع ٤٢٠ وصحيح أبي داود.

بانگدا گەیشتیە "**حي على الفلاح**" واتە رابە بۆ رزگاربوون، بڵێ: "**الصلاة خير من النوم**" واتە: نوێژ لە خەو خێرترە.

پێشەوا حەسەن بەنا (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "**دقائق الليل غالية، فلا ترخصوها بالغفلة**".[1] واتە: خولەکەکانی شەو بە نرخو گرانبەهان، بەبێ ئاگایی هەرزانفرۆشو تاڵانفرۆشیان مەکەن.

چۆن یەك نین کەسێك لە پرشنگو رۆشنایی خواناسییدا بێتو کەسێکیش لە شەوانی سپڵەییو بێباوەڕیو یاخی بووندا بێت.[2]

نەخێر چۆن یەك نین کەسێك تاریکی شەوی کردبێتە رۆژی رووناکی، نوێژو نزاو پاڕانەوەو قورئانخوێندنو خواپەرستی، لەگەڵ کەسانێك شەوی غەفڵەتو زۆر خواردنو زۆر خەوتنو تەمەڵیو بێئاگایی بەسەر دەبەن.

## نوێژ خۆشنوودییە

نوێژ وتوێژو گفتوگۆی دەمو زوبانو دەروونو گیانە لەگەڵ پەروەردگارو دروستکاری بوونەوەردا، لەگەڵ ئەوەشدا نوێژێك لەگەڵ کۆمەڵی موسڵمان بکرێ بە جەماعەت خێری بیستو حەوت نوێژی هەیە کە لە بازاڕ یانماڵەوە بە تەنها ئەنجام بدرێ، هەتا بڕوادارو نوێژخوێن هۆگرو ئالودەی ناو کۆمەڵو براو دۆستو خۆشەویستان بێت، کە تێکەڵێشیان بوو دەبێ دڵیان راگرێ.

**عن مالك بن حويرث (رضي الله عنه) قال: "قال رسول الله ﷺ من زار قوما فلا يؤمهم وليؤمهم رجل منهم"**. واتە: لە مالیکی کوڕی حویریسەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "هەر کەس سەردانی کەسانێك بکات، نابێ پێشنوێژییان بۆ بکات، با پیاوێك لە خۆیان پێشنوێژییان بۆ بکات".

**و عن إبن مسعود (رضي الله عنهما)، قال رسول الله ﷺ: "لايؤم الرجل في سلطانه، ولا يجلس على تكرمته في بيته الا بأذنه"**.[3]واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی

---

[1] (رهبان الليل ج١، ص٤٢).

[2] (رهبان الليل ج١، ص٧٩).

[3] ـ صحيح رواه مسلم ٦٧٣وأحمد ١٧١٠٤ وأبوداود ٥٨٢، وموسوعة الأخلاق الإسلامية، ج٢ ص٥٧.

مەسعودەوە (رەزای خوای لیّ بیّ) پیّغەمبەر (سەلآتو سەلامی خوای لیّ بیّ) فەرمووی: با پیّشنویّژیی نەکریّ بۆ پیاویّك لە شویّنی دەسەلآتیدا، با دانەنیشیّ لە شویّنی دیاریکراوی مالّەکەیدا، مەگەر بە مۆلّەتی خاوەن مالّەکە.

کەواتە لە نویّژدا دەبیّ دلّڕاگرتنی بەرامبەر و هەست بریندارنەکردنی دۆستو خۆشەویستانی تیا رەچاو بکریّو لەبەرچاو بگیریّ، خۆ ئەگەر وانەکریّ بیّ فەرمانییی پیّغەمبەر کراوە.

**عن إبن طاووس عن ابيه عن أبي إسرائيل قال: "دخل النبي ﷺ المسجد وأبو إسرائيل يصلي فقيل للنبي ﷺ هو ذا يارسول الله لايقعد ولا يكلم الناس، ولا يستظل وهو يريد الصيام، فقال النبي ﷺ: ليقصد وليكلم الناس وليستظل وليصم"**[1] واتە: لە ئیبن **طاوس** لە باوکییەوە لە ئەبی ئیسرائیلەوە فەرمووی پیّغەمبەر (سەلآتو سەلامی خوای لیّ بیّ) هاتە مزگەوتو ئەبو ئیسرائیل نویّژی دەکرد، بە پیّغەمبەریان وت (سەلآتو سەلامی خوای لیّ بیّ) ئەوە ئەو کەسەیە کە دانانیشیّو قسە لەگەلّ کەس ناکاتو ناچیّتە سیّبەر دەیەویّ بەڕۆژوو بیّ، پیّغەمبەر (سەلآتو سەلامی خوای لیّ بیّ) فەرمووی: "با دانیشیّو قسە لەگەلّ خەلّکیی بکاتو بچیّتە سیّبەر".

## دوعای ناو نویّژ گیرایە

نویّژ لە زمانی عەرەبیدا بە وتای "دوعاو نزایە" پیّغەمبەر (سەلآتو سەلامی خوای لیّ بیّ) فەرمانی کردووە کە موسلّمان لە نویّژداو بە تایبەتی لە سوژدەدا زۆر بپاڕیّتەوە.

**فعن فضالة بن عبيد قال: "بينما رسول الله ﷺ قاعدا اذ دخل رجل فصلي فقال: اللهم اغفر لي، وارحمني، فقال رسول الله ﷺ: عجلت أيها المصلي إذا صليت فقعدت فاحمد الله بما هو أهله، وصل علي ثم ادعه". ثم صلى رجل آخر بعد ذلك، فحمد الله وصلى على النبي ﷺ، فقال له النبي ﷺ أيها المصلي ادع**

---

[1] ـ صحيح، رجاله ثقات أخرجه أحمد في المسند ١٧٤٦١, وصححه الهيثمي. وصحيح وصايا الرسول ج٣ ص١٩.

**تجب"**[1]. واتە: لە فەزالەی کوڕی عوبەیدەوە فەرمووی وابوو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) دانیشتبوو لەو کاتەدا پیاوێك هاتە ژوورەوە نوێژی دابەست و لە نوێژەکەیدا وتی: خوایە لێم خۆش بیو بەزەییت پێمدا بێتەوە، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پەلەت کرد ئەی نوێژخوێن، ئەگەر نوێژت کردو دانیشتی بۆ (تەحیات) سوپاسو ستایشی شایستەی خوا بکەو سەڵاوات لەسەر من بدە، ئینجا بپاڕێرەوە. دواتر پیاوێکی تر نوێژی کرد سوپاسو ستایشی خوای کردو سەڵاواتی لە پێغەمبەری خوا داو (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) پێی فەرموو ئەی نوێژخوێن بپاڕێرەوە دوعات گیرایە.

لە فەرمودەیەکی تریشدا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: "لە سوژدەدا زۆر بپاڕێنەوە، چونکە لە هەموو کات نزیکترن لە خودای خۆتان".

## نوێژ رووناکییە

نوێژی راستەقینە دەبێتە هۆی رەزامەندیی خوا، هەر کەس خوا لێی رازی بیٚ ژیانی دونیاو ناوگۆڕو بەرزەخو دوارۆژی بۆ رووناك دەکات، **"وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ"**. (النور: ٤٠). واتە هەرکەس خوا نوری رووناکی نەداتیٚ نوورو رووناکی نابیٚ.

**عن أبي مالك الأشعري (رضي الله عنه)، قال رسول الله ﷺ: "إسباغ الوضوء شطر الإيمان، والحمد لله تملأ الميزان، والتسبيح والتكبير يملأ السموات والأرض والصلاة نور والزكاة برهان، والصبر ضياء والقرآن حجة لك أو عليك كل الناس يغدو فبائع نفسه فمعتقها أو موبقها"**[2]. واتە: لە ئەبی مالیکی ئەشعەرییەوە (رەزای خوای لێبیٚ) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: "دەستنوێژگرتن بە چاکیی نیوەی ئیمانە، "الحمدلله" پڕی تەرازووەکەیە، "سبحان الله والله أكبر" پڕی ئاسمانەکانو زەوییە، نوێژ رووناکییە، زەکات بەڵگەیە، خۆڕاگریی رۆشنییە، قورئان

---

[1] ـ صحيح أخرجه الترمذي وغيره صحيح الجامع ٣٩٨٨.

[2] ـ رواه مسلم ٢٢٣. صحيح الجامع ٩٢٥.

بەڵگەیە بۆت یان بەڵگەیە لەسەرت، هەموو خەڵکیی سبەینێ دەکەنەوە دەروونو گیانی خۆی فرۆشتوە، یان رزگاری کردووە، یان گرفتاری کردووە.

له کۆمەڵێ فەرمودەی تریشدا باسی ئەو نوورە هاتووە وەکو فەرمودەی ژمارە "٤٧٢ ـ ٤٧٣ ـ ٤٧٤ الترغیب والترهیب".

**وأخرجه الطبراني أن رسول الله ﷺ قال: "إذا حافظ العبد على صلاته فأقام وضوءها وسجودها والقراءة فيها قالت له "حفظك الله كما حفظتني، وصعد بها الى السماء ولها نور حتى تنتهي الى الله عزوجل فشفع لصاحبها".**[1] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەموویەتی: ئەگەر بەندەیەك نوێژەکانی بپارێزێو نەیانفەوتێنێ بە چاکیی دەستنوێژو کڕنوشو سوژدەکانی ئەنجام بدا بە جوانی قورئان بخوێنێ تیایدا، نوێژەکە پێی دەفەرموێت: خوا بتپارێزێ وەکو منت پاراست، بەرز دەکرێتەوە بەرەو ئاسمان، نورو رووناکییەکی هەیە هەتا دەگاتە لای خوای باڵادەستو شکۆدار لەوێ تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات.

زەیدی کوڕی ثابت رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: "نوێژکردنی کەسێك یان پیاوێك لە ماڵەکەیدا رووناکییە.."[2].

## نوێژکردن رێ لە حەرا مخۆریی دەگرێت

نوێژ بە خواردنی یەك گەردیلە شت یان خواردنەوەی یەك دڵۆپە ئاو، یان شلەمەنی بە ئەنقەست بەتاڵ ئەبێتەوە، ئەو شتە حەڵاڵو زوڵاڵ و رەنجی شان و عارەقی ناوچەوان بێت، یان حەرامو ماڵی هەتیوو چڵکی سەگ بێت.

نوێژخوێن دەبێ لە حەرامو گومان خۆی بپارێزێ و لە حەڵاڵیش پارێز بکات، بەڵکو نوێژخوێنی راستەقینە دەبێ پارێزو وەرع لە ئاوی شەوێ بکات.

**قال رسول الله ﷺ يؤتي يوم القيامة بأناس معهم من الحسنات كامثال جبل تهامة، حتى إذا جيء بهم جعلها الله هباء منثورا، ثم يقذف بهم في النار. فقيل**

---

[1] ـ حسن: أخرجه الطبراني في الكبير وصحيح وصايا الرسول ج٢ ص٦٩٩.

[2] ـ حياة الصحابة ج٣ ص٨٥.

**يارسول الله كيف ذلك؟ قال: "كانوا يصلون ويصومون ويحجون غير أنهم كانوا إذا عرض لهم شيء من الحرام أخذوه فأحبط أعمالهم"**[1]. واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: لە رۆژی دواییدا خەڵكانێك دێنن چاكەیان پێیە بە وێنەی چیاكانی (**تهامة**)، هەتا دەیانهێننە بەرەوە، خودا بۆیان دەكاتە تەپوتۆزی بەهەواداچوو، ئینجا فڕێ دەدرێنە ناو ئاگر! وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ وایە؟ فەرمووی: ئەوانە نوێژیان ئەدا ئەكرد، رۆژوویان دەگرت، زەكاتیان دەدا، حەجیان دەكرد، بەڵام ئەوەندە هەبوو كە شتێكی حەرام و یاساغیان لێ هەڵدەكەوت خۆیان لێنەدەپاراست، خوا هەموو كردەوەكانی پوچەڵ كردنەوە.

لە یوسفی كوڕی ئەسباتەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: ئەگەر گەنجێك خوا بپەرستێ بە چاكیی، شەیتان بە داروودەستەكەی دەڵێ وردبنەوە بزانن سەرچاوەی خۆراكی چییە، ئەگەر سەرچاوەی بژێویی حەرام بێ، شەیتان دەڵێ لێی گەڕێن با خۆی ماندوو بكاتو هەوڵ بدات هەر خۆی بەسە بۆ خۆی. خۆی بە خۆی بێت، چونكە هەوڵو كۆششو خۆماندووكردن لەگەڵ خواردنی حەرام سوودی نییە".[2]

## نوێژ نزیكبوونەوەیە لە خوا

كەسی بڕوادارو خواپەرستو خواناس بە هەموو كردارو گوفتارو هەڵسوكەوتو جموجوڵێكی ئەندازەیەك لە خوا نزیك دەبێتەوە. نوێژیش چاكترینو باشترینو گەورەترین كرداری چاكو خواپەرستییە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ قال: "... اللهم اني اتخذ عندك عهدا لن تخلفينه فانما انا بشر فأي المؤمنين آذيته، شتمته لعنته، جلدتة فاجعلها له صلاة وزكاة وقربة تقربه بها اليك يوم القيامة"**.[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خوایە من لە خزمەت تۆدا پەیمانێكم وەرگرتووە پەیمانەكەم بۆ بەرەسەر، بەڕاستیی من مرۆڤم، هەر

---

[1] ـ صحيح / أخرجه الألباني.

[2] ـ صحيح وصايا الرسول ج٣ ص١٢٦.

[3] ـ رواه البخاري ٦٣٦١ ومسلم ٢٦٠١ واللفظ له، وموسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢ ص٤١٨.

بڕواداریکم سزادا بێ، جوێنم پێدابێ، نەفرینم لێکردبێ، جەڵدم لێدابێ، بۆی بکەرە نوێژو زەکاتو نزیکایەتییەك نزیکی بکاتەوە لە تۆ لە ڕۆژی دواییدا".

لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتووە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "..**یا کعب بن عجرة الصیام جنة، والصدقة تطفيء الخطیئة والصلاة قربان**".[1] واتە: ئەی کەعب کوڕی عوجرە، ڕۆژوو قەڵغانە، خێرو سەدەقە گڕوتینی گوناهەکان کپ دەکاتەوەو نوێژیش نزیك بوونەوەیە لە خوا.

**قال الحسن (رحمه الله): "إذا نام العبد صالح أباهی الله به الملائکة یقول انظروا الی عبدي یعبدني وروحه عندي وهو ساجد"**.[2] واتە: شێخ حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەگەر بەندەی خواپەرست لە سوژدەدا خەوی لێ کەوت خوا شانازی دەکات بەسەر فریشتەکانداو دەفەرموێت لەو بەندەی من وردبنەوە گیانو ڕۆحی لای منەو خۆشی لە سوژدەدایە.

خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: "**وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ**"[3] واتە: نوێژ بکەو نزیك بەوە لە خوا.

**روى الترمذي والحاکم مرفوعا.. "علیکم بقیام اللیل، فانه دأب الصالحین قبلکم، وهو قربة الی ربکم، ومکفرة للسیئات، ومنهاة عن الأثم"**.[4] واتە: ئاگاداربن! شەونوێژ بکەن، بەڕاستیی ڕەفتاری پیاوچاکانی پێش ئێوەیە، نزیکبونەوەیە لە پەروەردگارتان، سڕەرەوەی خراپەکانەو قەدەغەکەری گوناهە.

## بە نوێژو خوا پەرستی پێش شەهید چووە بەهەشت

لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵاوە گێردراوەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "دوو پیاو لە تیرەی (بلی) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)و هەردووکیان موسڵمان بوون، یەکێکیان زۆر زیاتر هەوڵی ئەداو جیهادی دەکرد

---

[1] ـ صحیح رواه أحمد ١٥٣١٩. وصحیح وصایا الرسول ج٣، ص٣٢٧.

[2] (رهبان اللیل ج١، ص٤٣٦).

[3] ـ سورة العلق.

[4] ـ الترغیب والترهیب ٩٠٧، حسن لغیره و ٩٠٨ عن سلمان/ حسن، وصحیح الجامع صحیح بلفظ آخر.

لەوی تریان هەتا جارێك چووە غەزاو شەهید بوو، ئەوی تریان ساڵێك دوای ئەو ژیا ئینجا مرد، تەلحە فەرمووی: لەخەودا بینیم، من لە لای دەرگای بەهەشت بووم، ئەو دوو پیاوەش لەوێ بوون، کەسێك لە بەهەشت هاتەدەرو ڕێگەی ئەوەیانیدا بچێتە ژوورەوە کە درەنگتر مردبوو، بە مردنی خۆی مرد، ئینجا هاتە دەرو ئیزنی شەهیدەکەشی دا بچێتە ژوورەوە، ئینجا گەڕایەوە وتی بە من: تۆ بگەڕێرەوە، تۆ جارێ کاتت نەهاتووە، تەڵحە بەیانیی خەوەکەی بۆ خەڵکیی دەگێڕایەوە، زۆریان پێ سەیر بوو، ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، بۆیان گێڕایەوە، فەرمووی: **"لە چی سەرتان سوورِ دەمێنێ؟!!"**.

ئایا ئەمەیان ساڵێك دوای شەهیدبوونی ئەو نەمایەوە؟!! وتیان بەڵێ، فەرمووی: گەیشتەوە رەمەزانو بەڕۆژوو بوو، ئەوەندە نوێژی کردو ئەوەندە سوژدەی برد لە ساڵەکەدا، وتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: دەی ئەوە نێوانیان زیاترە لە نێوانی ئەرزو ئاسمان.[1]

بۆیە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەد لەسەرەمەرگدا گریاو فەرمووی: **"**دەستی شکاوم**"**، داخەکەم بۆ ڕۆژوو و نوێژ، ئیتر بەردەوام قورئانی خوێند هەتا مرد.[2]

**وعن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: "كان رجلان من بلى حي من قضاعة، أسلما مع رسول الله ﷺ، فاستشهد أحدهما، واخر الآخر سنة. قال طلحة بن عبدالله: فرأيت المؤخر منها أدخل الجنة قبل الشهيد، فتعجبت لذلك، فاصبحت ذكرت ذلك للنبي ﷺ. فقال رسول ﷺ اليس قد صام بعده رمضان، وصلى ستة آلاف ركعة وكذا وكذا صلاة سنة".** واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دوو پیاو لە "بلى" کە ئاوەدانییەکی قوزاعە بوو، موسڵمان بوون لەگەڵ پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ)و یەکێکیان شەهید بوو، ئەوی تریان ساڵێك لە دوای ئەو مرد، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا فەرمووی لە خەوا ئەوی درەنگ مرد بینیم لە پێش شەهیدەکەدا چووە بەهەشت، لەوە سەرسام بووم، بەیانی گێڕامەوە بۆ پێغەمبەر

[1] ـ صحيح وصايا الرسول ج٣، ص٣٨٩.

[2] ـ صحيح وصايا الرسول ج٣، ص٣٩٠.

(سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بیّ) ئەویش فەرمووی: ئەی ساڵێك لە دوای ئەو بەرۆژوو نەبوو، ئەی لە دوای ئەو شەش هەزار ركعات نوێژو ئەوەندە و ئەوەندە نوێژی سوننەتی نەكرد ؟![1]

## نوێژ چاو پاراستنە لە سەیركردنی حەڵاڵو حەرام

لە نوێژدا سوننەتە نوێژخوێن سەیری شوێنی سوژدەكەی بكات، واتە شوێنی ناوچەوانی لە سوژدەدا، سەیركردنی ئەم لاو ئەولا لە نوێژدا پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ)و ڕێگەی لێگیراوە. هەروەها سەیركردنی سەرەوەو چاو بەرزكردنەوە بەرەو ئاسمان قەدەغەیەو پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) نەهیی لێ كردووە.

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "ما بال أقوام يرفعون أبصارهم الى السماء في صلاتهم! فاشتد قوله في ذلك، أو ليتخطفن أبصارهم".**[2] واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرموویەتی: پێغەمبەی خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بێت) فەرموویەتی: بۆچی كەسانێك هەن لە نوێژەكەیاندا چاویان بەرز دەكەنەوە بۆ ئاسمان؟ ئیتر لەم بارەیەوە زۆر بە توندی دوا، هەتا فەرمووی: دەبێ واز لەوە بێنن یان خوا چاویان كوێر دەكات.

## پێغەمبەر سوپاسی خودای كرد لەسەر نوێژی ئوممەتەكەی

تەواوی پێغەمبەرەكان (درووديان لەسەر بێت) بە كاری چاكو كرداری جوانو ڕەفتاری شیرینی ئوممەتو گەلەكەیان دڵخۆشو دڵشاد بوون، پێغەمبەری خواش (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێت: شانازیی دەكەم بە زۆریی ئوممەتەكەم لە ڕۆژی دواییدا. لەم فەرمودەیەشدا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) كەیفخۆشو دڵشادە بە بینینی ئوممەتەكەی لە ئەنجامدانی چاكترین جۆری خواپەرستی لە جوانترین دیمەندا.

---

[1] ـ صحيح، سنن إبن ماجه ٣١٨٥. صحيح وصايا الرسول ج٣ن ص٣٨٨.

[2] ـ رواه البخاري ١٩٤، ورياض الصالحين ١٧٥٤.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: "فتح رسول الله ﷺ باباً بينه وبين الناس، أو كشف سترا فإذا الناس يصلون وراء أبي بكر، فحمد الله على ما رأى من حسن حالهم، ورجاء أن يخلفه الله فيهم بالذي رآهم.."**[1] واته: له عائیشەوه (ڕەزای خوای لیّ بیّ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بیّ)، دەرگایەکی کردەوه کە لە نیوان خۆیو خەڵکیدا بوو، یان پەردەیەکی لابرد لەو کاتەدا خەڵکیی نوێژیان دەکرد لە دوای ئەبوبەکرەوە، پێغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بیّ) سوپاسی خوای کرد کە بەو شێوەیە جوانو ڕێكو پێکە، ئوممەتەکەی بینی بە ئومێدی ئەوەش کە لە دوای خۆی بەو شێوە دەبن کە بینیویەتی..

## خودا فەرمان دەکا بە پشتبەستن بە نوێژ

نوێژ کە پەیوەستبوونی گیانە بە خواوە، دەبێتە هۆی یادی خواو پشت بەستن بە خواو پەناو هانا بردن بۆ خواو لەگەڵ خوابوون، لە ژیانو مردن، لە نوێژو قوربانی کردندا، لە تەواوی وردو درشتی ژیاندا، نوێژخوێن پشت ئەستووره بە خوا، خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: **"وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ"** **(البقرة: ٤٥)**. واته: پشت بە خۆگرىو نوێژ ببەستنو پشت ئەستوور بن پێیان.

پێغەمبەری خواش (سەلاّتو سەلامی خوای لیّ بێت) لە هەموو تەنگانەو دووچاربوونێکدا بە داوی هەر گیروگرفتێك پەنای وەبەر نوێژ دەبرد، نوێژی دادەبەست.

لە کاتێکیشدا موسڵمانێك دەمرێتو بەرەو ژیانێکی تازەو بەرەو گۆڕی تەنگو تاريكو پرسیاری تاقیکردنەوەی فریشتەکان دەچیّو خۆشی دەستی لە دونیا بڕاوەو هیچ هاناو هاوارێکی نەماوەو ناشتوانیّ هیچ کارێکی خێرو هیچ جۆره نزاو پاڕانەوەو پەرستشێك ئەنجام بداتو بیکاتە فریادڕەس، بۆیە دۆستو خۆشەویستانو دڵسۆزانی نوێژی لەسەر دەکەنو بۆی دەکەنە تکاو نورو ڕووناکیو ئاسانکاریو فریادڕەس بۆ ئەو هەموو تەنگانەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەوەش فەرمانی خوایە کە نوێژ بکەینە تکاکار بۆ مردووەکانمان، چونکە دەستیان لە دونیا ترازاوەو پەنا وەبەر

---

[1] ـ صحيح. صحيح سنن إبن ماجة. ١٣١٠. وسلسلة الأحاديث الصحيحة ١١٠٦ وقال الألباني صحيح بشواهده. وصحيح وصايا الرسول ج٣، ص٦١٢.

چڵەپوشێکیش دەبەن. پێغەمبەریش لە کاتێکدا گیروگرفتو پەرچێك رووبەڕووی دەبووەوە پەنای دەبردە بەر نوێژکردن.

## نوێژ بەزەیی و میهرەبانییە

زۆرجار پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە نوێژدا پەلەی دەکرد، کە گوێی لە گریانی منداڵ بوایە. هەروەها فەرمانی کردووە بە پێشنوێژەکان کە حاڵی پیرو پەککەوتەو نەخۆشو دەردەدارو ژنی شیردەر، کە منداڵی شیرەخۆری بەجێهێشتبێ لەبەرچاو بگرنو لە نوێژەکەدا پەلە بکەنو لە نوێژەکەشدا بەزەییان بجوڵێ بەو کەسانەی لە ژێر فەرمانیدان.

**قال رسول الله ﷺ: "انی لأدخل في الصلاة، وأنا ارید أن أطیلها فأسمع بكاء الصبي، فأتجوز في صلاتي، مما اعلم من شدة وجد امه ببكائه".**[1] صحیح عن أنس. واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "من هەندێ جار دەچمە ناو نوێژەوەو نوێژ دادەبەستم و دەمەوێ نوێژەکە درێژ بکەمەوە، لەو کاتەدا گوێم لە گریانی منداڵ دەبێ، پەلە دەکەمو نوێژەکە کورت دەکەمەوە، چاك دەزانم کە دایکی چۆن دڵی لایەتیو پەرۆشی گریانەکەیەتی".

**وقال ﷺ: "إني لأسمع بكاء الصبي، فأتجوز في الصلاة".**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بەڕاستیی کە گوێم لە گریانی منداڵ دەبێ نوێژەکەم کورت دەکەمەوە".

**عن جابر (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "یا معاذ أفتان أنت؟ فلولا صلیت ب(سبح أسم ربك الأعلى) (والشمس والضحاها)، و(والليل إذا يغشى)، فانة يصلی وراءك الكبير والضعيف وذو الحاجة". صحیح**[3] واتە: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی موعاز ئەرێ تۆ فەوتێنەری؟ خۆزگە کە نوێژت کرد سوڕەتی **"سبح إسم ربك الأعلى"** یان

---

[1] ـ صحیح الجامع ٢٤٧٨ء ٢٤٩٣ بلفظ آخر. والجامع الصحیح من احادیث النساء ص١٠٨.

[2] ـ صحیح، صحیح الجامع ٢٤٨٤.

[3] ـ صحیح الجامع ٧٩٦٦.

**"والشمس وضحاها"**، یان **"والليل إذا يغشى"** بخوێندایە، بێگومان گەورەو بە تەمەنو لاوازو خاوەن ئیش لە دواتەوە نوێژ دەکەن.

## نوێژکردن چاوکردنە لە پێغەمبەر

کاتێك کە نوێژ فەرز کراوە لەسەر موسڵمان خەڵکانی دەوری پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نەیانزانیوە بە پەیڕەوی دینی تازە چۆن نوێژ بکەن، بۆیە داوایان لە پێغەمبەر کردووە کە چۆن نوێژ بکەن؟ چۆن فەرمانی خوا جێبەجێ بکەن؟ پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) پێی فەرموون: **"صلوا كما رأيتموني أصلي"**. واتە: "نوێژ بکەن هەر چۆن من دەبینن نوێژ دەکەم".

خوای گەورەش دەفەرموێ: **"لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ.."** **(الأحزاب: ٢١)**. واتە: "بۆ ئێوە لە پێغەمبەری خوادا چاکترین سەر مەشق هەیە".

هەردوو دەقی فەرمودەکەی پێغەمبەرو دەقی ئایەتەکە بەڵگەن لەسەر چاولێکەری و هەڵگرتنی شوێنپێی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە هەموو کارو کردارو گوفتارێکدا، بە تایبەتیش لە نوێژکردندا کە گەورەو سەرداری هەموو کردەوە چاکەکانە.

ئەگەر کەسێك سەدان هەزار رکات نوێژ لەبەر خواو بۆ خوا بکات، بەڵام بە گوێرەی شەرعی خوا بە چاولێکەری پێغەمبەری خوا نەبێت، لێی وەرناگیرێت.

هەر لەو دیدی چاولێکەریی‌و شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) دە کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) خەڵاتی **(عشرة المبشرة)** دە کەسە مژدە پێدراوەکەیان پێبەخشرا، لەناو نوێژدا کاتێ رووگە لە قودسەوە گۆڕا بۆ مەککە. پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ناو نوێژدا رووی وەرگێڕا بەرەو مەککەو ئەو دە کەسەش لەگەڵیدا روویان وەرگێڕا، هەر لەوێدا دەستبەجێ مژدەی بەهەشتیان پێدرا، چونکە بوونە رەمزی گوێڕایەڵی‌و چاولێکەری سوننەتو رەویەی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ).

کاتێکیش پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) لە جێی چوار رکات نوێژی نیوەڕۆ دوو رکاتی کردو سەلامی دایەوە هەموو ئەو هاوەڵانەی نوێژیان لە دوواوە دەکرد

لەگەڵیدا سەلامیان دایەوەو پاشان بە دواداچوونو لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردو پرسییان ئایا نوێژی نیوەڕۆ بۆتە دوو رکات ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، دوو رکاتی تری کرد.

بەپێوە وەستان پایەی سەرەکی نوێژە، کەسێك بتوانێ بە پێوەو بە راوەستانەوە نوێژ بکات، بەڵام بە ئەنقەست بە دانیشتنەوە یان بە راکشانەوە نوێژەکەی بکات لێی وەرناگیرێو بەتاڵەو لەسەریشی گوناهبار دەبێ.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"أني قد بدنت، فان ركعت فاركعوا، وإذا رفعت فارفعوا، وإذا سجدت فاسجدوا، ولا الفين رجلا سبقني الى الركوع ولا الى السجود"**.[1] واتە: من سەنگین بووم، ئەگەر کڕنوشم برد، کڕنوش بەرن، کە هەستامەوە، هەستنەوە، ئەگەر سوژدەم برد، سوژدە بەرن، کەیفم بە کەسێك نایەت بۆ کڕنوشو سوژدە پێشم کەوێ.

## نوێژ وزەو چالاکیی لاشەو گیانە

تەواوی پایەو سوننەتو فەرزەکانی نوێژ جولانو وەرزشو چوستو چالاکییە بۆ هەردوو بەشی پێکهاتەی ئادەمیزاد، کە لاشەو گیانە. نوێژخوێن لاشەی دەجولێ بە هەموو بەشەکانییەوە، بەپێوە دەوەستێ، کڕنوش دەبات، سوژدە دەبات، دڵو گیانیشی زیندوو و بە ئاگایە، بیروهۆشو ئەندێشەی لە کاردایە. کەسی چوستو چالاكو لەش سووك و رۆح سووك لە گەرمەی خەو و لە تاریکی شەودا جێگەی گەرمو نەرمی خۆی واز لێدێنێو بەوپەڕی گڕوتینەوە دەستنوێژ دەگرێو رووی دڵو گیانو لاشەی دەکاتە خوا، لە کاتێکدا خەڵکیی لە گەرمەی خەودانو بێئاگان لە شەوبێدارانو شەونخونیکێشان. بۆیە کەسێك وەنەوزو خەونوچکە گرتی، نابێ نوێژ بکات، بەڵکو دەبێ پشوو بداتو بخەوێو دواتر نوێژەکەی بکات.

**عن عائشة (رضي الله عنها)، أن النبي ﷺ، قال: "إذا نعس أحدكم وهو يصلي فليرقد حتى يذهب عنه النوم، فان احدكم إذا صلي وهو ناعس لايدري لعله يذهب**

---

[1] ـ صحيح ـ صحيح الجامع ٢٤٧١.

**يستغفر فيسب نفسه"**.[1] واته: له عائيشه‌وه (ره‌زای خوای لێ بێ) پێغه‌مبه‌ری خوا (سه‌لامی خوای له‌سه‌ربێ) فه‌رموویه‌تی: "ئه‌گه‌ر یه‌كێكتان له‌ نوێژدا وه‌نه‌وزی كرد، با بخه‌وێ هه‌تا خه‌وه‌كه‌ی به‌ری ئه‌دات، چونكه‌ ئه‌گه‌ر یه‌كێكتان به‌ خه‌والوویی نوێژ بكات له‌وانه‌یه‌ بڕوات له‌ جیاتی داوای لێخشبوون جوێن به‌ خۆی بدات".

له‌ فه‌رموده‌یه‌كی تری سه‌حیحدا پێغه‌مبه‌ر (سه‌ڵات‌و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر) ده‌فه‌رموێت: **"إذا نعس أحدكم وهو يصلي فلينصرف فلينم، حتى يعلم مايقول"**.[2] واته: ئه‌گه‌ر یه‌كێكتان له‌ نوێژدا خه‌و بردییه‌وه‌، بابڕوات بخه‌وێ‌و هه‌تا بزانێ چی ده‌ڵێ، دواتر نوێژه‌كه‌ی بكات.

ئه‌گه‌ر له‌ كاتی وتاری هه‌ینیشدا خه‌وی هات ده‌بێ شوێنه‌كه‌ی بگۆڕێ‌و جێگۆڕكێیه‌ك بكات هه‌تا خه‌وه‌كه‌ی بڕه‌وێ.

**قال رسول الله ﷺ: "إذا نعس أحدكم يوم الجمعة فليتحول الى مقعد صاحبه وليتحول صاحبه الى مقعده". صحيح**[3] واته: پێغه‌مبه‌ری خوا (سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێ)، فه‌رموویه‌تی: "ئه‌گه‌ر یه‌كێكتان رۆژی هه‌ینی خه‌و بردییه‌وه‌ با بچێته‌ جێی هاوڕێیه‌كی‌و هاوڕێكه‌شی بێته‌ جێی ئه‌و".

هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت: **"ليصل أحدكم نشاطه، فإذا كسل أو فتر فليقعد"**. واته: هه‌ر كه‌سێكتان نوێژی كرد با به‌ چوست‌و چالاكیی بیكات، ئه‌گه‌ر ته‌مه‌ڵ بوو یان په‌كی كه‌وت با دانیشێ.[4]

## نوێژ توێشووی بانگخوازانه

خوای گه‌وره‌ به‌رنامه‌و نه‌خشه‌ی په‌روه‌رده‌یی‌و خۆسازدانی بۆ بانگه‌وازو هه‌ڵگرتنی كۆڵی سه‌نگین و گرانی بانگه‌وازو پێشه‌وایه‌تی كردنی مه‌ردومی بۆ پێغه‌مبه‌ری خۆی كێشاوه‌، كه‌ هه‌ڵگری په‌یامی خوداو به‌رنامه‌ی رزگاریخوازی ئاده‌میه‌كان ده‌بێ به‌ دڵی

---

[1] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٨١٠ ومختصر صحيح مسلم ٣٨٦. وصحيح أبي داود ١١٨٣.

[2] ـ صحيح الجامع الصغير وزيادته ٨١٢.

[3] ـ صحيح الجامع ٥٤٥٥

[4] ـ صحيح الجامع ٥٤٥٥

قایمو پتەوو گیانی پۆڵاییەو پەیوەست بە خوا بناغە دارێژێ، دەبێ بانگخوازان شەویشیان هەر رۆژ و زیندو بێ، کاتێك خەڵکیی لە گەرمەی خەودان دەبێ بانگخواز سەنگەر چۆڵ نەکاتو نیگابان بە هەست و زیندوو و بە ئاگا بێت وەکو خوا لە زمانی حەزرەتی نوحەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: **"إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً"**. واتە: بەڕاستیی بانگەوازی گەلی خۆم کرد بە رۆژ و بە شەو.

ئەگەر خەڵکانێ بە ئاگا بوون، دەبێ بە شەو بانگەواز بکەن هەتا بیانویان نەبێت، ئەگەر خەڵکیش هەموو لە گەرمەی خەودا بوون ئەو بە خەبەر بێت بە رۆحو گیانو لاشە گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگاری خۆی بکات و غەرقی عەشقی خودایی بێت. خوا دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ * قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً * نِصْفَهُ أَو انقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً"**. **(المزمل ١ ـ ٣)**. واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆی لە پێخەفدا داپۆشیوە هەستە بۆ شەونوێژ مەگەر کەمێك لە شەو نەبێت نیوەی شەو یان تۆزێ کەمتر.

سەیید (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بە پێغەمبەر وترا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) هەستە، هەستا زیاتر لە بیست ساڵو پشووی نەدا، بۆ خۆی نەژیا، بۆماڵو خێزان نەژیا، بەڵکو هەر بە پێوە بوو، لەسەر پێ وەستا لە پێناو بانگەوازی خواییدا". [١]

**قال الفضيل بن عياض: "إنا غربت الشمس فرحت بالظلام لخلوتي بربي، وإذا طلعت حزنت له لدخول الناس علي".**[٢] واتە: فوزەیلی کوڕی عیاض (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: کاتێك خۆر ئاوا دەبێ، دڵخۆش دەبم بە تاریکی کە لەگەڵ پەروەردگارم هاودەم دەبم، خەڵوەتی لەگەڵدا دەکێشم، کاتێکیش خۆر هەڵدێ دڵتەنگ دەبم بە هاتنی خەڵکیی بۆ لام.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنذِرْ" (المدثر ١ ـ ٢)**. واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت لە پێخەفدا داپۆشیوە هەستەو یەکسەر بانگەواز بکەو خەڵکی ئاگادار بکەرەوە.

---

[1] ـ الجامع الصحيح من أحاديث النساء ص٤٤٦.

[2] ـ الجامع الصحيح من احاديث النساء ص٢٤٢.

سەعیدی کوڕی عامیر جومەحیش لە مەحکەمەی عومەری کوڕی خەتتابدا فەرمووی: ڕۆژم داناوە بۆ بەینی خۆم و بەندەکانی خوا، شەویشم داناوە بۆ بەینی خۆمو پەروەدگارم.

## نوێژ ئامادەباشییە بۆ جیهادو خەبات

لە قۆناغەکانی بانگەوازی پێغەمبەردا (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ) هەرگیز نەبینراوە داوای جیهادو خەباتو سەنگەر گرتن کرابێ لە پێش نوێژدا مەگەر کەسانێکی ناوازە.

هەموو دەقی بەڵێنو پەیمانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لە هاوەڵانی وەرگرتووە ئەگەر باسی نوێژی تیادا بووبێ لە پێش جەنگو جیهادا باسکراوە. خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: **"أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إذا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللّهِ أو أَشَدَّ خَشْيَةً..". (النساء: ٧٧)**. واتە: ئایا تۆ ئەوانەت نەبینی کە پێیان وترا هەتا لە مەککەن دەست بپارێزنو دەست مەوەشێننو نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەنو زەکات بدەن.. ئەوانەی پەلەی جیهادیان بوو نوێژیان زۆر بە لاوە گرنگ نەبوو ئەوەندە لە دوژمن دەترسان ئەوەندە لە خوا نەدەترسان.

لە تەواوی ئەو فەرموودانەشدا کە باسی نوێژو جیهاد بە یەکەوە کرابێ، باسی نوێژ لە پێشترا کراوە.

بابای موجاهیدو خەباتگێڕ دەبێ پەروەردە کرابێ بە پەروەردەی ئیسلامو پێغەمبەری ئیسلام (سەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت). حەتمەن دەبێ مەشقی لەسەر خواناسیی کردبێت، لەناو نوێژەکەیدا دڵو دەروونی پەیوەستی خوا کردبێتو خۆی یەکلا کردبێتەوە بە وتنی **(إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) (الفاتحة: ٥)** واتە: خودایە هەر تەنها تۆ دەپەرستمو هەر تەنها پشتو پەنام بە تۆ دەبەستم. دەبێ لە نوێژەکەیدا بەڵێنی هەڵبژاردنو پابەندبوونی دابێ لە ناخی دڵو دەروونیەوە بە ڕێبازی پێغەمبەرانو بە ڕاستدانەرانو شەهیدانو پیاوچاکان **(اهدِنَ ـ ـ ـ ـ ا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ * صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ....). (الفاتحة: ٦ ـ ٧)**. واتە: خودایە دامەزراوو ڕاوەستاوم کە لەسەر ڕێگە ڕاستەکە، کە ڕێگەی پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکانە.

هەروەها دەبێ لە نوێژەکەدا بڵێ: "... **غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ**". **(الفاتحة: ٧)** واتە: نەخەیتە سەر ڕێگەو ڕێبازی ئەوانەی خەشمو قینت لێ گرتوون کە جولەکەکانن، هەروەها ڕێگەی ئەوانەی گومڕابوون کە گاورەکانن. کەواتە دەبێ موجاهید لە پێشدا بە خواپەرستی گۆش کرابێ، بە تایبەتی نوێژ کە هەموو واتاو سیفاتی موجاهیدو خەباتگێڕی تێدایە.

**قال رسول الله ﷺ: "رأس الأمر الإسلام وعموده الصلاة، وذروة سنامه الجهاد". رواه احمد.** واتە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: سەری کارو فەرمان ئیسلامەو کۆڵەکەو موراغەی پشتی نوێژە، چڵەپۆپەکەی جیهادە.

**وجاء في رواية الإمام أحمد: "والذي نفس محمد بيده ما شحب وجه ولا أغبرت قدم في عمل يبتغي به درجات الجنة بعد الصلاة المفروضة كالجهاد في سبيل الله عز وجل".** واتە: لە ریوایەتی پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) هاتووە: "سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە هیچ روخسارێ خۆڵاوی و هیچ پێیەك تۆزاوی نەبوو لە کارێکدا کە لە پێناوی بەرز بوونەوەی پلەی بەهەشت لە دوای نوێژە فەرزەکان کرابێ وەکو جیهاد لە ڕێی خوادا خێر بێت".[١]

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) أن رجلا أتى النبي ﷺ، فسأله عن افضل الأعمال، فقال النبي ﷺ: الصلاة، قال ثم مه؟ قال: ثم الصلاة. قال ثم مه؟ قال: ثم الصلاة. ثلاث مرات. قال: ثم مه؟ قال: ثم الجهاد في سبيل الله.**[٢] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) پرسیاری باشترین کرداری لێکرد، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: نوێژ. وتی: ئینجا چی؟ فەرمووی: ئینجا نوێژ. فەرمووی ئینجا چی؟ فەرمووی: ئینجا نوێژ. وتی ئینجا چی؟ فەرمووی: ئینجا جیهاد لە ڕێگای خوادا.

---

[1] ـ صحيح وصايا الرسول ج٢، ص٥٣٩.

[2] رواه أحمد وإبن حبان في صحيحه ١٧٢٢ كتاب فضل الصلاة ص٤١.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "منتظر الصلاة كفارس اشتد به فرسه في سبيل الله على كشحه وهو في الرباط الاكبر".**[1] واته: له ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (سەلاٌتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی ئەو کەسەی چاوەڕێی نوێژێ دەکات وەکو سوارچاکێك وایە کە ئەسپەکەی ببەستێتەوەو لە پێناوی خوادا. لەسەر رێ بێ لە جیهادی هەرە گەورەداو بە پشتی رووتو بەبێ زین سوار ئەسپەکەی بووبێت.

## نوێژ هێزو شکۆدارییە

خوای کردگار خۆی هێزو توانای دروستکردووەو بەخشیویەتی بە دروستکراوەکانی، بە تایبەتی بە ئادەمیزادەکان. پێغەمبەری خواش (سەلاٌتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضعيف"**. واتە: بڕواداری بەهێز چاکترو خۆشەویستترە بە لای خواوە لە بڕواداری بێ هێز.

خوای گەورەش دەفەرموێت: **"وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ"**. واتە: دەسەلاٌتو شکۆداری بۆ خواو پێغەمبەرەکەیو بڕوادارانە.

نوێژ، بڕوادار پەروەردەی هێزو دەروونبەرزی و گەردنبلٌندی دەکات، فێری دەکات تەنها ملکەچو گەردنکەچو چاو لەبەری خوا بێ، بۆ غەیری خوا زەلیلی بە کوفرو بێباوەڕی بزانێ. پێشەوا شافیعی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت:

**همتي همة الملوك ونفسي  نفس حر ترى المذلة كفرا**

واتە: ورەم وەکو ورەی پاشاکان بەرزەو دەروونیشم دەروونێکی ئازادەو زەلیلی بە کوفرو بێباوەڕیی دەزانێ.

خوا دەربارەی نوێژکردنی بڕواداران لە کاتی جیهادو سەنگەرو گەرمەی جەنگدا دەفەرموێت: **"وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِن وَرَائِكُمْ وَلْتَأْتِ طَائِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّوا فَلْيُصَلُّوا مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ**

---

[1] رواه احمد ٨٦١٠ والطبراني في الأوسط، وفضل الصلاة ص٤٢. والترغيب والترهيب، ٦٣٤ حسن.

فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَو كُنتُم مَّرضَي أَن تَضَعُواْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ اللّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَاباً مُّهِيناً". (النساء: ١٠٢). واته: ئەگەر تۆش لە سەفەر لەگەڵیاندا بوویو خۆت نوێژت بۆ دابەستن، با هەندێکیان لەگەڵ تۆدا گوێ لەسەر هەستو بە چەکەوە نوێژ دابەستن، ئەگەر سوژدەیان برد ئەو رکاتەیان تەواو کرد با ئەو دەستەی تر کە پاسەوانیان دەگرن لەگەڵ تۆدا نوێژەکەیان بکەن بە ئاگاداری و بە چەکەوە، بێبڕواکان دەیانەوێ و بە ئارەزوون ئێوە ئاگاتان لە چەكو کەرەسەو کەلوپەکانتان ببڕێ لە پڕ پەلامارتان بدەن، ئەگەر باران سەغڵەتی کردن یان نەخۆش بوون گوناهبار نابن چەکەکانتان دابنێن، بەلاَم هەردەبێ هۆشیارو گوێ لەسەر هەست بن، بەڕاستیی خوا بۆ بێبڕواکانی ئامادەو ساز کردووە سزای ریسواکەرو ئابڕوبەر.

لەم ئایەتەدا باس لەوە دەکات کە بڕواداران لە کاتی نوێژداو لەناو نوێژیشدا نابێ چەك دابنێنو نابێ بێئاگابن.

باوەڕدار خاوەنی عیززەتو شکۆدارییە، بۆیە خوا دەفەرموێت: "وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ". واتە: دەسەڵاتو شکۆداری تەنها بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و باوەڕدارانە.

تاکە خواپەرستییەکیش کە باوەڕدارو بێ باوەڕ لێك جیادەکاتەوە نوێژە وەکو لە فەرمودەی راستو دروستو سەحیحی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) هاتووە.

## نوێژکردن خێری جیهادکردنی هەیە

نوێژکردن کە ئامادەباشییە بۆ جیهاد بۆ پەروەردە کردنی دەروونی خەباتگێڕان هەتا زیاتر چەسپاوو دامەزراو بنو لە رووبەڕووبوونەوەداو لە سەنگەری بەرامبەر دوژمندا ببنە چیای سەرکەشو پۆڵایین. خوا دەفەرموێت: "أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللّهِ أَو أَشَدَّ خَشْيَةً.." (النساء: ٧٧). واتە: ئایا نەتڕوانیو وردنەبوویەوە لەوانەی کە پێیان وترا دەست بپارێزن کاتی جەنگ نییە، بەڵکو جارێ

هەر نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن، کاتێکیش جەنگیان لەسەر پێویست کرا دەستەیەکیان لە خەڵکیی دەترسان بەو ئەندازەی کە لە خوا دەترسان، بەڵکو زیاتریش..

ئەمانەش ئەو کەسانە بوون کە مەشقی پەروەردەی گیانی‌و دەروونییان زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو، هەر هەڵپەو پەلەی جەنگ‌و جیهادیان بوو. بۆیە دەبینین چەند ساڵ پێش فەرزبوونی جیهاد نوێژ فەرز بووەو مەشقی رۆحی‌و دەروونیی لەسەر کراوە لە لایەن پێغەمبەر و هاوەڵەکانیەوە (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەربێت)، دواتریش لە مەیدانی جەنگ‌و خەبات‌و جیهادا نوێژیان واز لێنەهێناوە، بەڵکو جەماعەتیشیان واز لێنەهێناوەو خوای گەورە ئاسانکاریی بۆ کردوون لە کردنی نوێژەکانیاندا، بەڵام بە هیچ جۆر مۆڵەتی نەکردنی نەداون.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "منتظر الصلاة كفارس اشتد به فرسه في سبيل الله على كشحه، وهو في الرباط الأكبر".** حسن.[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: چاوەڕوانکاری نوێژ وەکو ئەو کەسەیە ئەسپەکەی بەستبێتەوە لە پێناوی خوادا، ئامادەباش‌و پێ لەسەر زین بێت بۆ جیهاد، چۆن بە پشتی رووتی سواری ئەسپەکەی بێت‌و غاری پێبکات، ئەوە لە جیهادی هەرە گەورەدایە.[2]

چونکە ئەو کەسەی جیهادی هەرە گەورە دەکات دەبێ لەوەوپێش پەروەردەکرابێ بە مەشقی دەروونیی‌و گیانیی‌و جەستەیی‌و دارایی، هەموو ئەم مەشق‌و پەروەردەیەش گەوهەرێکی شاراوەیە لە خواپەرستیەکاندا، بە تایبەتی لە نوێژدا.

---

[1] رواه أحمد ٨٦١٠، والترغيب والترهيب ٦٣٤.

[2] وشەی (کشحه) واتە بە پشتی رووت‌و بەبێ زین سواری ئەسپەکەی بووبێت‌و غاردان‌و راکردنی پێبکات، (الكشح) واته: الخصر". واتە: کەلەکە، النهايه في غريب الحديث والأثر، ج١ ص١٧٥.

# نوێژ دۆستایەتی و كۆمەكیی خوا مسۆگەر دەكات

## نوێژ هۆكاری سەركەوتنە بە سەر دوژمندا

نوێژكردن گوێڕایەڵیی‌و جێبەجێكردنی فەرمانی خوایە، هەركەسیش فەرمانی خوا جێبەجێ بكات نیشانەی خۆشەویستیەتی بۆ خوا. هەر بەو نوێژكردنەش لە خوا نزیك دەبێتەوەو دۆستایەتیی‌و خۆشەویستیی خوا مسۆگەرو دەستەبەر دەكات بۆ خۆی. خواش هەركەس‌و هۆزو گەلێكی خۆشویست بەرگرییان لێدەكات‌و پشتیان دەگرێ‌و كۆمەكییان دەكات. لە فەرمودەی قودسیدا هاتووە كە خوا دەفەرموێت: **"من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب"** واتە: هەركەس دەستدرێژیی و دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێكی مندا بكات، جەنگی لەگەڵ بەرپا دەكەم.

نوێژخوێنی راستەقینە دۆستی نزیك‌و خۆشەویستی خوایە، خوا پشتی دەگرێ‌و كۆمەكیی دەكات‌و كارەكانی بۆ ئاسان دەكات.

پێغەمبەریش (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: **"إنما ينصر الله هذه الأمة بضعيفها، بدعوتهم وصلاتهم وإخلاصهم"**.[1] واتە: بێگومان خوا ئەم ئوممەتە سەردەخات بە هۆی بێدەسەڵاتەكانییەوە، بە دوعاو نزاو پاڕانەوەو نوێژەكانیان.

## پلەو پایەی نوێژ لە جیهاد بەرزو بڵندترە

نوێژ لە پێش جیهادو خەباتدا فەرز كراوە، ـ نوێژ لە ئاسمان‌و جیهاد لەسەر زەوی فەرز كراوە ـ ، نوێژ لەسەر هەموو كەس‌و لە هەموو كات‌و شوێن‌و ئان‌و زەمانێكدا فەرزە، بەڵام جیهاد لەسەر ئافرەت‌و نەخۆش‌و كەمئەندام‌و پیرو پەكەوتەو دەردەدار فەرز نییە، مەگەر لە كاتی نائاساییدا، وەك (نفير العام) بانگهێشتی گشتیی.

لە جیهاددا مۆڵەت وەرگرتن هەیە، بەڵام لە نوێژدا مۆڵەت نییە بۆ كەس، پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) مۆڵەتی خەڵكی ئەدا بە بیانوێكی شەرعیی كە نەچێت بۆ جیهاد، بەڵام مۆڵەتی كەسی نەداوە تەنها نوێژێك بفەوتێنێ بە هیچ بیانویەك، بەڵكو بە گوێرەی توانا هەردەبێ نوێژەكەی بكات، بەڵكو جیهاد بۆیە

---

[1] صحيح الجامع ٢٣٨٨ والترغيب والترهيب ٧ صحيح و ٤٦٨٢ بلفظ آخر.

فەرزکراوە کە بەرنامەی خوا بە خەڵکی رابگەیەنرێ، کە دوای ئیمان گەورەترین پایەی ئیسلام نوێژەو خەڵکی فێری نوێژکردنو رووکردنە خوا بکەینو مل بۆ غەیری خوا دانەخەنو سەر بۆ کەسی تر کەچ نەکەن.

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) أن رجلا أتى النبي ﷺ فسأله عن أفضل الأعمال، قال النبي ﷺ الصلاة، قال: ثم مه؟ قال: الصلاة، قال: ثم مه؟ قال: ثم الصلاة، ثلاث مرات، قال: ثم الجهاد في سبيل الله"**. واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لێ بێ) پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) پرسیاری باشترین کردەوەی لێکرد، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: نوێژ، وتی: ئینجا چی؟ فەرمووی: نوێژ، وتی: ئینجا چی؟ فەرمووی: نوێژ (سێ جار) وتی: ئینجا چی؟ فەرمووی: ئینجا جیهادو خەبات لە پێناوی خوادا.

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی لەسەر بێت) پلەی نوێژی سێ چەندانە بەسەر جیهاددا باس کرد.

## بەزەیی خودا لە نوێژخوێنانە

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) عن النبي ﷺ قال: "رحم الله امرءاً صلى قبل العصر أربعاً"**.[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بەزەیی خوا لەو کەسە لە پێش نوێژی عەسردا چوار رکات نوێژ بکات". "واتە: چوار رکات نوێژی سوننەت".

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"أرحموا من في الأرض، يرحمكم من في السماء"**. واتە: "بەزەییتان بە وانەی سەر زەویدا بێتەوە، تاکو ئەوەی لە ئاسمانە بەزەیی بە ئێوەشدا بێتەوە".

[1]. راوه أبوداود ١٢٧١ والترمذي ٤٣٠، وقال حديث حسن. وصححه إبن حبان ٢٤٥٣ ـ ورياض الصالحين ١١٢٠

له وەسیەتەکانی پێغەمبەریشدا (سەلاَتو سەلامی خوای لیّ بیّ) هاتووە: "کە ئەگەر پێشنوێژیتان بۆ خەڵکیی کرد، خێرا تەواوی بکەنو ماوەکەی کەم بکەنەوە، چونکە لە دواتانەوە پیرو نەخۆشو پەککەوتەی لێیە".
واتە: ئامۆژگاری کردوون کە لە نوێژەکەیانا بەزەییان بێتەوە بە دەردە دارو گرفتارو نەخۆشدا، ئەوکاتە چاوەڕێی بەزەیی خوا بن.

## نوێژ خەفەت لە رابردوو ترسان لە داهاتوو ناهێڵیّ

نوێژخوێن ترسو پەژارەی نییە، نوێژ خاوەنەکەی لە خوا نزیك دەکاتەوەو دەیکاتە دۆستو خۆشەویستی خوا، هەرکەسیش ئاوا لەگەڵ عەشقو خۆشەویستیی خوادا تێکەڵو ئاوێتە بێت، رابردوو و داهاتووی تەسلیمی خوا دەکاتو لە دونیاو دوارِۆژدا ئارامو بێترسو دامەزراوو راوەستاو دەبێت. کە بەرەو دوارِۆژو کۆچی دواییو مردنیش هەناسەکانی نزیك دەبنەوە خەفەت لەو شتانە ناخوات کە لە دونیادا بەجێیان دەهێڵیّ، بێخەمو پەژارە تەسلیمی خوایان دەکات، لە داهاتووش ناترسیّ، چونکە خۆی بۆ ئامادە کردووەو هەنگاو دەنیّ بەرەو دۆستو خۆشەویستی خۆی، فەرمانەکانی جێبەجیّ کردووەو خۆی لە قەدەغەکراوەکانی پاراستووە. لە کاتی مردنو لە دونیا دەرچوونیشدا هەست دەکات لە کۆتو زنجیرو بەندی دونیا رزگاری دەبێتو دەچێتە دونیایەکی فراوانو خۆشتر. خواش دەربارەیان دەفەرموێت: **"إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ" (البقرة ٢٧٧)**.[1] واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووەو بە چاکیی نوێژیان کردووەو زەکاتیان داوە، پاداشتی ئەوان لە لای پەروەردگاریانەو ترسیان لە داهاتوو نییەو خەمو پەژارەی رابردووشیان نییە. کە دەفەرموێت کردەوە چاکەکان (عملوا الصالحات)، نوێژ چاکترین کردەوەی چاکەیە، دووبارە دەفەرموێت: **"وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ"** بە چاکیی نوێژەکانیان کردووە.
کەواتە نوێژ کاریگەرترین کردەوەو خواپەرستییە کە دەبێتە هۆی نەترسان لە داهاتوو و نەبوونی خەمو پەژارەو خەفەت خواردنیش لە رابردوو، هەرکەس بە

[1] ـ فضل الصلاة ص١٣٤.

نوێژکردنو خواپەرستی هەردوو ژیانی بەرزەخو دوارۆژی خۆی ئاوەدان کردبێتەوە، حەز دەکات بەرەو ئەو ئاوەدانیو نوور و رووناکییو کۆشكو تەلارە بڕواتو لە بەڕێکەوتنی بەرەو ئەو دوو قۆناغە تازەی ژیانی خەمو پەژارەو ترسی نییە.

خەلیفە مەئمون لە زانایەکی پرسی: ئەی زانای پایەدار بۆ ئێمە حەزمان لە مردن نییەو دەترسین بمرین؟ زاناکەش فەرمووی: ئەوە نیشانەی عەقڵمەندیو ژیرییتانە، چونکە ئێوە دونیای خۆتان ئاوەدانو دوارۆژی خۆتان کاولو وێران کردووە، کەسی ژیرو عاقڵیش حەز ناکات لە ئاوەدانییەوە بەرەو وێرانیی بڕوات!.

## پاداشتی هەرە گەورە بۆ نوێژخوێنانە

پاداشتی گەورە بۆ کاری گەورەو گرانبەهایە، نوێژیش لە گەورەترین کردارو خواپەرستییەکانە، بۆیە گەورەترینو شایستەترین پاداشتی لە لایەن خواوە بۆ بڕیار دراوە، چونکە فەرمانی خواو پێغەمبەریان (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) ئەنجام داوەو ئایەتی پیرۆزی قورئانیان کردۆتە رەفتاریانو خۆیان پەیوەستی پەروەردگاری خۆیان کردووەو بە لاشە لەسەر زەویو روو لە روگەو بە رۆحو گیانیش لە ئاسمانو عەرشی خواداو شوێنی فەرزبوونی نوێژە، لە کاروانی پێغەمبەرانو پۆلی فریشەکان خۆی ریزبەند دەکاتو ناوی خۆی لە پێڕی دۆستانی خوادا تۆمار دەکات، بە نوێژکردن لە خوا نزیك دەبێتەوەوە خوداش لەو نزیکتر دەبێتەوە، نوێژەکەشی لە خراپە دووری دەخاتەوەو هانی ئەدات بۆ چاکە، سوننەتی پێغەمبەرانی پێ زیندوو دەکاتەوە، دڵی زیندوو و ویژدانی هەستیارو گیانی پەروانەی عەرشی خودا دەبێ، بە لاشە لەگەڵ ئادەمیان و بە رۆحو گیان لەگەڵ فریشتەکانە.

خوا دەفەرموێت: **"لَّكِنِ الرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ مِنْهُمْ وَالْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَالْمُقِيمِينَ الصَّلاَةَ وَالْمُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالْمُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أُوْلَـئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْراً عَظِيماً"**. (النساء ١٦٢). واتە: بەڵام ئەوانەی لە زانستدا رۆچوون و بڕوادارن، بڕوایان هەیە بەوەی بۆ تۆ هاتۆتە خوار و بەوەی لە پێش تۆدا هاتۆتە خوار، ئەوانەشی بە چاکیی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەنو بڕوایان بە خواو بە رۆژی دوایی، هەیە ئەوانە لەمەودوا پاداشتی گەورەیان دەدرێتەوە. هەروەها لە روانگەی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەریشەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کە لێیان

پرسیوه کام کردەوە لە هەمووان چاکترە؟ فەرموویەتی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، یان نوێژ لەسەرەتای کاتیدا، ئەوە بەڵگەی چاکترینو گەورەترین پاداشتە بۆ نوێژ، کە چاکترین کردارە.

## خودا لەگەڵ نوێژخوێنانە

بڕوادار رووی لە هەر لایەك بێت، رووی لە خوای خۆیەتی لە نوێژدا، بە فەرمانی خوا رووی روخساری دەکاتە رووگەیەك کە پەروەردگاری بۆی دیارییکردووە، بەڵام بە گیانو دەروون لەگەڵ خوای خۆیەتی، یادی خودا دەکات، سەرقاڵی چاکترین کرداری چاکەکارانە، نوێژەکەی بۆتە قەڵغانو لە خراپە دەیپارێزێ، دەبێ نوێژخوێن خۆڕاگرو بە ئارام بێت.

خواش لە قورئاندا دەفەرموێت: من لەگەڵ ئەو کەسانەدام کە یادم دەکەن، لەگەڵ چاکەکارانو پارێزکاران، نوێژخوێن یادی خودا دەکات، هەروەك خوا بە حەزرەتی موسا دەفەرموێت: **"وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي"**. (طه: ١٤) واتە: بە چاکیی نوێژ بکە بۆ یادی من.

نوێژخوێن لە چاکەکارانە (المحسنين)، (إن الله مع المحسنين)، بێگومان خواش لەگەڵ چاکەکاراندایە.

نوێژخوێن لە پارێزکارانە (المتقين) **"إن الله مع المتقين"**. واتە: بێگومان خوا لەگەڵ پارێزکارانە.

نوێژخوێن بە ئارامو خۆڕاگرە، خواش لەگەڵ خۆڕاگرانە **"ان الله مع الصابرين"** واتە: بەڕاستیی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

لە سورەتی (المائدة)شدا دەفەرموێت: **"... قَالَ اللّهُ إِنِّي مَعَكُمْ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلاَةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ..."** (المائدة ١٢). واتە: خوا پێی فەرموون: بەڕاستیی من لەگەڵتانم، ئەگەر بە چاکی نوێژ بکەنو زەکات بدەنو باوەڕتان هەبێت بە پێغەمبەرەکانمو پشتیوانیان بکەن..

خوا لەگەڵ خەباتگێڕانو موجاهیدانە، ئەوانیش لە نوێژخوێنانو لە گەرمەی جەنگو جیهاددا دەبێ نوێژ بکەن، خوا لەگەڵ دۆستانیدایە، دۆستانی خوداش بە نوێژو خواپەرستیی گەیشتونەتە ئەو پلەو پایەو مەنزڵە.

ئەی پێڕی نوێژخوێنان لە هەر کوێ هەن، لە هەر سەردەمو زەمانێکدا دەژین "وهو معكم أينما كنتم" خواتان لەگەڵو پشتو پەناتانە.

کاتێکیش نوێژخوێن هەڵدەستێو نوێژ دادەبەستێ، رووی لە خوایەو خواش رووی تێدەکات، بۆیە نابێ نوێژخوێن لە ناو نوێژەکەیدا ئاوڕ بداتەوەو روو وەرگێڕێ بەملاو ئەو لادا.

حوزەیفە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: کاتێك بەندەیەکی خوا دەستنوێژ دەگرێ بە چاکیی، ئینجا هەڵدەستێ بۆ نوێژ، خوا رووی تێدەکاتو موناجاتی لەگەڵ دەکات، خوا رووی لێ وەرناگێڕێ هەتا ئەو روو وەرنەگێڕێ بە لای راستو چەپیدا".[1]

## نوێژ ئەمانەتە

خوا نوێژێکی لە بەندەکانی دەوێ کە تەنها بۆ خوا بێتو تەنها هەر بە گوێرەی شەرعی خوا بێت، ئەو نوێژەش کە ئاوها بێت خاوەنەکەی دەکاتە دۆستو خۆشەویستی خواو، نزیکی دەخاتەوە لە خواو دووری دەخاتەوە لە شەیتانو شەیتان بازان، دووری دەخاتەوە لە هەموو وتەو کردارێك، لە هەموو مامەڵەو رەفتارێك کە خوا پێی ناخۆش بێت، یەکەم پەرستنێکە خوا داوەریو لێپرسینەوەی لەسەر دەکات، ئەمانەتەکەی خۆی ئاوا وەردەگرێتەوە.

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: "القتل في سبيل الله يكفر الذنوب كلها إلا الأمانة، قال: يؤتى العبد يوم القيامة، وان قتل في سبل الله فيقال أد أمانتك، فيقول: اى رب كيف وقد ذهبت الدنيا، فيقال: انطلقوا به الى الهاوية، فينطلق به الى الهاوية، وتمثل له أمانته كهيئتها يوم دفعت اليه، فيراها فيعرفها فيهوى في أثرها حتى يدركها، فيحملها على منكبيه حتى إذا ظن انه خارج قلبت عن منكبيه فهو يهوى في أثرها أبد الأبدين؟!، ثم قال: الصلاة أمانة والوضوء أمانة، والوزن أمانة والكيل أمانة، وأشياء عددها وأشد ذلك الودائع، قال: يعنى زادان. فأتيت البراء بن عازب، فقلت: الا ترى الى ماقال إبن مسعود؟ قال: كذا. قال: صدق. أما**

---

[1] ـ حياة الصحابة ج٣، ص٨٥.

سمعت الله يقول: "إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا".[١] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (خوای لێ رازی بێ)، فەرموویەتی: شەهیدبوون لە پێناوی خوادا هەموو گوناهو خراپەیەك دەسڕێتەوە بێجگە لە ئەمانەت، فەرمووی: بەندەیەك لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێ، هەرچەند لە ڕێگەی خوا کوژرابێ، پێی دەوترێ، ئەمانەتەکەت بدەرەوە، دەڵی: خوایە چۆن کە دونیا بەسەرچووە، دەوترێ: بیبەن بۆ هاویە "دۆزەخ"، دەیبەنە هاویە، ئەمانەتەکەی بۆ دەکرێتە پەیکەرو وەکو شێوەی ئەو ڕۆژەی پێی سپێردراوە، کە دەیبینێ دەیناسێتەوە، دوای دەکەوێ هەتا دەستی لێی گیر دەبێ، بە سەرشان هەڵیدەگرێ هەتا وا دەزانێ نزیکە چوونە دەرەوەی، ئیتر فڕێ دەدرێتە خوار بۆ بنی دۆزەخ هەتا هەتایە، ئینجا وتی: نوێژ ئەمانەتە، دەستنوێژ ئەمانەتە، کێشانو پێوان ئەمانەتە، زادان دەڵێ: چوومە خزمەت بەڕائی کوڕی عازب وتم: ئەوە نازانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود چی فەرمووە؟ ئاوای فەرمووە. وتی: ڕاست دەکات، ئەی تۆ نەتبیستووە خوا دەفەرموێت: مانای ئایەتەکە: "بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات سپاردەو ئەمانەتەکان وەکو خۆیان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان".

## نوێژ پەیوەستە بە ئیمانو دواڕۆژەوە

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: "**بين الكفر والإيمان ترك الصلاة**". واتە: لە نێوان بێباوەڕیی و ئیماندا وازهێنانە لە نوێژ.[٢] خوا دەفەرموێ: "**وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَهُمْ عَلَى صَلاَتِهِمْ يُحَافِظُونَ**". (الأنعام: ٩٢). واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە، ناردوومانەتە خوار، ڕاستیی کتێبەکانی پێشوو دەسەلمێنێو بۆ ئەوەی شاری مەککەو دەوروبەری ـ دانیشتوانی هەموو جیهان ـ ئاگادار بکاتەوە، ئەوانەی باوەڕ دێنن بە ڕۆژی دوایی، بڕوا دێنن بە قورئانیشو لەسەر نوێژەکانیان بەردەوام دەبنو دەیانپارێزنو لە کاتی خۆیاندا ئەنجامیان دەدەن".

---

[1] ـ الترغيب ٢٦٢٤و ٤٤٠٦ وفيه انه حسن ـ إسناد جيد.

[2] الترغيب والترهيب ١٩٥ صحيح.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە بڕوابوون بە ڕۆژی دواییو قورئانی پیرۆزی لەگەڵ نوێژکردن باس کردووە، چونکە نوێژ کاریگەریی و پەیوەندیی گەورەی بە بڕواوە هەیە.

**قال رجل: یارسول الله، أوصني؟ قال: علیك بالیأس مما في أیدی الناس، فانه الغني، وایاك والطمع، فإنه الفقر الحاضر، وصل صلاتك وانت مودع، وایاك وما یعتذر منه". حسن**[1] واتە: پیاوێك بە پێغەمبەری خوای (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) وت: ئامۆژگاریيم بکە، فەرموی: ئومێدت بە ماڵی خەڵکی نەبێ، ئەوە دەوڵەمەندییە، نەکەی تەماعت هەبێ، ئەوە هەژارییەکی بەرجەستەیە، کە نوێژت کرد، وا بیکە وەك ئەوەی دوا نوێژت بێتو خواحافیزی بکەیت، خۆت بپارێزە لەوەی بیانووی بۆ بێنیتەوەو داوای لێخۆشبوونی لێبکەی.

لێرەشدا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، نوێژی بەستۆتەوە بە دواڕۆژو سەفەرکردن بەرەو دواڕۆژ، بۆیە بە کابرای فەموو نوێژ خوا حافیزییە لە دونیا، هەروەها لە بابەتەکانی تردا دەبینی کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ژیانی دونیاداو لە ناو نوێژدا بەهەشتو دۆزەخی بینیوە کە هەردووکیان لە دوارۆژدان.

**عن أبي الدرداء ﷺ: "لاأیمان لمن لا صلاة له، ولا صلاة لمن لاوضوء له.."**[2] واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێردراوەتەوە فەرموویەتی: هەرکەس نوێژ نەکات ئیمانی نییە، هەرکەسیش دەستنوێژی نەبێ، نوێژی دروست نییە. "نوێژ بە بێ دەستنوێژ بەتاڵە، کەواتە ئیمانیش بە بێ نوێژ بەتاڵە، چۆن ئەگەر باسی کەسێکی دەغەڵو زۆر بێ ئیمان بکرێ دەڵێن نوێژی بە بێ دەستنوێژ کردووە، ئاواش دەڵێن فلان کەس دەڵێ موسڵمانم، بەڵام نوێژ ناکات".[3]

ئەوزاعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس زۆر شەونوێژ بکات ڕاوەستانی قیامەتو مەحشەری بۆ ئاسان دەبێت".

---

[1] ـ أخرجه احمد وإبن ماجة ٤١٧١. وموسوعة الأخلاق الإسلامية ج٢، ص٥١.

[2] ـ فتاوى معاصرة ص٢٠٩.

[3] ـ صفة الصفوة ج٤، ص١٥١.

## نوێژ خێری زیاترە لە دونیاو هەرچی لە دونیادایە

پاداشتی نوێژ بۆ رۆژی دواییە، دونیاش لە دوارۆژدا هیچ نرخێکی نامێنێ مەگەر دونیایەك كە خرابیتە خزمەت جێبەجێكردنی فەرمانی خوا، بەڵام دارو بەردو ئاڵتونو زیو و پارەو سامانو ماڵو مەنزڵ هیچ سوودێك ناگەیەنێتو تەرازوو نایخوێنێتەوە.

**عن عائشة (رضي الله عنها) عن النبي ﷺ قال: "ركعتا الفجر خير من الدنيا وما فيها".**[1] واتە: لە عائیشەوە (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "دوو ركاتە نوێژە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی خێریان زیاترە لە دونیاو هەرچی لە دونیادایە".

لە تەرازووی كێشانەی كردەوەكاندا كە تەرازووی پڕ دادگەری خوایە، هەموو دونیاو هەرچی لە دونیادایە تەنها یەك ركات نوێژ هەڵناكێشێ، نەك ئەو كەمە ماڵەی كۆی دەكەیتەوە، یان ئەو لەوێچە میراتەی بەجێی دێڵی، كە زۆرجار لە خەرجكردنیدا پیسكەیی دەكەی، لە دوای خۆشت میراتگرەكان بە دارو بەردیدا دەدەن، هەوڵبدە بە ركاتی نوێژەكانت تەرازوی كردەوە چاكەكانت قورسو سەنگین بكەیت.

هەروەها لەو فەرمودەیەی باسمانكرد لە ریوایەتەكەی پێشەوا موسلیمدا هاتووە: **"لهما أحب اليَ من الدنيا جميعا"** (صحيح). واتە: بەڕاستیی ئەو دوو ركاتە لە لای من خۆشەویستترن لە تەواوی دونیا.

## نوێژ هۆكاری سەركەوتنە بەسەر دوژمندا

نوێژ پشتبەستنو پەنا بردنە بە خوا، داواكردنەو پاڕانەوەیە لە خوا كە هەموو كارێكی بەدەستە، گفتوگۆكردنە لەگەڵ خوا كە سەركەوتن هەر لە لای ئەوەو لای كەسی تر نییە **"وَمَا النَّصْرُ إِلاّ مِنْ عِندِ اللّهِ"**. واتە: سەركەوتن تەنها هەر لە لای خوایەو لە لای ئەوەوە نەبێ سەركەوتن نییە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "منتظر الصلاة بعد الصلاة كفارس اشتد به فرسه في سبيل الله على كشحه وهو في الرباط الأكبر".**[2]

---

[1] رواه مسلم ٧٢٥. ورياض الصالحين ١١٠٢ ونضرة النعيم ج٦ ص٢٥٨١ رقم ١٧٣ والترغيب والترهيب ٨٢٩.

[2] رواه احمد ٨٦١٠ والطبراني في الأوسط. الترغيب والترهيب، ٦٣٤.

(حسن). واته: "له ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی لێ بێ) فەرمووی: "چاوەڕوانکاری نوێژ له دوای نوێژ، وەکو سوارچاکێکە ئەسپەکەی له ڕێگەی خوادا بەستبێتەوە لەسەر ئاخوڕەکەی، ئەوە له نیگابانی گەورەدایە".

مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك، کە یەکێك بووە لەسەرکردە موسڵمانە بەناوبانگەکان، بە لەشکرەکەی گەمارۆی قەڵایەکی دا، کونێك هەبوو له قەڵاکەدا نەیانئەتوانی پیایدا سەرکەون، پیاوێك کە دەمامکی پۆشی بوو له ناوەڕاستی سوپاکەوە هات، لەو کونەوە چووە ژوورەوەو قەڵاکەی بۆ موسڵمانان ڕزگار کرد، مەسلەمە هاواری کرد کوا ئەو کەسە له دەلاقەکەوە چووە ژوورەوە، کەس نەهات، زۆر بە دوایدا گەڕان، بەڵام پیاوێك هات وتیان تۆ ئەوی؟ وتی: نەخێر، بەڵام هەواڵی ئەوتان پێئەدەم. ڕۆیشت بۆ خزمەت مەسلەمە، پێی وت ئەو کابرایەی کە ناو دەبرا بە دەمامك پۆش، سێ داواکاری له ئێوە هەیە:

١ ـ ناوی نەنووسن‌و ناوی له هیچ لاپەڕەیەکدا تۆمار نەکەن.

٢ ـ هیچی نەدەنێ.

٣ ـ پرسیار نەکەن دەربارەی کێیەو چییە.

مەسلەمەش بەڵێنی دایە. کابراکە فەرمووی: دە ئەو دەمامکپۆشە منم. لەوەودوا مەسلەمە هیچ نوێژێکی نەبوو کە نەڵێ: خوایە لەگەڵ دەمامکپۆش دام بنێ.

**قال رسول الله ﷺ: "انما ينصر الله هذه الأمة بضعيفها بدعوتهم، وصلاتهم، واخلاصهم".**[١] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بەڕاستیی خوا ئەم ئوممەتە سەردەخات بەبێ هێزەکانیان‌و نزاو پاڕانەوەیان‌و نوێژەکانیان‌و دڵسۆزییەکانیان". لەم ڕوانگەیەوە قوتەیبەی کوڕی موسلیم له جەنگی تورکەکاندا فەرمووی کوا زانای موسڵمان‌و پایەدار موحەممەدی کوڕی واسیع؟ وتیان ئەوەتا. پڕی بە تیرو کەوانەکەیدا کردووەو بە پەنجەی هێما بۆ ئاسمان دەکات، فەرمووی: پەنجەی ئەوم له لا خۆشەویستترە له سەد هەزار شمشێری هەڵکێشراو.[٢]

---

[1] رواه النسائي ٤٣٨٧. صحيح الترغيب والترهيب، ٤٦٨٢.

[2] موسوعة الأخلاق الإسلامية ج١ ص٢٦.

دوژمنان دەربارەی پادشای شەهید نورەدین زەنگی وتویانە: "بەڕاستیی بە سەربازی زۆرو لەشکرەکە زەفەری بە ئێمە نەبردو بەسەرماندا سەرنەکەوت، بەڵکو بە دوعاو پاڕانەوەو شەونوێژ زەفەرمان پێدەباتو سەردەکەوێ بە سەرماندا". [1]

هەروەها دەربارەی پێشەوا قورتوبییش وتراوە کە هەموو شەوێ قورئانی خەتم کردووە لە سیانزە ركات نوێژداو زۆریش هۆگری رۆژووگرتن بووەو لە حەفتا جەنگو غەزاشدا بەشدار بووە.

## نوێژ هەر بە نیازی دڵ دەنووسرێت

هەرکەس نیازی بوو کاری خێر بکاتو بەڕاستیی و لە ناخی دڵییەوە بێت تەنها بە گوزەرکردنی ئەو نیازە بە پەڕەکانی دڵێدا چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، ئەگەر نەشیکات، خۆ ئەگەر ئەنجامی بدا هەتا یەك بە حەوسەد بۆی دەنووسرێ، ئەم باسە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە. (الترغیب والترهیب، ٢٢. **رواه البخاري ومسلم**).

**عن أبي نر أو عن أبي الدرداء شك شعبة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "مامن عبد يحدث نفسه بقيام ساعة من الليل فينام عنها الا كان نومه صدقة تصدق الله بها عليه وكتب له أجر ما نوى". صحيح** [2] واتە لە ئەبی زەڕەوە یان ئەبی دەردائەوە، شوعبە گومانی هەبووە کامیانە (رەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: "هەر کەسێك لە دەروونی خۆی بڵێ ئەم شەو شەونوێژ دەکەم، بەڵام خەوی لێبکەوێو بێدار نەبێتەوە، خەوەکەی بە خێر بۆ ئەنووسرێ و پاداشتی نیازەکەشی بۆ ئەنووسرێ".

**عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من اتى فراشه وهو ينوى ان يقوم يصلى من الليل فغلبته عينه حتى يصبح كتب له ما نوى، وكان نومه صدقة عليه من ربه". حسن.** [3] واتە: لە ئەبی دەردائەوە (رەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس بچێتە سەر پێخەفو

[1] (رهبان الليل ج١، ص٥٦٥).

[2] **الترغيب والترهيب، ٨٧٢. صحيح و ٨٧١ صحيح بلفظ آخر و٨٧٠ بلفظ آخر.**

[3] **صحيح الجامع ٥٩٤١. الترغيب والترهيب ٢٥ حسن صحيح.**

لە کاتێکدا ئەو بەنیازە هەستێ شەونوێژ بکاتو چاوی زاڵ بوو بە سەریداو هەتا بەیانی بە خەبەر نەهات، ئەوەی نیازی هەبووە بۆی نووسراوە و خەوەکەشی خێرێك بووە لە لایەن خواوە پێیدراوە".

**و عن عائشة (رضي الله عنها) أن رسول الله ﷺ قال: "مامن امريء تكون له صلاة بالليل فيغلبه عليها نوم الا كتب الله له أجر صلاته، وكان نومه عليه صدقة". حسن**[1]واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی لێ بێ) فەرمووی: "هەر کەسێك کە شەونوێژ بکاتو خەو زاڵ ببێ بەسەریدا، پاداشتی شەونوێژەکەی بۆ ئەنووسرێو خەوەکەی بۆی دەبێتە خێر".

ئەمەش گەورەییو پلەو پایەی نوێژ دەردەخاتو بە ڕۆشنی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا پێی خۆشە بەندەکانی ئەگەر تەنها بیریش لە نوێژ بکەنەوەو بڕیار بدەن لە داهاتوودا ئەنجامی بدەن، کە داهاتوو تەنها خودا دەیزانێ، ئەو کاتەی ئەو کەسە بیر دەکاتەوەو لەبیرو خەیاڵی خۆیدا بریار دەدات نوێژی تیادا بکات لەوانەیە ئەو لەگۆڕدا بێت، بەڵام خوا خێری بۆ دەنووسێ.

## نوێژ رەمزی گوێڕایەڵی نەکردنە بۆ بێباوەڕو هاوبەشدانەران

نەفامیی بە پەیڕەوکردنی بەرنامەی غەیری خوا دەوترێ، عەرەبە هاوبەشدانەرەکان کە بە نەفام ناوبراون لەبەر نەخوێندەواری نەبووە، لەبەر نەبوونی ڕەوشتی جوانو پیاوەتیو بازرگانیو مەردایەتی نەبووە، بەڵکو لەبەر شوێنکەوتنی بەرنامەی خوداو کەتەلۆکی جیهانو یاسای گەردون بووە، سەردەمەکەشیان هەر لەبەر وازهینانو پەیڕەوی نەکردنی بەرنامەی خوا پێی وتراوە سەردەمی نەفامیی.[2]

لە کاتێکدا نوێژ ڕێ بگرێ لە هەموو خراپەیەکو، هەموو ستەمو بەدکرداریی و کاولکارییەك بنبڕ بکات، وەکو خوا دەفەرموێت **"اِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء**

---

[1] الترغيب والترهيب، ٨٧٠ و٨٦٩ بلفظ آخر.

[2] موحەممەد قوتب کتێبی "جاهلية القرن العشرين" ی لەم بیرۆکەوە دارشتووەو دەفەرموێ: پێشکەوتنی سەدەی بیستەم کە ملکەچو گەردنکەچی بەرنامەی خوا نەبێ دەبێتە نەگبەتیو نەهامەتی بۆ سەرانسەری گۆی زەوی، نەك هەر بۆ مرۆڤەکان، بەڵکو بۆ تەواوی گیاندارو بێ گیانەکانیش.

وَالْمُنكَرِ"، واته: بێگومان نوێژ هەموو خراپەو خراپەکارییەك کۆتایی پێ دێنێ و بنبڕی دەکات، کەواتە نوێژ گوێڕایەڵی خوایەو دوورکەوتنەوەو دژایەتی هەموو کردارو رەفتارو نەریتێکی نەفامییە.

هەروەها کاتێ ئەبوجەهل رێگەی نەئەدا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە کەعبەو دەوروبەریدا نوێژ بکات، خوا پێی فەرموو: "كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ". (العلق: ١٩). واتە: ئەی موحەممەد هەرگیز بە گوێی مەکەو سوژدەبەرەو لە خوا نزیکبەوە. لە نوێژەکەشدا نوێژخوێن دەڵێ: "اهدِنَ - - - - ا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ * صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ". (الفاتحة ٦ ـ ٧). واتە: خودایە یارمەتیم بدەو بمخەرە سەر رێگە راستو رەوانەکە، رێگەی ئەوانەی بەهرەت بە سەردا رشتون، نەك رێگەی ئەوانەی خەشمو قینت لێگرتوون کە جولەکەکانن، رێگەی گومڕاگانیش نا، کە گاورەکانن.

## هەرکەس لە نوێژدا گەردنکەچ بێت رزگاری بووە

نوێژ بەندایەتیە، جۆرێکە لە خواپەرستیی لە نێوان بەندەی بێدەسەڵاتو خوای باڵادەست، کەواتە نوێژ هەتا زیاتر گەردنکەچییو بێدەسەڵاتییو رەمزو نیشانەی بەندایەتیی پێوە دەرکەوێو رەنگی تێدا بداتەوە، چاکترەو پاداشتی گەورەترەو خاوەنەکەشی چاکتر رزگار دەکات، خوا دەفەرموێت: "قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ". (المؤمنون: ١ ـ ٢). واتە: بەڕاستیی ئەو بڕوادارانە رزگاریان بووە، ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا ملکەچو گەردنکەچن.

کەسێك لە نوێژخوێنان ملکەچی راستەقینەیە کە ئەنجامدانی نوێژەکەی ملکەچو گەردنکەچی تەواوی فەرمانەکانی خوای بکات، خوا نوێژێك داوا دەکات کە خاوەنەکەی لە خراپە بگێڕێتەوەو رووی پێ لە چاکە بکات، خوا نوێژێك قبووڵ ناکات خراپەی لەگەڵدا بکرێ، یان خاوەنەکەی لە خراپە نەگێڕێتەوە.

لەم روانگەیەوە حەبیبەی عەدویە (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە دوای نوێژ فەرموویەتی: خوایە لە بێئەدەبییم خۆشبە لە نوێژەکانمدا.[1] ئەبوبەکر الوراق (رەحمەتی

[1] صلاح الأمة ج٢، ص٤٤٣.

خوای لێ بێ) فەرموویەتی: جاری وا هەیە دوو ركات نوێژ دەكەم بۆ خواو دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە خۆم وەكو دزێك دێتە بەرچاو لە شەرما.

## تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژدا حەرامە

نوێژخوێن ڕووی لە خوایەو خواش ڕووی لەوە، كەسێك لە نوێژدا بێ، بە لاشە ڕووی لە كەعبەیەو بە دڵو گیان ڕووی لە خوایە. نوێژخوێن لەگەڵ خوادا گفتوگۆ دەكاتو ڕۆحی بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسمانو عەرشو شوێنی فەرزبوونی نوێژ، نوێژخوێن لە گەورەترین حاڵەتی خواپەرستییدایە، بە جۆرێك ناتوانێ لەزەتو چێژ لە هیچ خواردنو خواردنەوەیەك بكاتو بۆی نییە قسە بكات غەیری وشەكانی نوێژ كە دیارییكراون، ناتوانێ ئاوڕ بداتەوەو لا بكاتەوە و كەمترین جموجوڵ بكات. كەواتە دەبێ ڕێز لەو هەڵوێستەی بگیرێو بە بەردەمیدا تێنەپەڕن.

**عن أبي جهم، عبدالله بن الحارث بن الصمة الأنصاري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "لو يعلم المار بين يدي المصلي مإذا عليه، لكان ان يقف أربعين خيرا له من ان يمر بين يديه، قال الراوي: لا أدري قال أربعين يوما، أو أربعين شهرا، أو أربعين سنة". متفق عليه.**[1] واتە: لە ئەبی جوهەیمەوە، عەبدوڵلای كوڕی حارس كوڕی سەممەی ئەنساری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو كەسەی بە بەردەمی نوێژخوێندا تێدەپەڕێ ئەگەر بیزانیایە چەند گوناهبار دەبێ، ئەوە (چل) ڕاوەستایە باشتر بوو بۆی لە تێپەڕین بە بەردەمیدا. گێڕەرەوەی فەرموودەكە كە (أبو النصر)ە فەرموویەتی: نازانم فەرمووی چل ڕۆژ، یان چل مانگ، یان چل ساڵ.

**عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "إذا كان أحدكم يصلى فلا يدع أحدا يمر بين يديه وليَدرأه ما استطاع، فان أبى فليقاتله، فإنما هو الشيطان".**[2] واتە: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری

---

[1] رواه البخاري ٤٨٨ ومسلم ٥٠٧ ورياض الصالحين ١٧٥٨ وأبوداود ٧٠١ والترمذي ٣٣٦ وصحيح الجامع ٥٣٣٧.

[2] رواه مسلم ٥٠٥ ورواه البخاري ٤٨٧ بلفظ آخر وصحيح الجامع ٧٥٥.

خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیَ بیَ) فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان نوێژی دەکرد با ڕێگە نەدات کەس بە بەردەمیدا تیپەڕیَ هەتا دەتوانیَ، ئەگەر هەر وازی نەهێنا با بەگژیدا بچێت، چونکە ئەوە شەیتانە.

لە ریوایەتەکەی بوخارییدا دەفەرمویێت: **"إذا صلى أحدكم الى شيء يستره من الناس، فأراد أحد ان يجتاز بين يديه فليدفعه، فان أبى فليقاتله فإنما هو الشيطان"**.[1] واتە: ئەگەر یەکێکتان بەرەو بەربەستێك لە نێوان خۆیو خەڵکیدا نوێژی کرد، یەکێکیش ویستی بە بەردەمیدا بڕوا، با نەهێڵیَو پاڵی پێوەنیَ، ئەگەر هەر نەگەڕایەوە با بە گژیدا بچیَ، بە راستی ئەوە شەیتانە. لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمویێت: **"إذا صلى أحدكم الى سترة فليدن منها لا يقطع الشيطان عليه صلاته"**.[2] واتە: ئەگەر یەکێکتان بەرەو بەربەستێك نوێژی کرد با لێی نزیك بێت هەتا شەیتان نوێژەکەتان لیَ تێکنەدات.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیَ بیَ) نوێژێکی فەرزی دەکرد، لە ناو نوێژەکەدا دەستی نوقاند، کە لیَ بووەوە وتیان ئەی پێغەمبەری خوا شتیَ روویدا لە نوێژەکەتدا؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام ئەوەندە هەبوو شەیتان ویستی بە بەردەممدا تێپەڕیَ، منیش دەستم لە بینی (قوڕقوڕاگەی) نا هەتا ساردایی زمانی بەدەستم گەیشت، سوێند بە خوا ئەگەر سولەیمانی برام دەستپێشخەری نەکردایە، بە پایەیەکی مزگەوتەوە دەمبەستەوە، هەتا منداڵنی مەدینە لێی کۆببوونایەتەوەو بە دەوریدا هەڵسوورانایە، جا هەر کەس دەتوانیَ نەهیڵیَ شەیتان لە نێوان خۆیو رووگەدا تێبپەڕیَ با هەوڵ بدات.[3]

وقال رسول الله ﷺ: **"لأن يقوم أحدكم أربعين، خير له من أن يمر بين يدى المصلي"**. صحيح[4] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بیَ) فەرمووی: "ئەگەر یەکێکتان راوەستیَ چل، باشترە لەوەی بە بەردەمی نوێژخوێنێکدا تێپەڕیَ".

---

[1] رواه البخاري ٤٨٧.

[2] رواه أبوداود ٦٩٥ وصححه الحاكم رقم ٩٢٢. صفة الصلاة النبي ص٥٦.

[3] رواه الطبراني بسند صحيح. صفة صلاة النبي ص٥٧.

[4] صحيح الجامع ٥٠٤٧.

## نوێژ كۆتا وشەو وەسیەتی پێغەمبەر بوو، بەر لە دونیا دەرچوونی

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ماوەی ژیانیدا نوێژی نەچواندوە، مەگەر لە حاڵەتی نائاساییدا كە بە دەستخۆی نەبووبێو لە خەو خەبەری نەبووبێتەوە، یان لە جەنگی ئەحزابدا (خەندەق) كە بە هۆی سەرقاڵیی‌و سەرگەرمبوونیان بە جەنگ‌و هێرشهێنانی هاوبەشدانەرانو كافرەكانەوە لە یادیان كردبوو، لە كاتی نەخۆشیی و ژانو ئازاری سەرەمەرگیشدا هەرگیز نوێژی لە یاد نەكردووە.

كۆتا وەسیەتو ئامۆژگاری پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) دەربارەی نوێژو چاكە كردن بووە لەگەڵ ئافرەتان. **قال أنس (رضي الله عنه) كانت وصية رسول الله ﷺ حين حضره الموت: "الصلاة وما ملكت أيمانكم حتى جعل يغرغر بها في صدره، ولا يفيض بها لسانه".**[١]واتە: ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: وەسیەتی پێغەمبەر لەسەرەمەرگدا ئەمە بوو: "نوێژو ئافرەتانی پێ سپێرراوتان هەتا لە سنگ‌و گەروویدا غەرغەرەی دەكرد، بە زمان بۆی دەرنەدەبڕا".

**عن على (رضي الله عنه) قال: "كان آخر كلام النبي ﷺ الصلاة، الصلاة، أتقوا الله في ما ملكت أيمانكم".**[٢]واتە: عەلی (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: كۆتا قسەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) ئەمە بوو: "نوێژ، نوێژ، لە خوابترسن لەو ئافرەتانەی پێتان سپێرراون".

## كۆكردنەوە "حشر"ی خەڵكی بە گوێرەی كاریگەریی نوێژەكانیانە

ئەنجامدانی نوێژو چۆنییەتی گەردنكەچیی كاریگەریی هەیە لەسەر كردارو رەفتارو وتەو گوفتاری نوێژخوێن و رەنگدانەوەی نوێژ لە گۆرینی هەموو رەوشتو نەریت‌و بیروبۆچونو هەڵسوكەوتی نوێژخوێن بۆ چاك‌و چاكتر، هەروەها كاریگەریی هەیە لەسەر خۆشی‌و ناخۆشی ناو گۆڕو راوەستان و دادگایی‌و لێپرسینەوەی رۆژی دوایی.

---

[1] رواه أحمد وإبن ماجه ٢٦٩٧ وإبن حبان والسيرة النبوية للصلابي ج٢ ص٦٨٨، وتعظيم قدر الصلاة ص٢١٢ وقال إسناده حسن والحديث صحيح لغيره.

[2] صحيح الجامع ٤٦١٦.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: يحشر الناس يوم القيامة على قدر صنيعهم في الصلاة، وقبض أبو النضر شماله بيمينه، وانحني هكذا".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە گێڕدراوەتەوە (رەزای خوای لێ بێ) کە فەرموویەتی: "خەڵکی لە رۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوەو حەشر دەکرێن بە ئەندازەی کاریگەریی نوێژەکانیان لەسەریان و گرنگیدانیان بە نوێژ، (أبو النصر) بە دەستی راستی دەستی چەپی گرتبوو ئاواهی، وەکو لە نوێژدا دەیگریت".

هەروەها ئەبو زەکوان فەرموویەتی: "خەڵکی لە رۆژی قیامەتدا ئاوا زیندوو دەکرێنەوە، دەستێکیانی خستە سەر دەستەکەی تری، عەبدوررەحمان دەستی راستی دانا لەسەر دەستی چەپی".[2]

مەبەست ئەوەیە لە نوێژدا چۆن رادەوەستیو دەستی راست دەخەیتە سەر دەستی چەپ، لەوێش بە هەمان شێوە دەوەستێنرێن.

## نوێژ کۆتا هیواو ئامانجی ئیماندارە

پێغەمبەری خوا (سەڵات سەلامی خوای لێ بێ) لە رۆژەکانی کۆتایی تەمەنیدا نوێژەکانی هەر کردووەو نەیفەوتاندون، ئەوکاتەش هەموو لاشەی لە جوڵە کەوتووەو هێزی نەماوە نوێژەکانی بکات، وەسیەتی کردووە بۆ موسڵمانان کە نوێژەکانیان نەفەوتێننو لە بەرنامە پیرۆزەکەشیدا نوێژی دانا کە لەسەر تەرمی مردووەکان بکرێ، بۆ هیچ مردوویەك نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەردا بەبێ نوێژ لەسەرکردنی بنێژرێ و ئەسپەردەی خاك بکرێ. کاتێك پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) کۆچی دوایی کرد، هاوەڵە بەرێزەکانی بە پیاو و ژن منداڵ و بەندەوە نوێژیان لەسەر کرد، بەڵام یەك یەك نوێژیان لەسەر کرد، نەك بە کۆمەڵ. زەیدی کوڕی دەسنەش رەزای خوای لێ بێ لە کۆتا هەناسەکانی ژیانیدا داواکاری لە بکوژەکانی ئەوەبوو مۆڵەتی بدەن دوو رکات نوێژ بکات، دوای سەلامدانەوەو تەواوکردنی دوو رکاتەکە فەرمووی

---

[1] إسناده حسن، تعظيم قدر الصلاة، ص٢١٨، رقم ٣٣١.

[2] إسناده صحيح، تعظيم قدر الصلاة ص٢١٨، رقم ٣٣٢.

زۆر حەزم دەکرد ئەو دوو رکاتە درێژ بکەمەوە ئەگەر لەبەر پڕوپاگەندەی ئێوە نەبوایە.. بە کافرەکانی فەرموو".

زۆرێ لە زانایانو پیاوچاکان لە کاتی لە داردانو گوللەبارانکردنو سەربڕینیاندا داوایان کردووە مۆڵەتیان بدەن دوو رکات نوێژ بکەن.

سەعیدی نوورسی (رەحمەتی خوای لێ بێ) کاتێ لە روسیاو لە ویلایەتی سیبیریا فەرمانی لەسێدارەدانی دەرچوو، لێیان پرسی کۆتا داواکارییت بلێ، لە ژێر داری سێدارەکەیدا فەرمووی: دوو رکات نوێژ دەکەم، کە بە شێوەیەکی ئارامیو ئاسایی دوو رکات نوێژەکەی کرد، کاربەدەستی گەورەی ئامادەبووی روسیا وتی: "ئەوا عەفوم کردی، بەڕاستیی رێزم هەیە بۆ دینێك پیاوی ئاوا بە جەرگو ورە بەرز و چاونەترس پەروەردە دەکات".

ئووەیس (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: سوێند بێ دەبێ لەسەر زەویدا بەشێوەیەك خوا بپەرستم کە فریشتەکان لە ئاسمان دەیپەرستن.[١]

یونسی کوڕی موحەممەدی موئەددیب (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "حومادی کوڕی سەلەمە لە نوێژدا و لە مزگەوتدا گیانی دەرچوو".[٢]

تەلْق (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: موسڵمان لە نێوان دوو شتە زۆر چاکەکەدا دەمرێ، چاکەیەکیانی تەواو کردووە چاوەڕێی ئەویتریانە.[٣] واتە: نوێژ، بەردەوام لەم نوێژە بۆ ئەو نوێژە، لەمەیانەوە بەرەو پیری ئەوی تریان دەچێ.

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: مەسروقم پێگەیشت (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی سەعید هیچ نەماوە حەزمان لێ بێ مەگەر رووخسارمان لە خۆڵ وەردەین، خەفەت لە هیچ ناخۆم بێجگە لە سوژدە بردن بۆ خوای باڵا دەست کە لە دەستمان دەچێ.[٤]

---

[1] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٧٣.

[2] صلاح الأمة ج٢، ص٤١٣.

[3] صلاح الأمة ج٢، ص٣٩٠.

[4] صلاح الأمة ج٢، ص٣٧٥.

## دوو پاشا به هۆی نوێژەوە دەستیان لە پاشایەتی هەڵگرت

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ) قال: "ان بني إسرائيل استخلفوا خليفة عليهم بعد موسى عليه السلام، فقام يصلي ليلة فوق بيت المقدس في القمر، فذكر امورا كان يصنعها فتدلى بسبب، فاصبح السبب معلقا في المسجد وقد ذهب. قال: فانطلق حتى أتى قوما على شط البحر فوجدهم يضربون لبنا، أو يصنعون لبنا، فسألهم: كيف تأخذون على هذا اللبن؟ قال: فاخبره. فلبن معهم فكان يأكل من عمل يده، فإذا كان حين الصلاة قام يصلي، فرفع ذلك العمال الى دهقانهم: أن فينا رجلا يفعل كذا وكذا، فأرسل اليه فابي أن ياتيه (ثلاث مرات) ثم إنه جاء يسير دابته. فلما رآه فر، فاتبعه فسبقه، فقال: أنظرني أكلمك، قال: فقام حتى كلمه فأخبره خبره، فلما اخبره أنه كان ملكا وأنه فر من رهبة ربه، قال: أني لأظنني لأحق بك، قال: فاتبعه فعبدا الله حتى ماتا برميلة مصر". قال عبدالله: لو أني كنت ثم لاهتديت الى قبرهما بصفة رسول الله ﷺ التي وصف لنا".**

حسن[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بەنی ئیسرائیل لە دوای پێغەمبەر موسا خەلیفەیەکیان دیارییکرد، شەوێکی مانگەشەو نوێژی دەکرد، هەندێ خراپەی بیرکەوتەوە کە لەوەوپێش کردبووی، بە پەتێك خۆی داهێشت، بەیانی پەتەکە بە هەڵواسراوی بە مزگەوتەکەوە مابووەوەو پاشاش ڕۆیشتووە، فەرمووی: پاشا ڕۆیشت، هەتا بە لای کۆمەڵێ خەڵکدا تێپەڕی لە ڕۆخی دەریا خشتیان دەبڕی، یان کاری خشتیان دەکرد. پرسیاری لێکردن: چۆن کرێ وەردەگرن لەسەر ئەم خشتە؟ فەرمووی: ئەوانیش هەواڵیاندایە، دەستی کرد بەخشت بڕین لەگەڵیان، ئیتر نانی دەستی خۆی دەخوارد، هەر کە کاتی نوێژیش دەهات هەڵدەستا نوێژی دەکرد، کرێکارەکان ئەم باسەیان بۆ گەورەکەیان "سەرەك هۆزەکەیان" گێڕایەوە. کە پیاوێکی ئاواو ئاوامان لەگەڵدایە، ئەمیش ناردی بە شوێنیا، ئەویش ڕازیی نەبوو بچێ، هەتا سێ جار، ئینجا کابرای سەرەك هۆز بە سواری وڵاخەکەی هات بۆ لای. کاتێ کابرای بینی ڕایکرد، ئەویش شوێنی کەوت، بەڵام نەیگەیشتێ، ناچار پێی وت: مۆڵەتم بدە قسەت لەگەڵ

---

[1] أخرجه البزار ١٩٩٠ وأحمد والطبراني في الكبير ١٠٣٧٠ وغيرهم وحسنه الألباني في الصحيح ١٨٢٢.

دەکەم، فەرمووی: وەستا هەتا قسەی لەگەڵ کرد، ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، کاتێ هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە کە پاشا بووەو لە ترس‌و بیمی خوا رایکردووە، فەرمووی لێت مەعلوم بێ منیش شوێنت دەکەوم، فەرمووی: شوێنی کەوت، دەستیان کرد بە خواپەرستیی هەتا هەردووکیان لە رومەیلەی میسر مردن. عەبدوڵڵا فەرمووی: ئەگەر من لەوێ بوومایە گۆڕەکەیانم نیشان ئەدان بە گوێرەی ئەو وەسفەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بۆی کردین.

## نوێژخوێنان دۆستی خودانو لە بەهەشتدا لەگەڵ پێغەمبەردان

**عن عمر الليثى (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ في حجة الوداع: "إن أولياء الله المصلون ومن يقيم الصلوات الخمس التي كتبهن الله عليه ويصوم رمضان ويحتسب صومه ويؤدي الزكاة محتسبا طيبة بها نفسه، ويجتنب الكبائر التي نهى الله عنها، فقال رجل من أصحابه: يا رسول الله وكم الكبائر؟ قال: تسع أعظمهن: الأشراك بالله، وقتل المؤمن بغير حق، و فرار من الزحف، وقذف المحصنة، والسحر، وأكل مال اليتيم، وأكل الربا، وعقوق الوالدين المسلمين واستحلال البيت الحرام قبلتكم احياء وامواتا، لايموت رجل لم يعمل هؤلاء الكبائر ويقيم الصلاة ويؤتى الزكاة الا رافق محمدا ﷺ في بحبوحة الجنة، أبوابها مصاريع الذهب".** [1] واتە: لە عومەیری لەیسییەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، لە حەجیماڵئاواییدا فەرمووی: بەراستی دۆستانی خوا نوێژخوێنانن، هەرکەسێ پێنج فەرزەی نوێژ بکات کە خوا لەسەری پێویست کردووە، رۆژووی رەمەزان بگرێ بە تەمای خوا، زەکاتیش بدا بە تەمای خواو لە ناخی دڵییەوەو بە خۆشحاڵیەوە، خۆی لە گوناهە گەورەکان بپارێزێ کە خوا قەدەغەی کردووە، پیاوێك لە هاوەڵانی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوناهە گەورەکان چەندن؟ فەرمووی: نۆ دانەن، گەورەترینیان هاوبەشدانانە بۆ خواو کوشتنی

[1] رواه الطبراني في الكبير ١٠١ وقال إسناده حسن، والترغيب والترهيب، ١١١٣، وقال البخاري فيه نظر، ولبعضه شواهد صحيحة، وضعفه عبدالحميد بن سنان، ونضرة النعيم ج٩، ص٤٣١٣ وصحيح وصايا الرسول.

بڕوادار بە ناهەقو راکردن لە جەنگو بوختانکردن بۆ ئافرەتی داوێنپاك، جادوو کردن، خواردنی ماڵی هەتیو، خواردنی سوو، ئازاردانی باوكو دایکی موسڵمانو حەلاڵکردنی ماڵی بەرێزی خوا کە رووگەتانە بە زیندوویی‌و مردوویی، هەر کەسێك بمرێو ئەم گوناهە گەورانە نەکات و نوێژ بە چاکی بکاتو زەکات بدات، بێگومان هاورێی موحەممەد دەبێ (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لە ناوەڕاستی بەهەشتێکدا، کە لاشیپانی دەرگاکانی ئاڵتونە.

## نوێژخوێنان لەو کەسانەن زۆر یادی خوا دەکەن

نوێژ لە دابەستنیەوە تا سەلامدانەوە تەواوی یادی خوایەو سوپاسو ستایشو نزاو پاڕانەوەو پەنابردنو پشت بەستنە بە خوایە، نوێژ لە دەستپێکردنەوە هەتا کۆتایی دەربڕینی پەسنی‌و بێگەردی خوایە، باسی گەورەیی‌و دەسەڵاتو شکۆداریی خوایە، هەموو ئەو بابەتانە یادی خودانو لە سنووری یادی ئەو دەرناچن. کەواتە تەواوی نوێژ لەسەرەتاوە هەتا سەلامدانەوە هەمووی یادی خودایەو نوێژخوێنانی راستەقینەش لەو کەسانەن بەردەوام یادی خوا دەکەن، بە شەو و بە رۆژ، بە پێوەوە بە دانیشتنەوە، لەسەر تەنیشتو بە راکشانەوە، لە چۆڵەوانی‌و ئاوەدانی، بە پیادەو بە سواری، لەسەرو لە خوار، برسی بن، یان تێر.

**قال رسول الله ﷺ: "إذا استيقظ الرجل من الليل وأيقظ أهله وصليا ركعتين كتبا من الذاكرين الله كثيرا والذاكرات".** (صحيح[1]) واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) فەرمووی: "ئەگەر پیاوێك شەو لە خەو بە خەبەر بێتو خێزانەکەی بەئاگا بێنێ‌و بە یەکەوە دوو رکات نوێژ بکەن، لەو ژنو پیاوانە دێنە ژمار کە زۆر یادی خوا دەکەن، پاداشتی ئەو کەسانەش لە قورئاندا دیاریکراوە کە بریتییە لە **".. أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً"**. (الأحزاب: ٣٥). واتە: خوا لێخۆشبوونو پاداشتی هەرە گەورەی ئامادە کردووە بۆ ئەوان.

وشەی **(الذكر)** یاد، بە مانای لە بیرنەکردن و بە مانای پاراستنی شتو ئەو شتەی بەسەر زماندا دێت، ستایشی چاکە، هەموو ئەو واتایانەش لە نوێژدا هەیە، چونکە

---

[1] رواه أبوداود ١٤٥١ وغيره

نوێژ یادی خوای تیادا دەکرێ، لە بیرنەکردنی خوایە، وەکو خوا بە موسای فەرموو **"وأقم الصلاة لذكري"**. واتە: نوێژ بکە هەتا منت لە یاد بێت.

هەروەها نوێژ پاراستنی خاوەنەکەیەتی لە خراپەو بێفەرمانیی خوا، بە تایبەتی لەناو نوێژەکەدا زۆرشتی حەڵاڵیشی لێ حەرامە، وەکو قسەکردن و خواردنو جوڵان.. هتد.

نوێژ وەکو یادی خوا بە زمان دەکرێ، لە هەمانکاتدا ستایشی خواشە، هەر لە قورئاندا وشەی **(الذكر)** هاتووە بە واتای پێنج فەرزی نوێژ **"فَإِذا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّه"**. **(البقرة: ٢٣٩)**. واتە: ئەگەر ئەمین و ئارام بوونەوە پێنج فەرزەی نوێژ بکەن.

هەروەها نوێژی عەسر بە **(ذكر)** ناوبراوە لە قورئاندا **"إني أحببت حبّ الخير (أو الخيل) عن ذكر ربي"** (ص٣٢). واتە: سەرقاڵیی‌و دڵخۆشبوونم بە رەوە ئەسپەکانەوە نوێژی عەسری لە بیر بردمەوە. وشەی (الخير) واتە: ماڵ، یان (الخيل) واتە: ئەسپ. دوای خۆرئاوابوون حەزرەتی سولەیمان (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) نوێژی عەسری بیرکەوتەوە.[1] چونکە سەرقاڵی سەیرکردنی رێورەسمی نمایشی رەوە ئەسپەکانی سوپاکەی بووە.

## مشتومڕو گفتوگۆی فریشتەکان دەربارەی سێ شتە، کە هەرسێکیان لە بازنەی نوێژدان

**عن إبن عباس (رضي الله عنهما) قال قال رسول الله ﷺ: "أتاني الليلة ربي تبارك وتعالى في أحسن صورة، فقال: يامحمد هل تدري فيم يختصم الملأ الأعلى؟ قلت: لا، فوضع يده بين كتيفي، حتى وجدت بردها بين يدي، فعلمت ما في السموات وما في الأرض، فقال: يامحمد هل تدري فيم يختصم الملأ الأعلى؟ قلت: نعم، في الكفارات والدرجات، والكفارات المكث في المساجد بعد الصلوات والمشيء على الأقدام الى الجماعات، وإسباغ الوضوء في المكاره. قال: صدقت يامحمد. ومن فعل ذلك عاش بخير ومات بخير وكان من خطيئته كيوم ولدت امه وقال: يامحمد إذا صليت فقل: اللهم إني أسألك فعل الخيرات وترك المنكرات، وحب المساكين،**

---

[1] زاد المسير ج١٠ ص٢٣.

**وأن تغفر لي، وترحمني، وتتوب علي، وإذا أردت بعبادك فتنة فاقبضنى اليك غير مفتون. والدرجات: إفشاء السلام وإطعام الطعام، والصلاة بالليل والناس نيام".**[١]
واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بە خزمەتی خوا گەیشتم و هات بۆ لام لە جوانترین دیمەندا، فەرمووی: ئەی موحەممەد ئایا دەزانی دەستەی باڵا (فریشتەکان) دەربارەی چی دەدوێنو گفتوگۆیانە؟ وتم: نەخێر. دەستی لە نێوان هەردوو دەفە شانمدا دانا، هەتا هەستم بە فێنکیی کرد لە نێوان مەمکەکانمدا، هەرچی لە ئاسمانو زەویدایە فێری بووم، فەرمووی ئەی موحەممەد: دەزانی دەستەی باڵا (فریشتەی ئاسمان) مشتومڕو گفتوگۆ لەسەر چی دەکەن؟ وتم: بەڵێ، لە سڕەرەوەی گوناهەکان (الکفارات) و پلە بەرزەکان. سڕەرەوەی گوناهەکان بریتین لە مانەوە لە مزگەوت دوای نوێژەکان، ڕۆیشتن بە پێ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەتو دەستنوێژگرتن لە کاتی ناڕەحەتییدا، فەرمووی: ڕاست دەکەی ئەی موحەممەد، جا هەرکەس ئەوە بکات بە خێر دەژیو بە خێر دەمرێو دەربارەی گوناهەکانیشی وەکو ڕۆژی لە دایکبوونی لێدێ، فەرمووی: ئەی موحەممەد هەرکات نوێژت کرد بڵێ: خوایە داوای کردنی چاکەکانو دوورکەوتنەوەی خراپەکانو خۆشەویستی هەژارانو لێخۆشبوونمو بەزەیی هاتنەوەت پێمداو تەوبە گیرابوونت لێدەکەم، ئەگەر ویستت بەڵاو فیتنە دابارێنی بەسەر بەندەکانتا من ببەرەوە لای خۆت بەبێ گرفتار بوون. پلەکانیش بڵاوکردنەوەی سەلامو ئاشتیو خواردن بە خشین بە هەژارانو شەونوێژ لە کاتێکدا خەڵکی لە پرخەی خەودان.

## مزگەوت ڕەمزی پیرۆزیی بووە لای گەلانی پێش ئیسلام

پەرستگە پیرۆزترین شت بووە لە لای هەموو گەلەکانو دروستکردنو بونیادنانو سازکردنی شوێنی خواپەرستییان بە خێرو مایەی ڕەزامەندیی خواو سەربەرزی دونیاو دوارۆژی خۆیان زانیوە.

---

[1] صحيح. صحيح الجامع الصغير وزيادته ٥٩. وصحيح الترغيب والترهيب ٤٠٥ و٤٥١ والترغيب والترهيب ٦٣٧ وترتيب الأحاديث "صحيح الجامع الصغير وزيادته" ج١، جزء٢، باب فضل أنتظار الصلاة والمشي اليها.

له مێژه لەناو هەموو گەلاندا کەنیسەو کڵێساو دێرو مزگەوت هەبووەو بەرزو پیرۆز ڕاگیراوەو ڕێگە نەدراوە کەس سوکایەتییو بێئەدەبی بەرامبەری بکاتو بە مایەی سەربەرزیی خۆیان زانیوە و شانازییان پێوە کردووەو پارەو ماڵی حەڵاڵو زوڵاڵو ڕەنجی شانی خۆیان تیادا خەرج کردووەو وەستاو بیناسازیی تایبەتیو دەسترەنگییان بۆ پەیدا کردووە.

دەربارەی یارانی ئەشکەوت کە خەڵکی ئەو سەردەمە گفتوگۆیەکی زۆریان کرد ئاخۆ کام شێوە گڵکۆیان بۆ هەڵبەستنو نەزەرگەو تەلاریان بۆ سازدەن، لە دوای مشتومڕو گفتوگۆیەکی زۆر قسەیان یەکلاکردەوە لەسەر دروستکردنی مزگەوتێکی قەشەنگ لەسەر گڵکۆی ئەو خواپەرستە گەورانە، خوا دەفەرموێت: **"قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِداً"**. (الكهف: ٢١)

## خۆشەویستترین نوێژ بە لای خواوە

هەموو جۆرەکانی خواپەرستیی خوا دایناونو کردونیە ئەرکی بەندەکانی، بەڵام هەندێ لە خواپەرستییەکانی خێریان زیاترەو بە نەکردنیشیان بەندە تاوانبارترو گوناهبارتر دەبێت، نوێژ لە هەموو جۆرەکانی پەرستن گەورەترو خێری زیاترە، وازلێهێنانیشی گوناهو تاوانی لە وازلێهێنانی هەموو پەرستنەکانی تر زیاترە، نوێژیش هەندێکیان خێریان زیاترەو پاداشتیان زۆرترە لەوانی تر، وەکو نوێژی ئەو کەسەی بۆ نوێژکردن دەچێتە مزگەوت، یان بە جەماعەت نوێژەکانی دەکات، یان ماڵی دوورە لە مزگەوتەوەو بەردەوام ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبێ بە هۆی دووریەکەیەوە هاتوچۆی مزگەوتو جەماعەت پەکناخات، یان وەکو ئەو نوێژانەی لە چۆڵەوانییدا دەکرێن، یان بە نهێنی دەکرێنو کەس ئاگای لێیان نییە، کە هەر نوێژێکی بە پەنجا نوێژە، هەروەها وەکو دەستنوێژگرتن لە وەرزی سەرماو سۆڵدا، یان دەستنوێژگرتن بە ئاوی ساردو یان نوێژکردنی بابای نەخۆشو دەردەدار.

**عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "أحب الصلاة إلى الله صلاة داود، وأحب صيام الى الله صيام داود، كان ينام نصف الليل**

**ويقوم ثلثه وينام سدسه، ويصوم يوما ويفطر يوما".**[1] واته: له عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خۆشەویستترین نوێژ بە لای خواوە نوێژی داودە، خۆشەویستترین ڕۆژوو بە لای خواوە ڕۆژووی داودە، عادەتی وابوو نیوەی شەو دەخەوتو سێیەکی شەو شەونوێژی دەکرد، دووبارە شەش یەکی دەخەوتو ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو.

## بڕواداران بە هۆی نوێژەوە دەبنە برا

چۆن خەڵکی بە هۆی دایكو باوكو شیرخواردنەوە دەبنە برا، جۆرێکیش لە برایەتی یەکدەنگ بوونو پابەندبوونی کۆمەڵێکە لەسەر بەرنامەیەك، جا ئەگەر کەسانێك لەگەڵ شەیتان، یەك بگرنەوە و یەك بەرنامە پەیڕەو بکەن ئەوە پێیان دەوترێ: **(إخوان الشياطين)** واتە براکانی شەیتان وەکو خوا دەفەرموێت: **"إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ...."**. واتە: ئەوانەی زۆر زیادەڕەویی دەکەن لە هەڵەخەرجییدا، برای شەیتانەکانن.

هەروەها پەیوەست بوون بە یەك هۆزو گەلو نەتەوەوە خەڵکی دەکاتە جۆرێکی تر لە برا، وەکو خوا دەفەرموێت: **"أَخَا عَادٍ"** برای هۆزی عاد کە مەبەست پێی (هود) پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێ)، ئەوانەش خوا هودی بە برایان ناو بردووە کافرو بێدین بوونو بڕواشیان بە هود هەر نەبووە.

لە چەند شوێنی تردا لە قورئاندا ئەو جۆرە دەقانە هەیە بۆ نموونە: **"وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً"** واتە: بۆ (مەدیەن)یش (شوعەیب)"ی برای خۆیانمان نارد.

مەبەستم ڕێخۆشکردن بوو بۆ گەیشتنو تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی ئەم بابەتە کە بڕوادارانیش بە هۆی ئیمانەوە دەبنە برا، خوا دەفەرموێت: **"إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ"** واتە: تەنها بڕواداران برای ڕاستەقینەن. هەروەها بە هۆی نوێژەوە کە هەموویان نوێژخوێنن و بەیەك شێوە نوێژ دەکەن و یەك ڕێوڕەسم و دینو بەرنامەیان هەیە

---

[1] رواه البخاري ١٠٧٩ ومسلم والترغيب والترهيب ٩٠٥ الطبعة الاولى.

پەیڕەوی دەکەن. خوا دەفەرموێت: "فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ". (التوبة: ١١). واتە: جا ئەگەر بەڕاستیی تەوبە بکەنو نوێژەکانیان بە چاکیی بکەنو زەکات بدەن، ئەوە برای ئاینیی ئێوەن، کەواتە موسڵمان بە هۆی دینو نوێژەکانیانەوە دەبنە برای راستەقینەی یەکتر، هەرچەند لە یەك دایكو باوك، یان یەك هۆزو عەشیرەت، یان یەك گەلو نەتەوەش نەبن.

نوێژ خاوەنەکانیو نوێژخوێنان یەکدەخات لەسەر پەیڕەو کردنی یەك جۆر کردارو رەفتارو گوفتار لە قورئانخوێندنو هەڵسانو دانیشتنو کڕنوشو سوژدە بردن، هەموویان لە نوێژدا یەك سورەت لە قورئان دەخوێنن کە سورەتی فاتیحەیە، بەبێ ئەو سورەتە نوێژەکانیان بەتاڵە، هەموو بە یەك شێواز دەستنوێژ دەشۆرن، یەکسانن لەو شتانەدا کە دەستنوێژیان پێی دەشکێو نوێژیان پێی بەتاڵ دەبێتەوە، فەرزیان یەك فەرزەو سووننەتیان یەك سوننەتە، یەك خوایان هەیەو نوێژی بۆ دەکەن، یەك رووگەیان هەیە رووی تێدەکەن و هەرکەس بە عەمدەن رووی تێنەکات لە نوێژدا، نوێژی بەتاڵە. بە کورتی جیاوازیی لە گەورەیی و بچووکیيو دەسەڵاتدارو بێدەسەڵاتو پاشاو گەداو نێر و مێدا نییە، مەگەر لە حاڵەتی نائاسیی و ناچارییدا.

بۆیە نوێژ کراوەتە رەمزی برایەتیی لە نێوان موسڵمانانداە.

## ئادەمیزاد بە نوێژ دەبێتە موسڵمانی راستەقینە

ئیمان کەمو زیاد دەکات، نوێژ چاکەو بە چاکییو بە چاکترو بە چاکترین شێوە ئەنجام ئەدرێ، هەروەکو بە تەمەڵییو بە بێگارییش دەکرێ. ئەوکەسەی نوێژ بە چاکترین شێوە ئەنجام بدات، ئەو نوێژە هاندەرو رێگەخۆشکەرو سەرمەشقی دەبێت بۆ کردنی هەموو چاکەیەكو وتنی هەموو چاکەیەكو دەبێتە قەڵغانو سوپەرێك دەیگێڕێتەوە لە هەموو خراپەیەك، کەسێکیش ئامادەی کردنی هەموو چاکەیەك بێتو پارێز لە هەموو خراپەیەك بکات، دەبێتە چاکترینو بەرێزترین ئادەمیزاد.

خوا دەفەرموێت: "إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ * الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ * أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقّاً لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ

كَرِيمٌ". (الأنفال: ٢ ـ ٤). واتە: بەڕاستیی موسڵمانانی ڕاستەقینە ئەوانەن ئەگەر یادی خوا بکرێ دڵەکانیان ترس دای دەگرێو ئەگەر ئایاتو بەڵگەکانی ئەویان بەسەردا بخوێنرێتەوە بڕوایان زیاد دەکاتو پشت هەر بە خوا دەبەستن، ئەوانەی نوێژەکانیان بە چاکیی ئەنجام ئەدەن لەو ڕۆزیەی پێمان داون دەبەخشنو خەرج دەکەن بۆ هەژاران، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، چەندەها پلەو پایەیان هەیە لای پەروەردگاریان، هەروەها لێخۆشبوونو بژێوی پەسەندیش.

## نوێژخوێن شایستەی بەزەیی خودایە

خوا بەزەیی بە هەر کەسو گەلێکدا بێتەوەو ڕووی بەزەیی تێبکات، لێی خۆش دەبێت، تەواوی پێغەمبەرەکانو زانایانو پیاوچاکانو خواپەرستان داوای بەزەیی خوا دەکەن **"قطرة من رحمته تجعل الكافر وليا"**، واتە: دڵۆپێ لە بەزەیی خوا کافری پێ دەبێتە دۆستی ڕاستەقینەی خوا.

نوێژخوێن پێشەنگی ئەو کەسانەیە کە خوا بەزەیی خۆی دەڕێژێ بەسەریاندا، لەبەر ئەو کارە گەورەو پەسەندەی ئەنجامی داوە کە نوێژکردنە. خوا دەفەرموێت: **"وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْض يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ"** (التوبة: ٧١). واتە: بڕوادارانی پیاو و ئافرەت دۆستو خۆشەویستو لایەنگری یەکترن، فەرمان دەکەن بە چاکەو، ڕێ دەگرن لە خراپە، نوێژەکانیان بە چاکیی ئەنجام ئەدەنو زەکات ئەدەن، گوێڕایەڵو بەرفەرمانی خودان، ئەوانە لەمەودوا خوا بەزەیی خۆی دەڕژێنێ بە سەریاندا، بەڕاستیی خوا بە دەسەڵاتو کارزانو دانایە.

## چاکترین و خۆشەویستترین نوێژی ئافرەتان بە لای خواوە

خوای گەورە خۆشی دێت لە هەموو نوێژو نوێژخوێنێك، بە تایبەتی لە نوێژێك کە زیاتر ڕۆحو گیانو دڵو دەروون پابەندو پەیوەستی خوا دەکاتو هەموو مەرجو پایەو سوننەتەکانی تیادا ئەنجام درابێتو خاوەنەکەی لە هەموو خراپەو بێفەرمانییەکی خوا دوور بخاتەوە، هەروەها نوێژێك لە تاریکیی و چۆڵەوانیی بکرێت و خوا نەبێ کەس ئاگاداری نەبێت.

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: ما صلت امرأة من صلاة أحب الى الله من أشد مكان في بيتها ظلمة. حسن لغيره** [1]واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئافرەت هیچ نوێژێکی نەکردووە چاکترو خۆشەویست تر بێت لە نوێژێك لە تاریکترین شوێنی ماڵەکەیدا بیکات.

**وعن إبن خزيمة (رضي الله عنه) في صحيحه من رواية إبراهيم الهجري عن أبي الأحوص عنه (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ قال: إن أحب صلاة المرأة الى الله في أشد مكان في بيتها ظلمة. حسن لغيره.**[2]واتە: ئیبن خوزەیمە لە سەحیحەکەیدا لە ریوایەتی ئیبراهیمی هەجریەوە ئەویش لە ئەبی ئەحوەصەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: چاکترین و خۆشەویستترین نوێژی ئافرەت بە لای خواوە نوێژی ئافرەتێکە لە تاریکترین شوێنی ماڵەکەیدا بیکات.

کەوابوو هەر ئافرەتێك کچ بێت، یان ژن، ئەگەر حەز دەکات خۆشەویستیی و لێخۆشبوونی خوا بەدەست بێنێت، با لە تاریکە شەودا لە کاتێك خەڵکی لە پرخەی خەودان، چەند رکات نوێژ بکات، هەروەها بە رۆژیش با لە چۆڵترین و تاریکترین شوێنی ماڵەکەیدا نوێژ بکات، هەتا سەرقاڵی هیچ شتێك نەبێتو خەیاڵی نەڕواتو داڵغەی لە نوێژ دەرنەچێو هەموو هەستو نەستو خەیاڵو خەتەرەو داڵغەو بیروهۆشی لە نوێژەکەیدا کۆبکاتەوە.

لەم روانگەیەوە **(حبيبة العدوية)** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) عادەتی وابوو کە نوێژی خەوتنانی دەکرد لەسەربانەکەی رادەوەستا قەڵغانو زرێی لە خۆی دەبەستو دەیفەرموو: "خودایە ئەستێرەکانت هوروژمیان هێناو دەرکەوتن چاوەکان خەوتن، پاشاکان دەرگای خۆیان داخست، دەرگای تۆ کراوەیەوە لەسەر پشتە، هەموو خۆشەویستێك لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا جوت بووە، ئەمەش پلەو مەقامی منە لەبەردەستدا.

---

[1] الترغيب والترهيب ٥١٠.

[2] الترغيب والترهيب ٥١٠.

## ئەو شوێنەی نوێژی لەسەر دەکرێ پیرۆزترین پارچەی سەرزەوییە

پیرۆزترین پارچەی سەر زەوی مزگەوتو شوێنی سوژدەو نوێژە، چاکترینو پیرۆزترین شوێنە، چونکە چاکترینو بەرێزترین نەوەی تیادا پەروەردە دەکرێت کە دەستپاکترینو داوێنپاکترینو بەرزترینو بەرێزترینو چاکەخوازترینو تەواوترین نەوەی سەرزەوی بوون، بە تایبەتی لە هاوەڵانو شوێنکەوتووە چاکەکانی ئەوان.

دووهەم پیرۆزترین شاری سەرزەوی کردنەوەو دەستپێکردنی ژیانی پیرۆزی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێبێ)و بەردی بناغەی دەوڵەتی ئیسلامو گۆڕانکاریی ڕێڕەوی مێژوو بە دروستکردنو دانانی بەردی بناغەی مزگەوت دەستی پێکرد بە دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت)، خوا دەفەرموێت: **"لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ"**. واتە: بەڕاستیی مزگەوتێك شایستەیە نوێژی تیادا بکەیتو تیایدا بوەستی لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی خواناسیو پارێزکاریی بناغەی دارێژراوە.

**روى إبن يعلي باسناد حسن عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: مامن بقعة يذكر الله عليها بصلاة.. إلا إستشرقت بذلك إلى منتهاها إلى سبع أرضين، وفخرت على ماحولها من البقاع.."**.[1] واتە: ئەبو یەعلی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) گێڕاویەتییەوە بە سەنەدێکی باش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: هەر پارچە زەوییەك کە یادی خوای لەسەر بکرێ بە نوێژکردن، بەو نوێژە ئەدرەوشێتەوەو هەتا کۆتایی حەوت توێخی، یا حەوت چینی زەوی هەموو پارچەکانی دەوروپشتی سەریان نەویە لە خزمەتیا. هەروەکو لە ئاسمانیش خوا سوێندی پێ خواردووە **"والْبَيْتِ الْمَعْمُورِ"** (الطور: ٤). واتە: سوێن بە بيت المعمور. کە مزگەوتو شوێنی نوێژە لە ئاسمانی حەوتەم، لە فەرمودەکەی ئەنەس و مالیکی کوڕی صەعصەعەدا هاتووە لە هەردوو سەحیحی بوخاریو موسلیمدا.[2]

---

[1] فضل الصلاة ص٥٥.

[2] زاد المسير ج٧ ص٣٦٢. والسيرة النبوية للصلابي ج١ ص٣٩٠ وزبدة التفسير ص٦٩٦ في تفسير الطور. وكنز العمال ج١٢ ص١٠٣.

دەربارەی پیرۆزترین شوێنو پارچەی زەوی، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: **"خير البقاع المساجد، وشر البقاع الأسواق"**.[1] واتە: باشترینو چاکترین پارچە زەوی مزگەوتەکانە، خراپترین پارچە زەوی بازاڕەکانە.

**وروى إبن حبان في صحيحه "إن خير ما ركبت إليه الواحل مسجدي هذا والبيت العتيق". صحيح**[2] واتە: بەڕاستیی باشترین شوێنێك کاروانی بۆ بەڕێ بکرێ ئەم مزگەوتەی منەو مزگەوتی دێرینە (البيت العتيق). چۆن مزگەوتو سوژدەگا پیرۆزترینە لە تەواوی پارچەکانی تری سەر زەوی کە لە تەواوی شوێنەکاندا بەری پێ لەسەر زەویە، بەڵام لە مزگەوتا ناوچەوانو سەری بڵند لەسەر زەویە، شوێنەکانی تر ماڵی خەڵکنو مزگەوتەکان ماڵی خودان.

## نوێژ هاندەرە بۆ کاسبی

قیزەونترین شت بە لای خواوە سواڵکردنو دەست پانکردنەوەیە، هەروەکو ماڵپەرستییو رەزیلی و پیسکەیی سیفەتێکی ناشیرینو ناپەسندە.

ئەبوبەکری سدیق (رەزای خوای لێ بێ) لەگەڵ پاشگەزبووەکان لە ئیسلام جەنگی بەرپاکرد، چونکە خۆیان بە موسڵمان دەزانیو زەکاتیان نەئەدا، ئیسلام دینێکی مامناوەندییە، نە سواڵ کردن بە حەڵاڵو زوڵاڵ دەزانێ، نە چروکیو پیسکەییو رژدی بە سیفەتێکی موسڵمانانەو مەردانە دادەنێ. بۆیە هەر خودی نوێژ هاندەرە بۆ کاسبی، بەڵکو دەبێ نوێژەکە دەروونو گیانی پەروەردە بکات، کە دەروون بەرزو شکۆدار بێتو سواڵکردنو زەلیلی بە کوفرو ریسوایی دونیاو دواڕۆژ دەزانێو سواڵکردنیش مایەی غەزەبو خەشمو قینی خواو خەڵکی خوایە.

خوا دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ * فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ" (الجمعة: ٩ ـ ١٠)** واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژ ڕۆژی

---

[1] صحيح الجامع ٣٢٧١.

[2] الترغيب والترهيب ١٨١٣.

هەینی، بە گورجو گۆڵیی بچن بەدەم یادی خواوە کە نوێژە واز بێنن لە کڕینو فرۆشتن، ئەوە خێرترە بۆ ئێوە ئەگەر دەزانن، هەرکاتیش نوێژ تەواو بوو بە زەویدا بڵاو ببنەوەو بۆ چاکەی خوا بکۆشن و زۆر یادی خوا بکەن، بە ئومێد بن رزگارتان بێت.

## یەکەم هەنگاوی پێغەمبەرایەتی موسا (علیه السلام) بە نوێژ دەستی پێکرد

یەکەم ئەرکی خوایی‌و یەکەم جۆری خواپەرستیی کە خوا لە پێغەمبەرەکانی داوا کردووە، دوای هەڵبژاردنیان و کردنیان بە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوایان لێ بێ)، نوێژو نزاو پاڕانەوەو پەیوەندیی نێوان بەندەو خوایە، ملکەچو گەردنکەچی بەندەیە بۆ پەروەردگاری. پێغەمبەرەکانیش (سەڵاتو سەلامی خوایان لێ بێ) لە هەموو کەس شایستەترو لە پێشترن بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی لەگەڵ خواو نزاو پاڕانەوەو پەیوەستبوونی دڵو دەروون بە خواوە، خوا دەربارەی حەزرەتی موسا دەفەرموێت: **"وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى * إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي"**. (طه: ١٣ ـ ١٤). واتە: من بۆ خۆم تۆم دەستنیشان کردووە دەی گوێ بگرە بۆ نیگاو راسپێری بەڕاستیی من خوام (الله) جگە لەمن خودای تر بەحەق نییە، دەسا تۆ هەر من بپەرستەو نوێژ بە چاکیی بکە هەتا منت لەیاد بێتو یادی من بکەیتەوە.

جا دوای ئەوەی خوا وەسیەتو فەرمانی خۆی بە موسا گەیاند، کە هیچ خوایەك بە حەق نییە، بێجگە لە (ألله)و نوێژەکانیشی بە چاکیی بکات، ئینجا راسپاردەی پێغەمبەرایەتییەکەی پێراگەیاند، ئەویش داواکارییەکانی دەربڕیو داوای لە خوا کرد بۆی جێبەجێ بکات، ئینجا فەرمووی: **"كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيراً"**. (طه: ٣٣). واتە: هەتا زیاتر پاکییو پێگەردیو پەسەندی تۆ دەربڕین.

ئیبن عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: هەموو وشەی (تسبیح)ێك لە قورئاندا بە واتای نوێژە. واتە: هەتا زیاتر ئێمە نوێژ و تەسبیحات بکەین.

## باشترین كەس نەرمو نیانترین كەسە لە نوێژدا

نوێژ قوتابخانەی فێرخوازییە، نوێژخوێنان فێر دەكاتو رایان دێنێو مەشقیان پێدەكات لەسەر خۆراگریو دڵنەرمییو بەزەییو پەروەردەی هەموو رەوشتو ئاكارو رەفتارێكی جوانیان دەكات. فێری پاكو خاوێنیو پشوودرێژییو لێبوردەییو دڵفراوانییو نزیكبوونەوە لە خواو خەڵكی خوا دەكات. فێریان دەكات چۆن لەگەڵ دروستكراوەكانی خوادا هەڵسوكەوت بكەنو بەدەم تەواوی رێبوارانی رێگەی بەرەو خوا چوونەوە بێتو هەموو كارئاسانییەك بۆ غەیری خۆی بە خواپەرستیی بزانێ. پێغەمبەری ئیسلام (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: **"خیاركم لینكم في الصلاة".** [1] واتە: باشترینتان نەرمو نیانترینتانە لە نوێژدا.

## بە نوێژ دەبێتە چاكترین پیاو

چاكترین و خواناسترین كەس ئەو كەسەیە لە هەمووان زیاتر پابەندی فەرمانی خوا بێت بە كردنی چاكەو دووركەوتنەوە لە خراپە. چاكترین و ئاسانترین رێگەش بۆ جێبەجێكردنی ئەو دوو خاڵە، نوێژكردنە. خوا دەفەرمووێت: **"وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ" (البينة: ٥)** واتە: فەرمانیان پێنەكراوە تەنها بە پەرستنی خوا بە دڵسۆزییو بێگەردییو ئەنجامدانی نوێژەكانیان و زەكاتدان نەبێت.

دەربارەی پارێزكارییش دەفەرموێت: **"إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ".** واتە: بەڕاستیی نوێژ كۆتایی دێنێ بەو خراپەكارییو ستەمكارییو ریشەكێشی دەكات.

جا كەسێك هەموو چاكەیەك ئەنجام بدات و لە هەموو خراپەیەك بە دوور بێتو خۆی كەنار بگرێت، ئایا نابێتە چاكترین و بەسوودترین تاكی كۆمەڵو كۆمەڵگا؟ بەڵێ، چاكترین كەسە، چونكە چاكترین كاری كردووە.

كاتێك باسی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر كرا (رەزای خوایان لێ بێ)، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: **"نعم الرجل عبدالله، لو كان یصلی**

---

[1] صحيح الجامع.

**من الليل"**. صحيح[1] واته: چاكترین پیاو عەبدوڵلایە ئەگەر شەونوێژ بكات. پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی لەسەر بێت) فەرموویەتی: **"إن عبدالله رجل صالح لو كان كثير الصلاة من الليل"**.[2] واته: بەڕاستیی عەبدوڵلا پیاوێكی چاكە ئەگەر زیاتر شەونوێژی بكردایە.

**حافظ إبن حجر** لە **(فتح الباري)**دا دەفەرموێت: لەم فەرموودەوە ئەوە وەردەگیرێ كە هەركەس شەونوێژ بكات وەسف دەكرێ بە چاكترین پیاو.[3]

## نوێژخوێن لەگەڵ پێغەمبەرانو راستگۆیانو شەهیدانە

نوێژكردن گرنگترین جۆری پەرستن بووە لای پێغەمبەرەكانو هەرگیز لە ماوەی تەمەنیاندا فەرامۆشیان نەكردووە، راستگۆیانو شەهیدانیش بە ئیمانی راستەقینەو پێشكەشكردنی خوێنی گەشی خۆیان بە پەروەردگاریان هاوڕێیەتی پێغەمبەرانیان لە بەهەشتا بەدەستهێناوەو مسۆگەریان كردووە، هەروەها نوێژخوێنانیش بە نوێژكردن ئەو پلە بەرزەیان دەست دەكەوێتو دەبنە هاودەمو هاوڕێی پێغەمبەرانو راستگۆیانو شەهیدان.

**عن عمرو بن مرة الجهني (رضي الله عنه) قال: جاء رجل الى رسول الله ﷺ فقال: يارسول الله شهدت ان لاإله الا الله، وانك رسول الله، وصليت الخمس واديت زكاة مالي وصمت رمضان، فقال رسول الله ﷺ من مات على هذا كان مع النبيين والشهداء يوم القيامة هكذا ونصب أصبعيه ما لم يعق والديه"**. واته: لە عەمری كوڕی موڕڕەی جوهەنییەوە (رەزای خوا لێ بێ) فەرمووی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بڕوام هێناوە كە هیچ خوایەك بە هەق نییە بێجگە لە (الله)، بڕوام هەیە كە تۆش پێغەمبەری خوایو پێنج فەرزەی نوێژ دەكەم و زەكات دەدەمو رۆژووی رەمەزانیش

---

[1] صحيح الجامع ٦٧٧١.

[2] (رهبان الليل ج١، ص١٦٩. رواه البخاري ومسلم وإبن ماجة صحيح الجامع ٢١٠١).

[3] (رهبان الليل ج١، ص١٦٩، نقلا عن فتح البارى ج٣، قيام الليل).

دەگرم، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوا لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەس لەسەر ئەوە بمرێت ئەوە لەگەڵ پێغەمبەرەکانو راستگۆیانو شەهیدانە لە رۆژی دواییدا، ئاوا هەردوو پەنجەی بە یەکەوە نوساند ئەگەر دایكو باوكی ئازار نەدابێ.

## گەورەترین پاداشت لە نوێژدا بۆ کێیە؟

پاداشتی هەرە گەورە بۆ ئەو کەسەیە زیاتر ماندوو دەبێت بە ئەنجامدانی نوێژ لەسەر سوننەت، ئەو کەسەی لە رێگەی دوورەوە دەچێتە مزگەوت خێری لە هەمووان زۆرترە، چونکە بە هەموو هەنگاوێك خێرێکی بۆ تۆمار دەکرێتو خراپەیەکی بۆ دەسڕێتەوەو پلەیەکیش بەرز دەبێتەوە، خواش دۆستو بەندەی ئاوا دڵسۆزی خۆش دەوێ کە لە دوورەوە هەموو جارێ سەردانی ماڵەکەی بکات.

**عن أبي موسى (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ أبعدهم اليها ممشى فأبعدهم، والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الإمام أعظم اجرا من الذي يصليها ثم ينام"**. صحيح. واتە: لە ئەبی موساوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: بەڕاستیی گەورەترین پاداشت لە نوێژدا بۆ ئەو کەسەیە لە دوورترین شوێنەوە دێتە نوێژ، ئەو کەسەش چاوەڕوانی نوێژ دەکات هەتا ئەنجامی ئەدات لەگەڵ پێشنوێژدا پاداشتی زۆرترە لەوەی نوێژەکەی دەکاتو دەخەوێ.

## گەورەترین نوێژ

نوێژ بە گوێرەی شوێنو کات، کەسی نەخۆشو ساخ، شەو و رۆژ، قەرەباڵغیی و چۆڵەوانییو نوێژکردن بە تەنیا بە کۆمەڵ، جیاوازیی لە خێرو پلەو پایەی نوێژو پاداشتی نوێژخوێندا هەیە.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: **"أفضل الصلوات عندالله صلاة الصبح يوم الجمعة في جماعة"**. صحيح[1] واتە: باشترین نوێژ بە لای خواوە نوێژی بەیانی رۆژی هەینییە بە کۆمەڵ.

---

[1] صحيح الجامع ١١١٩.

بەڵێ باشترین کردەوە نوێژە بە شاهیدی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت)، هەر بە فەرمودەی راستو دروستی پێغەمبەر باشترین نوێژیش نوێژی بەیانی و رۆژی هەینییە بە کۆمەڵ.

**وعن جندب بن سفيان (رضي الله عنه) قال: كان رسول الله ﷺ يقول: "ان أفضل الصلاة بعد المفروضة الصلاة في جوف الليل، وافضل الصيام بعد رمضان شهر الله الذي تدعونه المحرم". صحيح لغيره.**[1] واتە: لە جوندوبی کوڕی سوفیانەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: بەڕاستیی چاکترین نوێژ لە دوای نوێژە فەرزەکان نوێژی نیوەشەوە، چاکترین رۆژووش لە دوای رەمەزان رۆژووی ئەو مانگەیە کە پێی دەڵێن موحەڕڕەم.

## نوێژ ئارامییە

نوێژ گفتوگۆکردنو ئاخافتنە لەگەڵ پەروەردگاری ئادەمیزاد، کەواتە دەبێ بەوپەڕی ئارامیی‌و ئەدەبو هێمنییەوە ئەنجام بدرێتو نابێ کەسی نوێژخوێن لە ناو نوێژەکەیدا شپرزەو شەپۆکاو و شڵەژاو بێت، بەڵکو دەبێ بەوپەڕی ئارامیی‌و لەسەرخۆیی بچێتە ناو نوێژەکەیەوە، نابێ تەنگاو بێت، پێغەمبەری خوا قەدەغەی کردووەو رێگری کردووە، کە کەسێك تەنگاو بێتو نوێژ بکات، وەکو فەرموویەتی: **"نهى أن يصلي الرجل وهو حاقن". صحيح**[2]واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) قەدەغەی کردووە کەسێك نوێژ بکاتو تەنگاو بێت.

هەروەها دەفەرمووێت: **"إذا ثوب للصلاة فلا تأتوها وانتم تسعون، واتوها وعليكم السكينة فما أدركتم فصلوا، ومافاتكم فأتموا، فان أحدكم إذا كان يعمد الى الصلاة، فهو في الصلاة". صحيح**[3] واتە: ئەگەر بانگبێژ بانگی دا بۆ نوێژ، یان وتی: **(الصلاة خير من النوم)**، بە پەلە مەڕۆن بۆ نوێژ، بەڵکو بە ئارامیی بڕۆن، خۆتان

---

[1] الترغيب والترهيب ١٥٠٢ رواه النسائي ١٥٠٠ و الترغيب والترهيب عن أبي هريرة.

[2] صحيح الجامع ٦٨٣٢.

[3] صحيح الجامع ٤٥٦ء ٣٦٩ مع زيادة.

مەشڵەژێنن، ئەوەی فریاکەوتن بیکەنو ئەوەی فریانەکەوتن تەواوی بکەن، چونکە بێگومان ئەگەر یەکێکتان بە نیازی نوێژ بچێ ئەوە هەر لە نوێژدایە.

ئەگەر کەسێك لە کاتی هەستان بۆ نوێژ تەنگاو بوو، دەبێ لە پێشدا دەست بە ئاو بگەیەنێت، ئینجا نوێژەکەی بکات. پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: **"إذا أقيمت الصلاة وأراد الرجل الخلاء، فليبدأ بالخلاء"**. صحيح[1] واتە: ئەگەر قامەتکراو نوێژ دەستی پێکردو پیاوێك ویستی دەست بە ئاو بگەیەنێت، با لە پێشدا دەست بە ئاو بگەیەنێت.

هەروەها دەفەرمووێت: **"إذا أقيمت الصلاة، وحضر العشاء فابدؤا بالعشاء"**. **صحيح**[2] واتە: ئەگەر قامەتکراو خواردنیش ئامادە بوو دەست بە خواردنەکە بکەن. واتە خواردنەکە پێش بخەن، هەتا لەزەتو چێژ لە خواردنەکەش و نوێژەکەش وەرگرن. زانای خواناس (**ثابت البناني**) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"بیست ساڵ نوێژ ماندووی کردم، ئینجا بیست ساڵی تر لەزەتو چێژم لێوەرگرت"**.[3]

ئیبن زەید فەرموویەتی دەربارەی مانای ئەم ئایەتە (**هي أشد وطئا**). واتە: "نوێژخوێن لە شەونوێژدا زیاتر ئارامەو دڵی لەسەرخۆیەو سەرقاڵی هیچ نییەو هیچ کارو پێویستییەك ڕووی تێناکات".[4]

لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا نوێژەکە دەخرێتە دوای خواردنو خەو و دەست بە ئاو گەیاندن، هەتا یەکێك لەو شتانە ئارامیی و دامەزراویی نوێژەکە تێکنەداتو نەیڕاکێشێو خێری نوێژەکەش کەم نەبێتەوەو نەبێتە بێئەدەبیی بەرامبەر خوای کردگار. لەم ڕوانگەیەوە حەبیبەی عەدەویە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"اللهم اغفر لي سوء أدبي في صلاتي"**. واتە: یاڕەبی خوایە لە بێئەدەبیی ناو نوێژەکەم لێم ببوری".[5]

---

[1] صحيح الجامع ٣٧٣.

[2] صحيح الجامع ٣٧٤ والبخاري الفتح ٦٧١.

[3] (رهبان الليل ج١، ص٤٩).

[4] (رهبان الليل ج١، ص١١١).

[5] صلاح الأمة ج٢ ص٤٤٣.

نوێژ ئارامی بەخشی دڵو دەروونو ڕۆحو گیانە، ئەمەشە هۆی سەرەکیی بۆ کەمبوونەوەی دیاردەی نەخۆشی دەروونییو خەمۆکییو دڵەڕاوکێ لە وڵاتانی ئیسلامیی، بەڵکو لەناو گەلە موسڵمانە زۆر دواکەوتووەکانیشدا، خۆ ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ وڵاتانی پێشکەوتووی خۆرئاواو تەنانەت وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناموسڵمانیش دەبینی ئەو دەردو بەڵاو نەخۆشییە دەروونییو گیانیانە، لەو وڵاتانە زۆرترە، هەتا لە ناو موسڵماناندا[1]. هەرچەندە لە لایەنی خۆشگوزەرانیو پزیشکییو زانستییو زۆر شتی تریشدا لەگەڵ وڵاتانی ئیسلامییدا بەراورد ناکرێن و نێوانیان ئاسمانو ڕێسمانە.

خوا دەفەرموێت: **"فَإِذا قَضَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَاذْكُرُواْ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِكُمْ فإذا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَّوْقُوتاً".** **(النساء: ١٠٣)**. واتە: کە نوێژتان تەواوکردو لێبوونەوە یادی خوا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر ڕاکێشان، لە کاتی ئارامییو خاترجەمییدا بە چاکیی نوێژەکانتان بکەن، بەڕاستیی نوێژ لەسەر بڕواداران فەرزو پێویست کراوە لە کاتی دیارییکراودا.

## نوێژکردن بەجێگەیاندنی فەرمانی پێغەمبەرە ﷺ

لە چەندەها فەرموودەداو لە هەموو جۆرەکانی فەرموودەدا، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمانی کردووە بە نوێژکردنو بە کۆڵەکەو ستوونی سەرەکیی دینی ئیسلامی داناوەو لە دوای بڕواهێنان، بە بەهێزترینو پۆڵاترینی پایەی دینی داناوە. بۆیە هەرکەس نوێژی کرد فەرمانی پێغەمبەری بە ئەنجام گەیاندووە.

**عن إبن عباس (رضي الله عنهما)، قال: حدثني أبوسفيان في حديث هرقل فقال: "يأمرنا يعنى النبي ﷺ بالصلاة والصدق والعفاف والصلة..".**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرموویەتی: ئەبوسوفیان بۆی باس کردم لە فەرموودەکەی باسی هیرەقلدا، ئەبوسوفیان وتبووی: پێغەمبەر (سەڵاتو

---

[1] الايمان والحياة ص١٠٣.

[2] رواه البخاري ٧ ومسلم ١٧٧٣. ونضرة النعيم ج٦ ص٢٥٥٣ رقم ٨.

سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرمانمان پێدەکات بە نوێژکردنو خێرکردنو داوێنپاکیی و پەیوەندیی خزمایەتیی و..".

هەروەها لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) کە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) بە وەفدی عەبدولقەیسی فەرموو: **"آمركم بأربع، وأنهاكم عن أربع: آمركم بالإيمان بالله، هل تدرون ما الإيمان؟ شهادة أن لاإله الا الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة..".**[1] واتە: فەرمانتان پێدەکەم بە چوار شتو چواریشتان لێ قەدەغە دەکەم: فەرمانتان پێدەکەم بە ئیمان بە خوا، ئایا دەزانن ئیمان بە خوا چییە؟ شایەتدانە، واتە بڕوابوونە کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق، بێجگە لە (الله) و نوێژکردنە بە چاکیی و زەکات دانەو...

**وقال** ﷺ: **"... وصلوا كما رأيتموني أصلي.."**[2]. واتە: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ".. نوێژ بکەن وەکو من دەبینن نوێژ دەکەم..".

## خراپترین دزیی لە نوێژدایە

لە کاتی نوێژکردندا بڕوادار لە بەرامبەر پەروەردگاری وەستاوەو قسەی لەگەڵ دەکات و لێی دەپاڕێتەوەو ستایشو سوپاسی دەکاتو بەڵێنی لەگەڵ تازە دەکاتەوەو خوا دەیبینێو وتەکانی دەبیستێ، کەواتە نابێ پەلە پەل بکاتو بە شڵەژاویی و پەرێشانیی نوێژ ئەنجام بداتو بە شێوەیەك کە کۆتایی سوڕەتی فاتیحە لە ڕکوعدا تەواو بکاتو پێش تەواوبوونی فەرزی کڕنوش سەر بەرز بکاتەوە، بەو شێوەیە لە هەموو روکنو پایەیەك شتێك دەدزێ بۆ پایەکەی ترو لەوێ تەواوی دەکات. پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) هەڕەشەی زۆری کردووە لەو کەسانەو، تەنانەت فەرموویەتی: **"لاينظر الله الى عبد لايقيم صلبه بين ركوعه وسجوده".**[3] واتە: خوا سەیری بەندەیەك ناکات لە نوێژدا پشتی ڕاست نەکاتەوە لە کاتی ڕکوع و سوژدەدا.

---

[1] رواه البخاري ٧١١٧ ومسلم ١٧ ونحوه عند إبن خزيمة ٣٠٧ ونضرة النعيم ج٦ ص٢٥٥٢ رقم ٣

[2] البخاري الفتح ٦٣١ ومسلم ٦٧٤.

[3] الترغيب والترهيب ٧٤٣.

هەروەها دەفەرموێت: هەر کەس لە نوێژ کەم بکاتەوە، خوا لێی دەپرسێتەوە لەسەری، هەتا دەفەرموێت بە پیاوێك کە رکوع و سوژدەی بە تەواوی ئەنجام نەئەدا لە نوێژدا: ".. **لو مات هذا، لمات على غير ملة محمد** ﷺ". **صحيح موقوف**[١] واتە: ئەگەر ئەوە بمرێت لەسەر غەیری دینی موحەممەد مردووە. کەواتە دزیی لە نوێژدا تاوانە و گوناهەو دروست نییە، دەبێ نوێژخوێن خۆی لێ بپارێزێ.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "أسوأ الناس سرقة الذي يسرق صلاته قال: كيف يسرق صلاته؟ قال: لايتم ركوعها ولاسجودها". حسن**[٢] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەلاّت و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "خراپترین دز ئەوەیە دزیی لە نوێژەکەیدا دەکات. وتیان چۆن دزیی لە نوێژ دەکات؟ فەرمووی: رکوع و سوژدەکانی تەواو ناکات".

**وعن النعمان بن مرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "ما ترون في الشارب والزاني والسارق؟ وذلك قبل ان تنزل فيهم الحدود، قالوا الله ورسوله أعلم. قال: "هن فواحش، وفيهن عقوبة وأسوأ سرقة الذي يسرق صلاته، قالوا وكيف يسرق صلاته؟ قال: لايتم ركوعها ولاسجودها". صحيح لغيره**[٣] واتە: لە نوعمانی کوڕی موڕڕەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەلاّت و سەلامی خوای لەسەربێ) فەرمووی: "راتان چۆنە بەرانبەر عارەقخۆرو زیناکەرو دز، ـ ئەمەش پێش هاتنی سزای ئەم گوناهانە بوو ـ، وتیان خواو پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن، فەرمووی: ئەوانە هەموو خراپەن و سزایان هەیە، خراپترین دزیش ئەوەیە نوێژەکەی ئەدزێ، وتیان چۆن نوێژەکەی ئەدزێ؟ فەرمووی: رکوع و سوژدەکەی تەواو ناکات.

لە فەرمودەیەکی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر لە سوچێکی مزگەوتدا دانیشتبوو، پیاوێك هات نوێژی کردو سەلامی لە پێغەمبەر کرد، پێغەمبەر (سەلاّت و سەلامی خوای لەسەربێ) فەرمووی (عليك السلام) بڕۆ نوێژ بکە، بەڕاستیی نوێژت

---

[1] الترغيب والترهيب ٧٤١.

[2] الترغيب والترهيب ٧٤٥ وقال رواه الطبراني في الأوسط وإبن حبان في صحيحه والحاكم وصححه.

[3] الترغيب والترهيب ٧٤٧.

نەکردووە. هەتا دووجار نوێژی دەکرد، دەهات سەلامی لە پێغەمبەر دەکرد، ئەویش پێی دەفەرموو (عليك السلام) تۆ نوێژت نەکردووە، بڕۆ نوێژ بکە. لە دووهەم جار یان سێهەم جاردا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فێرم بکە، فەرمووی: ئەگەر هەستای بۆ نوێژ دەستنوێژێکی باش بگرە، ئینجا روو بکەرەوە رووگەو (الله أكبر) بکە، چەند دەتوانی قورئان بخوێنە، ئینجا رکوع بەرەو ئارامیی تیادا بگرە، ئینجا هەستەرەوە بە رێکیی، ئینجا سوژدەبەرەو ئارامیی تیا بگرە، ئینجا هەستە لە سوژدەو دانیشەو ئارامیی تیادا بگرەو ئینجا سوژدەبەرەو ئارامیی تێدا بگرە، ئینجا هەستەو دانیشە و ئارامیی تیادا بگرە، لە هەموو رکاتەکانتدا ئاوا بکە. (صحيح).[1] لە کتێبی (رهبان الليل) دکتۆر سەیید بن حسين العفانی دەفەرموێت : **"لاتطفف في صلاتك إذا كان الله يقول "ويل للمطففين" في الكيل والميزان فما بالك بمن يطفف في عمود الدين الصلاة"**.[2] واتە: دزیی و تەرازووبازیی لە نوێژەکاندا مەکە، ئەگەر خوا دەربارەی کێشان وپێوان دەفەرموێت "سزای وەیل بۆ تەرازووبازەکان "ئەی دەبێ کەسێك تەرازووبازیی و دزی لە نوێژدا بکات، گۆڕی چی بێت؟!".

## بە نوێژ دەبنە باشترین ئوممەت

نوێژ کە پەیوەندیی نێوان بەندەو پەروەردگارە. هەتا ئەو پەیوەندییەش بەهێزترو بەتین تر بێت، چاکترە، بەندەکان باشترنو نزیکترن لە پەروەردگاریانەوە، کەسانێك پلەو پایەیان بەرز دەبێتەوە بە هۆی خواپەرستییەوە، چڵەپۆپەی خواپەرستییش نوێژە، یەکێك لەو شتانەی پلەو پایەی ئەم ئوممەتەی پێ بەرز دەبێتەوەو پلەو پایەی پێغەمبەری ئەم ئوممەتەی بەرزکردۆتەوەو بەسەر پێغەمبەرانی تردا (سەلامی خوایان لێ بێ) نوێژکردنە.

**عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "فضلت بأربع: جعلت انا وامتي في الصلاة كما تصف الملائكة، وجعل الصعيد لي وضوءا، وجعلت لي**

---

[1] الترغيب والترهيب ٧٤٨.

[2] (رهبان الليل، ج٢ ص٢٦٦).

**الأرض مسجدا وطهورا، وأحلت لي الغنائم".** [1] واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوا لەسەربێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: پلەم بە چوار شت بەرز کراوەتەوە: خۆمو ئوممەتەکەم لە نوێژدا وەکو فریشتەکان ریز دەبەستین، ڕێگەی دەستنوێژم پێدراوە بە خۆڵ، زەویم بۆ کراوەتە مزگەوتو شوێنی پاکو دەستکەوتم بۆ حەڵاڵ کراوە.

لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت پلەم بەرزکراوەتەوە بەسەر پێغەمبەرانی تردا بەوەی: زەویم بۆ پاکژ کراوەو بۆم کراوەتە مزگەوت، هەرکەس لە ئوممەتی من ویستی نوێژ بکات هیچی دەست نەکەوت نوێژی لەسەر بکات ئەوە زەوی پاکەو مزگەوتە، با نوێژی لەسەر بکات[2].

## بە نوێژ ئیمان تەواوتر دەبێ

ئیمان کەمو زیادی هەیە، زۆرو کەمی هەیە، ئیمان بەهێزو بێ هێز دەبێ، بە ئەندازەی پابەندبوونی خاوەنەکەی بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خواوەو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانییەوە.

بە ڕەوشتی جوان ئیمانی تەواو تەواوتر دەبێ، خاوەنەکەی زیاتر لە خوا نزیك دەبێتەوەو هەتا دەگاتە پلەی ڕۆژووەوانی نوێژخوێن. واتە کاتێك بڕوادارێك ڕەوشتی جوان دەکاتە کاڵای باڵای، ئەو کاتە ئیمانی تەواوتر دەبێتو بەرزتر دەبێتەوەو دەگاتە پلەی ڕۆژووەوانو نوێژخوێن.

**قال رسول الله ﷺ: "ان أكمل المؤمنين أيمانا أحسنهم خلقا، وان حسن الخلق ليبلغ درجة الصوم والصلاة".** [3] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: بەڕاستیی تەواوترین بڕوادار لە ئیماندا ڕەوشت جوانترینتانە،

---

[1] صحيح الجامع ٤٢١٩.

[2] صحيح الجامع ٤٢٢٠ و لە دەقی چەند فەرمودەیەکی تردا هاتووە بە ژمارە ٤٢٢٢ صحيح الجامع ٤٢٢٣ صحيح الجامع.

[3] صحيح الجامع ١٥٧٨

بێگومان ڕەوشتی جوان دەگاتە پلەی ڕۆژوو و نوێژ. کەواتە پلەی نوێژو ڕۆژوو لەسەرووی پلەی ڕەوشت جوانیشەوەیە.

## نوێژ خاوەنەکەی بێبەریی دەکات لە گاورو جولەکە

پایەی بنەڕەتیی و ڕوکنی سەرەکیی لە نوێژدا خوێندنی سوڕەتی فاتیحەیە، نوێژ بەبێ خوێندنی سوڕەتی فاتیحە بەتاڵەو وەرناگیرێ. لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: **لاصلاة لمن لا يقرأ بفاتحة** الكتاب. واتە: نوێژ دروست نییە هەرکەس فاتیحەی قورئان نەخوێنێ. یەکێکیش لە ئایەتەکانی سوڕەتی فاتیحە، کە دەبێت لە هەموو ڕکاتێکی فەرزو سوننتەدا بخوێنرێ ئەم ئایەتەیە: **"غير المغضوب عليهم ولاالضالين"**. واتە: مەخەرە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشمو قینت لێ گرتوونو لێیان توڕەی، کە جولەکەکانن، هەروەها مەخەرە سەر ڕێبازی گومڕاکان، کە گاورەکانن **المغضوب**: اليهود جولەکانن. **الضالين**: النصارى: گاورەکانن.

لە هەموو ڕکاتی نوێژەکاندا بە فەرزو سوننەتەوە، موسڵمان دەبێ بڵێ: خوایە مەخەرەوە سەر ڕێبازی جولەکەکانو گاورەکانو بە زمانی حاڵو بە زمانی سەرخۆی بەری دەکات لەو ڕەگەزە دوور لە هەقو ڕاستییە.[1]

## نوێژ لەسەرەتاو کۆتایی حەجدا

لە کاتی حەجدا نوێژکردن مۆڵەتی نییە، دەبێ هەموو فەرزەکان بکرێن بە چاکیی و بەبێ کەموکوڕیی، بەڵکو لە کاتی حەجدا نوێژکردن خێری زیاترە بە تایبەتی ئەگەر لە مزگەوتی ماڵە پیرۆزەکەی خوادا بکرێن، هەر نوێژێك لە مزگەوتی رووگەی موسڵمانان بە سەد هەزار نوێژە، لە مزگەوتی پێغەمبەریش (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) نوێژێك بە هەزار نوێژە.

لە دوای نییەتی ئیحرامو پۆشینی پۆشاکی ئیحرام، ئەگەر کاتی نوێژە فەرزەکان بوو، بە چاکیی ئەنجام دەدرێن، بەڵام ئەگەر کاتی نوێژە فەرزەکانیش نەبوو، دوو ڕکات

---

[1] الوسطية، ٣٥٠، علي محمد الصلابي.

نوێژی سوننەتی دەستنوێژ دەکات، هەر کاتیش لە تەواف بووەوە دوو رکات نوێژ دەکاتو سورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)ء (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)یان تێدا دەخوینێ.[1]

## یەکەم هەنگاوو کۆتا هەنگاوی گەشتی شەوڕەویی‌و بەرزبوونەوەی پێغەمبەر، نوێژ بووە

سەرەتاو یەکەم هەنگاو و دەستپێکی هەموو کارێکی چاكو هەموو گەشتو سەفەرێك، سوننەتە بە نوێژ دەست پێبکاتو کۆتاییەکەشی دوو رکات نوێژ بێت.

پێغەمبەر (سەلأاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) هەرکات چوویێتە سەفەر لە کاتی رۆیشتنیدا چۆتە کەعبە لە مەککەو دواتریش لە مەدینە چۆتە مزگەوتی خۆیو دوو رکات نوێژی کردووە ئینجا بەرێکەوتووە، لە کاتی گەڕانەوەشدا پێش چنە ماڵی خۆی چۆتە مزگەوت و دوو رکات نوێژی کردووە ئەوجا چۆتە ماڵەوە، ئەم نوێژەش بۆتە سوونەت بۆ هەموو ئوممەت.

بە هەمان شێوەش، گەشتو سەفەری شەوڕەویی‌و بەرزبوونەوەی بە نوێژ دەستپێکردو بە نوێژیش کۆتایی پێهات، لە باسکردنو گێڕانەوەی بەسەرهاتی گەشتەکەیدا فەرموویەتی: لە کۆڕێکدا کە موتعەمی کوڕی عەدی و عەمری کوڕی هیشامو وەلیدی کوڕی موغیرە ئامادەی بوون: **"إني صليت الليلة العشاء في هذا المسجد وصليت به الغداة، وأتيت فيما دون ذلك بيت المقدس، فنشر لي رهط من الأنبياء منهم إبراهيم، وموسى وعيسى وصليت بهم، وكلمتهم، فقال عمروبن هشام كالمستهزىء، صفهم لي، فقال..."**. واتە: فەرمووی: من نوێژی خەوتنانم لەم مزگەوتەدا کردو نوێژی بەیانیشیم هەر لەوێ کرد، لەو بەینەشدا چوومە بيت المقدس، ئینجا دەستەیەك لە پێغەمبەرانم بۆ کۆکرایەوە لەوانە ئیبراهیم و موساو عیسا، پێشنوێژییم بۆ کردنو قسەم لەگەڵ کردن، ئینجا عەمری کوڕی هیشام، کە ئەبوجەهلە، بە گاڵتەپێکردنەوە وتی: بۆمان وەسف بکە.. ئیتر فەرموودەکە بە درێژیی لە کتێبەکانی ژیانی پێغەمبەرو کتێبی فەرموودەدا هاتووە، وەکو کتێبی (**سيرة** إبن هشامو **مجمع** الزوائد و زۆر سەرچاوەی تر).

---

[1] صحيح فقه السنة ج٢ ص١٧٧.

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کە لە باسی سەرەتای گەیشتنە مەککەی دەکات و دەفەرموێت: نوێژی خەوتنانم لێرە کردو رۆیشتم و لە بيت المقدس ـ یش پێشنوێژییم بۆ دەستەیەك لە پێغەمبەران کرد، لە ئاسمانیش نوێژ لەسەر خۆمو ئوممەتەکەم فەرز کرا، پەنجا نوێژ، دواتر بە گوێرەی بەرنامەیەك کە موسا بۆی کێشاو بە تکاو رجاو داواکاریی، جار لە دوای جار، خوا کردیە پێنج نوێژ، کە گەڕاشمەوە لێرە لە کەعبەی پیرۆز، نوێژی بەیانیم کرد.

هەر لەو سەفەرەدا نوێژ لەسەر پێغەمبەرو ئوممەتەکەی فەرز کرا.

# نوێژ نەخۆشی پەڕێن و شیفایە

نوێژ پتەوکردنی گیانو دەروونەو بە هۆی پەیوەندیی بەندەکان بە خواوە لە ڕێگەی نوێژەوە ئادەمییەکان دەروون پۆڵاینو دامەرزاو و نەبەزیو دەردەچنو بەرگریی و کاردانەوەی بەهێزو بەردەوامی دەبێت بۆ نەخۆشی بەتایبەتییش نەخۆشییە دەروونییەکان، هەڵسانو دانەوینی و کڕنوش و سوژدە دەبنە وەرزشو چارەسەری سروشتی بۆ هەموو جومگەکانی لەشو بە تایبەتی بڕبڕەکانی موراغەی پشت و تەواوی ئیسقانەکانی لەش.[1]

**عن بلال (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ: "عليكم بقيام الليل فانه دأب الصالحين قبلكم وان قيام الليل قربة الى ربكم عز وجل. ومنهاة عن الإثم وتكفير للسيئات، ومطردة للداء عن الجسد".**[2]واتە: لە بیلالەوە (خوای لێ ڕازی بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێبێ) فەرمووی: شەونوێژ بکەن، بەڕاستیی کرداری پیاوچاکانی پێش خۆتانە، بێگومان شەونوێژ نزیك بوونەوەیە لە پەروەردگارتان، ڕێگرە لە خراپە، سڕەڕەوەی گوناهەکانەو لابەری نەخۆشیی لاشەیە.

یوسفی کوڕی ئەسبات (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئەی پیری گەنجەکان فریای لەشساغیی بکەون دەستپێشخەریی بۆ بکەن، نەخۆشیو گرفتاری کەسی نەماوە ئێرەیی پێبەرم تەنها پیاوێك نەبێ کە کڕنوشو سوژدەکانی بە تەواوی ببات، من ئەوەم لەدەست چوو، نەخۆشی ڕێی ئەوەی لێ گرتووم.[3]

تازە زانستی سەردەم دەریخستووە لە ڕێگەی ئەزموونەوە تەوژمێکی کارەبایی کە دوو جەمسەری جیاوازیی هەیە کاریگەریی لەسەر دابەشکردنی کاری خانە ئێسکیەکان هەیە بە گوێرەی تایبەتمەندییەکانیان خانەی دروستکردنی یان خانەی روخاندن. ژمارەیەك لە لێکۆڵەرەوەکان ئەندازەی باریك بوونو کەم بونەوەی ئێسقانیان دەست

---

[1] الإستشفاء بالصلاة، ص١١٣ـ ١٢٨.

[2] صحيح أخرجه الترمذي صحيح الترمذي ٢٨١٤. عن أبي أمامة وصحيح الجامع ٤٠٧٩. وصحيح وصايا الرسيول ج٢، ص٥٣٧.

[3] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٣٢.

نیشان کردووه له کاتی نەجولاٌنو خامۆشیدا، بۆیان دەرکەوتووە لەو حالەتەدا ئێسقان زیاتر کەم دەکاتو بەرەو لەناوچوون دەچێت و ناسكو بێ هێزو زەبون دەبێت، وەك لە گەشتە ئاسمانییەکاندا بە روونی دەردەکەوێت. کە ماسولکەکان بەرگەی هێزی کێشندەی زەوی ناگرن. هەموو نەجولاٌنو خامۆشییەکی بەردەوام ئەندازەیەك ئێسقان لەدەست ئەدات بە گوێرەی کەمو زۆری ئەو نەجولاٌنە، ئەو پووکانەوەی ئێسقانەش لە تەمەنی پیریدا زۆرترە وەك لە تەمەنی گەنجی.[1] پزیشکەکان بۆ بەهێزکردنی ئیسقانە زەبوونەکان تەنها دەرمانیان بەکار نەهێناوە بەڵکو جموجوڵو وزەو وەرزشیان بۆ داناون، بەلاٌم ئیسلام لە شەو و رۆژێکدا حەڤدە رکات نوێژی فەرزو سیو سێ سوننەتی دیاریی کردووە.[2]

بێجگە لەوەی نوێژی خۆبەخش هەر ژمارەی دیاریکراوی نییە، نوێژ دەبێتە رێگر لە سەدان هەزار نەخۆشی کۆمەلاٌیەتیو دەروونیو جەستەیی، خوا دەفەرموێ: **"إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ"** واتە: نوێژ کۆتایی دێنێ بە داوین پیسیو خراپەکاری وشەی (**الفحشاء والمنکر**) کە تەواوی خراپەکاری ناو کۆمەلگەی ئادەمیزاد دەگرێتەوە، نوێژ بنبڕو ریشەکێشی دەکاتە نەکردنی خراپە و دوورکەوتنەوە لێی دەبێتە شیفای هەموو نەخۆشییە کۆمەلاٌیەتییەکانی ناو بەرەی ئادەمیزاد.

دورکەوتنەوەش لە شەروالّ پیسی و داوێن پیسیو بەدڕەوشتیو رەوشت نزمی قەدەغەکردنو حەرامکردنی دەبێتە پاراستنی بەرەی ئادەمیزاد لە سەدان هەزار نەخۆشی کوشندەو بێ چارەسەر کە هەڕەشەی مەرگ لە بەرەی مرۆڤایەتی دەکات، زیاد لەوەش هەڕەشەی کەمئەندامی و مردنی کتوپڕیو شەلیو نوقسانیو ئێشو ئازاری لاشەو ئەشکەنجەی دەروونی.

نوێژ چاکترین چارەسەرە بۆ تەواوی نەخۆشییە کۆمەلاٌیەتیو دەروونیو جەستییەکان، پێش رودانیان باشتر وایە بلێین دەبێتە قەلغانو پارێزەری ئادەمیزاد لە تەواوی ئەو نەخۆشییانەی پێش نوێژ بوون، دووچار بوون بەو دەردو نەخۆشیو گرفتاریانەی، چونکە **"الوقایة خیر من العلاج"** پارێز باشترە لە چارەسەر، مەرجی

---

[1] الإستشفاء بالصلاة، ص١١٦ـ ١١٧.

[2] الإستقشاء بالصلاة، ص١١٨.

سەرەکی نوێژ دوورکەوتنەوە و خۆپاراستنە لە هەموو نەخۆشیو بەدڕەوشتی دەردو بەڵای کۆمەڵایەتیو دەروونی و لاشەییەکان.

**عن عثمان بن حنيف (رضي الله عنه) انّ اعمى اتى الى رسول الله ﷺ فقال: يارسول الله ادع الله ان يكشف لى عن بصري قال: "أو أدعك"، قال: يارسول الله انه قد شق على ذهاب بصري. قال: فانطلق فتوضا ثم صل ركعتين ثم قال اللهم انى اسألك وأتوجه اليك بنبينا محمد ﷺ نبي الرحمة يامحمد اني اتوجه الى ربي بك ان يكشف لى عن بصرى اللهم شفعه في، وشفعنى في نفسي، فرجع وقد كشف الله عن بصره.**[1] واتە: لە عوسمانی کوڕی حونەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کوێرێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) و وتی ئەی پێغەمبەری خوا داوام بۆ بکە لە خوا کە شیفای چاوەکانم بدات فەرمووی: ئایا وازت لێ دێنم وتی ئەی پێغەمبەری خوا بەراستیی لەدەستدانی چاوم زۆر گرانە بەلامەوە، فەرمووی: بڕۆ دەستنوێژ بگرە، ئینجا دوو رکات نوێژ بکە، پاشان، بڵێ: خوایە داوات لێدەکەم و ڕووت تێ دەکەم بە پێغەمبەرەکەت موحەمەد (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) پێغەمبەری بەزەیی و میهرەبانی ئەی موحەمەد من بە تۆوە ڕوو دەکەمە خوا کە چاوەکانم چاك بکاتەوە، خوایە بیکەرە تکاکار بۆمو تکام بۆ خۆم گیرا بکە، کە گەڕایەوە خوا شیفای چاوەکانی دابوو.

## نوێژ هۆی پتەوکردنو بەهێزکردنی ماسولکەکانە

چەند پزیشکێکی پسپۆری میسری لە بەشی ڕۆماتیزم لە کۆلیجی پزیشکی ئەزهەر لە خەستەخانەی جەووی کە دکتۆر حەسەن و موحەممەد بسیونی و موحەممەد نورەددین و موحەممەد ڕەزا **عوض** بوون، لێکۆڵینەوەیەکیان کرد لەسەر هەڵسوکەوتو جموجوڵی ناو نوێژ و کاریگەرییان لەسەر بەهێزکردن و پتەوکردنی ماسولکەکان.

باسەکەش بە درێژی لە کتێبی **"الإستشفاء بالصلاة"** لاپەڕە (١٣٠ بۆ ١٣٤)دا هاتووە، ئەمەش کورتەیەکی پوختی ئەو لێکۆڵینەوەیە: تەنها لە یەك ڕکاتی نوێژدا بەشێکی زۆر لە ماسولکەکانی لاشە بەشدارن لەناو ئەوانیشدا ئەو ماسولکانەی کە

---

[1] صحيح، الترغيب والترهيب ١٠٠٨.

کاریگەرییان هەیە لەسەر جموجوولّی جومگەکان، ئەمەش مەشقو راهێنانێکی رێکوپێكو رۆژانەیە، جومگەکانو ماسولکەکان دەخاتە کار، لە کەمترین ئاستی لەتوانابووندا لەسەر پاراستنی تەندروستییان، ئەگەر لە ماسولکەکانی لاشە بە گشتی وورد بینەوە، دەبینین بە شێوازێك لە شێوازەکان بەشدارن لە ئەنجامدانی نوێژ، ئەویش بە پلەی جیاواز لە هێزی کرانەوەو چوونەیەك، زیاتریش ماسولکەکانی چوار تەنیشتەکان.

هەر ئەو توێژەرەوانە ئەو ئەنجامەیان بەدەست هێنا، کە دینی ئیسلام باشترین رێگای دیاریی کردووە بۆ پارێزگاریی لە توانا لاشەییەکان بە شێوەیەك کە هەموو ئەو ماسولکانەی لە توانای مرۆڤدایە بیانجولێنێ بەشدارن لە ئەنجامدانی ئەو مەشقە لاشەییە تەواو بەردەوامەدا، کە رۆژانە بە لایەنی کەمەوە پێنج جار دووبارە دەبنەوە بە درێژایی تەمەن و ژیان.[1]

## نوێژو پتەوبوونی ئێسقان

جموجوولّو بزوانی ناو نوێژ کاریگەریی زۆرو راستەوخۆی هەیە لەسەر پتەوکردنی و گەشەکردنی ئێسقانو زیادکردنی وزەو گەشەی خانەکانی دروستکردنو بێهێز کردنو لاواز کردنو زەبوون کردنی خانەکانی روخاندن.

بۆیە پزیشکەکان تەنها هێنانی دەرمانیان بە چارەسەر دانەناوە بۆ بەهێزکردنی ئێسقانە زەبوونەکان، بەلّکو هاندەرن بۆ جولاّنو بزوان و جۆرە وەرزشێك، ئیسلام پێش زانستی تازە کەوتووەو لە چارەسەری زەبوونی و بێهێزی ئێسقان، جا زەبوونی و بێهێزیو لاوازییەك سروشتی بێ یان بە هۆی چوونە تەمەنەوە یان بە هۆی نەجولاّنو خامۆشییەوە بێت.

سەرنج بدە کردنی حەڤدە رکات نوێژ لە میانەی کردنی پێنج فەرزەکانەوە سیو سێ (٣٣) رکات نوێژی سوننەت وادەکات مرۆڤ پابەند بێت بە جولّەی مامناوەندیی لاشەوە بە درێژایی سێ سەعات، بە جۆرێك هەر رکاتێك حەوت جولّەی تیایە.

---

[1] الإستشفاء بالصلاة ص١٣٤ دكتور زهير رابح قراحي.

سەرنج بدە كۆی (١٧) ركات نوێژی فەرزو (٣٣) ركات نوێژی سوننەت دەكاتە پەنجا ركات رۆژانە.

ئەگەر حەوت جوڵەی هەر ركاتێك بدەین لە ژمارەی ركاتی نوێژە فەرزو سوننەتەكان دەكاتە (٣٥٠) جوڵەی رۆژانە (٧×٥٠= ٣٥٠).

كە نزیكەی دوو سەعات جوڵانو كۆششی وەكو مەلەكردن دەكات، ئەمەش دەبێتە هۆی پتەوبوونی ئێسقانی لاشەی نوێژخوێنەكە.

بۆیە لە كۆمەڵگەی موسڵمانانیدا پابەندبوون بە نوێژەوە دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی دیاردەی پشتكۆمبوونەوەو پشت چەمانەوە.

## نوێژو نەخۆشی دەوالی

نەخۆشی دەوالی لە قاچەكاندا بریتییە لە فروان بوونو چرچو لۆچبوونی خوێنهێنەرەكان، كە لەگەڵیدا ئازارو هیلاكیی بۆ نەخۆشەكە دروست دەكات لە "توێژینەوەیەكی" دكتۆر تۆفیق عەلواندا كە پێشكەشی كردووە بۆ زانكۆی **"الأسكندرية"** لە میسر بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەر، لە دەربارەی پەیوەندیی نێوان نوێژكردنو نەخۆشی دەوالی قاچەكانی دەكۆڵییەوە.

لە ئاكامدا چەندین ئەنجامی سەرسوورهێنەری بۆ دەركەوت، لەوانە ئەم نەخۆشییە لەناو نوێژخوێناندا رێژەكەی نیوەی هەمان نەخۆشییە لە چاو نوێژنەكەراندا بە هۆی چەند فاكتەرێكەوە، لەوانە زیادبوونی رێژەی ماددەی "هایدرۆكس برۆكلین" كە دەبێتە هۆی بەهێزكردنو گرژكردنی دیواری خوێنهێنەرەكان، بۆی دەركەوت لە نوێژخوێناندا رێژەكەی دەگاتە (٨٠,٩٣)، بەڵام لە نوێژنەكەراندا رێژەكەی (٦٣,٤٠).

هەروەها بۆی دەركەوت كە نوێژكردن پەستان لەسەر خوێنهێنەرەكانی قاچ زۆر كەم دەكاتەوە، بە تایبەتی لە كاتی سوژدەبردندا كە ئەم دوو فاكتەرە وا دەكات خوێن بە باشی بگەڕێتەوە بۆ دڵ لە چەند خوێنهێنەرێكی بەهێزەوە لە قاچەكانیدا. كەواتە دەتوانین بڵێین نوێژ پارێزەرە لە تووشبوون بە نەخۆشی دەوالی قاچەكان.[1]

---

[1] الإستشفاء بالصلاة ص٩٨.

## دەوری نوێژی عەسر (الصلاة الوسطى)

دەرکەوتووە لە مرۆڤدا ماددەی ئەردینالین کە ماددەیەکی چالاكو وزەبەخشی لاشەیەو زیندەچالاکییەکان زیاد دەکات، ئەگەر ڕێژەکەی لە ئاستی ئاسایی خۆی زیاد بکات دەبێتە هۆی ماندوو بوونو شەکەت کردنی بە تایبەتی لەوانەیە تووشی جەڵتەی بکات، هەروەها تووشی لەرزینی لەشو نەمانی تەرکیزو دیقەت گرتن و چەندین شتی خراپتری بکات.

بینراوە ئەم ماددەیە بە درێژایی ڕۆژ زیاد دەکات تا دەگاتە کاتی نوێژی عەسر، لەو کاتەدا ڕێژەکەی دەگاتە لوتکە، بۆیە پێویستە مرۆڤ خۆی سەرقاڵی جۆرە جوڵانو مەشقێك نەبێت کە لاشەی ماندوو بکاتو بیرو ئەندێشەی تووشی دڵەڕاوکێ بکات بۆ ئەوەی ئەم ڕێژەیە دابەزێت، دەرکەوتووەو بینراوە کە نوێژی عەسرو هاوپێچەکانی کردنیان لە کاتی خۆیدا باشترین هۆکارن بۆ دابەزینی ئەو ڕێژەیەی ئەردینالین.

کاتێك مرۆڤ سەرەتا گوێی لە بانگ دەبێت ئارامی پێدەبەخشێتو کە دەچێت بۆ مزگەوت بەدەم یادی خواوە ئەوەندەی تر ئارام دەبێتو کە نوێژەکەی تەواو دەبێت ئیتر هیچ جۆرە مەترسییەکی لەسەر نامێنێت و ڕێژەی ئەردینالین ئاسایی دەبێتەوە ئاسوودەیی و ئارامی بە هەموو لاشەی دەبەخشێتو، بە تایبەتی دڵ.[1]

## ڕۆڵی نوێژ لە پاراستنی داخورانی جومگە

بە هۆی بەدوایەکدا هاتنی پەستانەکان لەسەر جومگەکانی ئەژنۆکان لە کاتی نوێژدا، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە پەستان لە کاتی سوژدەدا جیاوازە لە پەستان لە کاتی وەستاندا، بەم شێوەیە ئاوی ناو جومگەکان بەردەوام لە جوڵەدا دەبێتو دەبێتە هۆی پاککردنەوەی جومگەکەکان لە پاشماوەو پاشەڕۆکەکان، هەروەها پاراستنی گەنجێتی ئەم خانانەی جومگەکان.

هەروەها نوێژ کاریگەرەو بە سوودە بۆ مانەوەی کرکراگەی جومگەکانی ئەژنۆ، کە بە هۆی پەستانە جیاوازەکانەوە دەیانپارێزێت لە لەت بوونو شەق بوون و نەرمبونەوە.

---

[1] الإستشفاء بالصلاة ص٩٠.

کەواتە نوێژ وەك کۆمەڵێك جووڵەو پەستانی جیاواز، کە دەبێتە هۆی چالاك کردنو بەهێزکردنی شانە ئێسکیەکانو شانە کڕکڕاگەییەکانو جومگەکان بەسەرو داوە جومگییەکان.

هەروەها هێزو وزەی ماسولکەکان دەپارێزێتو ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی پاراستنی لەش لە نەخۆشییەکانی لاوازبوونی ئێسكو پووکانەوەی ماسولکەکانو رەق بوونی جومگەکان.[1]

## کاریگەریی سوژدە لەسەر چوستو چالاککردنی دەورانی خوێن

باشترین شتێك لە سوژدەبردندا لە رووی تەندروستییەوە ئەوەیە کە کارێکی وا دەکات سووڕی خوێن بە گشتی بە ئاڕاستەی هێزی کێش کردنی زەویدا کار بکات، بە شێوەیەك ئەو خوێنەی کە ئەرکێکی زۆر دەکێشێت لە باری ئاساییدا بۆ سەرکەوتن بەرەو دڵ، لە کاتی سوژدەدا زۆر بە ئاسانی و بێ ماندوو بوون بەرەو دڵ مل دەنێ و تەوژم ئەدا.

هەروەها باری لەش لە کاتی سوژدەبردندا وا دەکات کە ماسولکەکانی پشت و قاچەکانو پێیەکان گرژ بنو پاڵ بە خوێنەوە بنێن بە گوڕو تەوژمێکی بەهێزەوە بەرەو دڵ.

هەروەها بە هۆی پەستانی ناو سكو گرژبوونی ماسولکەکانی دیواری سك لە کاتی سوژدەدا دەبێتە هۆی گوشینی خوێنو فشار لێکردنو پاڵنانو رۆیشتنی بەرەو دڵ، زۆر بە ئاسانی و بێ ماندبوون.

ئەمانە هەموویان کارێکی وا دەکەن کە پەستانی لەسەر دڵ و خوێنهێنەرەکان کەم بێتەوە لە کاتی سوژدە بردنداو سووڕی خوێنیش لەناو لەشدا بەگوڕترو چالاکتر بێت.[2]

**واثبتت الدكتورة سلوى محمد رشيد في بحث قدمها في "المؤتمر الإعجاز الطبي في االقرآن الكريم الذي عقد بالقاهرة ان صلاة التراويح تفيد الجهاز الدوري الدموي والتنفسي، وتؤدي الى مرونة مفاصل الجسم وخاصة العمود الفقري وتقوي عضله**

---

[1] الإستشفاء بالصلاة. ص١٢٥.

[2] الإستشفاء بالصلاة.

(القلب)".[1] واته: دکتۆره سەلوا موحەممەد رەشید له باسێکیدا که له "کۆنگرەی ئەعجازی پزیشکی له قورئانی پیرۆزدا" پێشکەشی کرد له قاهیره وتی: بێگومان نوێژی تەراویح سوودی بۆ کۆئەندامی دەورانی خوێنو هەناسەدان هەیه، دەوریشی هەیه له جومگەکانی لەشدا به تایبەتی بڕبڕەی پشتو ماسولکەکانی دڵ بەهێز دەکات.

## نوێژ نەکردن له وڵاتانی رۆژئاوا هۆکاری سەرکییه بۆ زۆر نەخۆشیی

لێرەدا دەتوانین هەندێك سەرژمێریی تۆمار بکەین که له حاڵەتی پشتئێشەو زیان گەیشتن به ئێسکی نێوان بڕبڕەکانی پشت له رۆژئاوا به گشتی، دەتوانین بڵێین نەبوونی کردارێکی وەکو نوێژکردن له ناویاندا فاکتەرێکی سەرەکی ئەم حاڵەتەیە:

١ ـ (٨٠٪)ی خەڵکی، رۆژێك له رۆژان ئازاری خوارەوەی پشتیان هەبووه.

٢ ـ نیوەی ژمارەی دانیشتوان رۆژێك له ژیانیان به هۆی ئازاری خوارەوەی پشتیان نەیانتوانیوه کار بکەن.

٣ ـ ناوەندی ئەو تەمەنەی که ئازاری ناوچەی خوارەوەی پشت له لایان پەیدا دەبێ (٢٧) ساڵە.

٤ ـ پشتئێشەی درێژخایەن تووشی ٢ ـ ٣٪ی خەڵکیی دەبێت که نیوەیان هۆکارەکەی ئینزیلاق لێکترازانە.

٥ ـ له ئەمریکا لەسەرژمێری ساڵی (١٩٧١)دا دەرکەوت که (٨) ملیۆن کەس ئەو ساڵە ئازاری پشتیان هەبووه واته له (٥٪)ی دانیشتوان.

٦ ـ ئازاری پشت سێیەمین هۆکاری کارنەکردنه لای کرێکاران لەو وڵاتانە، دوای ئازاری جومگەکان و رۆماتیزمو نەخۆشییەکانی دڵ.

٧ ـ ساڵانه چوار سەعات کارکردنی هەموو کرێکارێك دەفەوتێت به هۆی پشت ئێشەوە.

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٤٤٨.

٨ ـ ساڵانە (١٤) ملیار دۆلار خەرجی چارەسەرکردنی ئازارەکانی پشتە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

کەواتە ئەم حاڵەتە شکستپێهێنەرەی تاکەکانی کۆمەڵگەیەو خەسارەت و زیانێکی مالیی زۆریش دەخاتەوە کە بە دڵنیاییەوە ئەگەر لە وڵاتە موسڵمانەکاندا هەمان سەرژمێریی بکرێت زۆر لەوەی ئەوان کەمتر دەبێ.[1]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# ئەوانەی نوێژیان لێ وەرناگیرێ

پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوا لێ بێ) دەفەرموویێت: رەحمەتی خوا لەو کەسە کە ئیشێك دەکات بە چاکیو بێ کەموکورتیی ئەنجامی ئەدا. خوای گەورەش کە داوای نوێژمان لێدەکات دەبێ بەوپەڕی دڵسۆزیو بەوپەڕی کاملییو چاکیی ئەنجامی بدەینو نابێ دەغەڵییو کەمتەرخەمیی تیادا بکەینو بەبێ هودە تێی بڕوانین، بەڵکو نوێژ فەرزو سوننەتو رەوشتو ئادابو ئاکاری تایبەتی خۆی هەیە، دەبێ کەمتەرخەمییان تیادا نەکرێ، نوێژێك کە خوا داوای دەکات، دەبێ بە گیانو جەستە ئەنجام بدرێو نوێژخوێن خۆی بپارێزێ لە هەموو رەگەزی خراپەو گوناهو ستەمکارییەك لە کردارو گوفتارو رەفتارو تەنانەت بیرکردنەوەو خەیاڵو خەتەرەی خراپیش, نابێ نوێژخوێن ئازاری کەس بدات بە زمان بە کردار بە نووسین، بە هێماو هیچ شتێك کە بۆ خۆی بە رەوای نازانێ.

دەربارەی کەسانێك کەمتەرخەمیی لە نوێژ دەکەن، یان نوێژی بێناوەڕۆكو بێپێزو بێهێز دەکەن، خوا دەفەرموێت: **"فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ". (الماعون: ٤ ـ ٥)**. واتە: سزای وەیل بۆ ئەو نوێژخوێنانەی کە لە ناوەڕۆکی نوێژەکانیان بێئاگان.

باسیان لە ژنێك کردو پیایانا هەڵگوت لە خزمەتی پێغەمبەردا (سەلامی خوای لەسەربێ)، وتیان بە رۆژ بەڕۆژەووەو بە شەو شەونوێژ دەکاتو قورئان دەخوێنێو یادی خوا دەکات، بەڵام لەگەڵ دراوسێکانی باش نییەو ئازاریان دەدات، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەوە لە دۆزەخدایە.

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: **"من لم يزك فلا صلاة له"**. واتە: هەرکەس زەکات نەدات، نوێژی لێ گیرا نابێت.[1]

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٢٥.

## عارەقخۆر هەتا چل رۆژ نوێژی لێوەرناگیرێ

ژیریی گەورەترین بەهرەی خودایە کە مرۆڤەکان بە هۆیەوە بوونە شاگوڵی باخی بوونەوەرو بوونە فەرمانڕەواو تەواوی دروستکراوەکان لە خزمەتیاندا فەرمانبەرو خزمەتکارن.

هەرکات مرۆڤ ژیریی لەدەست دا، دەبێتە بار بەسەر کەسوکارو کۆمەڵگەوە، زۆرجاریش دەبێتە دێوەزمەو دەست دەوەشێنێ بە چاكو بە خراپ و بە راستو چەپدا، یان دەبێتە ئاژەڵێکی پیسو پیسخۆرو قێزەون و میکرۆباوی.

یان دەبێتە کەسێکی دەم پیس، لەبەر بێ عەقڵی رێزی رێزداران دەشکێنێو چاكو خراپ بە لایەوە یەکسانن، ئەگەر خاوەنی چەندەها بڕوانامەی بەرزو ناوازەش بێت، یان خاوەن ماڵو سامان بێت، یان خاوەن ژنو منداڵ بێت، بەژنو باڵای بەرزو رووخساری فریشتە ئاسا بێت.

کەسێك بە دەستی خۆی ئەو بەهرە گەورەیی خوا پێی داوەو بە هۆیەوە رێزدارو شکۆداری کردووە، لە ناوی بەرێ و لە جێی ئەوەی کەسێکی زاناو داناو بە کەڵكو بەرژەوەندیی دۆستو پاكو خاوێنو بە هۆشو گۆش بێت، ببێتە دڕندەو ئاژەڵی پیسخۆرو شێتو دەستوەشێن، ئارەزوباز، قومارباز، بێرێزو بێناز، خۆی لە بیر بکا، خوای لە بیرکا، ئایا دەبێ خودا نوێژی لێ قەبوڵ کا؟ یان دەکرێ بڵێین ئەوە نوێژە، دەشێ بڵێی رەسمو وێنەی بێگیانو رەقو تەقی نوێژ، نەك نوێژی راستەقینە بێت. لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رەزای خوای لێ بێ: ئەبوبەکرو عومەر و خەڵکیکی تر دانیشتبوون، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) باسی گەورەترین تاوانیان دەکرد، لێیان نەزانی، ناردیان بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، پرسیاریان لێکردو فەرمووی: عارەقخواردنەوە، هەواڵەکەیان هێنایەوە، پێی مولزەم نەبوون و ئینکارییان لێکرد، هەموو چوون بۆ ماڵەکەی، ئەویش هەواڵی دانێ کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **"ان ملكا من ملوك بني أسرائل أخذ رجلا فخيره بين ان يشرب الخمر أو يقتل نفسا، أو يزني أو يأكل لحم خنزير، أو يقتلوه، فاختار الخمر، وانه لما شرب الخمر لم يمتنع من شيء اراده منه. وان رسول الله ﷺ قال: مامن أحد يشربها فتقبل له صلاة أربعين ليلة ولا**

**يموت وفي مثانته منه شيء الا حرمت بها عليه الجنة، فان مات في أربعين ليلة مات ميتة جاهلية".**[1] واته: پاشایەك لە پاشاکانی بەنی ئیسرائیل پیاوێکی گرت‌و سەرپشکی کرد لە عارەق خواردنەوە، یان کوشتنی کەسێك، یان ئەنجامدانی زینایەك، یان خواردنی گۆشتی بەراز، یان دەیکوژێ، پیاوەکە عارەقەکەی هەڵبژارد، کاتێ عارەقەکەی خواردەوە هەرچی داوایان لێکردبوو، هەموویانی کرد".

ئینجا پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "هەر کەسێك عارەق بخواتەوە، بێگومان هەتا چل رۆژ نوێژی لێوەرناگیرێ، خۆ ئەگەر بمرێ‌و لە میزڵدانیدا یەك تۆز عارەقی تیامابیت، بەهەشتی لێ حەرام دەبێت، ئەگەر لەو چل رۆژەدا بمرێ بە مردنێکی نەفامیی دەمرێ".

**وكان رسول الله ﷺ قال: "أنهى عن كل مسكر اسكر عن الصلاة".**[2] واته: پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: هەرچی سەرخۆشکەرە قەدەغەم کردووە کە مەستکەرو سەرخۆشکەر بێت بۆ نوێژ.

**قال ﷺ: "من شرب الخمر، لم تقبل له صلاة أربعين صباحا، فان تاب تاب الله عليه، فان عاد لم تقبل له صلاة أربعين صباحا، فان تاب تاب الله عليه، فان عاد لم تقبل له صلاة أربعين صباحا، فان تاب تاب الله عليه فان عاد الرابعة لم تقبل له صلاة أربعين صباحا، فان تاب لم يتب الله عليه، وسقاه من نهر الخبال". صحيح**[3] واته: پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس عارەق بخواتەوە نوێژی لێوەرناگیرێ هەتا چل رۆژ، جا ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێگیرا دەکات، ئەگەر دووبارەی کردەوە هەتا چل رۆژ نوێژی لێوەرناگرێ، ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێوەردەگرێ. ئەگەر گەڕایەوە سەر عارەق خواردنەوە چل رۆژ نوێژی

---

[1] أخرجه الحاكم ١٤٦/٤، وقال صحيح على شرط مسلم، وذكره الهيثمي في المجمع ٦٧/٥، ٦٨. وراوه الطبراني في الأوسط، ورجاله رجال الصحيح فلا صالح من داود النجار" وهو ثقة من حديث إبن عمر. صحيح وصايا الرسول ج٣ ص٨٦

[2] رواه مسلم ١٧٣٣، وصحيح وصايا الرسول ج٣ ص٨٩.

[3] صحيح الجامع ٦٣١٢.

لێوەرناگرێ، ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێگیرا دەکات، ئەگەر بۆ جاری چوارەم عارەقی خواردەوە چل رۆژ نوێژی لێوەرناگیرێ، ئەمجارە ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی لێگیرا ناکاتو لە روباری پاشەڕۆی لاشەی سوتاوی دۆزەخیان دەرخواردی دەدات.

## هەرکەس روو لە کتێبگرەوەو جادووگەرەکان بکات نوێژی لێ وەرناگیرێ

لە رەوانەکردنی سەدو بیستو چوار هەزار پێغەمبەر، لە ئادەمەوە هەتا خاتەم (سەلامی خوایان لێ بێ)، دوو ئامانجی سەرەکیی رەچاو کراوەو ویستی خواش بە رەوانەکردنیان هەر ئەو دوپایە سەرەکیی‌و بنەڕەتییە بووە، وەکو فەرموویەتی: **"وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ"**. (النحل: ٣٦). واتە: بەڕاستیی لە هەموو گەلو هۆزێکدا پەیامبەرانمان رەوانە کردووە هەتا خوا بپەرستنو لە تاغوت و چەواشەکار دووربکەونەوە.

هەردوو ئامانجەکە بەربەستو رێگرن لەوەی باوەڕدارێك روو لە غەیری خوا بکات بۆ هەر کارێك تایبەت بێت بە خواوە، یان خوا رێگە نەدات لەو کارەدا پەنا بۆ غەیری خوا ببرێت، بە تایبەتی لە کاری پەنهانیی‌و دەمبەستو چاوبەستو چەواشەکاریی‌و گێلکاری‌و زەین کوێرکردنی خەڵکیی، نوێژخوێن دەبێ بێدارو هەست زیندو زرینگ‌و چالاك بێتو شوێن فاكو فیكو چاوبەستو سیحرو جادوی جادووگەران نەکەوێت. نوێژخوێن دەبێ لەو دوانە یەکێکیان ئەنجام بداو هەرگیز ناگونجێ هەردووکیان بە یەکەوەو لە یەککاتدا بکات.

**قال رسول الله ﷺ: "من أتى عرافا فصدقه بما يقول لم تقبل له صلاته أربعين يوما".**[1] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ)، فەرموویەتی: هەرکەس بچێتە لای کەسێك کە بڵێ پەنهان دەزانم‌و ئەوەی دەیڵێ بەڕاستیی بزانێ چل رۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێ.

**وقال رسول الله ﷺ: "من أتى عرافا فسأله عن شيء لم تقبل له صلاته أربعين ليلة".**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ)،

---

[1] رواه مسلم ٢٢٣٠ وصحيح وصايا الرسول ج١ص٢٥.

[2] صحيح الجامع ٥٩٤٠ والترغيب والترهيب ٤٤٧٥.

فەرموویەتی: "هەرکەس پرسیاری شتیك بكات كە كتێب گرەوەیەك دەیكات چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت".

## ئەوانەی لە ناوەڕۆکی نوێژەکانیان بێئاگان

نوێژ وەكو یادی خوایەو نزاو پاڕانەوەو ستایشو جێبەجێكردنی فەرمانی خوایە، لە هەمانكاتیشدا تازەكردنەوەی بەڵێنو پەیمانە لەگەڵ خوادا كە بەڵێن ئەدەم، پەیمانی ڕاستەقینە دەبەستم كە نوێژەكانم بە چاكیی ئەنجام ئەدەم، ڕێگەی هەموو چاكەو خواناسییەك دەگرمەبەرو خۆم لە خراپەكارانو ڕێبازیان دەپارێزم.

بابای نوێژخوێن لە ناو نوێژەكەیدا پەیمان بە خوا دەدات: "كە هەر تەنها تۆ دەپەرستمو تەنها هەر پشت بە تۆ دەبەستم، ڕێگەی ڕاست كە ڕێگەی خودایەو پەیڕەوكردنی دینی ئیسلامە، دەگرمەبەر، خودا تۆش كارئاسانییو چاوساغییم بكە، بەڵێن ئەدەم ڕێگەی جولەكەو گاورو خراپەكاران نەگرم، خودایە تۆش بۆم ئاسان بكەو دەستم لێ بەرمەدە".

جا هەركات ئەم پەیمانو بەڵێنەی شكاندو نوێژی لێ بووە وەرزشو چەند هەڵسانو دانیشتنێكو، نوێژەكەی لە خراپە نەیگێڕاوەو، ڕێگەی چاكەو چاكەخوازانی پێ نەگرتەبەر، ئەوە نوێژ نییە، بەڵكو سێبەری نوێژە، یان پەیكەری مردووی نوێژە، هەرچۆن بتپەرستنەكان پەیكەری درۆینەیان بۆ خوداو پێغەمبەرەكان دەتاشی، جیاوازیی نوێژی ڕاستەقینە لەگەڵ ئەو پەیكەرە نوێژەدا وەكو جیاوازیی خوداو پەیكەری خوداو پێغەمبەرەكانو پەیكەری داتاشراویان وایە، وەكو تۆ و وێنەی گیراو و دروستكراوی تۆ وایە. وەكو ئەو درەختە بەردارە وایە كە لە ڕۆخی دەریایەو وێنەكەی خۆی لە ناو دەریادا دیارە.

جیاوازیی درەختە ڕاستەقینەكە لەگەڵ وێنەی هەمان درەخت لە ناو ئاوەكەدا چۆنە، جیاوازیی نوێژی ڕاستەقینەو ئەو نوێژەی خوا داوای كردووەو وەریدەگرێ لەگەڵ ئەو نوێژەی كاریگەریی لەسەر خاوەنەكەی نییە، نە بە پەیڕەوكردنی چاكەو نە بە دووركەوتنەوە لە خراپە، ئاوایە.

خوا مژدەی ڕەزامەندیی خۆیو بەهەشتو ژیانو گوزەرانی خۆشو ناوازە ئەدات بە نوێژخوێنان، بەڵام هەر لە قورئاندا دەفەرموێت : **"فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ * الَّذِينَ هُمْ عَن**

**صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ"**. (الماعون: ٤ ـ ٥). واتە: سزاو وەیل بۆ ئەو نوێژخوێنانەی کە لە ناوەڕۆکی نوێژەکانیان بێئاگانو لە کاتی خۆیاندا دوایان دەخەنو گوێیان پێنادەن.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: موفلیس کێیە؟ وتیان: ئەوەی پارە و پوڵ و زێڕو زیوی نەبێ. فەرمووی: موفلیسی ئوممەتی من ئەو کەسەیە لەگەڵ نوێژو ڕۆژوو خواپەرستییەکەیدا دەستی لە خراپەش نەگرتۆتەوە.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "أتدرون من المفلس؟ قالوا: المفلس فينا من لا درهم له ولا متاع. فقال: ان المفلس من أمتي من يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة ويأتي قد شتم هذا، وقذف هذا، واكل مال هذا، وسفك دماء هذا، وضرب هذا، فيعطى هذا من حسناته، وهذا من حسناته، فأن فنيت حسناته قبل ان يقضى ما عليه أخذ من خطاياهم فطرحت عليه، ثم طرح في النار". صحيح**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: دەزانن (نابووت) کێیە؟ وتیان ئەو کەسەیە کە پارەو پوڵو کەلوپەلی نەمابێ، فەرمووی: موفلیس (نابوت) لە ئوممەتی مندا ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دێت، نوێژی کردووە، ڕۆژووی گرتووەو زەکاتی داوە، بەڵام جوێنی بەم وتوەو بوختانی بۆ ئەو کردووەوماڵی ئەمی خواردووە، خوێنی ئەوی ڕشتووە و لەوی داوە. لە چاکەکانی ئەم دەدرێت بەو، ئەگەر چاکەکانی تەواو بوون پێش گێڕانەوەی ئەو هەقەی لەسەریەتی، تاوانەکانی ئەوانی بە کۆڵا دەدرێت، ئینجا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر.

## سێ کەس نوێژەکانیان بستێك لەسەر سەریان بەرز نابێتەوە

خوا لە قورئاندا دەربارەی کەسانێك کە خواپەرستییو بەندایەتی خوا دەکەن بە بێ گوێدانە شەرعو سوننەتی پێغەمبەرو مەرجو ئەرکی شەرعیی، دەفەرموێ: **"عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ"**. (الغاشية: ٣). واتە: "ئیشکەری ڕەنج بە خەسارن". هەموو خواپەرستییو کردارو گوفتارێك کە ئادەمیزاد بیەوێ پاداشتی لەسەر وەرگرێ و سوودمەندبێ لێی لە

[1] رواه مسلم ٢٥٨١ والترمذي، والترغيب والترهيب ٣٢٨٩ وصحيح الجامع ٨٧.

دونیاو دوارۆژداو رووی هەبێ بڵێ ئەم کردەوەیەم بۆ خوا ئەنجام داوە، دەبێ دوو مەرجی سەرەکیی تیابێ:

**یەکەم:** بۆ خوا بێت.

**دووەم:** بە پێی شەرعی خوا بێت.

لێرەدا هەڵوێستەیەك دەکەین: ئایا هەرکەس رووی کردە رووگە، یان دەستو دەمو چاوێکی شۆرد، یان هەندێ دەمی جوڵان، دەبێتە نوێژو پێی دەوترێ ئەرکی شەرعیی نوێژی ئەنجام داوەو سزای نوێژنەکەری لەسەرخۆی لابردووەو پاداشتی نوێژخوێنی مسۆگەر کردووەو خودای لە خۆی رازی کردووە؟ با بچینە خزمەت ئەم فەرمودەیە:

**عن أبي أمامة (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال: "ثلاثة لا تجاوز صلاتهم آذانهم، العبد الآبق حتى يرجع، وامرأة باتت وزوجها عليها ساخط، وإمام قوم وهم له كارهون".**[1] واتە: لە ئەبی ئومامەوە (رەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: سیان نوێژەکانیان لە گوێچکەیان تێناپەڕێ، بەندەیەك لە گەورەکەی یاخی بووبێ هەتا دەگەڕێتەوە، ژنێکیش شەو بەسەربەرێت هاوسەرەکەی لێی زویر بێت، پێشەوای گەلیك کە نەیانەوێتو پێی رازی نەبن.

## ژنێك لە هاوسەرەکەی یاخی بێت

یەکێکی تر لەو کەسانەی نوێژی گیرا نییەو خوا لێی وەرناگرێ ئافرەتێکە لە هاوسەرەکەی یاخی بێت، هەتا لەگەڵیدا ئاشت دەبێتەوە. **عن إبن عمر (رضي الله عنهما)، قال: قال رسول الله ﷺ: اثنان لاتجاوز صلاتهما رؤوسهما، عبد آبق من مواليه حتى يرجع، وامرأة عصت زوجها حتى ترجع". صحيح**[2]واتە: لە عەبدوڵڵای

---

[1] رواه الترمذي ٣٦٠ وحسنه الألباني "مشكاة المصابيح" ١١١٢ أخرجه الترمذي وله شاهد عن أبي داود، وإبن ماجة وصحيح فقه السنة ج١ ص٥٢٧. الترغيب والترهيب ٦٨٣و ٢٨٢٣ وقال حسن. والجامع الصحيح من احاديث النساء ص١١٩.

[2] الترغيب ٢٨٢٢ صحيح و٢٨٢٣ حسن.

کوڕی عومەرەوە (رەزای خوایان لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: دووکەس نوێژەکانیان لەسەریان تێناپەڕێ، بەندەیەك لە گەورەکەی یاخی بووبێ هەتا دەگەڕێتەوە، ئافرەتێك لە هاوسەرەکەی یاخی بووبێت هەتا دەگەڕێتەوە.

## بەندەیەك لە گەورەکەی یاخی بێت نوێژی گیرا نییە

سوپاس بۆ خوا ئەم دیاردەیە نەماوەو بنبڕ بووە، لە سایەی ئەو بەرنامەرێژییەی ئیسلام بۆی کردووە، هەرکات نەیارانو دوژمنانی ئیسلام موسڵمانان ناچار نەکەن بە شەڕکردنو بە دیلگرتنی موسڵمانان لە بەرامبەردا ناچار بێباوەڕان بکەنەوە بەندەو بەو دیاردەیەش رێ لە ستەم و رەشبگیری کافران بگرن. لەم ناچارییەدا نەبێ ئیسلام رێگە بە شتی وا نادات.

**قال رسول الله ﷺ: "أيما عبد أبق من مواليه لم تقبل له صلاة".**[1] واته: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەر بەندەیەك سەرکەشیی بکاتو یاخی بێت لە گەورەکەی، نوێژی لێ وەرناگیرێ.

## پێشەوای خۆسە پێنەر نوێژی گیرا نییە

هەرکەس بە زۆر خۆی بسەپێنێ بەسەر خەڵکیداو سوارگەردنی خەڵکیی بێتو خەڵکە رەعیەتو بندەستەکانیشی بە دڵیان نەبێ و بۆیان لانەدرێو خۆیشی واز نەهێنێ، نوێژی گیرا نابێ.

لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلاوە گێردراوەتەوە کە پێشنوێژیی بۆ کۆمەڵێك کرد، کاتێ رۆیشت فەرمووی: لە بیرم نەبوو داوای مۆڵەتیان لێ بکەم پێش ئەوەی بچمە پێشەوە، ئەرێ رازی بوون پێشنوێژییتان بۆ بکەم، یان نان؟ وتیان: بەڵێ، جا کێ پێی ناخۆشە ئەی حەواریو هاوڕێی پێغەمبەر. فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو

[1] رواه مسلم ٧٠، وصحيح وصايا الرسول ج١ ص٢٥.

(سەلاَتو سەلامی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: هەر پیاوێك پێشەوایەتی گەلێك بکاتو بەدڵیان نەبێ، نوێژەکەی لە گوێچکەی تێناپەڕێ".[1]

لە فەرمودەیەکی تردا بەم شێوەیە هاتووە: **عن إبن عباس (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ قال: "ثلاثة لا ترفع صلاتهم فوق رؤوسهم شبرا، رجل أم قوما وهم له كارهون، وامراة باتت زوجها عليها ساخط، وأخوان متصارمان".**[2] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (رەزای خوا لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەلاَتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "سێ کەس نوێژەکانیان بستێ لەسەر سەریان بەرز نابێتەوە، پیاوێك پێشەوایەتی گەلێك بکات بە دڵیان نەبێ، ژنێك شەو تا بەیانی مێردەکەی لێ زویر بێت، دوو برای ناجۆرو نەگونجاو بە یەکەوە.

## دوو برا کە دوژمنداری یەکتر بن

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ قال: "ثلاثة لاترفع صلاتهم فوق رؤوسهم شبرا رجل أم قوما وهم له كارهون، وامراة باتت زوجها عليها ساخط، واخوان متصارمان".**[3] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (رەزای خوا لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەلاَتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "سێ کەس نوێژەکانیان بستێ لەسەر سەریان بەرز نابێتەوە، پیاوێك پێشەوایەتی گەلێك بکات بە دڵیان نەبێ، ژنێك شەو تابەیانی مێردەکەی لێ زویر بێت، دوو برای ناجۆرو نەگونجاو بە یەکەوە".

---

[1] حسن لغيره الترغيب والترهيب، ٦٨٠ء ٦٨١ بلفظ آخر، و٦٨٣ بلفظ آخر حسن. وصحيح الجامع ٢٧١٨.

[2] رواه إبن ماجة ٩٧١ وإبن حبان وصححه. الترغيب والترهيب ٦٨٢.

[3] رواه إبن حبان وصححه ورواه إبن ماجة ٩٧١. الترغيب والترهيب ٦٨٢ و١٥/٤٠

## ئەو کەسەی زەکات نەدات، نوێژی گیرا نییە

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت: **"من لم يزك فلا صلاة له".** [1] واتە: هەرکەس زەکات نەدا نوێژی لێ وەرناگیرێ.

هەڵوێستی ئەبوبەکری سدیق (ڕەزای خوا لێ بێ) بەرامبەر ئەو کەسانەی هەڵگەڕانەوە لە دین، جەنگو جیهاد بوو کە زۆربەیان تەنها زەکاتیان نەئەدا، دەنا نوێژیان دەکردو خواپەرستیی و حەڵاڵو حەرامیان بە گوێرەی شەرع بوو. لە شەرعدا دروست نییە نوێژخوێن بکوژرێ، یان جەنگی لەگەڵدا بکرێ، بەڵام ئەمانە نوێژەکەیان بە نوێژ حیساب نەبووە، بۆیە ئەبوبەکر بە گژیاندا چووە، کە ڕوویان لە زەکاتدان هەڵکرد، حیسابی نوێژکردنی بۆ نەکردنو لەگەڵیان جەنگاو فەرمووی: ئەگەر کەس لەگەڵمدا نەیەت خۆم بە تەنها لەگەڵیان دەجەنگمو بەگژیاندا دەچم.

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٢٥.

# نوێژنەکردن لە روانگەی قورئان و سوننەتەوە

نوێژنەکردن لە روانگەی قورئانو سوننەتەوە بەهاوبەش دانان ناوبراوە. خوا دەفەرمویێت: **"وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ"**. (الروم: ٣١) واتە: بە چاکی نوێژەکانتان بکەنو لە هاوبەش دانەران مەبن.

هەر لە قورئاندا باسی نوێژی لەگەڵ بڕوابوون بە خواو بە رۆژی دوایی کردووەو پەیوەستی کردووە بە بڕوابوون بە خواو رۆژیی دوایی، نوێژ لە قورئاندا فەرمانی خوایە، باشترین کردارە و یەکێکە لە کردەوە چاکەکان، نوێژ لە قورئاندا بەشێك بووە لە رەوشتی پێغەمبەرەکان، وەکو دەربارەی موسا دەفەرموێت: **"وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي"**. **(طه: ١٤)**. واتە: ئەی موسا نوێژ بکە هەتا منت لە یاد بێ.

نوێژ لە قورئاندا وەسیەتی پێغەمبەرەکانە، بۆ نەوەکانیان، نوێژ رەوشتی پێغەمبەری ئیسلام بووەو، بەشێکی گەورەو بنەرەتو بووە لە خواپەرستی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، نوێژ ئایەتی قورئانەو هەمیشەو هەردەم زیندووەو کەس بۆی دەستکاری ناکرێ، بە تێکچوونی ئەرزو ئاسمان ناژاکێ.

نوێژ لە فەرموودەو ئاکارو پەرستشی پێغەمبەردا، بە فێنکیو گلێنەو بیلبیلەی چاوی داناوە، نوێژنەکەری پێ موسڵمان نەبووە، لە ئاسمان لەسەری فەرز کراوە، بە پێچەوانەی تەواوی پایەو فەرزو سوننەتی دینەوە کە لەسەر زەوی فەرز کراون، نوێژ یەکەم پەرستشە داوای جێبەجێکردنی کرابێ، نوێژ تکاکاری مردووەکانو پەیوەندیی نێوان خواو بەندەکانە، نوێژ فەوتانی نییە لە هیچ کاتو شوێنێکدا، لە هیچ عەسرو سەردەمێکدا، نوێژ مۆڵەتی نەکردنی نییە، بۆ نەخۆشو دەردەدارو بۆ نیشتەجێو گەشتیار، بۆ دەڵەومەندو هەژار، نە بۆ ژن، نە بۆ منداڵ.

حەج بەبێ نوێژ نابێ، رۆژوو بەبێ نوێژ نابێ، زەکاتو بەرات و جیهادو خەبات بەبێ نوێژ دەبنە شیری بزڕکاوی بێ هەوێن، لە سوننەتی پێغەمبەردا نوێژ هەموو ئیسلامە، پێغەمبەرەکان لە ناو گۆڕیشدا ئەنجامیان داوە.

تەمبەڵیی کردن لە ئەنجامدانیدا نیشانەی دووڕووییە، ئەی دەبێ نەکردنی بە بەردەوامیی چی بگەیەنێتو نیشانەی چی بێت، کەسێك تەنها نوێژی عەسر بفەوتێنێ

کردەوەکانی بەتاڵ دەبنەوە، ئەی کەسێك بە درێژایی تەمەنی نوێژ نەکات دەبێ حاڵی چۆن بێت.

## نوێژنەکردن هاوەڵدانانە بۆ خوا

لە یەکێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا دیمەنێکی نوێژنەکەرمان بۆ باس دەکات، دەفەرموێت: "..وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ". (الروم: ٣١). واتە: نوێژەکانتان بە چاکیی بکەن و مەبنە هاوبەشدانەر.

**وجاء في رواية أن رسول الله ﷺ قال: "بين الرجل و بين الشرك والكفر ترك الصلاة".** [1]واتە: لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە: لە نێوان پیاوی بڕوادارو هاوبەشدانەر و بێبڕوادا وازهێنانە لە نوێژ".

**وعن ثوبان (رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: "بين العبد وبين الكفر والإيمان، الصلاة، فإذا تركها فقد أشرك". صحيح**[2] واتە: لە سەوبانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: لە نێوان بەندەی خواو بێبڕوایيو ئیماندا نوێژ هەیە، هەرکەس وازی لێ بێنێ بەڕاستیی هاوبەشی بۆ خوا داناوە.

## نوێژنەکردن هەموو کردەوەکان بەتاڵ دەکاتەوە

کەمتەرخەمییکردن لە گەورەترین فەرمانی خوا کە نوێژەو بەبێ هودەو کەمبایەخ سەیرکردنی بە ئەنقەست، دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوە و سوککردنی کێشی کردەوەکان، چونکە نوێژ هەوێنی هەموو کردەوەکانە و واتای تەواوی هەموو کردەوەکانی لە خۆ گرتووە.

**عن بريدة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من ترك صلاة العصر فقد حبط عمله".**[3] واتە: لە بورەیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەر

---

[1] الترغيب والترهيب ٧٩٥و ٨٠٤ رواه محمد بن نصر في كتاب الصلاة بلفظه، حسن لغيره.

[2] الترغيب والترهيب ٧٩٩ وقال محققه رواه الطبراني باسناد صحيح.

[3] رواه البخاري ٥٢٨ ورياض الصالحين ١٠٥٢ وصحيح الجامع٦١٤٦ والترغيب والترهيب ٦٧١.

(سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس وازبێنێ لە نوێژی عەسر بێگومان کردەوەکانی بەتاڵ دەبنەوە".

**وعن أبي الدرداء (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من ترك صلاة العصر متعمدا فقد حبط عمله"**[1]. **(رواه أحمد باسناد صحيح).** واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس بە ئەنقەست واز لە نوێژی عەسر بێنێ بەڕاستیی کردەوەکان پوچەڵ دەبنەوە".

**وعن إبن عمر (رضي الله عنهما) عن النبي ﷺ قال: الذي تفوته صلاة العصر فكأنما وتر أهله وماله". صحيح**[2]واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێ)، فەرمووی: "ئەوەی نوێژی عەسر بفەوتێنێ وەکو خێزانو ماڵی لە دەست دابێ و بە تەنها خۆی بەجێمابێ وایە".

**ورواه إبن ماجه بلفظة قال: "بكروا بالصلاة في يوم الغيم فانه من فاتته صلاة العصر حبط عمله".**[3] واتە: زوو نوێژ بکەن لە ڕۆژی هەورو هەڵادا، چونکە بەڕاستیی ئەوەی نوێژی عەسر بفەوتێنێ هەموو کردەوەکانی بەتاڵ دەبنەوە.

جا ئەگەر بە فەوتاندنی یەك نوێژ هەموو کردەوەکان پوچەڵ ببنەوە، ئەی ئەگەر کەسێك هەر نوێژ نەکاتو لەژیانیدا کڕنوشو یەك سوژدەی بۆ خوا نەبردبێ؟! کەسێك نوێژ بکاتو لە ناوەڕۆکی نوێژەکەی بێئاگا بێت، یان نوێژ بکاتو تەنها گوناهی ئەوە بێت لە کاتی خۆی دوای بخات بچێتە وەیلەوە، ئەی ئەگەر هەر نوێژ نەکات و لە ڕواڵەتو ناوەڕۆکی نوێژی بێئاگا بێت، دەبێ حوکمی چۆن بێت؟!

---

[1] الترغيب والترهيب ٦٧٢.

[2] رواه مالك والبخاري ٥٢٧ ومسلم ٦٢٦ وأبوداود ٤١٤ والترمذي ١٧٥ والنسائي ٣٦٤ وإبن ماجة ٦٨٥ وإبن خزيمة في صحيحه ٣٣٥. والترغيب والترهيب ٦٧٤ عن نوفل بن معاوية "صحيح". الترغيب والترهيب ٦٧٣

[3] الترغيب والترهيب "صحيح" الترهيب من فوات العصر بغير تحذر ٦٧١.

## نوێژنەکەر لە دیدی پێغەمبەرەوە ﷺ

نوێژنەکەر لە دیدی پیرۆزی پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) لە ریزی هاوبەشدانەرو بێبڕواو دوور لە ئیمان ریزبەندیی دەکرێ، ئەگەرچی زانایان نوێژنەکەران پۆلێن دەکەنو هەندێکیان بە شایستەی ئەو حوکمانەی سەرەوەی دەزانن و هەندێکیشیان بە موسڵمانی یاخیو دوور لە خوا لە قەڵەمی دەدەن.

نوێژنەکەر لە خوای نەترسە، فەرمانی خوای شکاندووە، فەرمانی پێغەمبەری پشتگوێ خستووە، ئایەتی قورئانی فەرامۆش کردووە. نوێژنەکەر دوور لە خوایە، لە دوارۆژ بێئاگایە، بێ پشتو پەنایە. نوێژنەکەر ڕێبازی شەیتان دەگرێتەبەر، کاتێ خوا فەرمانی پێکرد سوژدە بۆ ئادەم بەرە، ملی نەداو فەرمانی خوای شکاند. نوێژنەکردن یادی خوا نەکردنو فەرامۆشکردنی لایەنی دەروونیو سروشتییە، نوێژنەکەر پەیوەندیی خۆی لەگەڵ خودای خۆی دەپچڕێنێ.

لەسەردەمی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) کەسانێك هەبوون گاورو جولەکەو تەنانەت هاوبەشدانەریش، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)و هاوڕێکانی داوای نوێژیان لێ نەکردوون، بەڵام کەسانێك بڵێن موسڵمانین و نوێژ ناکەین، یان ئیمانداربینو بڕوامان هەیە بە بەرنامەی ئیسلامو نوێژ ناکەین شتی لەم جۆرەو کەسانێك بەو ناونیشانە، نە لەسەردەمی پێغەمبەرو (سەلامی خوای لێ بێ) نە لە شەرعی ئیسلامدا نەبوونو نین.

تەنانەت پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) بە خەیاڵیدا هاتووە دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە کە خۆیان وەکو موسڵمان ناساندووەو لە کردنی نوێژەکاندا تەمەڵیو دەغەڵیان کردووە ماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا بە درێژایی مێژووی ئیسلام هەر لەسەردەمی زێڕینی پێغەمبەرو (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) خەلیفە راشیدەکانو لەسەردەمی ئەمەویو عەبباسیو عوسمانییشدا نوێژنەکەری ناموسڵمان لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ئیسلامدا خۆشگوزەرانو خۆشبەخت ژیاون لە گاورو جولەکەو تەنانەت بتپەرستو جۆرەها دینو غەیرە دینی ترو کەسیش دەستی بۆ نەبردون، تەنانەت پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) هەڕەشەی کردووە لە هەر کەسێك دیانێك واتە گاور، یان جولەکەیەکی ژێر دەسەڵاتی ئیسلام

بکوژێ، بەڵام کەسێك بڵێ موسڵمانم نوێژ ناکەم، پێغەمبەری ئیسلام (سەلامی خوای لێ بێ) ئەو کەسەی بە هاوبەش دانەرو بێبڕواو بێوەفاو خراپەکارو غافڵو بێئاگا لە قەڵەم داوەو ئەو کەسە شایستەی هیچ جۆرە پاداشتێك نییە لە دونیاو دوارۆژدا. پێغەمبەری خواش (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) تکای بۆ ناکاتو لەگەڵ فیرعەونو هامانو قارونو ئوبەیەی کوڕی خەلەفدا حەشر دەکرێتو، بەبێدینو بێئیمانو زۆر شتی تر وەسفکراوە، لە فەرمودە هەرەشە ئامێزەکانی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ).

## وازهێنان لە نوێژ بێباوەڕییە

**قال تعالى: ".. وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ"**. واتە: بە چاکیی نوێژەکانتان بکەنو مەبنە هاوبەش دانەر.

پێغەمبەری خواش دەفەرموێت: **"بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة"**.[1] واتە: لە نێوان کەسێکی باوەڕدارو هاوبەشدانەرو کافردا وازهێنانە لە نوێژ.

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە، **عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة". (رواه أحمد ومسلم)**. واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی کە پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: نێوان پیاوێکی موسڵمانو کافر وازهینانە لە نوێژ.

لە ریوایەتێکی تردا کە پێشەوا ئەبوداود گێڕاویەتیەوە **"ليس بين العبد وبين الكفر الا ترك الصلاة"**. واتە: نێوانی بەندەی خواو بێباوەڕیی وازهێنانە لە نوێژ، پێشەوا **(الترمذي)** بەم دەقە گێڕاویەتییەوە **"بين الكفر والإيمان ترك الصلاة"**. واتە: نێوانی بێباوەڕیىو ئیمان وازهێنانە لە نوێژ، إبن ماجە بەم شێوەیە گێڕاویەتییەوە **"بين العبد وبين الكفر ترك الصلاة"**.صحيح[2] واتە: لە نێوان بەندەی خواو بێباوەڕییدا نوێژنەکردنە.

---

[1] صحيح الجامع ٢٨٤٨. الترغيب والترهيب ٧٩٥ صحيح.

[2] الترغيب والترهيب ٧٩٥.

وعن عبدالله بن شقيق العقيلي (رضي الله عنه) قال: كان أصحاب محمد ﷺ لايرون شيئا من الأعمال تركه كفر غير الصلاة". صحيح موقوف[١] واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی شەقیقی عوقەیلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوایان لێ بێ) وازهێنان لە هیچ کارو فەرمانو ئەرکێکی شەرعییان بە کوفرو بێباوەڕیی نەزانیوە تەنها وازهێنان لە نوێژ نەبێت.

قال أبو درداء ﷺ: "لا أيمان لمن لاصلاة له"[٢]. واتە: بڕوای نییە ئەوەی نوێژ نەکات.

کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر ئەو ڕایە بوون کە هەرکەس بە ئەنقەست واز لە نوێژ بێنێ بێباوەڕە، لەوانەش عومەری کوڕی خەتتاب، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، موعازی کوڕی جەبەل، جابری کوڕی عەبدوڵڵا، ئەبودەرداء و غەیری ئەمانیش (ڕەزای خوایان لێ بێ) وە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویە و عەبدوڵڵای کوڕی موبارەكو نەخەعیو حەکیمی کوڕی عوتەیبە و ئەیوبی سەختیانیو زۆری تریش.[٣]

## وازهێنان لە نوێژ بێباوەڕیی بەڵگەنەویستە

کۆمەڵێ لە زانایان نوێژنەکردنیان بە "کفر البواح" (بێباوەڕیی بەڵگەنەویست) داناوە. **"فقد ثبت عن عبدالله بن شقيق العقيلى التابعى الجليل أنه قال "لم يكن أصحاب رسول الله ﷺ) يرون شيئا تركه كفر، غير الصلاة".**[٤]واتە: چەسپاوە لە عەبدوڵڵای کوڕی شەقیقی تابیعی پایەدارەوە فەرموویەتی: "هاوەڵانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)و (ڕەزای خواش لەوان) وازهێنان لە هیچ ئەرکێکی شەرعیان بە کوفرو بێباوەڕیی نەزانیوە، بێجگە لە وازهێنان لە نوێژ.

---

[1] الترغيب والترهيب ٧٩٨.

[2] الترغيب والترهيب ٨١٨.

[3] صحيح وصايا الرسول ج٣ ص٣٩.

[4] مجموع الفتاوى (إبن باز) ج١، ص٢٩٣.

وازهێنان لە نوێژ بێباوەڕیی گەورە بووە بە لای ئەوانەوە، بەڵگەگەلێکی زۆریشیان بە دەستەوە بووە، لەوانە: خوا دەفەرموێت: **".. وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ"**. واتە نوێژ بکەنو مەبنە هاوبەشدانەران.

**عن جابر (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ أنه قال: "بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة".**[1] واتە: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: لە نێوان پیاوێکی موسڵمانو پیاوێکی بێباوەڕ نوێژنەکردنە، ئەگەر نوێژ نەکات موسڵمان نییە.

**عن بريدة بن الحصيب (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ أنه قال: العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر".**[2]واتە: لە بورەیدەی کوڕی حەسیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا ـ بێباوەڕاندا ـ هەیە نوێژە، بێگومان هەرکەس وازی لێ بێنێ بێباوەڕ دەبێ".

پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی پێشەوای موسڵمانان، ئەوانەی واز لە نوێژ دێننو حەرامکاریی دەکەن، وتیان بە گژیاندا نەچین؟ فەرمووی: **"لا، ما أقاموا فيكم الصلاة"** واتە: نەخێر هەتا لە ناوتاندا نوێژ بکەن.

لە دەقێکی تری فەرموودەکەدا فەرموویەتی: **"إلا أن تروا كفرا بواحا"** فەرمووی نەخێر، مەگەر کوفرو بێباوەڕیی رون و ئاشکرایان لێببینن. ئەمەش بەڵگەیە کە وازهێنان لە نوێژ (کفر بواح) بێباوەڕی ئاشکراو بەڵگەنەویستە.[3]

ئەبوئەیوبی سجستانی فەرموویەتی: وازهێنان لە نوێژ کوفرێکە جیاوازیی تیا نییە.[4] واتە: لە نێوان زانایاندا.

---

[1] رواه مسلم ٨٢.

[2] رواه الامام أحمد ٢٢٩٨٧ وأبوداود الترغيب والترهيب ٧٩٦ صحيح، والترمذي ٢٦٢١، وقال حسن صحيح.

[3] مجموع الفتاوى (إبن باز) ج١٠، ص٢٩٣ـ ٢٩٤.

[4] صحيح وصايا الرسول ج١، ص٢٣.

## نوێژنەکردن عاقڵمەندی نییە

نوێژ ئەرکێکی خواییە لەسەر کەسانی عاقڵو خاوەن ژیریی، هەرکەس ئەو بەهرەیەی لە دەستدا، نوێژی لەسەر نامێنێ، منداڵ چونکە عەقڵی کامڵ نەبووە نوێژی لەسەر فەرز نییە، شێت نوێژی لەسەر فەرز نییە، چونکە نائاوزێ، گیاندارو ئاژەڵ و باڵندە نوێژی ئیسلامو لێپرسینەوەیان لەسەر نییە.

لە دروستکراوەکانی خوا ئەوانەیان خاوەنی ژیریین نوێژی ئیسلامیان لەسەر فەرزە و بە نەکردنی گوناهبار دەبن، خوا دەفەرموێت: **"وَإذا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ اتَّخَذُوهَا هُزُواً وَلَعِباً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَعْقِلُونَ" (المائدة: ٥٨)**. واتە: کاتێك بانگ دەفەرموێ بۆ نوێژ، بێبڕواکان دەکەونە گەمەو گاڵتە، چونکە ئەوانە گەلێکن عەقڵیان پێناشکێو نافامن، هەروەها دەفەرمویت: **"ولاتقربوا الصلاة وأنتم سکاری"** واتە: نزیکی نوێژ نەکەون لە کاتێکدا مەستو سەرخۆشو بێهۆشن.

زاناکان چەند شتێکیان فەرمووە دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥٨) لە سوڕەتی مائیدە، کە لەسەرەوە باسمان کرد:

١ ـ دەفەرموون جولەکەکان لە کاتی بانگو قامەتدا دەیانوت هەستان، هەڵنەستان، نوێژیان کرد، نوێژیان نەکرد، بەگاڵتەو گەپ ئەم قسانەیان دەکرد.

٢ ـ کافرو بێبڕواکان کە گوێیان لە بانگ دەبوو ئیرەییو حەسوودییان بە پێغەمبەرو موسڵمانان دەبردو دەیانوت: ئێی، موحەممەد شتێکی تازەی داهێناوە، کە لەوەوپێش نەمانبیستووە، جا ئەگەر تۆ بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکەی چۆن دەبێ لە بانگدا پێچەوانەی پێغەمبەرانی پێشوو بکەیت، جا دەیانوت ئەم دەنگە چەند ناخۆشە و کارێکی ناهەموارە.

٣ ـ زانای پایەدار **(السدي)"** فەرموویەتی: "پیاوێکی گاور لە شاری مەدینە کە گوێی لە بانگ دەبوو کە دەڵێ: **"أشهد ان محمدا رسول الله"** کابرا دەیوت: درۆزن سووتا "یان دەسووتێ"، خزمەتکارەکەی شەوێك دەچێتەوە ماڵەوە ئاگرێکی پێدەبێ، خەوی لێدەکەوێ، ئەوانیش هەموو خەوتبوون، پریسکێك لە ئاگرەکە بەردەبێتەوە، ماڵەکە هەموو دەسوتێنێ و کابرا خۆیو خێزانەکەشی دەسووتێن.

هەرکەس دوو مەرجی تیابێ نوێژی لەسەر فەرزە **"البلوغ"** پێگەیشتنو باڵغ بوون، **"العقل"** ژیرییو عاقڵپێشکانو ئاوزان. کەواتە عەقڵ مەرجی سەرەکییە بۆ نوێژ.

**عن أبي موسى (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "كل ما أسكر عن الصلاة فهو حرام". صحيح**[1] واتە: لە ئەبوموساوە (رەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەموو شتێکی سەرخۆشکەرو بێهۆشکەر لە نوێژ حەرامە". چونکە نوێژ کاری کەسی بێعەقڵ و بێهۆشو سەرخۆشو مەست نییە و نابێ بەسەرخۆشیی ئەنجام بدرێ.

## شۆردنی تەرمی نوێژنەکەر ئەرکی شەرعیی نییە

شۆردنی تەرمی مردوو پێش ئەسپەردەکردنی ئەرکێکی شەرعییە لەسەر زیندووەکان، کە مافێکی مردووی موسڵمانە بەسەر زیندووەکانەوە و دەبێ ئەنجامی بدەن. ئەگەر کەسێك بمرێو بەبێ شۆردن ئەسپەردەی خاك بکرێ، هەموو کەسێکی ژیرو پێگەیشتووی ئەو شوێنە تاوانبار دەبن لای خواو خەجاڵەتی لای مردووەکەش دەبن.

زانایانی ئیسلام دەربارەی نوێژنەکەر چەند رایەکیان هەیە، رای یەکەم: زانایان (رەحمەتی خوایان لێ بێ) جیاوازیی رایان نییە، ئەگەر کەسێکی عاقڵی پێگەیشتوو کە تازە موسڵمان نەبێو بڕوای بە نوێژ نەبێ و بە فەرزو ئەرکێکی شەرعیی نەزانێ، کافرە، با خۆیشی بە موسڵمان بزانێ و رۆژوو بگرێو حەج بکاتو زەکات بداتو خێر بکات، هەرکەس بڕوای وابوو بە موسڵمان ناژمێرری، کە مرد وەکو موسڵمان مافی بەسەر زیندووەکانەوە نییە، لە شۆردنو نوێژ لەسەرکردنو ئەسپەردەکردن، نابێ لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێ.

دووهەم: ئەگەر نوێژ بە فەرزو ئەرکی شەرعیی بزانێ، بەڵام بە تەمەڵیی و دەغەڵیی نەیکات و بێهودەو بێبایەخ بڕوانێتە ئەو پایەو ئەرکە شەرعییە، زانایان دوو رایان لەم بارەوە هەیە:

١ ـ دەفەرموون موسڵمانەو بە بڕوادارو موسڵمان حیساب دەکرێو حیسابی نەفامیی و تێنەگەیشتوویی بۆ دەکرێ.

٢ ـ دەفەرموون موسڵمان نییەو هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نامێنێ، ئەگەر لە ماوەی ژیانیدا نوێژی نەکردبێو نەیکات، وەکو ئەرکی شەرعییو خوایی ئەنجامی

[1] صحيح الجامع ٤٥٤٥.

نەدابێ، هەرچەند بە فەرزو فەرمانی شەرعییشی بزانێ، لەو زانایانەش پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵو غەیری ئەویش دەفەرموون: "نوێژی لەسەر ناکرێ و لە گۆڕستانی موسڵمانانیش ئەسپەردە ناکرێ".

ئەبودەردائیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"لا أيمان لمن لا صلاة له، ولا صلاة لمن لا وضوء له".** [١] واتە: ئیمانی نییە ئەوەی نوێژ نەکاتو نوێژی دروست نییە ئەوەی دەستنوێژی نەبێ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"من ترك الصلاة فلا دين له".** [٢] واتە: هەرکەس واز لە نوێژ بێنێ دینی نییە.

## شەیتان لە گوێی نوێژنەکەر هەڵدەمیزێ

**عن إبن مسعود (رضي الله عنه) قال: "ذكر عند النبي ﷺ رجل نام ليلة حتى أصبح قال: ذاك بال الشيطان في أذنيه أو قال في أذنه". صحيح** [٣] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: باسی پیاوێك کرا لە خزمەت پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ)، وتیان پیاوێ کە شەو تا بەیانی خەوتووە، فەرمووی: ئەوە شەیتان میزی لە هەردوو گوێچکەی کردووە، یان فەرمووی لە گوێچکەکەی کردووە.

ابن حبان فەرموویەتی لە ڕیوایەتێکەدا **"نام عن فريضة"** واتە ئەوەی بخەوێو فەرزێك نەکاتو بیفەوتێنێو زایەی بکات. **"إبن حجر"** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: مەبەست بە میزکردنە گوێوە دەست بەسەرداگرتنو ژێر دەستکردنو بەخسیرکردنە لە لایەن شەیتانەوە، هەتا وەکو شوێنی میزکردن ئامادەو داماوی دەکات، ئەگەر میزیشی پیادا بکات بە خەبەر نایەت. [٤]

---

[1] فتاوى معاصرة ص٢٠٩. يوسف القرضاوى. وصحيح فقه السنة ج١ ص٢٣١.

[2] فتاوى معاصرة ص٢٠٩. وصحيح فقه السنة ج١، ص٢٣١.

[3] رواه البخاري ٣٠٩٧ ومسلم ٧٧٤ والنسائي ١٣٠٢ وإبن ماجة والرغيب والترهيب ٩٤١ ورياض الصالحين ١١٦٤.

[4] صحيح وصايا الرسول ص٤١١ـ ٤١٢.

**قال إبن مسعود: "حسب الرجل من الخيبة والسر ان ينام حتى يصبح وقد بال الشيطان في أذنه".**[1] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: کەسێك هەتا بەیانی بخەوێو هەڵنەستێ بۆ شەونوێژ، ئەوەندەی بەسە لە نائومێدییو بەدبەختییو شەڕەنگێزیی کە شەیتان میز دەکاتە گوێیەوە.

## نوێژنەکردن نیشانەی تەمەڵییە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی دووڕووەکان دەفەرموێت: **"..وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى.."**. واتە: ئەگەر هەڵدەستان بۆ نوێژ بە تەمەڵیی هەڵدەستان، هەروەها لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، فەرموویەتی: نوێژی بەیانیو خەوتنان لە هەموو نوێژەکان گران تر بووە بە لای دووڕووەکانەوە.

بە هەندێ لە خواپەرستان وتراوە: بۆ ئەوەندە ئەم لاشەی خۆت سزاو ئەشکەنجە ئەدەیت؟ واتە زۆر نوێژ دەکەیت؟، فەرموویەتی ڕێزی ئەوم ئەوێت.

**وإذا كانت النفوس كبارا        تعبت في مرادها الاجسام**

واتە: ئەگەر گیانو دەروونەکان گەورەو شکۆدار بوون، لە پێناویاندا دەبێ لاشە ماندو بێت.

نوێژکردن کەسی چوستو چالاكو لاشەی سوكو مرۆڤی زرینگو خۆنەویستو ماندووبینەناس پەروەردە دەکات، چونکە هەموو نوێژێك هەندێك ماندوویەتیو چالاکییو خۆنەویستی گەرەکە، نوێژخوێن دەبێ هەندێك لە خەوو پشوو ئیسراحەتی بفەوتێنێ، دەبێ بە ئاوی ساردو لە کاتی سەرمادا دەستنوێژ بگرێ، خەوی خۆشی بەیانیان واز لێدێنێ، بەگەرمای نیوەڕۆ و لە کاتی دەستهەڵگرتن لە کارو کاسبی دەبێ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بکات، شەو نابێ بخەوێ ئەگەر ترسی بە خەبەر نەهاتنەوەی هەبێ، هەتا نوێژەکەی دەکات، لە سەفەرو جەنگو کاروانو ڕێگەو ڕێبازدا نابێ نوێژ بفەوتێنێو تەمەڵیی بکات، چونکە تەمەڵییکردن، لە ئەنجامنەدانی نوێژ نیشانەی

---

[1] رهبان الليل ج١، ص٢١٣.

تەمەڵییە، لەم روانگەیەوە پێغەمبەر دوعا دەکات لەو کەسانەی لە نوێژدا بە باشیو رێکوپێکی پشتیان رێکنا کەنەوە.
هەروەها مۆڵەتی داوە بە کەسێك خەو دایبگرێ کە نوێژەکەی دوابخاتو جارێ سەرخەوێ بشکێنێو دواتر نوێژەکەی بە چوستو چالاکیی بکات.

## وازهێنان لە نوێژ دەبێتە هۆی زاڵبوونی شەیتان

نوێژکردن بە چاکیی هۆی نزیکبوونەوەیە لە خواو بە دەستهێنانی نزیکیی و خۆشەویستیی خوایە، وازهێنانیش لە نوێژ دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە خواو هەموو دوورکەوتنەوەیەکیش لە خوا نزیکبوونەوەیە لە شەیتانو زاڵبوونی بەسەر هەستو نەستی مرۆڤدا.
**عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: "ما من ثلاثة في قرية ولا بدو لاتقام فيهم الصلاة إلا قد استحوذ عليهم الشيطان، فعليكم بالجماعة، فإنما يأكل الذئب من الغنم القاصية".**[1] واتە: لە ئەبی دەردائەوە (رەزای خوای لێ بێ)، فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ)، دەیفەرموو: "هەر سێ کەسێك لە لادێیەکدا، یان لە دەوارنشینێکدا نوێژ ئەنجام نەدەن بە کۆمەڵ، ئەوا شەیتان سوار سەریان دەبێو زاڵ دەبێت بەسەریاندا، دەستبگرن بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە، چونکە گورگ بزنی لاکەوتەو پەڕاگەندە دەخوات، هەروەها لە کاتی نوێژدا شەیتان هەوڵدەدات خەیاڵو خەتەرەو سەرقاڵیی بۆ نوێژخوێنان دروست بکاتو گێروگرفتو تەنگو چەڵەمەی وەبیر بێنێتەوەو ئەویش لە نوێژەکەی بێئاگابێ و سەرگەرمی چارەسەری گرفتەکان بێت، دواتر کە سەلامی دایەوە نەزانێ چەند رکاتی کردووە.

## نوێژنەکردن تاوانی هەرەگەورەیە

نوێژکردن بەو شێوەیەی خوا فەرمانی کردووە بە ئەنجامدانی، چاکترین کردەوەیە، کەواتە وازلێهێنانی گەورەترین گوناهەو وازهێنانە لە گەورەترین و چاکترین کردەوە.

---

[1] رواه أبوداود باسناد حسن رقم ٤٥٧ ورياض الصالحين ١٠٧٠.

**وشدد إبن حزم (رحمه الله)) في ذلك فقال: لا ذنب بعد الشرك أعظم من تأخير الصلاة عن وقتها وقتل المؤمن بغير حق".**[1] واته: إبن حزم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) زۆر توند بووە دەربارەی نوێژ فەوتانو فەرموویەتی: "هیچ گوناهێك لە دوای هاوبەش دانان گەورەتر نییە لە درەنگخستنی نوێژ لە کاتی خۆیداو، کوشتنی بڕوادار بە ناهەق".

نوێژنەکردن وازهێنانە لە فەرمانێکی خواو ئەرکێکی شەرعیی کە خوا دەفەرموێت نوێژ بکەو مەبەرە هاوبەشدانەرو لە من غافڵو بێئاگا مەبە.. نوێژ بکە کە دەتەوێ یادی من بکەی.. پێغەمبەری پێشەواش (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: نوێژ پەیمانی نێوان منو ئێوەیە، هەرکەس نوێژی نەکرد موسڵمان نییە و پەیمانی لەگەڵ خوادا شکاندووە.

## نوێژنەکردن خۆ بێبەرییکردنە لە خوا

نوێژ بەهێزترینو پتەوترین پەیوەندیی نێوان بەندەو پەروەردگاریەتی، کە وازی لە نوێژ هێنا ئەو پەیوەندییە گەورەو بەهێزەی نامێنێ، نوێژخوێن روو لە خوا دەکات، قسەی لەگەڵ دەکات، دڵی پەیوەستە پێوەی، لاشەو گیانی ملکەچو گەردنکەچی خوایە، بە بێ پەردە لەگەڵ خوای خۆیەتی، لێی دەپاڕێتەوەو ستایشی دەکات، داوای یارمەتیی و هیدایەتی لێدەکات، بەندایەتیی خۆی دەنوێنێ.

**عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "لاتشرك بالله شيئا، وان قطعت وحرقت، ولاتترك صلاة مكتوبة متعمدا، فمن تركها متعمدا فقد برئت منه الذمة، ولاتشرب الخمر، فإنها مفتاح كل شر". صحيح**[2] واتە: لە ئەبی دەردائەوە (ڕەزای خوا لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، فەرمووی: "هیچ هاوبەشێك بۆ خوای گەورە بڕیار مەدە، هەرچەند بتبڕنەوەو بتسووتێنن، واز لە نوێژی فەرز مەهێنە بە ئەنقەست، هەرکەس بە ئەنقەست واز لە

---

[1] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٣٩٠.

[2] رواه إبن ماجة٤٠٣٤ وصحيح الجامع٧٣٣٩ والترغيب والترهيب ٨٠٦ـ ٨٠٧ـ ٨٠٩ حسن لغيره.

نوێژ بێنێ بێبەریی دەبێ لە خوا ـ بەندایەتیی خوا لە گەردنی دادەماڵێ ـ عارەق نەخۆیتەوە، بەڕاستیی کلیلی هەموو شەڕێکە".

## مردنی نوێژنەکەر مەرگەساتە

نوێژنەکەر کاتێك لە دونیا لەسەر پێخەفی مەرگ رادەکشێو هەناسەکانی بەرەو تەواوبوونو لاوازبوون دەچنو رۆحی هێواش هێواش تەلاری لاشەی بەجێدێڵێو چۆڵی دەکاتو پاشەکشێ دەکات لەو لاشەیەی چەندەها ساڵە دەستی بەسەردا گرتووەو هەڵی دەسووڕێنێ، لەو کاتەدا کە ئەندامەکانی لاشە یەك لە دوای یەك لە هێزو توانا دەکەونو پەکیان دەکەوێو هیچ پزیشكو حەکیمو دەرمانێك دادی نادات **"تَظُنُّ أن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ"**. (القيامة: ٢٥). واتە: چاوەڕێی جەزرەبەی کەمەرشکێنە کەموارغەی پشتیان بشکێنی. **"كَلا إذا بَلَغَتْ التَّرَاقِيَ * وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ * وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ"**. **(القيامة: ٢٦ ـ ٢٨)**. واتە: "نەخێر هەر بە خۆی نازانێ تا مەرگ گەروی دەگرێ، دەوترێ کێ فریادرەسیەتی، ئەوجا لێی روونە کاتی جیابوونەوەی رۆحو گیانیەتی. **"وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ"**. (القيامة: ٢٩). واتە: "قاچو لینگ و لەتەر تێك دەئاڵێن". **"إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ"** (القيامة: ٣٠). واتە: بۆ لای پەروەردگارت راپێچ دەکرێن، بۆیە ئاوا بە ناخۆشییو شپرزەیی **"فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّى"** **(القيامة: ٣١)**. واتە: چونکە نەبڕوای هێناوەو نەنوێژیشی کردووە. **"وَلَكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّى"** **(القيامة: ٣٢)**. واتە: بەڵکو بە درۆی خستۆتەوە، بڕوای پێنەهێناوەو پشتی هەڵکردووەو خۆی بواردوە. هەروەها لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی نوێژنەکەر دەفەرموێت **".. ومن لم يحافظ عليها، لم يكن له نور ولا برهان ولا نجاة، وكان يوم القيامة مع قارون وفرعون وهامان وابي بن خلف"**.[1] واتە: هەرکەس پارێزگاریی لە نوێژ نەکات، نە نوورو رووناکییو نە بەڵگەی رزگاربوونی هەیەو لە رۆژی دواییشدا لەگەڵ قارونو فیرعەونو هامانو ئوبەی کوڕی خەڵەف حەشر دەکرێ.

[1] رواه إبن حبان في صحيحه ١٤٦٧ وأخرجه احمد ٦٥٧٦ وصحيح وصايا الرسول ج١ ص٤٠٦ وقال إسناده جيد.

دیاره لەگەڵ ئەوان حەشر بکرێ مردنەکەشی وەکو مردنی ئەوان بووە، لەسەرەمەرگدا بە مەرەدی ئەوان چووە.

## نوێژنەکەر لە دوارۆژدا لەگەڵ قارونو فیرعەونو هامانو ئوبەی کوڕی خەڵەف دەبێ

نوێژ ئەرکێکی خواییەوە گەورەترین پایەو کۆڵەکەی دینە لە دوای بڕوابوون بە خوا، بە هیچ جۆرێك مۆڵەتی نەکردنی نییە بۆ هیچ کەسێكو لە هیچ کاتو شوێنو زەمانێکدا، نە بۆ پاشا، نە بۆ گەدا، نە بۆ هەژارو نەدار، نە بۆ بێکەس، نە بۆ کەسدار، نە بۆ بازرگانو نە بۆ ماڵدار.

**عن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنه) عن النبي ﷺ أنه ذكر الصلاة يوما فقال: "من حافظ عليها كانت له نورا وبرهانا ونجاة يوم القيامة، ومن لم يحافظ عليها لم يكن له نور ولا برهان ولانجاة، وكان يوم القيامة مع قارون وفرعون، وهامان، وابي بن خلف".**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) ڕۆژێك باسی نوێژی دەکرد فەرمووی: هەرکەس پارێزگارییان لێ بکا، نورو بەڵگەو رزگار بوونی ڕۆژی دوایی بەدەستهێناوە، هەرکەسیش پارێزگارییان لێ نەکات، نە نوور و نە بەڵگە و نە رزگاربوونی هەیەو لە ڕۆژی دواییشدا لەگەڵ قارونو فیرعەونو هامانو ئوبەی کوڕی خەڵەف دەبێت. بۆ لەگەڵ ئەوانە دەبێت؟، هەتا خەڵکی بە گشتیی بزانن، نە پاشاو نە گەدا، نە خاوەن کەسو نە بێنەوا، نە بازرگانو خاوەن ماڵ، نە وەزیرو گزیر، نە خاوەن پرسو راو تەگبیر، کەس بۆی نییە نوێژ بفەوتێنێ، لە شەرع دەرچێو خۆی بنوێنێ. ئەم فەرموودە پیرۆزە بیانوو بە دەست کەسەوە ناهێڵێ، هەر پلەو پایەیەكو شوێنو مەقامێکی هەبێ، ئەگەر کەسێك دەسەڵاتو پاشایەتیو پایەداریی بکاتە بیانووی نوێژنەکردن، لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ فیرعەون دادەنرێ، ئەگەر تەگبیرو راو سیاسەتو پلاندانان نوێژی لەبیر

---

[1] إسناده جيد أخرجه أحمد في المسند رقم (٦٥٧٦) ٢/١٦٩، وإبن حبان في صحيحه ١٤٦٧. صحيح و صايا الرسول ج١ ص٤١٢-٤١٣. و ص٤٠٦.

بردبووەوە، لەگەڵ هامانی وەزیری شەڕەنگێز دادەنرێ، ئەگەر سەروەتو سامانو ماڵی زۆرو کۆشكو تەلارو دوکانو بازاڕ سەرقاڵی کردبوو، لەگەڵ قارون دەبێ، ئەگەر بازرگانییو مامەڵەو کڕینو فرۆشتنو پارەبژاردنو ئاڵتونو زێڕ نوێژی پێفەوتاندبوو و لە بیری بردەوە، ئەوە لەگەڵ گەورەی فاسقان، ئوبەی بێ دینو ویژدان دەبێتە هاودەم.

## نوێژنەکەر بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریەوە نەچووە

نوێژکردن وەڵامدانەوەی بانگەوازی خواو تەواوی پێغەمبەرانەو جێبەجێکردنی ئەرکی خواییو داواکاری دەروونی مرۆڤە، بە پێچەوانەشەوە نوێژنەکردن وەڵامنەدانەوەی بانگەوازی خواو سەرجەم پێغەمبەرانە، هەروەها نوێژنەکردن فەرامۆش کردنی داواکاریی دەروونی مرۆڤە.

خوا دەفەرموێت: **"وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ...."**. (الشوری: ٣٨) واتە: ئەوانەی وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاریان داوتەوەو نوێژیان بە چاکیی کردووە...

بەستنەوەی ڕستەی **"وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ"** بە پیتی (واو) بە ڕستەی **(وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ)**. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وەڵامدانەوەی پەروەردگار بە نوێژکردن دەبێو هەرکەس نوێژی نەکرد بانگەوازی خواو جاڕی گەردوونییو ئاسمانیی و پەیمانی پێغەمبەرانی فەرامۆش کردووە.[1]

## نوێژنەکردن خۆهەڵاواردنە لە تەواوی بوونەوەر

بوونەوەر سەرتاپا هەمووی پابەندی بەرنامەو ڕێو ڕەسمو نەخشەیەکە کە دروستکەرو نیگارکێشەکەی بۆی دیارییکردووە، تەواوی بوونەوەر سەرگەرمو سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەو بەرنامە خواییو نەخشە گەردونییەیە کە خوا بۆی داڕشتووە، مەگەر کەمێك لە ئادەمیزاد و جنۆکەی سەرکێشو یاخی نەبێت. خوا دەفەرموێت: **"يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأرض الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ"**. (الجمعة: ١).
واتە: پەسەندییو پاكو بێگەردی خوا دەردەبڕن ـ نوێژ دەکەن ـ هەرچی لە ئاسمانو زەویدایە بۆ پاشای پەسەندو پاكو بێگەردو دەسەڵاتدارو کاربەجێ.

---

[1] فضل الصلاة ص١٢٥.

هەروەها دەفەرمویت: ".. وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـ ـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ..". واتە: هیچ شتێك نییە کە پاكو بێگەردی خوا (نوێژ) و سوپاسو ستایشی خوا نەکات، بەڵام ئێوە لە زمانیان حاڵی نابنو تێناگەن.

لە زۆر شوێنی تری قورئاندا باسی تەسبیحاتو نوێژو دەبڕینی پاکو بێگەردی خوا دەکەن لە لایەن تەواوی بوونەوەرەوە. بۆ نموونە: "سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأرض وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ". (الصف : ١) واتە: نوێژ دەکەنو پاكو بێگەردیی خوا دەکەن، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە ئەو خوایەی کە دەسەڵاتدارو کاراو لێزانە. هەروەها لەسەرەتای سوڕەتی (الجمعة والتغابن)یشدا هەر بەو شێوەیە دەفەرموێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموێت: هەموو وشەیەکی "تسبیح" لە قورئاندا بە واتای نوێژە".

لە ڕوانگەی ڕاڤەی عەبدوڵڵای کوڕی عباس بۆ هەموو وشەی تەسبیح کە لە قورئاندا هاتووە کە دەفەرموێ هەمووی بە واتای نوێژە، هەموو بوونەوەر بە گیاندارو بێگیانەوەو، بە زیندوو بە مردووەوە، بە ئەرزو ئاسمانەوە، بە مرۆڤو جنۆکەو فریشتەوە، باڵدارو زیندەوەرەوە، هەموویان نوێژ دەکەن. کەواتوو نوێژنەکەر بە نوێژ نەکردنەکەی خۆی لە هەموو بوونەوەر جیا دەکاتەوەو لە هەموو دروستکراوەکانی خوا خۆی هەڵاواردووە.

# هەڵوێستی پیاوچاکان لە ئاست نوێژدا

پیاوچاکانو پیاوخودایان بە کردنو ئەنجامدانی چەند کردارو رەفتارو رەوشتی جوانو کردەوەی چاك بوونە پیاوچاك، نوێژیش لەسەرووی هەموو کردەوە چاکەکانەوەیەو پێشەنگی هەموو خواپەرستییەکانە.

بۆ پیاوچاکان زۆر گرنگییان پێداوەو بەشێکی تەمەنی خۆیان بۆ تەرخان کردووەو لەسەرمەرگیشدا ئاخیان بۆ هەڵکێشاوە؟ ئەوەندەی خەمیان لە دوورکەوتنەوەی نوێژ خواردووە، ئەوەندە لە مردن نەترساون، لەبەر ئەوەی نوێژ رووناکیی‌و فێنکی چاویان بووەو رەزامەندی خواو بەهەشتو دۆزەخو دادگای پەروەردگاریان لە روانگەی نوێژەکانیانەوە بینیوە. حاتەمی ئەسەم (رەحمەتی خوای لێ بێ)، کاتێك پرسیاری نوێژەکەی لێدەکرێ، دەفەرموێ: هەڵدەستم بۆ نوێژو کەعبە دەخەمە نێوان برۆکانم و لەسەر پردی سیڕات دەوەستم، بەهەشت لە لای راستمو دۆزەخ لە لای چەپم، فریشتەی گیانکێش لە دوامەوەو وا دەزانم کۆتا نوێژمە.[١]

گەورەی نەوەکانی ئادەم، سەروەرو پێشەنگی خواپەرستان، سەرداری پێغەمبەران، مامۆستای خواناسان، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ کە هۆگرو هاودەمی نوێژ بووە، مەیدانی خوا رازی کردنو بەهەشتی رازاوەی پڕ گوڵو گوڵزار، بەهرەو بەهرەمەندیی‌و ناونیشانی نوێژ بووە، ئەو خواناسەی بە بیلالی دەفەرموو: ئەی بیلال بە نوێژ ئاسوودەمان بکە. کە تینی بۆ دەهاتو سەغڵەت دەبوو نوێژی دەکرد، نوێژی کردبووە بیلبیلەو گلێنەو فێنکی چاوە پیرۆزەکانی‌و لە ئەنجامدانی نوێژدا بەری پێی هاسابوو، بە شەو لە پێخەفدا ئۆقرەی نەدەگرتو خەوی لێ هەراسان دەبوو، شەوی لێ دەبوو بە رۆژی روونو خەو لە چاوەکانی دەزڕاو شەونخونی بۆ نوێژەکانی دەکێشا، لە جیاتی خەو، چاوەکانی جۆگەلەی فرمێسکیان لێ هەڵدەنیشت، خەڵکی هەڵدەستانەوە بۆ نوێژ، ئەم هێشتا نەخەوتووە، پێخەفەکەی بە ئاواتی دەخواست گەرمیی لاشەی ئەویان بەرکەوێ، لەو کاتەوە کە **"يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ"** هاتۆتە خوار، بۆ گەشتو گەڕانو، بۆ گەڕانەوە، بۆ مانگو خۆرگیران، بۆ جەژنو، تەوبەو پاڕانەوە، بۆ شەوڕەوی‌و بەرەو

---

[1] صلاح الأمة في علو الهمة ج٢ ص٣٥٢.

ئاسمان بەرزبوونەوە، بۆ ئاشتیو جەنگو دەستەویەخە بوونەوە، نوێژی کردبووە رەمزی لە خوا نزیکبوونەوە.

لە ساغیو نەخۆشیی، لە تەنگانەو خۆشی، لە پرسەو ناخۆشی، هەر نوێژ بوو، لە جیاتی ناشکوریو رەشپۆشی. بۆ منداڵی تازە لە دایك بوو، بۆ موسڵمانی تازە مردوو **"حي على الصلاة"** دروشمی بوو. لە گەرمەی جەنگا، لە نەخۆشی سەرەمەرگا، لە هەژارییو کەمیی پۆشاكو بەرگا، لە مردنی ئازیزو منداڵو جگەرگۆشەدا، پەنا بە نوێژ دەبا.

دوای بڕواهێنان، هیچ فەرزو سوننەتو ئەرکێکی شەرعیی وەکو نوێژی بەلاوە گرنگ نەبووەو باسی نەکردووە، بە نەکردنی هیچ ئەرك و فەرمانێکی شەرعییش، ئەوەندەی فەوتانو نەکردنی نوێژ توورە نەبووەو ئەوەندەش بە گوناهی نەزانیوە، بۆیە لەسەردەمی زێڕینی ئەودا لەوانەیە کەسانێك هەبووبن کە رۆژوویان فەوتاندبێ، یان حەجیان نەکردبێ، یان کەمتەرخەمییان لە زەکاتو جیهاددا کردبێ، بەڵام تاقە یەك موسڵمان نەبووە نوێژی نەکردبێو خۆشی بە موسڵمان زانیبێ، لەسەردەمی پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت)، تەنها نامسوڵمانانو گاورو جولەکەو بتپەرست نوێژی ئیسلامیان نەکردووە. ئیتر کەسێك نەبوو بە ناو موسڵمانو نوێژنەکەریش بووبێ، یان نوێژنەکەرێ نەبوو پێغەمبەرو یارانی بە موسڵمانیان زانیبێ، تەنانەت داوایان لە خوا کردووە کە رێگەیان بدات لە دوای مردنیش لە گۆڕەکانیاندا نوێژ بکەن. موحەممەدی کوڕی سابتی کوڕی ئەسلەمی بەنای (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە نزاو پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو: "خوایە ئەگەر مۆڵەتی نوێژکردنت لەناو گۆڕدا بەخشیوە بە یەك کەس، با ئەو کەسە من بم، ئومێدیشم وایە خوا نزاکەم رەت نەکاتەوە".[١]

## ورەبەرزیی پێشینی ئەم ئوممەتە بەرامبەر بە نوێژ بەم شێوەیە بووە:

١ ـ شوێنی دوورە مزگەوتیان هەڵبژاردووە، هەتا خێری زیاتریان بگات بە هاتوچۆ.
٢ ـ پێشبڕکێو کۆششیان کردووە بۆ نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت).
٣ ـ بەردەوام بەشداریی نوێژی بە کۆمەڵ بوون.

---

[1] (رهبان الليل ج١، ص٤٤٦).

٤ ـ له شەوی هاوسەر گواستنەوەدا چوونە نوێژی بەیانی.

٥ ـ دەرمانو چارەسەری نەخۆشییان بەکارنەهێناوە، لە ترسی فەوتانی بەشداریی لە نوێژی خەوتنانو بەیانی بە کۆمەڵ.

٦ ـ بە نەخۆشیی چوون بۆ نوێژی بە کۆمەڵ.

٧ ـ لە ئاڵۆزترینو ئاساییترین کاتدا چوونە مزگەوتیان واز لێ نەهێناوە.

٨ ـ سووربوون لە چاوەڕوانی نوێژ تا مردن لە مزگەوتو نەگەڕانەوە.

٩ ـ کوڕەکانیان هانداوە بۆ پەیوەست بوون بە مزگەوتەوە.

١٠ ـ لە کوڕەکانیان پرسیوەتەوە دەربارەی چوونە مزگەوتیان.

١١ ـ بە کوڕ و منداڵەکانیاندا هەڵشاخاونو ئەدەبیان داداون لەسەر دواکەوتنی مزگەوت.[1]

١٢ ـ هەوڵیانداوە لە نەخۆشیی مەرگدا بۆ نوێژی خەوتنانو بەیانی بچنە مزگەوت.

١٣ ـ کاربەدەستی موسڵمانان زۆر گرنگیان بە نوێژی بە کۆمەڵ داوە.

ئەمەش نموونە لەسەر هەر یەکێك لەو خاڵانە:

## شوێنی دووره مزگەوتیان هەڵبژاردووه هەتا خێری زیاتریان بگات

پێشەوا موسیلم (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە گێڕاویەتیەوە (رەزای خوای لێ بێ)، فەرموویەتی: پیاوێکی یاریدەدەر "واتە موسڵمانی مەدینەیی" ماڵی لەوپەڕی شار بوو، هەرگیز لە نوێژیش دوانەدەکەوت لەگەڵ پێغەمبەردا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، فەرمووی ئێمەش خەفەتمان لێدەخوارد، پێم وت: فلان کەس خۆزگە گوێ درێژێکت بکڕییایە بیپاراستیتایە لە گەرماو لە مار و مێرووی زەوی، وتی: وەڵڵاهی حەزناکەم ماڵم بە ماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ بێ، منیش بۆم هەڵگرت هەتا چوومە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بۆم گێڕایەوە. ئەویش بانگی کرد، کابراش هەمان قسەی کرد، وتی دەمەوێ پاداشتی هاتوچۆکەم دەستکەوێ، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) پێی فەرموو: ئەوەت دەستگیر بووە". بە چەند ریوایەتی تریش هاتووە.

[1] صلاح الأمة. ج٢ ص٣٦٠.

## کۆششکردن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ

سەیری ورەبەرزیی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بکە لە پەلەکردنی بۆ نوێژی جەماعەت، لە سولەیمانی کوڕی موساوە فەرموویەتی: "بانگبێژەکەی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزم بینی ئەو کاتەی کە خەلیفە بوو، لە "خەناسیرە" لە دەرگاوە سەلامی لێدەکرد (السلام علیکم)، فەرماندەی موسڵمانان لە وەڵامی سەلامەکە نەبووەوە کە هەستا رۆیشت بۆ نوێژ".[1]

## بەردەوام بەشداریی نوێژی بە کۆمەڵ بوون

لە ئەبی حەرمەلەوە گێڕدراوەتەوە کە سەعیدی کوڕی موسەیەب فەرموویەتی: ماوەی چل ساڵە نوێژی جەماعەت، بە کۆمەڵم لە دەست نەچووە. هەروەها فەرموویەتی: (الله أکبر)ی نوێژ دابەستنم لە دەست نەچووە ماوەی پەنجا ساڵە، ماوەی پەنجا ساڵە پشتە ملی کەسم نەدیوە لە نوێژدا، واتە بەردەوام لە ریزی پێشەوە بووم.

هەروەها لە عوسمانی کوڕی حەکیمەوە فەرموویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب بووە دەیفەرموو: ماوەی سی ساڵە بانگبێژ بانگی نەفەرمووە کە من لە مزگەوتدا نەبم.[2]

بیشری کوڕی عاسیم فەرموویەتی: بە سەعیدی کوڕی موسەییەبم وت: مامۆ خۆزگە بهاتیایە نانت لەگەڵ خزمان بخواردایە؟ فەرمووی: پەنا بە خوا ئەی برازای خۆم، واز لە بیستو پێنج نوێژ بێنم بۆ پێنج نوێژ. سەعیدی کوڕی موسەیەب (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس پارێزگاریی لە پێنج فەرزەی نوێژ بکات بە کۆمەڵ ئەوا دەریاو وشکانی پڕ کردووە لە خواپەرستیی".[3]

---

[1] صلاح الأمة ج٢ ص٣٦١-٣٦٢.

[2] صلاح الأمة ج٢ ص٣٧٣.

[3] صلاح الأمة ج٢ ص٣٧٥.

## له شەوی هاوسەرگیرییدا چوون بۆ نوێژی بەیانی

بڕوانه ورەبەرزیی هاوەڵی بەڕێز، حاریسی کوڕی حەسسان، شەوی ژن گواستنەوە لە نوێژی بەیانیدا ئامادە بوو.

عەنبەسەی کوڕی ئەزهەر فەرموویەتی پێیان وت ئەرێ ئەی حارس هاتویە نوێژی بەیانیو ئەمشەویش هاوسەرت گواستۆتەوە؟ فەرمووی وەڵڵاهی ژنێك رێگەی نوێژی بەیانیم لێ بگرێ بە جەماعەت، ژنێکی خراپە.[1]

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "رحم الله رجلا قام من الليل فصلى، وأيقظ امرأته فصلت، فإن أبت نضح في وجهها الماء، رحم الله امرأة قامت من الليل فصلت وأيقظت زوجها فصلى، فإن أبي نضحت في وجهه الماء".**[2] واتە: رەحمەتی خوا لەو پیاوەی هەڵدەستێ بۆ شەونوێژو نوێژ دەکاتو ژنەکەشی هەڵدەستێنێ، ئەگەر خەبەری نەبۆوە بە هێواشی ئاوپڕژێنێ بە رووخساریدا، رەحمەتی خوا لەو ژنەش هەڵدەستێ بۆ شەونوێژو هاوسەرەکەشی هەڵدەستێنێ، ئەگەر هەڵنەستا ئاو بپرژێنێ بە رووخساریدا.

## تەداوییان نەکردووە لە ترسی لەدەستدانی جەماعەت

سەعیدی کوڕی موسەییەب (رەحمەتی خوای لێ بێ) چاوی ژانی دەکرد، مەڵهەمو دەرمانەکەی بەکارنەهێنا، چونکە ئەگەر بەکاری بهێنابە نەدەبوو بچێتە نوێژی جەماعەت، فەرمووی یەعنی بەرگەی ئازاری فەوتانی جەماعەتەکە دەگرم، بەلاَم بەرگەی ئازاری چاوم ناگرم؟[3]

## بە نەخۆشیی چونە نوێژی بە کۆمەڵ

خوای بالاَدەست و کارامە ئەرکێك لە بەندەکانی ناخوازێت کە لە توانایاندا نەبێ، بەڵکو داواکارییەکی لێیان نییە کە هەر پێی نارەحەتو بێ کەیف بن، بۆیە مۆڵەتی

---

[1] صلاح الأمة ج٢ ص٣٦٢.

[2] صحيح الجامع ٣٤٨٨. ورهبان الليل ج١، ص٢٠٩.

[3] صلاح الأمةج٢ ص٣٦٢.

نەخۆشی داوە کە لە توانایدا نەبوو بەڕۆژوو نەبێو نەچێتە حەجی ماڵی خوا، نەچێتە جیهادو مەیدانی خەباتو نەچێتە مزگەوت، ئەگەر لە ماڵەوەش نەیتوانی بە پێوە نوێژ بکات، با بە دانیشتنەوە بیکات، ئەگەر نا بە راکشانەوە یان لەسەر لا، لەسەر پشت ـ بۆ هەر لایەك بتوانێ، ئەگەر هەر بەدڵیش بێ، دەبێ نوێژەکەی بکات.

بەڵام پیاوچاکان بەخۆبەخشو خۆشحاڵیی خۆیان لە کاتی نەخۆشییو تەنانەت لەسەرەمەرگو گیانەڵاش بە چوونە مزگەوتو بەشداریی نوێژی بە کۆمەڵ گیانو دەروونی خۆیان ئاسوودە کردووە. ئەوە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەدە کاتێك کەوتە سەرەمەرگو گیانەڵا گریا، پێیان وت بۆ دەگری؟ فەرمووی بەداخەوەم بۆ نوێژو رۆژوو، بەردەوام قورئانی دەخوێند هەتا مرد.

یەحیای کوڕی قەتتان (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەستی بە دیوارەکەوە دەگرت هەتا هەڵدەستا بۆ ریزی یەکەم، ئیبراهیمی تەمیمی (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەگەر کەسێکت بینی بە بێ رێزو بەبێ هودە سەیری ریزی یەکەمی نوێژی دەکرد کە دەستت لێی درا، دەست بشۆرە".[١]

ئیبنو جورەیج (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "بیست ساڵ مزگەوت شوێنی تاعەتی بوو، لە هەموو کەسیش جوانتر نوێژی دەکرد، بە سەعیدی کوڕی موسەیەبیان وت: تاریق دەیەوێ بتکوژێ، لە ماڵەوە دانیشە، فەرمووی: چۆن گوێم لە (**حي على الفلاح**) بێ بە دەنگیەوە نەچم"؟[٢]

ئیبن خوسەیم "**إبن الخثيم**" بە دووکەس لە هاوڕێکانی مزگەوت راستیان دەکردەوە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بینی، فەرمووی: خوا مۆڵەتی داوی مەیەرە مزگەوت. فەرمووی: بەڵام گوێم لە "**حي على الفلاح**"ە، توخوا هەرکەستان گوێی لێ بوو وەڵامی بداتەوەو بچن بە دەمیەوە.[٣]

ئەم کارەیشیان بە سوننەتی پێغەمبەر زانیوە (سەلامی خوای لێ بێ)، کاتێ لە نەخۆشیی مەرگیدا هاتە مزگەوتو لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژی کرد، ئەبو

---

[1] صلاح الأمة ج٢ ص٣٩٣.

[2] صلاح الأمة في علو الهمة ج٢ ص٣٦٣.

[3] هەمان سەرچاوە، ل٣٧٨.

عەبدڕڕەحمانی سوللەمی فەرمانی کرد بە خۆشیی هەڵی گرن بۆ مزگەوت، لەبەر بارانو بەناو قوڕدا بردیانە مزگەوت.[1]

ئەوان نەخۆش نەبوون، ئێمە دڵمان نەخۆشە.

## لە ئاڵۆزترینو ئاساییترین کاتدا، چوونە مزگەوتیان واز لێ نەهێناوە

پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێ) لە ژێر هەڕەشەو بەردە بارانو ورگو ڕیخۆڵە بەسەرداکردنو هەڕەشەی کوشتن لە لایەن ئەبوجەهلەوە وازی لە کەعبەو نوێژی مزگەوت نەدەهێنا، هاوەڵەکانیشی چاویان لێدەکرد، بە سەعیدی کوڕی موسەییەبیان وت: تاریق دەیەوێ بتکوژێ لە ماڵ دەرمەچۆ، فەرمووی: چۆن گوێم لە **"حي على الفلاح"** بێ نەچم بە دەنگیەوە.[2]

هەردوو خەلیفەی راشد پێشەوایان عومەرو عەلی لە مزگەوتدا لە نوێژی جەماعەت شەهید کران.

## سوور بوون لە چاوەڕوانیی نوێژ تا مردن

ئەبی عەبدوڕڕەحمانی سوللەمی لەسەرەمەرگدا بوو چاوەڕوانی نوێژی دەکرد لە مزگەوت، کاتێ کەوتە گیانەلا، رێگەی نەدان بیبەنە ماڵەوە بۆ سەر جێگەکەی، هەر لەوێ گیانی سپارد. هەر ئەو (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەمەوێ لە مزگەوتی خۆم بمرم.

## کوڕو نەوەکانیان هانداوە بۆ پەیوەستبوون بە مزگەوتەوە

ئەبو دەرداء (رەزای خوای لێ بێ) بە کوڕەکەی دەفەرموو: کوڕی خۆم با مزگەوت ماڵت بێ، چونکە گوێم لە پێغەمبەر بوو (سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: بێگومان

---

[1] هەمان سەرچاوە، ج٢، ص ٢٦٣.

[2] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٢.

مزگەوت ماڵی پارێزکارانە، هەرکەسیش مزگەوت ماڵو مەنزڵی بێت، خوا زەمانەتی ڕۆحو بەزەیی پێداهاتنەوەو پەڕینەوەی سەر پردی سیڕاتی دەکات.[١]

## لە کوڕەکانیان پرسیوە دەربارەی ئامادەبونیان لە مزگەوت

عەبدوڕڕەزاق لە موجاهیدی گێڕاوەتەوە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) فەرموویەتی گوێم لە پیاوێك بوو لە هاوەڵانی بەدر ئەشزانم کە لە بەدردا بەشدار بووە بە کوڕەکەی فەرموو: لەگەڵ ئێمە فریای نوێژ کەوتی؟ وتی: فریای (اللّٰه أکبر)ی یەکەم نەکەوتم. وتی: ئەوەی لە دەستت چوو لەو نوێژەدا خێری زیاتر بوو لە سەد وشتر کە هەموویان وشتری سوور بن.

## بە کوڕو منداڵەکانیاندا هەڵشاخاون لەسەر دواکەوتن لە چوونە مزگەوت

عەبدولعەزیزی کوڕی مەڕوان کوڕەکەی کە ناوی عومەر بوو ناردی بۆ مەدینە هەتا فێری ئەدەب بێ، نامەشی نووسی بۆ صالحی کوڕی کەیسان کە چاودێریی بکاتو لێی بپرسێتەوە، ئامادەی نوێژەکانی دەکرد، ڕۆژێك تەمەڵیی کرد لە نوێژ، فەرمووی: چیتە؟ وتی شانەکەم قژی مەڵاس کردوم، وتی: تێکچوونی قژت وای کردووە ئامادەی جەماعەت نەبی؟ نامەی بۆ باوکی نووسی، باوکی پیاوێکی بۆ نارد قسەی لەگەڵ نەکرد هەتا قژی پێ تاشی.[٢]

## لە نەخۆشیی مەرگیشدا بۆ نوێژی خەوتنانو بەیانی چوونە مزگەوت

لە ئەبی دەردائەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە نەخۆشی مەرگیدا فەرموویەتی: ئەوە بۆ هەڵمناگرن؟ هەڵیان گرتو بردیانە دەرەوە، فەرمووی: گوێ بگرن، بۆ دوای خۆشتانی ڕابگەیەنن، پارێزگاریی لەم دوو نوێژە بکەن خەوتنانو

---

[1] صلاح الأمة، ج٢، ص٣٦٤. وقال محقق الكتاب"الزهد لهناد" الشيخ محمد أبو الليث الخير آبادى إسناده صحيح.

[2] صلاح الأمة ج٢ ص٣٦٥.

بەیانی، ئەگەر بتانزانیایە چەند خێریان تێدایە بە گاگۆڵکەو لەسەر ئەژنۆو بە چنگەکڕە بۆیان دەچوون.

## کار بەدەستی موسڵمانان زۆر گرنگیان بە نوێژی بە کۆمەڵ داوە

پێغەمبەری خوا (سەلامو سەڵاتی خوای لەسەر بێ) هەڕەشەی زۆری کردووە لە وانەی ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ نەدەبوون, خۆشی هەردەم ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ دەبوو، بە ساغییو نەخۆشییو لە سەفەرو جەنگو حاڵەتی ئاساییو نائاساییدا هەرگیز دوانەدەکەوت.

تەنانەت وای بە خەیاڵدا هاتووە کە ماڵەکان بسووتێنێ بە سەر ئەو کەسانەدا کە ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ نەدەبوون، یان تەمەڵییان لە نوێژی هەینی دەکرد. عومەریش (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: وام بە دڵدا هات بنێرم لە ملی ئەوانە بدرێتو تێیان بخوڕدرێ و پێیان بوترێت بچنە نوێژو ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ بن. هەروەها عومەری فاروق (رەزای خوای لێ بێت) هەواڵی خەڵکی پرسیوەو بە دوایاندا گەڕاوە لە نوێژی بە کۆمەڵدا.

عومەری کوڕی خەتتاب چووە سەردانی سەعیدی کوڕی یەربوع بۆ ماڵەوە و سەرەخۆشی لە دەستدانی چاوەکانی لێکردو، فەرمووی: واز لە نوێژی هەینیو نوێژەکان مەهێنە لە مزگەوتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ)، وتی کەس نییە دەستم بگرێت, فەرمووی: من کەسێکی چاو ساغت بۆ دەنێرم, منداڵێکی بۆ نارد دەستی بگرێ.[1]

عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێ بێ) بە رێگەدا تێدەپەڕیو بانگی دەکرد "نوێژ، نوێژ"، خەڵکی هەڵدەستاند بۆ نوێژی بەیانی، هەموو رۆژێ ئەمە کاری بوو.

ئەمیری شاری مەککە عەتابی کوڕی ئوسەیدی ئەمەوی کە لە لایەن پێغەمبەرەوە دانرابوو: "هەڕەشەی لەگەردندانی لەوانەی کرد کە لە مزگەوتو نوێژی جەماعەت دوا دەکەوتن".[2]

---

[1] صلاح الأمة ج٢ ص ٣٦٧.

[2] هەمان سەرچاوە ص ٣٦٧.

**قال الاعداء في نورالدين الملك الشهيد: "فإنه لم يظفر وينصر علينا بكثرة جند ه وجيشه، وإنما يظفر علينا وينصر بالدعاء وصلاة الليل".**[1] واته: دوژمنەکانی دەربارەی پاشای شەهید نورەددینی زەنگی وتویانە: بەڕاستیی هەرگیز بە لەشکری زۆر زەفەری بە ئێمە نەبردووەو سەرنەکەوتووە بە سەرماندا، بەڵکو بە هۆی دوعاو شەونوێژەوە زەفەرمان پێدەبات و سەردەکەوێ بە سەرماندا.

نابێ کەسێك خۆی بە موسڵمان بزانێ‌و خۆی بە موسڵمان بناسینێ، بەڵام نەچێتە نوێژی جەماعەت، کە بڵێ موسڵمان نیم، گاور، یان جولەکە بێ، کەس لێی ناگرێ. حاتەمولئەسەم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: نوێژێکی جەماعەتم فەوتا، تەنها ئەبو ئیسحاقی بوخاری پرسەو سەرخۆشی لێکردم‌و دڵی دامەوە، ئەگەر منداڵێکم بمردایە زیاتر لە دە هەزار کەس سەرەخۆشی لێدەکردم، ئەوەش بەڵگەیە کە بەڵای دونیایان بەلاوە گەورەترە لە بەڵای قیامەت.[2]

---

[1] (رهبان الليل ج١، ص٥٦٥).

[2] صحيح وصايا الرسول ج١ ص ٣٤.

# نوێژ و مردووەکان

## بۆ نوێژ لەسەر تەرمی مردووەکان دەکرێت؟

کردنی نوێژێکی تایبەت و بە جۆرو شێوازێکی تایبەت لەسەر تەرمی مردووی موسڵمانان، بە فەرمانی خواو پێغەمبەرە ﷺو کەس لە بنباڵی خۆی دەرینەهێناوە، کەواتە کردنی نوێژ لەسەر تەرمی مردووەکان جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە، خواحافیزی و بەڕێکردنی مردووەکانە، هەقو مافی مردووەکانە بەسەر زیندوەکانەوە، دڵدانەوەو خەمڕەوێنە بۆ کەسوکارو خاوەن پرسە، تکایە بۆ مردووەکە، گەورەیی‌و بەرزی و بڵندی پایەی نوێژە کە پێشوازی پێدەکرێ لە تازە لە دایکبووەکانو تەرمی لە دونیا دەرچوونی مردووەکانیشی پێ ئەسپەردەو بەڕێدەکرێ بەرەو دادگای پڕدادی خودا.[1]

نوێژی مردوو هەروەها وەفاداریی زیندو،ەکانە بۆ مردووەکان، سەلماندنی دڵسۆزیی زیندووەکانە بۆ دۆستو خزمو هاوڕێکانیان، لە کاتێکدا کە دەسەلاتیان نەماوەو دەستیان لە دونیا بڕاوەو گلەییو پناشتیان بۆ ناکرێ، ئەو کاتە زیندووەکان دڵسۆزییو وەفاداریی‌و راستگۆیی خۆیان دەسەلمێنن.

چاکەکردن لەگەڵ بێدەسەلاتو کەسانی بێلانەو بێدەرەتانو لێقەوماو پاداشتی زۆر زیاترە لە چاکەکردن لەگەڵ کەسانێك کە ئەوەندە حەوجێی یارمەتی نەبن، مردوو دەستی لە دونیا بڕاوە، هەرکەس چاکەی لەگەڵ بکات ناتوانێت نە پاداشتی کەس بداتەوەو نە سوپاسی کەسیش بکات، چونکە خودا خۆی پاداشتی ئەو چاکانە ئەداتەوە کە چاویان لە دوا نییەو ئومێدی دونیاییان لە پشتەوە نییە.

**عن أبي رافع أسلم مولى أن رسول الله ﷺ قال: "من غسل ميتا فكتم عليه، غفر الله له أربعين مرة".**[2] واتە: لە ئەبی رافعەوە (رەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس تەرمی مردوویەك

---

[1] مەبەست بە وتنی بانگو **"حي على الصلاة"و "حي على الفلاح"**ە بەگوێی مناڵی ساواو مەلوۆتکەی تازە لە دایکبوودا دەدرێو، نوێژی مردووش لە رۆژی لە دونیادەرچووندا.

[2] رواه الحاكم ١٣٠٧و١٣٤٠ وقال: صحيح على شرط مسلم. ورياض الصالحين ٩٢٨.

بشواتو کەموکوڕیی بۆ بشارێتەوەو نەیدرکێنێ، خوا چل جار لە گوناحی خۆش دەبێ".

لە دایکی موسڵمانانەوە، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ)، گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: شەو پێغەمبەر دیار نەما (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، بوریدەم نارد بە شوێنیدا، هاتەوە وتی: لە گۆڕستانی بەقیعە. کەوتینە بەیانی، لێم پرسی شەو چوویە دەرەوە؟ فەرمووی: **"بعثت الى اهل البقيع لأصلي عليهم"**[1] واتە: "ڕەوانە کرام بۆ لای خەڵکی بەقیع تا نوێژیان لەسەر بکەم".

## پاداشتی ئەو کەسەی نوێژی مردوو دەکات

پاداشتی ئەو کەسەی نوێژی مردوو دەکات زۆر گەورەو سەنگینەو تەنها بریتی نییە لەو سوپاسو پێزانینە کەسو کاری مردووەکە، بەڵکو پاداشتی ئەوان لە ڕۆژی دواییدایەو پاداشتی خۆیان لە خودا وەردەگرن.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من شهد الجنازة حتى يصلي عليها، فله قيراط، ومن شهدها حتى تدفن، فله قيراطان، قيل: وما القيراطان؟ قال: مثل الجبلين العظيمين" متفق عليه**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەر کەس ئامادەی بەڕێکردنی تەرمێك بێ هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ، پاداشتی یەك قیراتی بۆ هەیە، هەرکەس ئامادە بێ هەتا بەخاك دەسپێردرێ پاداشتی دوو قیراتی بۆ هەیە. وترا: دوو قیرات چەندە؟ فەرمووی: وەکو دوو کێوی گەورەیە".

**عن ثوبان (رضي الله عنه) قال رسول ﷺ: "من صلى على جنازة فله قيراط، فان شهد دفنها فله قيراطان، القيراط مثل احد". صحيح**[3] واتە: لە سەوبانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس

---

[1] سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٧٧٤.

[2] البخاري ١٢٦١ ومسلم ٩٤٥ ورياض الصالحين ٩٢٩ وأبو داود ٣١٦٨ و ٣١٦٩ والترمذي ١٠٤٠ وصحيح الجامع ٦٣٥٣ و٦٣٥٥ وصحيح فقه السنة ج١ ص٦٤.

[3] صحيح الجامع ٦٣٥٢ والترغيب والترهيب ٥١٤٣

نوێژ لەسەر تەرمی مردووێك بكات خێری یەك قیراتی بۆ هەیە، ئەگەر ئامادەی ئەسپەردەكردنی بێت دوو قیراتی بۆ هەیە، یەك قیرات وەكو چیای ئوحد وایە".

## نوێژ یەكەم پایەی ئیسلامە كە دەبێتە تكاكار بۆ مردووەكان

**عن عائیشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله ﷺ: "ما من میت یصلی علیه امة من المسلمین یبلغون مائة كلهم یشفعون له الا شفعوا فیه"**[1] واتە: لە عائشەوە (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ)، فەرمووی: هەر مردوویەك كە ئوممەتێك لە موسڵمانان نوێژی لەسەر بكەن ژمارەیان بگاتە سەد كەس و هەموویان تكای بۆ بكەن، خوا تكایان بۆی گیرا دەكات.

**وعن إبن عباس (رضي الله عنهما) قال: سمعت رسول الله ﷺ یقول: "مامن رجل مسلم یموت، فیقوم على جنازته أربعون رجلا لایشركون بالله شیئا الا شفعهم الله فیه"**[2] واتە لە عەبدوڵلاّی كوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ)، فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێ) بوو، دەیفەرموو: "هیچ كەسێك نییە بمرێو لەسەر تەرمەكەی چل كەس نوێژ بكەن كە هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەن، حەتمەن خوا تكایان بۆی گیرا دەكات".

**وعن مرثد بن عبدالله الیزني قال: كان مالك بن هبیرة (رضي الله عنه) إذا صلى على الجنازة فتقال الناس علیها، جزأهم علیها ثلاثة أجزاء، ثم قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى علیه ثلاثة صفوف، فقد أوجب"**[3] واتە: مەرسەدی كوڕی عبد اللە یەزنی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی مالیكی كوڕی هوبەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) كە نوێژی مردووی دەكرد لەسەر تەرمێكو خەڵكەكە كەم بوونایە دابەشی دەكردن بە سێ ریز، ئینجا دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا (سەلاّتو سەلامی خوای لێ بێت)

---

[1] رواه مسلم ٩٤٧ وریاض الصالحین ٩٣٢ وصحیح فقه السنة ج١ ص٦٤

[2] رواه مسلم ٩٤٨ و ریاض الصالحین ٩٣٣ و صحیح فقه السنة ج١ ص٦٤٠.

[3] رواه أبو داود والترمذي ١٠٢٨ وقال حدیث حسن. ریاض الصالحین ٩٣٤

فەرموویەتی: "هەرکەس سێ ریز نوێژی لەسەر بکەن بۆ ئەو پێویست دەبێ، واتە تکایان گیرایە".

**قال رسول الله ﷺ: "ما من مسلم يصلى عليه امة الا شفعوا فيه".** حسن[1] واتە : پێغەمبەری خودا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: "هەر موسڵمانێك ئوممەتێك نوێژی لەسەر بکەن ـ نوێژی مردوو ـ ، هەرگیز تکایان رەد نابێتەوە".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ "من صلى عليه مائة من المسلمين غفر له".**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمووی: هەرکەس سەد کەسی موسڵمان نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکەن خوا لێی خۆش دەبێت.

## نوێژ لەسەر تەرمی پێغەمبەرەکانیش کراوە

نوێژی مردوو رێزو تکاو داواکردنی لێخۆش بوونو بەزەییو سۆزو میهرەبانیی خودایە بۆ مردووەکە، پێغەمبەرەکانیش لە هەموو کەس زیاتر شایستەی بەزەیی خوان و لە هەموو کەسیش زیاتر حەزیان لە نزیکی خوا بووەو خۆیشیان لە خەڵکیی جیانەکردۆتەوە، بۆیە نوێژ لەسەر تەرمی پیرۆزیان کراوە.

نوێژ لەسەر تەرمی ئادەم پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) کراوە، **عن أبي بن كعب (رضي الله عنه) قال ان آدم عليه السلام لما حضره الموت، قال لبنيه: اى بني، انى اشتهى من ثمار الجنة، فذهبوا يطلبون له فاستقبلتهم الملائكة، ومعهم اكفانة وحنوطة ومعهم الفئوس والمساحى والمكاتل". فقالوا لهم: يا بنى ادم ما تريدون وما تطلبون؟ او ما ترون؟ واين تذهبون؟ قالوا لهم ارجعوا فقد قضى قضاء ابيكم. فجاءوا فلمّا رأتهم حواء عرفتهم، فلاذت بآدم، فقال: اليك اليك عني، فأني انما اوتيت من قبلك، خلّى بينى وبين ملائكة ربى تبارك وتعالى، فقبضوه وغسلوه وكفنوه وحنطوه وحفروا له، وصلوا عليه، ثمّ دخلوا قبره**

[1] صحيح الجامع ٥٧٦٢.

[2] صحيح الجامع ٦٣٥٦.

**ووضعوا عليه اللّبن، ثمّ خرجوا من القبر، ثم حثّوا علية التراب، ثم قالوا: يا بنى ادم هذة سنتكم". صحيح** [1] واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووویەتی کاتێك ئادەم هاتە سەرە مەرگ بە کوڕەکانی فەرموو: "کوڕەکانم، حەزم لە میوەی بەهەشتە، ڕۆیشتن میوەی بۆ پەیدا بکەن، توشی فریشتەکان بوون کفن و بۆنی خۆش و تەورو پاچ و بێڵیان پێبوو، پێیان فەرمون: ئەی کوڕەکانی ئادەم چیتان دەوێ و بەدوای چیدا وێڵن؟ یان چیتان دەوێ و بۆ کوێ دەچن؟ وتیان: باوکمان نەخۆشە و حەزی لە میوەی بەهەشتە! پێیان فەرمون: بگەڕێنەوە بەڕاستیی باوکتان مردووە. فریشتەکان هاتن کاتێ حەوایان بینی ناسینیەوە خۆی دایە پەنای ئادەم، ئەویش فەرمووی لێم دوورکەوە، لێم دوورکەوە من لە لای تۆوە هاتووم، بەینی من و فریشتەکانی پەروەردگاری پاك و بێگەردو باڵادەست واڵاکەو چۆڵی کە. ئەوانیش گیانیان کێشاو شۆردیان و کفنیان کردو بۆنی خۆشیان پێدا کرد، گۆڕیان بۆ هەڵکەندو گۆڕیچەیان بۆ لێداو نوێژیان لەسەر کرد. ئینجا چوونە گۆڕەکەیەوەو خشتیان بۆ دانا، ئینجا لە گۆڕەکەدا دایان ناو هاتنە دەر، پاشان گڵیان بەسەردا کرد، ئینجا فەرمویان: ئەی نەوەی ئادەم ئەمە سوننەت و ڕێ و شوێنتانە".

**قال إبن عباس (رضي الله عنهما) لما مات رسول الله ﷺ: "ادخل الرجال فصلوا عليه بغير امام ارسالا، حتى فرغوا، ثم ادخل النساء فصلين عليه، ثم ادخل الصبيان فصلوا عليه، ثم ادخل العبيد فصلوا عليه ارسالا، لم يؤمهم على رسول الله ﷺ احد".** [2] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت) کۆچی دوایی کرد پیاوان چوون دەستە دەستە نوێژیان لەسەر کرد هەتا تەواو بوون، ئینجا ئافرەتان هاتن نوێژیان لەسەر کرد، ئینجا منداڵن هاتن نوێژیان لەسەر کرد، پاشان بەندەکان دەستە دەستە نوێژیان لەسەرکرد، کەس پێشنوێژیی بۆ نەکردن لە نوێژکردنیان لەسەر پێغەمبەر (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت).

---

[1] أخرجه احمد في المسند ٢١١٣٨ وقال إبن كثير إسناده صحيح. صحيح قصص الرسول ج٢ ص ٢٨٢.

[2] ـ رواه إبن ماجة ١٦٢٨. والسيرة النبوية للصلابي ج٢ ص٦٩٣

**قال إبن كثير: "وهذا الصنيع، وهو صلاتهم عليه فرادى لم يؤمهم أحد عليه أمر مجمع عليه، لا خلاف فيه.."**.[1] واته: "ئیبن کەسیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەو کارەش کە نوێژکردنیان بوو بە تاك تاكو، کەس پێش نوێژی بۆ نەکردن، کارێك بوو یەکدەنگیی موسڵمانانی لەسەر بوو و هیچ جیاوازیی لەسەر نەبوو".

دەربارەی عیساش، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لە ئاسمان دەهێنرێتەوە خوارو دەججال دەکوژێو دادگەریيو هەرزانیی دەخاتە سەرانسەری دونیای موسڵمانان، گاورو جولەکە هەموو بڕوای پێدێنن، دواتر حەج دەکاتو ماوەی چل ساڵ دەمێنێتەوە، دواتر دەمرێو موسڵمانان نوێژی مردووی لەسەر دەکەن. لە فەرموودەکەدا پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "... **ويهلك في زمانه الملك كلها الا الإسلام ويهلك المسيح الدجال، فيمكث في الأرض أربعين سنة، ثم يتوفي فيصلى عليه المسلمون..**"[2] واتە: لەسەردەمی عیسادا هەموو دینەکان لە بەین دەچن بێجگە لە ئیسلام، هەر ئەویش مەسیحی دەججال دەکوژێ، چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، ئینجا دەمرێو، موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "فيمكث في الأرض أربعين سنة، ثم يتوفي، ويصلي عليه المسلمون " صحيح**[3] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "عیسا چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، پاشان دەمرێو موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن".

---

[1] ـ السيرة النبوية للصلابي ج٢، ص٦٩٤.

[2] ـ صحيح الجامع ٥٣٨٩، القصص القرآني عرض وقائع وتحليل احداث ج٤، ص٤٢٢ـ ٤٢٣.

[3] ـ رواه أبوداود ٤٣٢٤. ومسند الإمام أحمد ٩٢٥٩، واليوم الآخر: القيامة الصغرى عمر الاشقر ص٢٦٩. وأشراط الساعة ص٣٦٤.

## نوێژ دەبێتە هۆی گوشادبوون و رۆشنبوونی گۆڕ

نوێژ دونیای ئادەمیزادەکان رۆشن دەکاتو دەبێتە هۆی رۆشنبوونی گۆڕەکانیش، هەروەها دەبێتە قەڵغانو بەری سزای گۆڕ دەگرێتو خاوەنەکەی دەپارێزێ لە سزاو وەحشەتی ناو گۆڕ.

لەو فەرمودەیەی کە ئەبوهورەیرە گێڕاویەتیەوە لە بەسەرهاتی نوێژکردنی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەسەر پیاوێك، یان ژنێکی رەشپێستو فەرمووی: **"ان هذه القبور مملوءة ظلمة على اهلها، وان الله ينورها بصلاتي عليهم "**.[1]واتە: "بەڕاستیی ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکی بەسەر دانیشتوانیاندا، بەڵام خوا رۆشنیان دەکاتەوە بە نوێژکردنی من لەسەریان".

لە ریوایەتەکەی بوخاریدا دەفەرموێت ئەو ژنە رەشپێستە مزگەوتی پاك دەکردەوەو دەیماڵی ـ یان گەنجێك بوو پێغەمبەر سەڵاتوسەلامی لێ بێ هەواڵی پرسی هتد..."

سوفیانی سەوری (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەبوزەڕی غەفاری (رەزای خوای لێ بێ)، لە لای کەعبە فەرمووی: "ئەی خەڵکینە من جوندوبی غەفاریم، فریاکەون بۆ لای برای میهرەبانو ئامۆژگاریکارتان، خەڵکی باوەشیان پێدا کردو دەستیان لە ملی کرد، فەرمووی: ئێوە دەزانن ئەگەر یەکێکتان بیەوێ بچێتە گەشتو سەفەر ئایا توێشوی گونجاو لەگەڵ خۆی نابات هەتا بیگەیەنێتە مەنزڵ؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: بەڕاستیی سەفەری رێگەی دوارۆژ زۆر لەوە دوورترە کە ئێوە دەیزانن، توێشوی تەواو وەپێچن. وتیان: چی بەکەڵکمان دێ؟ فەرمووی: حەج بکەن چونکە یەکێکە لە کردەوە گەورەکان. بەڕۆژوو بن لە رۆژێکی زۆر گەرمدا بۆ کۆبوونەوەو راوەستانی دوورو درێژ لە رۆژی دواییدا. دوو رکات نوێژ بکەن لە تاریکی شەودا بۆ وەحشەتو بێکەسیی ناوگۆڕ.[2] بەم شێوەیە لەسەر ئامۆژگارییەکانی بەردەوام بوو هەتا کۆتایی..".

---

[٨٨٩]ـ أخرجه البخاري ٤٥٨ومسلم ٩٥٦واللفظ له وصحيح فقه السنة ج١ص٦٥٢

[2] ـ صفة الصفوة ج١، ص٢٢٨الطبعة الأولى.

## سوژدەگا پرسەو ماتەمینی بۆ مەرگی نوێژخوێن دەگێڕێ

خوای گەورە دەربارەی گەلو دارو دەستەی فیرعەون لە قورئاندا دەفەرموێت: " **فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاء وَالأَرض**" (الدخان ٢٩). دەربارەی راڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزە سێ بۆچوون هەیە، کە یەکێکیان ئەمەیە:

**روى أنس بن مالك (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ، أنه قال: "ما من مسلم الا وله في السماء بابان، باب يصعد فيه عمله، وباب ينزل منه رزقه، فإذا مات بكيا عليه".**[1] واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتییەوە لە پێغەمبەری خواوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، فەرموویەتی: هەموو موسڵمانێك لە ئاسمان دوو دەرگای هەیە: دەرگایەك کردەوەکانی لێوەی سەردەکەونو دەرگایەکی تر بژێویو رۆزیەکەی لێوەی دێتەخوار، کە موسڵمانەکە مرد هەردووکیان بۆی دەگرین.

**وقال على (رضي الله عنه): إن المؤمن إذا مات بكى عليه مصلاه من الأرض ومصعد عمله من السماء، وأن آل فرعون لم يكن لهم في الأرض مصلى ولا في السماء مصعد عمل، فقال الله تعالى: فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاء وَالأَرض.**[2] واتە: پێشەوا عەلی (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: بەڕاستیی بڕوادار ئەگەر مرد سوژدەگاکەی لە زەویو شوێنی سەرکەوتنی کردەوەکانی لە ئاسمان بۆی دەگرین، بەڵام دەستو دایەرەی فیرعەون نە لە زەوی سوژدەگاو نە لە ئاسمان دەروازەی کردەوەی چاکیان نەبووە، بۆیە خواش دەفەرموێت نە ئاسمانو نەزەوی بۆیان نەگریان.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "سوورایی کەناری ئاسمان گریانی ئاسمانە".

موجاهیدیش (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: هەر بڕوادارێك بمرێ، چل رۆژ ئەرزو ئاسمان بۆی دەگرین، پێی وترا: جا ئاسمانو زەوی دەگرین؟! فەرمووی: چۆن زەوی بۆ کەسێکی خواپەرست ناگری کە کڕنوشو سوژدەی لەسەر بردووە؟ چۆن ئاسمان ناگری بۆ بەندەیەك کە زیکرو تەسبیحاتەکەی لە فەلەکدا وەکو وینگەی هەنگ (دوی النحل) وایە.

---

[1] ـ رواه الترمذي ٣٢٥٥، وزاد المسير ج٧، ص١٥٤.

[2] ـ زاد المسير ج٧، ص١٥٤.

ڕای دووهەمیش: دەفەرموون مەبەست لەم گریانی ئاسمانو زەویە، گریانی خەڵکی ئاسمانو زەوییە، دیارە خەڵکی دەگرین بۆ کەسی چاکو سوودمەندو خەمخۆرو سوودبەخشو بێ زیان، نەفرینیش دەکەن لە کەسانی دڕندەو خراپەکارو زیانبەخشو میکرۆب ئاسا، بە زیندوییو بە مردوویی هەر جێگەی نەفرینو لەعنەتی خەڵکی ئاسمانو زەوین.

## نوێژ قەڵغانی ناو گۆڕە

بڕوابوون، نوێژن، ڕۆژوو، زەکات، حەج، جیهاد، چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك، پەیوەندیی خزمایەتی، یادی خوا و هەموو کردەوەیەکی چاك بڕوادار دەپارێزیو بە هۆیانەوە خوا دەرووی خێر دەکاتەوە.

لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت) کە کردەوە چاکەکان ئادەمیزاد دەپارێزنو نیگابانی دەکەن لە گۆڕدا، ئیبنو تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێت: لە فەرمودەی مەشهوردا موحەممەدی کوڕی عەمر لە ئەبی سەلەمەوە، لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) کە ئەبو حاتەم لە سەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوەو پێشەوایانی تریش گێڕاویانەتەوە، فەرموویەتی: "بێگومان مردوو گوێی لە خشەی نەعلەکانیان دەبێ کاتێ بەجێی دێڵن، جا ئەگەر بڕوادار بێ، نوێژ لە لای سەریەوە دەبێ.. ئەگەر سزای گۆڕ لە لای سەریەوە بۆی هات نوێژ دەڵێ لە لای منەوە ڕێگە نییە..." [١] نوێژ لە لای سەرییەوە ڕێ لە سزای گۆڕ دەگریو دەڵی لای منەوە ڕێگە نییە.

## مردووەکان ئاوات بە نوێژکردن دەخوازن

مردوو وەکو ئەو کەسە وایە کە بە ڕووبارێکدا چووە، واتە، ئاو بردویەتی، دەست بۆ چڵە پوشێکیش دەبات هەتا خۆی پێ ڕزگار بکات، کەوابوو مردوو ئومێد بە بچووکترین چاکە دەخوازێت، چۆن ئاوات بە نوێژ ناخوازێ کە سەرداری کردەوە چاکەکانە.

---

[1] مجموع الفتاوى ٤\٣٧٥ القيامة الصغرى ص٦٨

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه)، أن رسول الله ﷺ مر بقبر فقال: "من صاحب هذا القبر؟ فقالوا: فلان. فقال: ركعتان أحب الى هذا من بقية دنياكم".**[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) بە لای گۆڕێکدا تێپەڕیو فەرمووی: "خاوەنی ئەم گۆڕە کێیە؟ وتیان فلان کەسە. فەرمووی: دوو رکات نوێژ بە لای خاوەنی ئەم گۆڕەوە خۆشترە لە پاشماوەی دونیای ئێوە.

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: مردن وەکو ئاو بردە وایە، دەست بۆ چڵە پوشێکیش دەبات، تا خۆی پێبگرێتەوە.

کەواتە مردوو ئاتاجی بە بچووکترین چاکەیە، تا بەهۆیەوە رزگاری بێت لە سزای خوا، کەواتە دەبێ دەستپێشخەریی بکات بە گەورەترین چاکە کە نوێژە، خۆی چەکدار بکاتو توێشوو هەڵگرێت بۆ تەنگانەو کاتی بێکەسیی.

## ئەندامی لاشەی مردوو نوێژی لەسەر دەکرێت

پارچەو ئەندامی لاشەی ئادەمیزاد بەڕێزە، هەروەکو لاشەکەی چۆن بە تەواوی خاوەن ڕێزە، ئەو ئەندامانەی جووتن وەکو گوێچکە، چاو، دەست، قاچ، بە هەردووکیان خوێنی ئادەمیزادێکن، ئەو ئەندامانەی تاکن وەکو لوتو زمان خوێنی هەریەکەیان خوێنی ئادەمیزادێکی تەواوە. بۆ نموونە ئەگەر بکوژ نەکوژرایەوەو هاتنە سوڵحو ئاشتەواییو ڕێکەوتن، خوێنی کەسێك سەد وشترە، ئەگەر لوتی کەسێکی بە تەواوی شکاندو لەکاری خست، یان زمانی بڕی، یان لە کاری خستو لاڵی کرد، خوێنەکەی سەد وشترە، خوێنی زمان بە تەنها سەد وشترە، بەڵام ئەگەر چاوێکی کوێر کرد، یان هەر یەکێك لەو ئەندامانەی دوانن، ئەوە خوێنەکەی پەنجا وشترە، هەروەها ئیسلام فرۆشتنی لاشەی ئادەمیزادی حەرام کردووە، مەگەر لە زۆر ناچارییدا، ئەگەر نا کڕینو فرۆشتنو مامەڵە بە ئادەمیزادو بە ئەندامەکانی لاشەی یاساغەو حەرامە.

---

[1] حسن صحيح/ الترغيب والترهيب ٥٥٦ ورواه الطبراني في الأوسط باسناد حسن. وصحيح وصايا الرسول ج٢، ص٣٦٦ـ ٣٦٧.

پێغەمبەری خودا فەرموویەتی سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت: **"على كل ميسم من الإنسان صلاة كل يوم "**.[١]واتە: لەسەر هەموو جومگەیەکی ئادەمیزاد نوێژ فەرزە رۆژانە، کەواتە هەموو ئەندامەکان نوێژخوێن بوون، بۆیە دەبێ نوێژیان لەسەر بکرێت.

## یەکەم پایەی ئیسلامە، پێغەمبەرەکان لە گۆڕدا ئەنجامیان داوە

گەورەترینو پتەوترین پەیوەندیی نێوان بەندەکانو پەروەردگاریان نوێژە. بۆیە پێغەمبەرەکان هەردەم پابەندبوون پێوەیو زۆر گرنگییان پێداوەو هەرگیز کەمتەرخەمییان تێدا نەکردووە. لە حاڵەتی نیشتەجێیو سەفەرو تەندروستیو نەخۆشیی و هەژارییو دەوڵەمەندیی حاڵەتی ئاساییو نائاساییدا، تەنانەت پێغەمبەرەکان لە دوای مردنیش بە جۆرێکی تایبەت ئەنجامیان داوە.

**عن أنس (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "مررت ليلة أسرى بي على موسى قائما يصلى في قبره" صحيح**[٢] واتە: لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەو شەوەی شەوڕەوییم پێکرا بە لای موسادا تێپەڕیم بە پێوە بوو نوێژی دەکرد لە گۆڕەکەیدا.

**وعن أنس (رضي الله عنه: قال رسول الله ﷺ: الأنبياء أحياء في قبورهم يصلون. صحيح**[٣] واتە: لە ئەنەسەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لێ بێ)، لە گۆڕەکانیاندا زیندوونو نوێژ دەکەن.

حەمادی کوڕی سەلەمە (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی سابت بونانی **(الثابت البناني)** دەیفەرموو: خوایە ئەگەر رێگەی یەك کەست داوە لە گۆڕدا نوێژ بکات،

---

[1] رواه إبن خزيمة في صحيحه.

[2] صحيح الجامع ٥٨٦٥ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٢٦٢٧.

[3] صحيح الجامع ٢٧٩٠ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٦٢١.

ڕێگەی من بدە لە گۆڕەکەمدا نوێژ بکەم، وتراوە ئەم نزایەی لێ وەرگیراوە، لە دوای مردنی بینراوە لە گۆڕەکەیدا نوێژی کردووە[1].

## نوێژنەکەر نوێژ لەسەر تەرمی ناکرێت

پێشتر باسمان کرد کە زانایان دەربارەی نوێژنەکەر واتە: کەسێك خۆی بە موسڵمان بزانێت و جاڕی موسڵمانێتی بۆ خۆی بدات، نوێژ نەکات. دەبنە دوو دەستەو خاوەنی دوو ڕای جیاوازن، بە مەرجێ ئەو نوێژنەکەرە دانبنێ بە فەرزێتی نوێژداو بڕوای هەبێ کە نوێژ ئەرکێکی خوایی‌و شەرعییە، بەڵام ئەگەر نوێژنەکات‌و نوێژ بە فەرز نەزانێ‌و بە بێهودەو بە کەمبایەخ سەیری بکات، هەموو زانایان یەك دەنگن‌و یەك قسەن دەربارەی کافربوون‌و بێباوەڕیی، بەڵام ئەگەر نوێژ بە فەرز بزانێ، خۆیشی بە موسڵمان بزانێ، بەڵام نوێژ نەکات‌و لە ئەنجامدانی نوێژ کەمتەرخەمیی‌و دەغەڵیی بکات، زانایان خاوەنی ئەم دوو ڕایەن:

١ ـ **ڕای یەکەم:** دەفەرموون کەسێك بڕوای بە خواو پایەکانی تری ئیسلام‌و ئیمان هەبێ‌و بڕوای بە فەرزێتی نوێژ هەبێ، بە موسڵمانی یاخی‌و گوناهبار دەژمێری‌و بە کافرو بێباوەڕ دانانرێت.

٢ ـ **ڕای دووەم:** دەفەرموون هەرکەس خۆی بە موسڵمان بزانێ‌و نوێژ نەکات، لەبەر تەمەڵیی یان لەبەر هەر هۆیەکی تر، موسڵمان نییە، بە زیندوویی حیسابی موسڵمانی بۆ ناکرێ‌و ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەش مرد بەبێ تەوبە، حیسابی موسڵمانی بۆ ناکرێ‌و شۆردن‌و کفن کردن‌و نوێژ لەسەرکردنی فەرزو ئەرکی شەرعیی نییە لەسەر زیندووەکان‌و بە نەکردنی تاوانبار نابن، خوا دەفەرموێت: **"ولا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَداً وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَاسِقُونَ"**. (التوبة: ٨٤) واتە: هەرگیز نوێژ لەسەر تەرمی یەکێ لەوان مەکەو لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەڕاستیی ئەوان بێبڕوابوون بە خواو پێغەمبەرەکەی و بە لە دین دەرچوویی مردن.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەش، کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول گەورەی دووڕووەکان مرد، کوڕەکەی داوای لە پێغەمبەر کرد کراسەکەی خۆی بداتێ لە

---

[1] صلاح الأمة ج٢ ص٣٩٤ وسير أعلام النبلاء ٢٢٢/٥.

باوکیەوە پێچیٚو دواتریش نوێژی لەسەر بکات، پێغەمبەر فەرمووی کە شۆردتان ئاگادارم بکە، ئەوانیش ئاگاداریان کردو نوێژی لەسەر کرد، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو نوێژکردن لەسەر ئەو کەسانەی قەدەغە کرد.[1] نابێت لە گۆڕستانی موسڵمانان ئەسپەردە بکریٚ.

[1] لە کتێبی "پوختەی تەفسیری قورئان، نوسینی مامۆستا موحەممەد بامۆکی" تەفسیری ئایەتی ٨٤ لە سورەتی تەوبە لاپەڕە ١٩یە.

# حوکمەکانی نوێژنەکەر

## هەر نوێژ نەکردنێك سەربکێشێ بۆ کوفرو بێباوەڕیی ئەم شوێنەوارانەی لێدەکەوێتەوە

### حوکمە دونیاییەکان:

١ ـ دروست نییە ئافرەتی موسڵمان بخوازێ: خوا دەفەرموێت: **"وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ..."**. (البقرة: ٢٢١). واتە: "..ئافرەتانی هاوبەشدانەرو خوانەناس مارە مەکەن، هەتا باوەڕ دەهێنن، بێگومان کەنیزەکێکی باوەڕدار چاکترە لە ئافرەتێکی هاوبەشدانەرو خوانەناس، هەرچەند جوانیی، یان پلەو پایەی سەرنجتان ڕاکێشێ‌و سەرسامتان بکات، ئافرەتانیشتان مارە مەبڕن لە پیاوانی هاوبەشدانەرو خوانەناس هەتا باوەڕ نەهێنن.

هەروەها دەفەرموێت: **"... فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنّ....."**. (الممتحنة ١٠). واتە:... جا ئەگەر زانیتان ئەو ئافرەتانە باوەڕدارن، مەیانگێڕنەوە بۆ لای هاوسەرە کافرەکانیان، چونکە نە ئەمان بەوان حەڵاڵن و نە ئەوانیش لەمانە حەڵاڵن.

٢ ـ سەرپەرشتیاریی لە دەست ئەدات و کاروباری کچ‌و خوشك‌و خزمەکانی پێناسپێردرێ‌و نابێتە سەرپەرشتیاری شەرعیی.

٣ ـ هەقی دایەنی نامێنێ: خوا دەفەرموێ: **".. وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً"**. (النساء: ١٤١) واتە: هەرگیز خوا ڕێگە نادات بێباوەڕەکان بەسەر بڕوادارانداندا دەستڕۆیشتوو بن‌و بەسەریاندا رابگەن.

٤ ـ دروست نییە بچێتە ناوشاری مەککە و ناوماڵی کەعبە.

٥ ـ تەرمەکەی ناشۆررێ وەکو تەرمی موسڵمان، شەرع فەرمانی بە شۆردنی نەکردووە.

٦ ـ سەربڕاوی دەستی ناخورێت‌و حەرامە.

٧ ـ لە گۆڕستانی بڕوادارانداندا ئەسپەردەی خاك ناکرێ.

٨ ـ میرات له خزمه نزیکه‌کانی نابات‌و ئه‌وانیش میراتی لێنابه‌ن.

٩ ـ نوێژی مردووی له‌سه‌ر ناکرێ، خوا ده‌فه‌رموێت: **"وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَداً وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَاسِقُونَ"**. **(التوبة : ٨٤)** واته: هه‌رگیز نوێژ له‌سه‌ر ته‌رمی که‌سیان مه‌که که به بێباوه‌ڕی مرد.

## حوکمی نوێژنه‌که‌ر له دواڕۆژ

١ ـ نوێژنه‌که‌ر له ڕۆژی دواییدا له‌گه‌ڵ فیرعه‌ون‌و هامان‌و قارون‌و ئوبه‌ی کوڕی خه‌له‌ف ده‌بێت.

٢ ـ ده‌بێ به بێباوه‌ڕێك که له دینی ئیسلام ده‌ریده‌کات و هه‌تا هه‌تایه له ئاگردا ده‌مێنێته‌وه. له‌سه‌ر رای به‌هێزی زانایان.[1]

## نوێژکردنی پێغه‌مبه‌ر له‌سه‌ر نه‌جاشی له ڕۆژی مردنیدا

کاتێك پێغه‌مبه‌ری خوا هه‌واڵی مردنی نه‌جاشی پاشای دادپه‌روه‌ر و خواناسی حه‌به‌شه‌ی بیست له ڕۆژی مردنیدا، نوێژی له‌سه‌ر کردو فه‌رمانی کرد به هاوڕێ به‌ڕێزه‌کانیشی که نوێژی له‌سه‌ر بکه‌ن.

**عن عمران بن حصين (رضي الله عنه) قال: "قال رسول الله ﷺ: "ان أخاً لكم قد مات فقوموا فصلوا عليه"**.[2] واته: له عیمرانی کوڕی حوصه‌ینه‌وه (ره‌زای خوایان لێ بێ) فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ری خوا (سه‌ڵات‌و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت) فه‌رمووی: بێگومان برایه‌کتان مردووه که نه‌جاشی بوو، هه‌ستن نوێژی له‌سه‌ر بکه‌ن.

**وعن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "مات اليوم عبد لله صالح (أصحمة) فقام فأمنا وصلى عليه"**[3]. واته: له جابری کوڕی عه‌بدوڵلای (ره‌زای خوای لێ بێ) فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ری خوا (سه‌ڵات‌و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت)

---

[1] الموسوعة الأم في تربية الاولاد ص٢٣٢ـ ٢٣٣.

[2] ـ رواه مسلم ٩٥٣. و صحيح الجامع ١٥٤٩.

[3] ـ رواه مسلم ٩٥٢.

فەرمووی: "ئەمڕۆ بەندەیەکی چاك لە بەندەکانی خوا مردووە کە ناوی (**أصحمة**)یە. هەستا پێشنوێژیی بۆ کردینو نوێژی بە غائیبی لەسەر کرد.

## ئایا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) نوێژی لەسەر ماعز کردووە؟

کاتێك ماعز، هاوڕێی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) هات لە بەرامبەری پێغەمبەری خوا دانی نا بە تاوانەکەیدا هەتا چوار جار، ئینجا فەرمووی گومانتان لە عەقڵی نییە؟ وتیان: نەخێر، عەقڵی تەواوە، ئینجا پێغەمبەر سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بیّ فەرمانیدا بەردەبارانی بکەن.

لە ریوایەتەکانی تردا هاتووە کە هەتا سیّ جار پێغەمبەر پێی فەرموو: تەوبە بکەو داوای لێبوردن لە خوا بکە. لەجاری چوارەمدا وتی: ئەی پێغەمبەر پاکم کەرەوە، فەرمووی لە چ پاکت کەمەوە؟ وتی: لە زینا. ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: ئەریّ ئەمە شێتە؟ وتیان: نەخێر شێت نییە. فەرمووی: ئایا عارەقی خواردۆتەوە؟ پیاوێك بۆنی دەمی کرد وتی: نەخێر. ئینجا فەرمانی دا بەردبارانی بکەن. خەڵکەکە بوونە دوو دەستە هەندێکیان وتیان تیاچووە و بووە بە ژێر گوناهەوە.

هەندێکی تریان وتیان کەس تەوبەی وای نەکردووە، هاتۆتە خزمەتی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیّ بیّ) دەستی خستۆتە ناو دەستیو پێی وتوە بەردەبارانم بکەو بمکوژە. دوو ڕۆژ، یان سیّ ڕۆژ بەو جۆرە مانەوە، ئینجا پێغەمبەر هات بۆ لایانو سەلامی لێکردنو فەرمووی: داوای لێخۆشبوون بۆ ماعز بکەن، وتیان خوا لێی خۆش بێت، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: بەڕاستیی تەوبەیەکی کرد ئەگەر دابەش بکرێت بەسەر ئومەتێکدا لێیان زیاد دەبێت.[١]

پاشان پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر تەرمەکەی کردو هاوەڵەکانیشی بانگکردو فەرمانی پێکردن نوێژیان لەسەرکرد، لە بوخاریو موسلیمدا نوێژ لەسەرکردنەکەی پێغەمبەر هاتووە (سەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت).

---

[٩٠٢]ـ رواه مسلم ١٦٩٥وصحيح قصص الرسول ج١ ص١٦

## نوێژکردنی پێغەمبەر لەسەر تەرمی غامودیە

لێرەدا نامەوێ چیرۆکەکانیان بگێڕمەوە، بەڵام بە کورتی بەسەرهاتەکەیان وەبیرتان دێنمەوە.

بورەیدەی ئەسلەمی (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: غامودیە هاتە خزمەتی پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زینام کردووە پاکم کەرەوە، ئەویش بەڕێی کرد. سبەینێ هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەکو ماعز بەڕێم مەکە بەڕاستیی سکم پڕ بووە. فەرمووی: دەی ئەگەر وایە بڕۆ هەتا منداڵەکەت دەبێ، کاتێ منداڵەکەی بوو لە پەڕۆیەکی پێچاو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەوە منداڵەکەم بوو. فەرمووی: بڕۆ شیری بدەرێ هەتا لە شیری دەبڕییەوە. کاتێ لە شیر بڕییەوە، منداڵەکەی هێناو پارچەیەك نانی دابووە دەست، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەتا لە شیرم بڕیوەتەوەو نان دەخوات. جا منداڵەکە درایە دەست پیاوێكو چاڵیان بۆ خۆی هەڵکەند هەتا سنگیو بەردەبارانیان کرد. خالیدی کوڕی وەلید بەردێکی بەسەری کێشا خوێنی پیا هەڵپڕژاو جنێوێکی بە ئافرەتەکە دا، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: لەسەرخۆبە خالید، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، تۆبەیەکی کردووە، ئەگەر خاوەنی مەکسیش ئەو تەوبەیەی بکردایە خوا لێی خۆش دەبوو، ئینجا فەرمانی کرد نوێژی لەسەر کراو ئەسپەردە کرا.[1]

لە ریوایەتێکی تردا عومەر فەرمووی: نوێژی لەسەر بکرێ ئەی پێغەمبەری خوا کە ئەو زینای کردووە. فەرمووی بەڕاستیی تەوبەیەکی کردووە ئەگەر دابەش بکرێت بەسەر حەفتا کەسدا لە خەڵکی مەدینە، لێیان زیاد دەبێ، بۆ تەوبەی لەوە چاکترت بینیوە کەخۆی کردە قوربانیی تەوبەکەی لەبەر خوا.[2]

## یادی مردن لە ناو نوێژدا

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) بۆ رازاندنەوەی نوێژو کۆکردنەوەو جەم کردنی تەواوی واتاکانی نوێژ، هەر لەناو نوێژەکەیدا بیری لە لای مردن بوو،

---

[٩٠٣] ـ رواه مسلم، ١٦٩٥. وصحيح قصص الرسول، ج١، ص١٩.

[٩٠٤] ـ رواه مسلم ١٦٩٦. وصحيح قصص الرسول ج١ ص١٩.

هەمیشە لە نوێژدا یادی مردنی دەکردەوەو ئەو ئایەتانەی باسی مردنو بەهەشتو دۆزەخو حیسابو کیتابی لای خوای تیابوو رایدەچڵەکاند، هاوڕێکانیشی هەر بەو شێوەیە پێگەیاند.

**عن انس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "اذكر الموت في صلاتك، فان الرجل إذا ذكر الموت في صلاته تحرى ان يحسن صلاته، وصل صلاة رجل لا يظن انه يصلى صلاة غيرها، واياك وكل أمر يعتذر منه"**[١] واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: یادی مردن بکە لە نوێژەکەتدا، بەڕاستیی ئەگەر کەسێك یادی مردن بکات لە نوێژەکەیدا زیاتر شایستەیە کە نوێژەکەی چاکتربێ، نوێژ وەکو نوێژی کەسێك بکە کە وا دەزانێ نوێژی تر ناکاتو ئەمە کۆتا نوێژیەتی، خۆت بپارێزە لە هەموو کارێك کە داوای لێبوردنی بۆ بکەیو بیانووی بۆ بێنیتەوە.

**وقال رسول الله ﷺ: "إذا قمت في صلاتك، فصل صلاة مودع، ولا تكلم بكلام تعتذر منه، وأجمع اليأس مما في أيدى الناس". صحيح**[٢] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئەگەر هەستای بۆ نوێژەکەت نوێژی ماڵئاوایی بکە، هەرگیز قسەیەك نەکەی داوای لێبوردنی بۆ بکەی، نائومێد بە لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە (بە تەمای ماڵی کەس مەبە).

**وقال (ﷺ): "صل صلاة مودع كأنك تراه فان كنت لم تراه فانه يراك".**[٣] واتە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: نوێژی ماڵئاوای بکە وەکو خوا ببینی، ئەگەر تۆش ئەو نەبینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ.

---

[1] حسن: سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٤٢١ و صحيح الجامع ٨٤٩ وقال حسنه الحافظ إبن حجر وصحيح وصايا الرسول ج١ ص٦١٧ و صلاح الأمة ج٢ ص٣٤١ وصلاح الأمة ج٥ ص٥٩٨.

[2] رواه احمد ٢٣٥٤٥ وإبن ماجة ٤١٧١، صحيح الجامع ٧٤٢ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٤٠١ وصلاح الأمة ج٢ ص٣٤١و ج٥ ص٥٩٩.

[3] حسن، حسنه الألباني في صحيح الجامع وصلاح الأمة ج٢ ص٣٤١.

# نوێژو دۆزەخ

ئەگەر كردنی نوێژ هۆكاری چوونە بەهەشتو بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بێت، لە بەرامبەریشدا نوێژ نەكردن هۆكاری چوونە دۆزەخو خەشمو قینی خوایە، چونكە نوێژ پەیوەستبوونی لاشەو گیانو دەروونە بە خواوە، هەركەس ئەنجامی نەدا لە هەموو ئەو لایەنانەوە پەیوەندییو پەیوەست بوونی بە خوا نامێنێ، بەڵكو نەكردنی نوێژ بە چاكییو بە ڕێكوپێكیو بەو شێوەی خواو پێغەمبەرەكەی بڕیاریان داوە دەبێتە هۆی چوونە دۆزەخو غەزەبی خوا: **"فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ (٤) الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ" (الماعون ٤ ـ ٥).**

واتە: سزای وەیل بۆ ئەو نوێژخوێنانەی لەناوەڕۆكی نوێژەكانیان بێئاگان، یان نوێژ لە كاتی دیارییكراوی خۆی دوا دەخەن، ئەی ئەگەر نوێژ هەر نەكەن سزایان چییە؟ هاوڕێكانی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) نەكردنی هیچ پایەو ئەركێكی دینیان بە كوفرو بێباوەڕیی دانەناوە، تەنها نوێژ نەكردن نەبێ.

پێشتر باسكرا كە نوێژنەكەر لەگەڵ فیرعەونو هامانو قارونو ئوبەی كوڕی خەڵەفدا حەشر دەكرێ، ئەمانەش سەرقافڵەی كافرو بێباوەڕو ستەمكارەكان بوون. ئەگەر لەگەڵ ئەوانا حەشر بكرێ دەبێ چاوەڕوانی چی بكات؟!

خوا دەفەرموێت: **"مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ (٤٢). قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ (٤٣)". (المدثر ٤٢ ـ ٤٣)** واتە: ئەوە چی ئێوەی راپێچی دۆزەخ كردووە، دەڵێن لە نوێژخوێنان نەبوینو نوێژمان نەدەكرد.

## دواخستنی نوێژ لەكاتی خۆیدا هۆكاری چوونە دۆزەخە

نوێژ فەرزێكی ئەوەندە گەورەو گرنگە، نەك نەكردنی، تەنانەت دواخستنیشی لەكاتی خۆیدا بە ئەنقەستو گوێ پێنەدانی هەتا كاتەكەی بەسەر دەچێ، دەبێتە هۆی چوونە ناو ناخۆشترین شوێنی دۆزەخ كە شیوی پڕ سزاو ترسناكی دۆزەخە. خوا دەفەرموێت: **"فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ (٤) الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ"** (الماعون ٤ ـ ٥).

واتە: هاوارو واوەیلا بۆ ئەو نوێژخوێنانەی هۆش بە نوێژەكەیان نادەنو لێی بێئاگان.

**إبن الجوزي** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: ئەم ئایەتە دەربارەی دووڕووەکان هاتە خوارەوە کە بە تەمای پاداشتی نوێژەکانیان نەبوونو لە نەکردنیشی ترسی سزایان نەبوو، ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەردا بوونایە نوێژیان دەکرد بە ڕووپامایی، خۆ ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەردا نەبوونایە نوێژیان نەدەکرد. بۆیە دەفەرمووێت: **"الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ"**. واتە: ئەوانەی ڕووپاماییان دەکرد.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێت: "ئەوانە بە تەواوی وازیان لە نوێژ نەهێنا بوو، خۆ ئەگەر بەیەکجاری وازیان لە نوێژ بهێنایە کافر دەبوون، بەڵام وازیان لە پارێزگاریی لە کاتەکانی نوێژ هێنا بوو، عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیش (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت ساهون. واتە: دوایان دەخست لە کاتی خۆی تا کاتی بەسەر دەچوو.[1]

**عن مسروق في قوله: "الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ" قال: إغفال الصلاة عن وقتها. قال أبو عمر: هكذا قرأ الاعمش "لاهون"**.[2] واتە: لە مەسروقەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گێڕدراوەتەوە کە دەربارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: "خۆیان بێئاگا کردووە لە کاتەکانی نوێژ، ئەبو عەمریش فەرموویەتی: ئەعمەش ئاوای دەخوێندەوە لە جیاتی "ساهون" دەیخوێندەوە "لاهون"، واتە گرنگییان پێنەداو بە هەوانتە گرتبوویان.

**قال إبن عباس: "ليس معنى اضاعوها تركوها بالكلية، ولكن أخروها عن أوقاتها"**.[3] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێبێ) دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە **"فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ**. (مريم: ٥٩). واتە: لە دوای خۆیان ئەوانەی جێنشینیان بوون، نوێژیان زایە کرد. فەرموویەتی: مەبەست بە **"أضاعوها"** زایەیان کردو مەبەست نەکردن نییە بە یەکجاریی، بەڵکو لە کاتی خۆی دوای دەخەن.

---

1 زاد المسير ب٨ ل٣٢٩ إبن الجوزي.

2 تعظيم قدر الصلاة للامام المزوري ل٥٦.

3 صحيح وصايا الرسول ج١ ص٣٨٧ نقلا عن تفسير الطبري.

## نوێژ دۆزەخی پێ سارد دەكرێتەوە

بەكارهێنانی ئاوی دەستنوێژ، واتە بەكارهێنانی ئاو بۆ خواپەرستییو ڕەزامەندیی خوا، بەكارهێنانی ئاو بۆ جێبەجێكردنی فەرمانی خواو پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت)، دەبێتە هۆی دووركەوتنەوە لە دۆزەخ.

**عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ انه قال: "إذا اشتدّ الحر فأبردوا بالصلاة، فأن شدة الحر من فيح جهنم".**[1] صحيح واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەری خواوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەگەر گەرما تینی سەند بە نوێژ فێنكی بكەن، چونكە قرچەی گەرما لە هاڵاوو گڕوتینی دۆزەخە".

## نوێژ هۆكاری ڕزگاربوونە لە دۆزەخ

نوێژ فەرمانی خوایە، جێبەجێكردنی فەرمانی خواش ئادەمیزاد لە خواو لە بەهەشتو ڕەزامەندیی نزیك دەكاتەوە، لە بەرامبەریشدا لە دۆزەخو لە خەشمو قینی خوا دووری دەخاتەوە.

**عن أبي زهير عمارة بن روينة (رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ) يقول: "لن يلج النار أحد صلى قبل طلوع الشمس وقبل غروبها" صحيح**[2] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرگیز كەسێك ناچێتە دۆزەخ كە پێش خۆرهەڵاتنو پێش خۆرئاوا بوون نوێژ بكات". مەبەست نوێژی بەیانیو عەسرە.

**عن أم حبيبة (رضي الله عنها) قال رسول الله ﷺ: "من صلى قبل الظهر أربعا، وبعدها أربعا حرمه الله على النار".صحيح** [3]واتە: لە ئوم حەبیبەوە (ڕەزای

---

[1] البخاري ٥١٠و٥١٢ صحيح الجامع ٣٣٩.

[2] صحيح الجامع ٥٢٢٨ مسلم ٦٣٤ والترغيب ٦٤٢ ورياض الصالحين ١٠٤٨ وصحيح وصايا الرسول ج١ ص٤٠٩.

[3] صحيح الجامع ٦٣٦٤ ورياض الصالحين ١١١٦ بهذا اللفظ "من حافظ على أربع ركعات قيل الظهر..."

خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار رکاتو دوای نیوەڕۆش چوار رکات نوێژ بکات، خوا لە ئاگری حەرامی دەکات، واتە قەدەغە دەکات بچێتە دۆزەخ.

**عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من صلى لله أربعين يوما في جماعة يدرك التكبيرة الأولى كتب له براءتان براءة من النار، وبراءة من النفاق". حسن لغيره**[1] واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس چل ڕۆژ لەبەر خوا بە کۆمەڵ (جەماعەت) نوێژ بکاتو فریای (الله أکبر)ی نوێژ دابەستن بکەوێ، رزگاری دەبێ لە دوو شت: رزگاری دەبێ لە ئاگرو رزگاری دەبێ لە دووڕوویی. پیاوچاکانو خواپەرستانیش بۆ خۆ رزگاکردن لە ئاگری دۆزەخ، پەنایان وەبەر نوێژکردن بردووە، هەرەمی کوڕی حەییان بە شەو هەندێك جار دەهاتە دەرەوەو بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: سەرم سوورماوە ئەوانەی بە تەمای بەهەشتن چۆن خەویان لێدەکەوێ؟ سەرم سوورماوە لە ئەوانەی لە دەست دۆزەخ رادەکەن چۆن خەویان لێدەکەوێ؟ ئینجا ئەم ئایەتەی خوێند: **"(أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا بَيَاتاً وَهُمْ نَآئِمُونَ) (الأعراف: ٩٧)**. واتە: خەڵکی شارو گوندەکان چۆن ئەمینن کە سزای خوایان بۆ نەیێت، کاتێ ئەوان لە گەرمەی خەودان.

عامری کوڕی قەیس کە بە شەو هەڵدەستا بۆ شەونوێژ دەیفەرموو: خەو ناچێتە چاوەکانم لەگەڵ باسی ئاگری دۆزەخ.[2]

## نوێژ خاوەنەکەی لە دۆزەخ دوور دەخاتەوە.

هەرکەس لە خوا نزیك بێتەوە بە هۆی خواپەرستییەوە بەو ئەندازەیەش لە دۆزەخ دوور دەکەوێتەوە. نوێژ لە هەموو خواپەرستییەکان زیاتر ئادەمیزاد لە خوا نزیك دەخاتەوە، بۆیە خوا دەفەرموێت: **(كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ) (العلق: ١٩)**. واتە: نەخێر وانییە، بە گوێی مەکە، سوژدەبەرەو لە خوا نزیك بەوە.

---

[1] صحيح الجامع ٦٣٦٥ و الترغيب والترهيب ٥٨١ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ١٩٧٩.

[2] (رهبان الليل ج١، ص٤٣٠).

هەروەها پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوە لە خواوە کە فەرموویەتی **"لا يزال العبد يتقرب الي بالنوافل"**. واتە: "بەردەوام بەندەکان لە خوا نزیك دەبنەوە بە کردنی سوننەتەکان. بە ئەندازەی ئەو نزیکبوونەوەیە لە خوا و لە بەهەشتو ڕەزامەندیی خوا نزیك دەبێتەوە، بەو ئەندازەیەش لە دۆزەخ دوور دەکەوێتەوە.

بە هۆی نوێژ نەکردنەوە ئادەمیزاد دەچێتە دۆزەخەوە، بەڵام نوێژخوێنی راستەقینە لە دۆزەخ دوور دەکەوێتەوە.

## ئەو نوێژەی پێغەمبەر ﷺ بەهەشتو دۆزەخی تیادا بینی.

**عن إبن عباس (رضي الله عنه) قال: انخسفت الشمس على عهد رسول الله، فصلى رسول الله ﷺ، فقام قياما طويلا نحوا من قراءة سورة البقرة، ثم ركع ركوعا طويلا، ثم رفع فقام قياما طويلا وهو دون القيام الأول، ثم ركع ركوعا طويلا وهو دون الركوع الأول، ثم سجد، ثم قام قياما طويلا وهو دون القيام الأول، ثم رفع فقام قياما طويلا وهو دون القيام الأول، ثم ركع ركوعا طويلا وهو دون الركوع الأول، ثم سجد، ثم انصرف، وقد تجلت الشمس، فقال ﷺ: ان الشمس والقمر آيتان من آيات الله، لا ينكسفان لموت احد ولا لحياته، فإذا رأيتم ذلك فاذكروا الله: قالوا: يارسول الله، رأيناك تناولت شيئا في مقامك ثم رأيناك كففت. قال ﷺ: انى رأيت الجنة، فتناولت عنقودا ولو أصبته لأكلتم منه ما بقيت الدنيا! ورأيت النار فلم أر منظرا كاليوم قط ورأيت اكثر أهلها النساء قالوا: بم يارسول الله؟ قال: بكفرهن. قيل: يكفرن بالله؟ قال: يكفرن العشير، وبكفر الإحسان، لو أحسنت الى احداهن الدهر كله ثم رأت منك شيئا قالت: مارأيت منك خيرا قط.**[١] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی لەسەردەمی پێغەمبەردا سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) نوێژی خۆرگیرانی کرد، وەستانێکی دوورو درێژ بە پێوە وەستا

[1] رواه البخاري ١٠٥٢ ومسلم ٩٠٧ والقصة في صحيح قصص الرسول ج٣ ص٢٧٧.

بە ئەندازەی خوێندنی (سورەتی **البقرة**)، ئینجا کڕنوشێکی درێژی برد، ئینجا هەستایەوە هەستانێکی درێژ لە راوەستانی یەکەم کەمتر بوو، ئینجا کڕنوشێکی تری برد، ئینجا هەستایەوە بۆ رکاتێکی تر راوەستا، بە راوەستانێکی درێژ، لە راوەستانی یەکەم کەمتر بوو، ئینجا سەری بەرز کردەوە بە درێژیی راوەستا لە راوەستانی یەکەم کەمتر، ئینجا کڕنوشی برد لە کڕنوشی یەکەمجار کەمتر، ئینجا سوژدەی بردوو رۆیشت (واتە نوێژەکەی تەواو کردو رۆیشت) خۆر بەرەڵا بوو درەوشایەوە، فەرمووی (سەلامی خوای لێ بێ: "بەڕاستیی خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، بۆ مردن‌و ژیانی کەس ناگیرێن، ئەگەر شتی واتان بینی یادی خوا بکەن. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا، بینیمانی لە شوێنی خۆت خەریکی بەکارهێنانی شتێك بووی، ئینجا بینیمانی کۆکەت کرد. پێغەمبەر (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: "بەڕاستیی بەهەشتم بینی، دەستم برد بۆ هێشوێ ترێ ئەگەر لێم بکردایەوە ئێوەش لێتان دەخوارد هەتا دونیا ماوە!، دۆزەخم بینی هەرگیز دیمەنی وا ترسناکم نەبینیبوو، بینیم بەشی زۆری خەڵکەکەی ئافرەتان بوون! وتیان بە هۆی چیەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بە هۆی (کوفریانەوە) ناشوکرییانەوە. وترا: بێباوەڕیی‌و کوفر بە خوا؟ فەرمووی: ناشوکرو سپڵەن بەرامبەر هاوسەرەکانیان، سپڵەو پێنەزانن بەرامبەر چاکەی هاوسەرەکانیان، ئەگەر چاکەت لەگەڵ یەکێکیان کرد بە درێژایی رۆژگار، ئینجا شتێکی لێ بینی، دەڵێ: هەرگیز خێرم لێ نەدیوی.

## پەناگرتن بە خوا لە سزای ناو گۆڕ لە نوێژدا

پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێ) لە هەموو کات‌و شوێنێك لە پاڕانەوەو نزاکانیدا پەنای بەخوا دەگرت لە سزای ناو گۆڕو، هاوەڵەکانیشی فێردەکرد و فەرمانی پێدەکردن کە لە ناو نوێژداو لە تەحیاتدا پەنا بۆ خوا بەرن لە سزای گۆڕو بپاڕێنەوە کە خوا بیانپارێزێ لەو سزاو ئەشکەنجەیە.

**عن أنس (رضي الله عنه) أن النبي ﷺ كان يقول: اللهم انى أعوذ بك من البخل والكسل، وأرذل العمر، وعذاب القبر، وفتنة المحيا والممات. صحيح.**[1] لەناو نوێژدا

[1] رواه مسلم ٢٧٠٦ والترغيب والترهيب ٣٨٣٠.

ئەم دوعایەی دەفەرموو کە لە ئەنەسەوە گێڕاوەتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: "خوایە پەنات پێدەگرم لە ڕژدیو چروکیی، لە تەمەڵیی، تەمەنی کەنەفتیو پەککەوتەیی، لە سزای ناوگۆڕ، لە فیتنەو بەڵای ژیان و مردن.

لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئافرەتێکی جولەکە هاتە خرمەتیو باسی سزای ناوگۆڕی کرد، وتی خوا پەنات بدات لە سزای ناو گۆڕ: عائیشە فەرمووی پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی سزای ناو گۆڕ فەرمووی: بەڵێ سزای ناو گۆڕ ڕاستەو هەقە، فەرمووی لەوەدوا پێغەمبەرم (سەڵاتو سەلامی خوای لێبێ) نەبینیوە نوێژ بکات کە تیایدا پەنا بە خوا نەگرێ لە سزای ناو گۆڕ. صحیح[1] بە هاوەڵەکانی دەفەرموو پەنا بە خوا بگرن لە سزای ناو گۆڕ لەناو نوێژدا، لە دوای تەواوکردنی تەحیات.

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: إذا تشهد احدكم فليستعذ بالله من أربع. يقول: اللهم انی اعوذبك من جهنم، ومن عذاب القبر، ومن فتنة المحيا والممات، ومن شر فتنة المسيح الدجال.**[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان تەحیاتی خوێند پەنا بە خوا بگرێ لە چوار شت. بڵێ: خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە دۆزەخ، لە سزای ناو گۆڕ، لە فیتنەو بەڵای ژیانو مردن، لە شەڕی فیتنەی مەسیحی دەججال.

---

[1] الترغيب والترهيب ٥٢١٠ رواه البخاري ومسلم. والقيامة الصغرى ص٣-٧٠-٧١.

[2] رواه مسلم ٥٨٨ كتاب المساجد ٥٨٨.

# نوێژ و بەهەشت

نوێژ جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە، گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرە (سەلات‌و سەلامی خوای لێ بێ)، نوێژ نزاو پاڕانەوەیە، نوێژ یادی خوایە، نوێژ پابەند بوونە بە دینی پاك‌و بێگەردو راست‌و رەوانی خواوە. نوێژ خۆبەریکردنە لە جولەکەو گاورەکان. نوێژ ملکەچی‌و فەرمانبەرداریی خوایە، بە نوێژ بەندە دەیسەلمێنێ کە بۆ فەرمانی خوا سەری لە رێدایە، سەری لەسەر زەوییە، بە نوێژ بەڵێن بە خوا ئەداو عەهدو پەیمانی لەگەڵ تازە دەکاتەوە، هەر بە نوێژو لە نوێژدا پەیمان بە خوا ئەدا کە توخنی یەك خراپە ناکەوێ، نوێژەکەی فێری دەکات کە دوورەپەرێز بێ لە هەموو کارو فەرمانێك کە پێچەوانەی فەرمانی خوا بێ، هەر لە نوێژەکەیدا پەیمان بە خوا ئەدا کە تەنها هەر ئەو بپەرستێ‌و پشتیش هەر بەو ببەستێ‌و سەر لە بەری ژیانی بە ورد و درشتەوە، بە پەیڕەوی ئیسلام دەکاتە کالآی بالآی.

بۆیە نوێژ گەورەترین پەیوەندیی بە بەهەشتەوە هەیە، دەشێ بڵێین بەهەشتیەکان هەموویان نوێژخوێن بوون، مەگەر کەسانێك وەبەر لێشاوی لێبوردەیی خوا کەوتبن، وەکو ئوسەیریم‌و موخەیریقی یەهودیی.[1] نوێژخوێنان دەرگای تایبەتیان هەیە لە بەهەشتاو لەوێوە بە شایستەترین شێواز پێشوازیی دەکرێن. لە بەهەشتا بەهرەمەندو خۆش گوزەران دەبن بە بەهرەگەلێ لە ژمارە نەهاتووە، ئەوەی بیانەوێ لە خواردن‌و خواردنەوەو هاوسەری شایستەو بەڕێزو حۆری ئاسا، بینینی خوای کردگار، بینینی سەدو بیست‌و چوار هەزار پێغەمبەرو بەخزمەت شادبوونیان. ئەوەی دڵیان مەیلی دەکات، ئەوەی چاویان ئارەزووی بینینی دەکات، ئەوەی هەرگیز بە دڵیاندا گوزەری نەکردووە بۆیان ئامادەکراوە. ئەرێ چۆن رازی بم بە باخچەی سەر زبڵدان لە کاتێکدا پاشای هەرە گەورە بانگم دەکات بۆ فیردەوسی بەرز و بڵند.[2]

---

[1] ئەم دوو کەسە موسوڵمان بوون لە جەنگی ئوحود داو، فریای نوێژو رۆژوو نەکەوتن، تەنها سوژدەیەکیان بۆ خوا نەبردو شەهید بوون.

[2] (رهبان الليل ج١، ص٦٥).

دەربارەی بەرزترین جێگای بەهەشتییەکان لە فەرمودەیەکی قودسییدا کە پێشەوا موسلیم گێڕاویەتییەوە، هاتووە: **"... قال أولئك الذين أردت غرس كرامتهم بيدي، وختمت عليها فلم تر عين ولم تسمع اذن ولم يخطر على قلب بشر"**. واتە: ".. خاوەنی بەرزترین پلە لە بەهەشتا ئەوانەن کە نەمامی رێزو پایەدارییی ئەوانم بە دەستی خۆم ناشتووەو مۆرم لێداوەو هیچ چاوێك نەیبینوەو هیچ گوێیەك نەیبیستووەو بە دڵی کەسیشدا گوزەری نەکردووەو بە دڵی کەسدا نەهاتووە".

## نوێژ هۆکاری چوونە بەهەشتە

نوێژکردن گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێ)، هەرکەسیش گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بێ لەسەر فەرمانبەرداریی ئەوان بژیو بمرێ، دەچێتە بەهەشتەوە.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال: رسول الله ﷺ: "من ثابر على اثنتي عشرة ركعة في اليوم والليلة دخل الجنة، أربعا قبل الظهر وركعتين بعدها، وركعتين بعد المغرب، وركعتين بعد العشاء، وركعتين قبل الفجر"**.[1] واتە: لە عائیشەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: هەرکەس سووربێ لەسەر دوانزە رکات نوێژ لە شەوو رۆژێکدا، دەچێتە بەهەشتەوە: چوار رکات پێش نیوەڕۆ دوو رکات دوای نیوەڕۆ، دوو رکات دوای نوێژی شێوان، دوو رکات دوای نوێژی خەوتنان، دوو رکات پێش نوێژی بەیانی.

**عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) ان رجلا سأل رسول الله ﷺ فقال: أرأيت إذا صليت المكتوبات، وصمت رمضان، وأحللت الحلال، وحرمت الحرام، ولم أزد على ذلك شيئا ادخل الجنة"؟ قال: نعم"**. واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رەزای خوای لێ بێ)، پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) کرد وتی: دەبینی ئەگەر نوێژە فەرزەکانم کردو رۆژووی رەمەزانم گرتو حەڵاڵم بە

[1] صحيح: صحيح سنن النسائي ١٧٩٣، وموسوعة الأخلاق الإسلامية ج٣ ص١٩٩ الترغيب والترهيب ٨٢٨ صحيح لغيره.

حەڵاڵو حەرامم بە حەرام زانیو هیچم لەمە زیاد نەکرد، دەچمە بەهەشت؟ پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرمووی: بەڵیٚ.

**عن أبي هريرة وابي سعيد رضي الله عنهما عن النبي ﷺ قال: ما من عبد يصلى الخمس، ويصوم رمضان، ويخرج الزكاة ويجتنب الكبائر السبع، الا فتحت له أبواب الجنة يدخل من أيها شاء، ثم تلا: "إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً".**[1] (سورة النساء: ٣١). واتە: لە ئەبی هورەیرەو ئەبی سعید (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ)، لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ)، فەرموویەتی: "هەر بەندەیەك پێنج نوێژە بكاتو ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێتو زەكات دەركاتو خۆی بپارێزیٚ لە حەوت گوناهە گەورەكان دەرگاكانی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە لە كامیانەوە بیەویٚ دەچێتە ژوورەوە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: "ئەگەر خۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی لێتان قەدەغەكراوە، خراپەكانتان بۆ دادەپۆشمو دەتانخەمە شوێنێكی بەڕێزەوە".

**عن أبي مالك الأشعري (رضي الله عنه) عن رسول الله ﷺ قال: "ان في الجنة غرفا يرى ظاهرها من باطنها، وباطنها من ظاهرها، أعدها الله تعالى لمن أطعم الطعام، وألآن الكلام وتابع الصيام، وصلى بالليل والناس نيام"**[2] واتە: لە ئەبی مالیكی ئەشعرییەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ)، پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرموویەتی: "لە بەهەشتدا چەند ژوورێك هەیە دەرەوەیان لە ناوەوە دیارەو ناوەوەیان لە دەرەوە دیارە، خوا ئامادەی كردوون بۆ ئەوانە خواردن ئەدەن، قسەیان نەرمو نیانەو ڕۆژوو بەدوای یەكدا دەگرنو شەونوێژ دەكەن لە كاتێكدا خەڵكی لە گەرمەی خەودان".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "إنا صلت المرأة خمسها، وحصنت فرجها، وأطاعت بعلها، دخلت من أي أبواب الجنة**

---

[1] حسن: أخرجه النسائي (المجتبى)٢٤٣٨ وإبن حبان و الحاكم ٢٠٠/١ وصححه و وافقه الذهبی.

[2] حسن رواه احمدو غيره، وحسنه الألباني، صحيح الجامع ٢١١٩ وصحيح وصايا الرسول ج٢ ص٢٥٨.

**شاعت"**.[1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەری خوا (سەلاٌتو سەلامی خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی: "ئەگەر ئافرەت پیٚنج فەرزەی کرد و داویٚنی خۆی پاراست، و گویٚ رایەلٌی هاوسەرەکەی کرد، لەهەر دەرگایەکی بەهەشتەوە بیەویٚت دەچیٚتە ژوورەوە".

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) ان اعرابيا أتى النبي ﷺ، فقال: يارسول الله دلني على عمل إذا عملته دخلت الجنة؟ قال: تعبد الله ولا تشرك به شيئا، وتقيم الصلاة المكتوبة، وتؤتي الزكاة المفروضة، وتصوم رمضان. قال: والذي نفسي بيده لا أزيد على هذا، ولا أنقص منه، فلما ولى، قال النبي ﷺ من سره ان ينظر الى الرجل من اهل الجنة فلينظر الى هذا"**.[2] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لیٚ بیٚ)، عەرەبیٚکی دەشتەکیی هاتە خزمەت پیٚغەمبەر (سەلاٌتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ)، وتی ئەی پیٚغەمبەری خوا کاریٚکم نیشاندە ئەگەر کردم بچمە بەهەشت. فەرمووی: خوا بپەرستەو هاوبەشی بۆ دامەنیٚو نویٚژە فەرزەکان بە چاکیی بکەو زەکاتی فەرز بدەو رۆژووی رەمەزان بگرە. وتی: سویٚند بەوەی گیانی منی بە دەستە، نە لیٚی زیاد دەکەم، نە لیٚی کەم دەکەم. کاتیٚ رۆیشت، پیٚغەمبەر (سەلاٌتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: هەرکەس پیٚی خۆشە سەیری پیاویٚکی بەهەشتیی بکات، با سەیری ئەوە بکات.

خوا لە قورئاندا دەفەرموویٚت: **"وَالَّذِينَ صَبَرُواْ ابْتِغَاء وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرّاً وَعَلاَنِيَةً وَيَدْرَؤُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ * جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا.."**.[3] واتە: ئەوانەی لەبەر خاتری خوا خۆراگرنو بە چاکیی نویٚژ دەکەنو لەوەی پیٚمان داون دەبەخشن بە ئاشکراو نهیٚنی، لە بەرامبەر خراپە چاکە دەکەن، بۆ ئەوانە دواخانە ئامادەیە، کە بەهەشتی نەبڕاوەیە دەچنە ناویەوە.

---

[1] صحيح رواه إبن حبان في صحيحه ٤١٦٣ صحيح الجامع ٦٦٠ وصحيح وصايا الرسول ج٣ ص٥٧.

[2] متفق عليه البخاري ١٣٣٣ ومسلم ١٤ عن جابر. والنسائي وصحيح وصايا الرسول ج٣ ص٤٦٦-٤٦٧.

[3] الرعد: ٢٢ـ ٢٣.

**عن أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) ان رسول الله ﷺ قال: "من صلى البردين دخل الجنة"**[1] واتە: لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "هەرکەس دوو نوێژە فێنکەکە بکات دەچێتە بەهەشت". مەبەست نوێژی بەیانیو عەسرە.[2]

**وقال عبد العزيز بن رواد رحمه الله): من أراد الجنة فعليه بصلاة التسبيح**[3] واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی رووواد (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەرکەس بەهەشتی دەوێ با نوێژی چێشتەنگاو بکات، یان با نوێژی سوننەت بکات بە هەردوو ماناکە هاتووە.

## نوێژخوێن بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت

پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت) دەفەرموێت:[4] **(من صلى البردين دخل الجنة)**. واتە: هەرکەس دوو نوێژە فێنکەکە بکات دەچێتە بەهەشت.

**عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه)، قال رسول الله ﷺ: "من توضأ فاحسن الوضوء، ثم صلى ركعتين، يقبل عليها بقلبه ووجهه، وجبت له الجنة" صحيح**[5] واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی :"هەرکەس دەستنوێژ بگرێت بە چاکی، ئینجا دوو رکات نوێژ بکات، بە دڵو رووخساری روو لە خوا بکا، بەهەشتی بۆ مسۆگەر (واجب) دەبێت.

هەروەها لە عوقبەوە (رەزای خوای لێ بێت)، پێغەمبەر (سەڵات و سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: **"ما من مسلم يتوضأ فيحسن وضوءه، ثم يقوم فيصلى**

---

[1] متفق عليه البخاري ٥٤٨ ومسلم ٦٣٥ ورياض الصالحين ١٠٤٧.

[2] رياض الصالحين ٣٣٩ في شرح الحديث رقم ١٠٤٧.

[3] صحيح وصايا الرسول ج١ ص٤١٦.

[4] الترغيب ٦٤١.

[5] صحيح الجامع ٦١٦٦ والترغيب والترهيب ٥٥٩ حسن صحيح وصحيح أبي داود.

**ركعتين، يقبل عليهما بقلبه ووجهه، الاّ وجبت له الجنة"**[1]. واته: هەر موسڵمانێك دەستنوێژ بگرێ بە چاكیی، ئینجا هەستێ دوو ركات نوێژ بكات، بە دڵو رووخسارو گیان ئاگای لێیان بێت، حەتمەن بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.

خوا لە وەسفێكی بڕواداراندا دەفەرمویێت: **"وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ * أُوْلَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ". (المعارج ٣٤ ـ ٣٥)**. واتە: "ئەوانەش كە پارێزگاریی لە نوێژەكانیان دەكەنو زایەیان ناكەن، ئەوانە لە كۆمەڵی بەهەشتو باخو باخچەدا رێز لێگیراون".

هەركەس كۆتا وشەی بەر لە دونیا دەرچوونو كۆچ وتنی: **"لا إله إلا الله"** بێت بەهەشتییە، بە پێی فەرموودەی راستو دروستو پیرۆزی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێت) نوێژخوێنی راستەقینە مسۆگەر لەوانەیە **(إن شاء الله)**، چونكە لە نوێژەكەیدا دەڵێ: **(أشهد أن لا إله إلا الله)**، جا ئەگەر دوای هەر نوێژێك بمرێ، ئەوە دوای وتنی **(لا إله إلا الله)** مردووەو مردنی مرۆڤیش لەو كاتانە بەدەر نییە، یان دوای نوێژی بەیانی هەتا نیوەڕۆ، یان دوای نوێژی نیوەڕۆ هەتا عەسر، یان دوای نوێژی عەسر هەتا ئێوارە، یان دوای نوێژی ئێوارە هەتا خەوتنان، یان دوای نوێژی خەوتنان هەتا نوێژی بەیانییە.

## دەرگای بەهەشت دەكرێتەوە بۆ نوێژخوێن

نوێژخوێنی راستەقینە كە نوێژێك دەكات خودا داوای كردووەو پێغەمبەریش بە چاكترینو باشترینو تەواوترین شێوە ئەنجامی داوەو هەر خۆیشی فەرموویەتی: **"صلوا كما رأيتموني أُصلي"**. واتە: نوێژ بكەن وەكو من دەبینن نوێژ دەكەم.

هەر كەس بەو شێوەیە نوێژ بكات، لە پارێزكاران (المتقين) دێتە ژمار، ئەوانیش لە پێشوازییاندا دەرگای بەهەشت والایەو لەسەر پشتە: **"وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَراً حَتَّى إذا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ**

---

[1] صحيح الجامع ٥٧٥٦، مختصر مسلم ١٤٣. صحيح ابي داوود ٨٤١ والترغيب والترهيب ٥٦٠ و ٥٥٩ في رواية.

**فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ"** (الزمر: ٧٣). واتە: "بەڕێ دەكرێن بۆ بەهەشت ئەوانەی لە بێفەرمانیی پەروەردگاریان خۆیان پاراستووە دەستە دەستە، هەتا نزیكی دەبنەوە، كە دەرگاكانی لەسەرپشتەو والآن، دەرگاوانەكان پێیان دەڵێن: سەلامتان لێ بێ بچنە ژوور".

**عن أبي هريرة وابي سعيد (رضي الله عنهما) قالا خطبنا رسول الله ﷺ يوماً، فقال: "والذي نفسي بيده (ثلاث مرات)، ثم اكبّ، فأكبّ كلّ رجل منا يبكى لايدرى على مإذا حلف، ثم رفع رأسه وفي وجهه البشرى فكانت احبّ الينا من حمر النعم، ثم قال: ما من عبد يصلى الصلوات الخمس، ويصوم رمضان ويخرج الزكاة ويجتنب الكبائر السبع، الا فتحت له ابواب الجنة، فقيل له ادخل بسلام"** [1] واتە: لە ئەبی هورەیرەوە، لە ئەبی سەعیدەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ)، فەرمویان ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) وتاری بۆ داین، فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە (سێ جار) ئینجا بە ڕودا كەوت، ئیتر یەك پیاو لە ئێمە نەما كە بە ڕووا نەكەوێو نەگری، نەشمان دەزانی بۆ سوێندی خوارد، ئینجا سەری بەرز كردەوەو لە رووخساریدا مزگێنی هەبوو كە لە لامان لە وشتری سوور باشتر بوو، ئینجا فەرمووی: هەر كەسێك پێنج فەرزە بكاتو ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێو زەكاتیماڵی دەركاتو خۆی لە حەوت گوناهە گەورەكە بپارێزێ، حەتمەن دەرگاكانی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوەو پێی دەوترێ بچۆرە ژوورەوە بە سەلامەتی.

إبن خزیمە **العبدي** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: لە ئەسكەندەرییە بووم، كەسێك هاتە خەوم و وتی هەستە شەونوێژ بكە، ئینجا وتی ئەوە نەتزانیوە كە كلیلەكانی بەهەشت لە لای كەسانی شەونوێژكارن، ئەوان گەنجینەداری بەهەشتن، ئەوان گەنجینەداری بەهەشتن، ئەوان گەنجینەداری بەهەشتن.[2]

**عن عبدالله بن السائب (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ كان يصلي أربعا بعد أن تزول االشمس قبل الظهر وقال: انها ساعة تفتح فيها ابواب السماء، فأحبّ أن**

---

[٩٤٠] ـ نضرة النعيم ج٣ ص٥١٧٩٧

[2] (رهبان الليل ج١، ص٥٤٩).

**يصعد لي فيها عمل صالح. صحيح.**[1] واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی سائیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێ) چوار ڕکات نوێژی دەکرد، دوای لاچوونی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماناداو پێش کردنی نوێژی نیوەڕۆ، فەرمووی: بەڕاستیی ئەمە سەعاتێکە دەرگاکانی ئاسمانی تیادا دەکرێتەوە، پێم خۆشە لەو کاتەدا کردەوە چاکەکانم بەرز ببنەوە.

## هەر کەس کەلێنی ریزی نوێژ پڕ بکاتەوە، کۆشکی بەهەشتی پێشکەش دەکرێ

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله ﷺ: من سدّ فرجة بنى الله له بيتا في االجنة، ورفعه بها درجة.**[2] واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی، پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەر کەس کەلێنێکی ریزی نوێژ پڕ بکاتەوە خوا کۆشکێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکاتو پلەیەکیش بە هۆیەوە بەرز دەبێتەوە".

## نوێژخوێن کۆشکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێ

خودا بۆ دۆستانو خۆشەویستانی خۆی کە بەندە ڕاستەکاننی کە خوا دەپەرستن بە هەردوو مەرجە سەرەکیەکەوە:

١ ـ لەبەر خوا.

٢ ـ بە پێی شەرعی خوا.

هەموو جۆرێك لە خۆشییو خۆشگوزەرانی لە باخ و باخات، لە بەهەشت کۆشكو سابات، لە شیرینیو گەزۆو نەبات، لە بەری درەختو هەمەجۆری میوەهات، ئاوی سارد، سەرچاوەی سازگار، جۆباری زوڵاڵ، گوڵو گوڵزاری بەهار، ڕایەڵەی هەنگوین،

[1] رواه النسائي. الترغيب والترهيب ٨٣٦ و٨٣٨ ورواه احمد والترمذي وقال حسن غريب.

[2] صحيح، سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٨٩٢.

شیرو ماست، شەرابە جۆگە بە رووبار، کۆشکی چەند نهۆمو خانوو و تەلاری بۆ ئامادە کردوون، وەکو بەخشش کە نیشانەی خۆشەویستییە.

لە عائیشەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: هەر کەس بەردەوام بێ لەسەر دوانزە رکات نوێژ لە شەوو رۆژێکدا دەچێتە بەهەشت، چوار رکات پێش نیوەڕۆ، دوو رکات دوای نیوەڕۆ، دوو رکات دوای ئێوارە، دوو رکات دوای خەوتنان، دوو رکات پێش بەیانی[1].

**عن أبي ذر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﷺ: "من ركع اثنتى عشرة ركعة بنى له بيت في الجنة"**[2] واتە: لە ئەبی زەڕڕەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ: "هەرکەس دوانزە رکات نوێژ بکات کۆشکێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێ".

**وعن أم المؤمنين ام حبيبة رملة بنت أبي سفيان، (رضي الله عنها) قالت: سمعت رسول الله ﷺ يقول: "ما من عبد مسلم يصلي لله تعالى كل يوم ثنتي عشرة ركعة تطوعا غير الفريضة، الا بنى الله له بيتا في الجنة أو الا بني له بيت في الجنة".**[3] واتە: لە دایکی بڕوادارانەوە ئوم حەبیبە، رەملەی کچی ئەبی سفیان (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (سەلاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: هەر بەندەیەك کە هەموو رۆژێك دوانزە رکات نوێژ بۆ خوا بکات بە خۆبەخش، بێجگە لە فەرزەکان، خوا ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشت، یان ماڵێکی بۆ دروست دەکرێ لە بەهەشت.

**عن أبي موسى (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من صلى الضحى أربعا، وقبل الأولى أربعا، بنى له بيت في الجنة" حسن**[4] واتە: هەرکەس چوار رکات نوێژی چێشتەنگاو بکات لە پێش نوێژی یەکەم کە چوار رکات بکات کۆشکێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێ.

---

[1] الترغيب والترهيب ٨٢٨ قال صحيح لغيره، وصحيح الجامع ٦١٨٣.

[2] صحيح الجامع ٦٢٦٦ وسلسلة الصحيحة.

[3] رواه مسلم ٧٢٨و ١٠٣ وأخرجه أبو داود: ١٢٥ والترمذي ٤١٥ ورياض الصالحين ١٠٩٧.

[4] صحيح الجامع ٦٣٤٠ وسلسلة الصحيحة ٤٣٤٩.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ)، فەرموویەتی:**"من صلى اثنتى عشرة ركعة، بنى الله له بيتا في الجنة"**.[1]واتە: هەرکەس دوانزە رکات نوێژ بکات، خوا لە بەهەشت کۆشکێکی بۆ دروست دەکات.

**وعن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله ﷺ: "من سد فرجة رفعه الله بها درجة، وبنى له بيتا في الجنة". صحيح لغيره**[2] واتە: لە عائیشەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: "هەرکەس کەلێنێکی ریزی نوێژ پڕ کاتەوە خوا پلەیەك بەرزی دەکاتەوەو کۆشکێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (رەزای خوایان لێ بێ)، لە پێغەمبەرەوە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە لە بەهەشتدا چەند ژوورێك هەیە، دەرەوەیان لە ناوەوە دیارەو ناوەوەشیان لە دەرەوە دیارە. ئەبومالیکی ئەشعەری فەرمووی: ئەوانە بۆ کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بۆ کەسانێك کە زمان شیرینو قسەخۆشنو خواردن دەبەخشنو کە خەڵك لە خەودان، ئەوان شەونوێژ دەکەن[3].

لە ئوم حەبیبەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: هەرکەس لە شەوو رۆژێکدا دوانزە رکات نوێژ بکات کۆشکێکی (خانویەکی) لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێ، چوار رکات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، دووڕکات دوای ئێوارە، دوو رکات دوای خەوتنان، دوو رکات پێش نوێژی بەیانی[4].

## نوێژخوێنان میراتگری بەهەشتن

خوای باڵا دەست لە قورئانی پیرۆزدا بەهەشتی کردۆتە میراتی نوێژخوێنان. خوا دەفەرموێت: **"وَالَّذِينَ هُمْ لأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ (٨) وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ**

---

1 سلسلة الصحيحة ٢٣٤٧.

2 الترغيب والترهيب ٧٠٤.

3 (رهبان الليل ج، ص١٨).

4 صحيح الجامع ٦٣٦٢ و ٦٣٦٠.

**يُحَافِظُونَ * أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ * الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (١١)". (المؤمنون ٨ ـ ١١).** واتە: ئەوانەی سپاردەكانیان لەبەرچاو دەگرن‌و ئەوانەی پارێزگاریی لە نوێژەكانیان دەكەن‌و نایان فەوتێنن، ئەوانەن میراتگر، ئەوانە فیردەوس بە میرات دەگرن‌و بە نەمریی‌و بەردەوامیی تیایدا دەمێننەوە.

## دەرگای ئاسمان بۆ نوێژخوێن دەكرێتەوە

دەرگای ئاسمان كە هەر خودا خۆی دەزانێ چۆنەو چۆن دەكرێتەوەو دادەخرێت، بەڵام لە كاتی سەركەوتنی كردەوەی چاك‌و بەرزبوونەوەی گیانی بڕوادار، دەكرێتەوە، بە تایبەتیش بۆ نوێژ كە چاكترین كردەوەیە.

**قال رسول الله ﷺ: "إذا نودي بالصلاة فتحت ابواب السماء، و استجيب الدعاء" صحيح**[1] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: كاتێك بانگ دەدرێت بۆ نوێژ، دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوەو نزاو پاڕانەوەش گیرا دەبێت.

**قال رسول الله ﷺ: "ان أبواب السماء تفتح الى زوال الشمس، فلا ترتج حتى يصلى الظهر، فأحب ان يصعد لى فيها خير" صحيح**[2]واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: بەڕاستیی دەرگاكانی ئاسمان لە كاتی لاچوونی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دەكرێنەوە، پێوەنادرێتەوە هەتا نوێژی نیوەڕۆ دەكرێت، بۆیە پێم خۆشە خێرو چاكەم لەوكاتەدا بۆ بەرز ببێتەوە.

**قال رسول الله ﷺ: "ساعتان تفتح ابواب السماء، وقلما ترد على داع دعوته، لحضور الصلاة والصف في سبيل الله". صحيح**[3] واتە: پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: دوو كات هەیە دەرگاكانی ئاسمانی تیا دەكرێتەوە نزاو پاڕانەوەش بەسەر كەسدا نادرێتەوە: كاتی ئامادەبوون بۆ نوێژ، كاتی ریز بون بۆ جیهاد لە پێناوی خودا.

---

[1] صحيح الجامع ٨١٨.

[2] صحيح الجامع ١٥٣٢.

[3] صحيح الجامع ٣٥٨٧ والترغيب والترهيب ٤٠٠. وجاء في الترغيب والترهيب بلفظ اخر ١٩٨٦–٤٠٦.

له عەبدوڵڵای کوڕی سائیبەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) پیٚغەمبەری خوا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ) چوار ركات نوێژی دەكرد دوای لادانی خۆر له ناوەڕاستی ئاسمان، پێش نوێژی نیوەڕۆ، دەیفەرموو: ئەمە كاتێكە دەرگاكانی ئاسمانی تێدا دەكرێنەوە، پێم خۆشە كردەوەی چاكم تیایدا سەركەون[١].

## دەرگایەكی بەهەشت ناوی دەرگای نوێژە

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال رسول الله ﷺ: "من انفق زوجين في سبيل الله نودي من ابواب الجنة: يا عبد الله هذا خير، فمن كان من اهل الصلاة، دعى من باب الصلاة، ومن كان من اهل الجهاد، دعى من باب الجهاد، ومن كان من اهل الصيام، دعى من باب الرّيان، ومن كان من اهل الصدقة، دعى من باب الصدقة، قال أبوبكر: هل يدعى احد من تلك الأبواب كلها؟ قال: نعم، وأرجو أن تكون منهم". صحيح**[٢] واتە: له ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) پیٚغەمبەری خوا (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: هەر كەس له پێناوی خوادا دوو جۆر بەهرە خەرج بكات، بانگ دەكریٚ له هەموو دەرگاكانی بەهەشت: ئەی بەندەی خوا ئەمە خێرە، هەر كەسیش له نوێژخوێنان بیٚ، له دەرگای نوێژەوە فەرموو دەكریٚ "بۆ ناو بەهەشت"، هەركەسیش له خەباتگێڕانو جیهادكەران بێت، له دەرگای جیهادەوە فەرموو دەكریٚ، هەركەسیش له ڕۆژووەوانان بیٚ، له دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەكریٚو فەرمووی لێدەكریٚ، هەركەسیش له خێرەومەندان بێت له دەرگای خێرو سەدەقەوە بانگ دەكریٚ، ئەبوبەكر فەرمووی: ئایا كەسێك هەیە له هەموو ئەم دەرگایانە فەرموو بكریٚ؟ پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: بەڵیٚ بە ئومێدم تۆ لەوان بیت.

## نوێژ هۆی بینینی خوایە له بەهەشتا

گەورەترینو مەزنترینو سەنگینترین بەهرەی بەهەشت بینینی خوای گەورەیە، گەورەترین هۆی چونە بەهەشتو بینینی خوای گەورەش دوای باوەڕهێنان نوێژكردنە.

---

[٩٥٥] الترغيب والترهيب ٨٣٨

[٩٥٦] صحيح الجامع ٦١٠٩

**عن جرير (رضي الله عنه) قال: كنا مع النبي ﷺ، فنظر الى القمر ليلة البدر، فقال انكم سترون ربكم كما ترون هذا القمر لاتضامون في رؤيته، فان استطعتم الا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها فافعلوا..."** (رواه الأربعة).[1]

واته: له جه‌ریره‌وه (ره‌زای خوای لیّ بیّ) فه‌رمووی: ئیّمه له‌گه‌ڵ پیّغه‌مبه‌ری خوا بووین (سه‌ڵاتو سه‌لامی خوای لیّ بیّ) سه‌یری مانگی کرد شه‌وی به‌در (مانگی چوارده) فه‌رمووی بیّگومان ئیّوه په‌روه‌ردگاری خۆتان ده‌بینن چۆن ئه‌و مانگه ده‌بینن، له بینیندا هه‌ست به ته‌ڵخیی‌و تاریکیی ناکه‌ن، که‌واته هه‌تا ده‌توانن زاڵ بن به‌سه‌ر کردنی نویّژدا پیّش خۆر هه‌ڵاتن‌و پیّش خۆرئاوا بوون‌و ئه‌نجامی بده‌ن.

[1] رواه الاربعة وفضل الصلاة ص ٧١

# چەند دیمەنێك لە ژیانی زانایان

## پێشەوا بوخاری

پێشەوا بوخاری (سۆزو بەزەیی خوای لەسەربێت) پێی وتراوە ئەبوعەبدوڵڵا، ناوی موحەممەد، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرە بووە، پێشەوای فەرمودەناسان و مامۆستای زەین روونانو زیرەکانی سەردەمی خۆی بووە.

رۆژی هەینی ١٣ شەووالی ساڵی ١٩٤ کۆچیی لە بوخارا لە دایکبووە، کاتێ دەستی کرد بە لەبەرکردنی فەرمودە نەگەیشتبووە دە ساڵیی.

پێشەوا بوخاری هەر لە تەمەنی منداڵیەوە هەردوو چاوی لە دەستداوەو بۆتە نابینا، دایکی لە خەودا بە خزمەتی ئیبراهیمی خەلیل گەیشتووە (سەڵاتو سەلامی خوای لێ بێت)، ئیبراهیم پێغەمبەر پێی فەرمووە: ئەی ئافرەت خوای گەورە چاوی کوڕەکەی چاکردیەوە بە هۆی ئەو هەموو گریانو دوعاو نزایەی تۆ کردت بۆ کوڕەکەت. کاتێ بەیانی هەستام کوڕەکەم چاوی چاك بوو بووەوە.[1]

لەو کاتەوە خەوو خۆراکی بووە خزمەتی فەرموودەو نووسینەوەو لەبەرکردنی فەرمودەو گەڕانو شارەو شارو وڵاتەو وڵاتو کۆچو کۆچبار، لە پێناوی فێربوونو لەبەرکردنو نووسینەوەو کۆکردنەوەیو بێژینگکردنی فەرموودە.

خۆی فەرموویەتی: "دووجار چوومە شامو میسرو دوورگەی عەرەبیی، چوارجاریش چوومە بەسرە، شەش ساڵیش لە حیجاز نیشتەجێ بووم، بۆم لە ژمارە نایە چەند جار چوومە کوفەو بەغداد لەگەڵ فەرمودەناسان. ناوبانگی هەر مامۆستایەکی بیستبێ خۆی گەیاندۆتیو فەرموودەی لێوەرگرتووەو پرسیاری لێکردووەو هەڵی سەنگاندووە، رەمزو نیشانە بووە لە هێزی لەبەرکردنو دەرخ کردن نمونەیەکی ناوازە بووە لە بەهێزیی چاو و لەبەرکردنو شارەزایی نەخۆشییەکانی رشتەو دەقی فەرموودە، جارێك لە منداڵیدا گوێی لە مامۆستاکەی بوو کە ئیسحاقی کوڕی راهەوەیهی بوو بە قوتابییەکانی دەفەرموو ئەگەر کتێبێکی کورتو قەشەنگتان کۆیکردایەتەوە لە

[1] صلاح الأمة ج٧، ص٨٢.

فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەربێت). بوخاری دەفەرموێت ئەم قسەیە بووە نەخشێك لەسەر دڵم و دەستم کرد بە کۆکردنەوەی کتێبە سەحیحەکەم، کە شانزە ساڵی خایاند و هیچ فەرمودەیەکیشم تیادا تۆمار نەکردووە هەتا خۆم نەشۆردبێ‌و دەستنوێژم نەگرتبێ‌و دوو رکات نوێژم نەکردبێ. دوای قورئانی پیرۆز راستترین‌و شایستەترین کتێبە. ئیبنوحەجەر لە پێشەکیی کتێبی (**فتح الباري**)دا فەرموویەتی: "**ژمارەی فەرمودەکانی سەحیحی بوخاری بە دووبارەبووەکانەوە (٧٣٩٧)** فەرمودەیە، بەبێ دووبارە بووەکانیش (٢٦٠٢) فەرمودەیە".

پێشەوا بوخاری (رەحمەتی خوای لێ بێ) پێش تەواوکردنی سەحیحەکەی، نیشانی پێشەوایان ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیبن موعین‌و ئیبن مەدینی‌و غەیری ئەوانیش داوە لە پێشەوایانی فەرمودەو زۆر بەچاکیان داناوەو شاهیدی سەحیحیان بۆ داوە، بێجگە لە چوار فەرمودە.[1]

عوقەیلی فەرموویەتی: "لەو چوار فەرمودەیەدا قسە قسەی بوخارییە". واتە ئەو چوارەش صەحیحن، زانایان زۆر بەو کتێبە کەیف خۆش بوون. پێشەوا (**الذهبي**) (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی سەحیحی بوخاری فەرموویەتی: "بەڵام (جامع البخاری الصحیح) گەورەترین‌و پایەدارترینی کتێبی ئیسلامە لە دوای کیتابی خوا، ئەگەر کەسێك بۆ گوێ لێگرتنی هەزار فرسەخ ببڕێ گەشتەکەی بە فیڕۆ نەچووە. زانایان ئەوەندەی گرنگییان بەم کتێبە داوە لە دوای قورئانی پیرۆز گرنگیان بە هیچ کتێبێکی تر نەداوەو، نزیکەی هەشتاو دوو شەرح و روونکردنەوەی لەسەر نووسراوە. **لە بەناوبانگترینیان ئەم چوارەن:**

١ ـ **شرح الأمام بدرالدین الزرکشي**، بە ناوی (التنقیح) (٧٩٤ کۆچیی).

٢ ـ **شیخ الإسلام إبن حجر**، بە ناوی (فتح الباری) (٨٥٢ کۆچیی). کە لە هەموویان دیاترو بەناوبانگترە.

٣ ـ **العلامة العیني الحنفي**، بە ناوی (**عمدة القاري**) (٨٥٥ کۆچیی).

٤ ـ **جلال الدین السیوطی**، بە ناوی (التوشیح) (٩١١ کۆچیی).

---

[1] السنة ومکانتها في التشریع الإسلامي، ص٤٨٥، الدکتور مصطفي السباعی.

پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ساڵی (٢٥٦ کۆچیی) لە دونیا دەرچووەو گەڕاوەتەوە بۆ لای پەروەردگار (هەزاران ڕەحمەت لە گیانی پاکی).

## پێشەوا موسلیم (مسلم)

ناوی موسلیم کوڕی حەجاجی قوشەیری نەیسابوریە، یەکێکە لە بەناوبانگترین پێشەوایانو زانایانی فەرموودە، لە ساڵی (٢٠٤) لە نەیسابور لە دایکبووە، هەر لە منداڵییەوە بە دوای فێربوونو دەستخستنی زانستدا وێڵ بووەو بە وڵاتانی ئیسلامییدا گەڕاوە، وەکو عێراقو حیجازو شامو میسر، لە مامۆستاکانی پێشەوا بوخاریش زانستی وەرگرتووەو زۆر زۆریش بوخاری خۆشویستووەو بە هەیبەتو شکۆوە باسی کردووەو ڕێزی لێگرتووە.

لە دانانی کتێبە سەحیحەکەشیدا چاوی لەو کردووە، کە ناسراوە بە سەحیحی موسلیمو لە چاکترینو پایەدارترین کتێبی فەرموودەیە لەگەڵ سەحیحی بوخاری، بەڵام زۆربەی زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) سەحیحی بوخارییان پێش سەحیحی موسلیم خستووە، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١ ـ پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لەسەربێت) هاوچەرخیو بەیەکگەیشتنی لە فەرمودەگێڕەوەدا بە مەرج داناوە، بەڵام پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێبێ) تەنها هاوچەرخیی بە مەرج داناوە.

٢ ـ وردیی تێگەیشتنو دەرهێنانی حوکمی شەرعی لە بوخاریداو نەبوونی لە سەحیحی موسلیمدا.

٣ ـ پشکنینی بوخاری لە ڕێو ڕەوشتو ژیاننامەی پیاوانی فەرموودە گێڕەوەدا، کە لە لای پێشەوا موسلیم ئەم لایەنە کەمتر بووە.

٤ ـ ئەو فەرمودانەی زانایان ڕەخنەیان هەبووە دەربارەیان، لە سەحیحی بوخاریدا کەمترن، وەك لە سەحیحی موسلیمدا.

زانایان یەك قسەن لەسەر پایەداریی و بلیمەتیی پێشەوا بوخاری بەسەر پێشەوا موسلیمداو خۆشی واتە پێشەوا موسلیم دانی بەوەدا ناوە، هەروەها موسلیم لە بوخارییەوە فەرمودەی گێڕاوەتەوە، بەڵام بوخاری لە موسلیمەوە فەرمودەی نەگێڕاوەتەوە.

ئەو فەرمودانەی پێشەوا موسلیم گێڕاونیەتەوە لە سەحیحەکەدا بەبێ دووبارەکان (٤) هەزار فەرمووده‌یە، بە دووبارەکانەوە (٧٢٧٥) فەرمودەن.

زۆرێك لە زانایان راڤەو شەرحیان لەسەر نووسیوە، تەنانەت خاوەنی کتێبی (کشف الظنون) یانزە دانەی لێ باس کردوون، لە بەناوبانگترین شەرحی پێشەوا نەوەوییە (٦٧٦ کۆچیی)، هەروەها ژمارەیەك لە زانایان سەحیحی موسلمیان کورتکردۆتەوەو بەناوبانگترینیان "تلخیص کتاب مسلم وشرحه) ی زانای پایەدار ئەحمەدی کوڕی عومەری قورتوبی (٦٥٦ کۆچیی).

پێشەوا موسلیم (رەحمەتی خوای لێ بێ) دوای تەمەنێکی پڕ خێرو بەرەکەت، لە ساڵی (٢٦١ کۆچیی) لە دونیا دەرچووە، هەزاران رەحمەت لە گیانی پاکی.[١]

## پێشەوا نەسائی

ناوی ئەبوعەبدوڕڕەحمان، ئەحمەدی کوڕی شوعەیب خۆراسانی بووە، لە ساڵی (٢١٥ك) لە دایکبووە لە شارۆچکەی (نەساء)، کە شارۆچکەیەکە بەناوبانگە لە ناوچەی خۆراسان.

هەر لە تەمەنی منداڵییەوە دەستی داوەتە فێربوونی زانستو لێبڕاوە بۆ فێربوونو خزمەتکردنی فەرمودەی پێغەمبەر (سەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێت)، گوێبیستی حەڵقەو کۆڕی زانستی زانایان بووە لە خۆراسانو حیجازو عێراقو میسرو شامو دوورگەی عەرەبیی. زۆر پارێزکارو دوورپەرێز بووە لە ناشەرعیی، پێشەوای سەردەمی خۆی بووە لە فەرموودەدا و پێشەنگی زانایانی هاودەمی خۆی بووە لە زانستی (الجرح والتعدیل) رەخنەسازیو راستکردنەوە، بلیمەت و سوارچاکی مەیدانی زانستی فەرمودەو زۆر بیرتیژ بووەو توانای لەبەرکردنی زۆر بەهێزو ناوازە بووە، تەنانەت پێشەوا زەهەبیی گێڕاویەتییەوە کە لەبەرکردنی لە پێشەوا موسلیم بەهێزتر بووە.

نەسائی (رەحمەتی خوای لێ بێ) کتێبەکەی کە بە ناوی (سنن الکبری)وە داناوەو نووسیویەتی، دواتر کورتی کردۆتەوە لە (سنن الصغری)داو ناوی ناوە (المجتبی)، کە

---

[1] السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي ص٤٨٧ ـ ٤٨٨ الدكتور مصطفي السباعي.

پلەی لە دوای سەحیحی بوخاریو موسلیمەوەیە. جەلالەدین **سیوطی** شەرحی ئەم کتێبەی کردووە لە کتێبێکی کورتدا، بە ناوی (زهر الربی علی المجتبی)، هەروەها **أبوالحسن محمد بن عبدالهادي السندي الحنفي**، شەرحی کردووە.

پێشەوا نەسائی (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە ساڵی (٣٠٣)ی کۆچیی لە دونیا دەرچووە، هەزارەها رەحمەت لە گیانی پاکی.

## پێشەوا ئەبو داود

ناوی سولەیمان، کوڕی ئەشعەس، کوڕی ئیسحاقی ئەسەدی سەجستانییە، لەساڵی (٢٠٢) لەدایکبووە.

لە پێناوی فێربوونی زانستدا، زۆر شوێن گەڕاوە، وەکو عێراقو شامو میسرو خۆراسان. فەرمودەی لە مامۆستاکانییەوە نووسیوەتەوە، هەروەکو لە مامۆستاکانی بوخاریو موسلیمیش فەرمودەی وەرگرتووە. وەکو پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵو ئیبن شەیبەو قوتەیبەی کوڕی سەعیدو غەیری ئەوانیش.

زانایان زۆر ستایشیان کردووە، بە تایبەتی دەربارەی زانایەتییو ئاستی زانستییو لەبەرکردنو تێگەیشتنی و پارێزکارییو دینداریییەوە.

حاکم (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "ئەبوداود پێشەوای زانایانی فەرمودە بووە لە سەردەمی خۆیدا".

کتێبی سونەنەکەی هەڵبژاردەی پێنجسەد هەزار فەرمودە بووە، کە چوار هەزارو هەشتسەد فەرمودەی لەخۆگرتووەو زیاتر ئەو فەرمودانەن کە دەربارەی حوکمە شەرعییەکانن، یەکەم کتێب بووە دەربارەی ئەحکام بنووسرێ لە لایەن زانایانی فەرمودەوە.

فەرمودەی سەحیحی تیا کۆکراوەتەوە، هەروەها ئەو فەرمودانەی کە نزیکن لە سەحیحەوە، ئەگەر فەرمودەیەکیش سەحیح نەبێت، یان زۆر بێهێز بووبێت، ئاماژەی بۆ کردووە، لە بابەتێکدا ئەگەر هەر فەرمودەی بێهێزی لەسەر بووبێت، فەرمودە بێهێزەکەی باس کردووەو فەرموویەتی: ئەو فەرمودەیە بێهێزە، بەڵام باشترە لە رەئی پیاوانە.

زۆر شەرحو راڤە نووسراوە بۆ سونەنەکەی، لەو زانایانەش کە شەرحیان لەسەر نووسیوە: خەتابی (٣٣٨ کۆچیی). **قطب الدين اليمني الشافعي** (٧٥٢ کۆچی). شهاب الدين الرملی (٨٤٤ کۆچی). **وشرف الحق العظيم آبادي** شەرحی کردووە بە ناوی (عون المعبود) والشيخ **محمود خطاب السبكي**.

لە شاری بەسرە کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی (٢٧٥ك). هەزاران رەحمەت لە گیانی پاکی.[1]

## پێشەوا تیرمیزی

ناوی ئەبوعیسا، موحەممەد، کوڕی عیسا، کوڕی سورە تیرمیزییە، لە ساڵی (٢٠٩ك) لە ترمیز لە دایکبووە. بەڵام إبن بديع الشيباني فەرموویەتی: ساڵی لە دایکبوونەکەی (٢٠٠)ی کۆچییە.

فەرمودەی لە زۆرێك لە زانایان وەرگرتووە، لەوانەش قوتەیبەی کوڕی سەعید، ئیسحاقی کوڕی موسا، سوفیانی کوڕی وەکیع، موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاریو غەیری ئەوانیش.

بە کەنارەکانی جیهانی ئیسلامییدا گەڕاوە بە دوای فێربوونی زانستدا، فەرمودەی وەرگرتووە لە زانایانی خۆراسانو عێراقو حیجازییەکان، هەتا بۆتە پێشەوا لە فەرمودەداو لەگەڵ ئەم زانستەدا پارێزکارییو لەبەرکردنو دەرخکردنو متمانەو دینداریی راستەقینەی کۆکردبوویەوە.

پێشەوا تیرمزی (رەحمەتی خوای لێ بێ) کتێبی (جامع)ەکەی نووسیوە، لە دەرگا فیقهییەکانەوە دایڕشتووەو فەرمودەی سەحیحو حەسەنو بێهێزی لە خۆگرتووەو پلەی هەموو فەرمودەکانیشی روونکردۆتەوەو هۆکاری بێهێزییەکەشی باس کردوون.

زۆرێك لە زانایان شەرحو راڤەیان لەسەر کتێبەکەی پێشەوا تیرمیزی نوسیووە، لەوانەش ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی (٥٣٤ی کۆچیی)، جەلالەدین سیوطیو ئیبن رەجەبی حەنبەلی (٧٩٥ی کۆچیی)، عەبدورڕەحمانی موبارەکفوری هیندی (١٣٥٣ی کۆچیی)، کە ناوی ناوە (**تحفة الأحوذي**).

[1] السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي ص٤٩٠.

پێشەوا تیرمیزی (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) لە ساڵی (٢٧٩ك)ی لە تیرمیزی کۆچی دوایی کردووە، هەزاران ڕەحمەت لە گیانی پاکی.[١]

## پێشەوا ئیبن ماجە

ناوی ئەبوعەبدوڵڵا، بن یەزید، بن ماجەی **حافظ**، زۆر بە دوای زانستی فەرمووددەدا گەڕاوە، شارەو شارو لادێو لادێی وڵاتان گەڕاوە، گوێبیستی هاوڕێو قوتابییەکانی پێشەوا مالیكو ئەللەیسی کوڕی سەعد بووە، خەڵکێکی زۆریش فەرمودەیان لێوە گێڕاوەتەوە.

پێشەوا ئیبن ماجە لە ساڵی (٢٠٧)ی کۆچیی لە دایکبووە، سەفەری کردووە بۆ عێراقو میسرو شام، لە پێناوی فێربوونو خزمەتکردنو پاراستنی فەرمودەی پێغەمبەر (سەلاّتو سەلامی خوای لەسەر بێت).

ئیبن کەسیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئیبن ماجە فەرموویەتی: "خاوەنی کتێبی (السنن) بەناوبانگەکە بەڵگەیە لەسەر زانیارییو کارکردن بە زانستەکەیو دەریاوانییو ئاگادارییو شوێنکەوتنی سوننەت بە ئەسڵو لقەکانییەوە".[٢] کە چوار هەزار فەرموودەی لە خۆ گرتووە.

ئەم پێشەوا پایەدارە لە ساڵی (٢٧٣) کۆچیی لە دونیا دەرچووەو خوا پلەو پایەی بەرز بکاتەوە لە بەهەشتدا.

زۆرێك لە زانایان شەرحی کتێبەکەیان کردووە، لەوانەش: موحەممەد کوڕی موسای الدمیری (٨٠٨ك) و پێشەوا **سیوطی** بە ناوی (مصباح الزجاجە علی **سنن إبن ماجة**).

---

[1] السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي ص٤٩٢.

[2] السنة وأثرها ص٤٩٣.

## پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل

ناوی ئەبوعەبدوڵلا، ئەحمەد كوڕی حەنبەلی شەیبانییە، لە شاری بەغداد لە ساڵی (١٦٤ك) لە دایكبووە، هەر لە بەغداد گەشەی كردووەو پێگەیشتووە.[1]

یەكەم جار لەسەرەتای هەوڵدانی بە دوای زانستدا بەشداریی كۆڕو بازنەی زانستیی ئەبی یوسفی هاوڕێی و قوتابی ئەبوحەنیفە بووەو دواتر دەستی كردووە بە گەڕان بە دوای فەرمودەدا، ئیتر لە ماوەی ژیانیدا سەرقاڵی خزمەتكردنی فەرمووده بووەو چۆتە خزمەتی زانایان و فەرموودەی لێوەرگرتوونو لەبەری كردوونو نوسیونییەتەوە.

پێشەوا ئەحمەد لە چڵەپۆپەو لوتكەی زیرەكییدا بووە، لە دەرخكردنو ئاگاداریی لە سوننەتی پێغەمبەردا (سەلاتو سەلامی خوای لەسەربێت)، دواتر بۆتە پێشەوا لە سونەتدا.

لەسەرەتادا شەرعی لە پێشەوا شافیعی وەرگرتووەو شافیعیش فەرموودەی لەو وەرگرتووە (رەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ)، تەنانەت پێشەوایان بوخاریو موسلیم لە قوتابییەكانی پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بوون، هەروەها خاوەنی پشكو بەشی گەورە بووە لە خواپەرستییو وازهینان لە دونیاو پارێزكاریو لەبەرگرییكردن لە حەقو راستیی.

دووجار تووشی فیتنەو گرفتی (خلق القرآن) بووە، زۆر خۆڕاگربووەو وەكو چیای سەركەش لە بەرامبەریدا وەستاوە، هەتا سەردەمی مەئمون بەسەرچووە، ئەم هەڵوێستەی زۆر كاریگەریی هەبووە، بۆ دامەزراوی زۆرینەی موسڵمان لەو سەردەمەداو هەتا ئێستاش كاریگەریی هەر ماوە، زانایان زۆریان پێدا هەڵوتووەو بە شكۆدارو خاوەن پلەو پایە باسیان كردووە.

ئەوەندە بەسە كە پێشەوا شافیعی (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەربارەی فەرموویەتی: "لە بەغدا دەرچووم كەسم بە پیاوتر بەجێنەهێشتووە چاكترو زاناترو پارێزكارترو دونیا نەویستو لە خواترس تر بێت لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل".

---

[1] السنة وأثرها ص٤٨١.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە شاری بەغدادو لە ساڵی (٢٤١)ی کۆچیی لە دونیا دەرچووەو خەڵکێکی زۆر لە بەڕێکردنی تەرمەکەیدا بەشداربوون، کە لە ژمارە نەهاتوون. لە گەورەترین‌و بەربووسەکانی کتێبی (موسنەد)ە، کە چل هەزار فەرموودەی لە خۆگرتووە.

# ماڵئاوایی

دوای سوپاس‌و ستایشی بێپایان و هەمیشەو بەردەوام بۆ پەروەردگار، سوپاسی هەموو ئەو برا بەڕێزو خوشکە بەڕێزانە دەکەم کە یارمەتییان داوم بە هەر شێوەیەك بێت، بە نووسینەوە، یان پیاچوونەوەی کتێبەکە.

هەروەها نەخشەی بەرگ‌و هەقی بە چاپگەیاندن‌و ئەوانەش هەستاون بە چاپکردنی‌و کارمەندانی چاپخانەکەش.

من زۆر سوپاسیان دەکەم، لە خواش داوا دەکەم پاداشتیان بە چاکترین شێوە بداتەوە.

**نووسەر**

**٢٠٠٧/٩/٢٧**

# سەرچاوەکان


١ ـ القرآن الكريم.

٢ ـ صحيح البخاري، محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، دار النشر: دار إبن كثير , اليمامة ـ بيروت ـ ١٤٠٧ ـ ١٩٨٧، الطبعة: الثالثة، تحقيق: د. مصطفي ديب البغا.

٣ ـ صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج أبو الحسين القشيري النيسابوري، دار النشر: دار إحياء التراث العربي ـ بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

٤ ـ سلسلة الأحاديث الصحيحة.

٥ ـ رياض الصالحين المرقم الطبعة العاشرة / ١٩٨٩، الإمام النووي.

٦ ـ شرح رياض الصالحين، الطبعة الأولى ٢٠٠٣، الشيخ محمد بن صالح العثيمين.

٧ ـ تعظيم قدر الصلاة، للأمام محمد بن نصر المزوري.

٨ ـ صحيح الجامع الصغير ـ الطبعة الأولى ١٤٢٥ ـ ٢٠٠٤ ـ الألباني.

٩ ـ الجامع لأحكام الصلاة، أبي إياس محمود بن عبداللطيف.

١٠ ـ الاستشفاء بالصلاة، دكتور زهير رابع قراحي.

١١ ـ الترغيب والترهيب، (الطبعة الأولى) ٢٠٠٤ه، الامام المنذري.

١٢ ـ زاد المسير (الطبعة الأولى) ١٤١٤ه/ ١٩٩٤م، إبن الجوزي.

١٣ ـ زبدة التفسير.

١٤ ـ صحيح فقه السنة، أبو مالك كمال بن السيد سالم.

١٥ ـ فتح الباري إبن حجر العسقلانى.

١٦ ـ صفة صلاة النبي طبعة ١٤، ١٤٠٨ ـ ١٩٨٧، الألباني.

١٧ ـ روح الصلاة في الإسلام، عفيف عبدالفتاح طبارة.

١٨ ـ تەفسیری ئاسان، چاپی دووەم، برهان ئەمین.

١٩ ـ أيسر التفاسير لكلام العلي الكبير، أبي بكر جابر الجزائري.

٢٠ ـ صفوة التفاسير، الطبعة الأولى ١٩٨١م/ ١٤٠١ه. محمد بن علي الصابوني.

٢١ ـ الأدلة الرضية، الطبعة الأولى ١٩٩١م/ ١٤١١ه، الإمام الشوكاني.
٢٢ ـ الجامع الصحيح من أحاديث النساء، (الطبعة الأولى) ١٤٢٣ه/ ٢٠٠٢م محمد على الصابوني.
٢٣ ـ رهبان الليل، الطبعة الثامنة ١٩٩٩، الدكتور سيد بن حسين العفانى.
٢٤ ـ صحيح قصص الرسول، سعد يوسف محمود أبو عزين.
٢٥ ـ وهرگێڕانی قورئانی پیرۆز، (چاپی یەکەم) هەژار موکریانی.
٢٦ ـ فتاوى معاصرة، الدكتور يوسف القرضاوي.
٢٧ ـ فضل الصلاة، (الطبعة الأولى ١٩٨٥) عبدالجبار فتحى زيدان.
٢٨ ـ القيامة الكبرى، الطبعة الثانية، الدكتور عمر سليمان الأشقر.
٢٩ ـ مع الأنبياء في القرآن الكريم، عفيف عبدالفتاح طبارة.
٣٠ ـ الرسل والرسالات، الدكتور عمر سليمان الأشقر.
٣١ ـ بەرنامەی پەروەردەی نەوجەوانان، موحەممەد سینەمۆکی.
٣٢ ـ مجتمع المثل، الدكتور العائض القرنى.
٣٣ ـ المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم، الطبعة الثالثة، الدكتور عبدالكريم زيدان.
٣٣ ـ صلاح الامة في علو الهمة، الدكتور السيد بن حسين العفانى.
٣٥ ـ موسوعة نضرة النعيم في مكارم أخلاق الرسول الكريم، (الطبعة الثالثة) ٢٠٠٤م، مجموعة من العلماء.
٣٦ ـ السيرة النبويه الدكتور على محمد الصلابي.
٣٧ـ تحفة الأحوذي شرح جامع الترمذي، الإمام الحافظ أبي العلا محمد عبدالرحمن إبن عبدالرحيم المباركفوري.
٣٨ ـ مجموع فتاوى ومقالات متنوعة، الشيخ عبدالعزيز عبدالله بن عبدالرحمن بن باز. الطبعة الثالثة، ١٤٢٣ه.
٣٩ ـ الموسوعة الام في تربية الأولاد / ج١، الدكتور احمد مصطفي متولي. الطبعة الأولى ٢٠٠٥م.
٤٠ ـ الجامع لأحكام الصلاة ج١ ـ ٢، لأبي إياس محمود بن عبداللطيف بن محمود (عويصة). الطبعة الثالثة ٢٠٠٣م.

٤١ ـ صحيح وصايا الرسول، سعد يوسف أبو عزيز.
٤٢ ـ السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي، الدكتور مصطفي السباعي. الطبعة الثانية.
٤٣ ـ صفة الصفوة، الطبعة الأولى، ٢٠٠٣ إبن الجوزي.
٤٤ ـ صفوة الاحكام من نيل الأوطار، وسبل السلام (الطبعة الأولى) ١٩٧٤م/ ١٣٩٣ه، قحطان عبدالرحمن الدوري.
٤٥ ـ تربية الأبناء والمراهقين من منظار الشريعة الإسلامية (الطبعة الأولى) ١٩٩٧، محمد شريف الصواف.
٤٦ ـ الصلاة، أ. د. عبدالله بن محمد بن أحمد الطيار.
٤٧ ـ الرياض الناضرة والحدائق النيرة، الطبعة الأولى ١٤١٨ه/ ١٩٩٨م. الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدى.
٤٨ ـ بەندايەتيى، مامۆستا ناصرى سبحانى.
٤٩ـ الرخص الفقهية في ضوء الكتاب والسنة، الشيخ أحمد عز وعناية
٥٠. المستدرك على الصحيحين، محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري، دار النشر: دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ ١٤١١ه ـ ١٩٩٠م، الطبعة: الأولى، تحقيق: مصطفي عبد القادر عطا.
٥١. صحيح إبن حبان بترتيب إبن بلبان، محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي، دار النشر: مؤسسة الرسالة ـ بيروت ـ ١٤١٤ ـ ١٩٩٣، الطبعة: الثانية، تحقيق: شعيب الأرنؤوط.
٥٢. صحيح إبن خزيمة، تأليف: محمد بن إسحاق بن خزيمة أبو بكر السلمي النيسابوري، دار النشر: المكتب الإسلامي ـ بيروت ـ ١٣٩٠ ـ ١٩٧٠، تحقيق: د. محمد مصطفي الأعظمي.
٥٣. السنن الكبرى، أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي، دار النشر: دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ ١٤١١ ـ ١٩٩١، الطبعة: الأولى، تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري , سيد كسروي حسن.
٥٤. سنن أبي داود، سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني الأزدي، دار النشر: دار الفكر ـ ، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد.

٥٥. سنن إبن ماجة، محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني، دار النشر: دار الفكر ـ بيروت ـ ، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

٥٦. الجامع الصحيح سنن الترمذي، محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي، دار النشر: دار إحياء التراث العربي ـ بيروت ـ تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون.

٥٧. المجتبى من السنن، أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي، دار النشر: مكتب المطبوعات الإسلامية ـ حلب ـ ١٤٠٦ ـ ١٩٨٦، الطبعة: الثانية، تحقيق: عبدالفتاح أبو غدة.

٥٨. المعجم الأوسط، أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني، دار النشر: دار الحرمين ـ القاهرة ـ ١٤١٥، تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد ,عبد المحسن بن إبراهيم الحسيني.

٥٩. المعجم الكبير، سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني، دار النشر: مكتبة الزهراء ـ الموصل ـ ١٤٠٤ ـ ١٩٨٣، الطبعة: الثانية، تحقيق: حمدي بن عبدالمجيد السلفي.

٦٠. مسند الإمام أحمد بن حنبل، أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، دار النشر: مؤسسة قرطبة – مصر.

٦١. البحر الزخار، أبو بكر أحمد بن عمرو بن عبد الخالق البزار، دار النشر: مؤسسة علوم القرآن , مكتبة العلوم والحكم ـ بيروت , المدينة ـ ١٤٠٩، الطبعة: الأولى، تحقيق: د. محفوظ الرحمن زين الله.

٦٢. مسند أبي داود الطيالسي، سليمان بن داود أبو داود الفارسي البصري الطيالسي، دار النشر: دار المعرفة ـ بيروت.

٦٣. مسند أبي يعلى، أحمد بن علي بن المثنى أبو يعلى الموصلي التميمي، دار النشر: دار المأمون للتراث ـ دمشق ـ ١٤٠٤ ـ ١٩٨٤، الطبعة: الأولى، تحقيق: حسين سليم أسد..

# ناوەڕۆك

# بڵاوکراوەکانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیره | ناوی کتێب | نووسەر |
| --- | --- | --- |
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
|---|---|---|
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |

| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
|---|---|---|
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صديق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |

| ٣٧ | سـەيد قوتـب، لـە هاتنـەدنياوە تـا شەهيدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخاليدی<br>و: تارق نەجيب رەشيد |
|---|---|---|
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسايەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەميد موحەممەد عەبدوڵڵا |